

# شیعرو پەخشانی سوارە

## لێکدانەوەو شیکردنەوەی بەرهەمەکانی سوارە ئێلخانی زادە

**کۆکردنەوەو ئامادەکردنی**
**محەممەد بەهرەوەر**

**هەولێر ٢٠١١**

# شیعرو پەخشانی سوارە

## لێکدانەوەو شیکردنەوەی بەرهەمەکانی سوارە ئێلخانی زادە

کۆکردنەوەو ئامادەکردنی
محەممەد بەهرەوەر

هەولێر: ٢٠١١

* ناوی کتێب: شعر و پەخشانی سوارە
لێکدانەوە و شیکردنەوەی بەرهەمەکانی سوارە
* کۆکردنەوەو ئامادەکردنی: محەممەد بەهرەوەر
* بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە (١٢٧ )
* پیت چنین: سوارە فتووحی
* نەخشەسازی: رزگار محسن
* بەرگ: عوسمان پیرداود
* سەرپەرشتیاری چاپ: د.عوسمان دەشتی
* تیراژ: ٥٠٠ دانە
* چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر
* لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٧٥٥ ) ساڵی (٢٠١١)ی پێدراوە.

# پێڕست

## پێشەکی

کاک سوارە بە ڕواڵەت نووسراوەکانی زۆر نین، بەڵام بەپێی ڕوانگەی خاوەن ڕایان ئەوەندەی کە هەیەتی و کەوتۆتە دەست خەڵک، بە وەزن سووک و بە قیمەت گرانە. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەو ڕەمز و ڕاز و وێچواندنە جوانانەی کە لە نووسراوەکانیدا بەیانی کردوون و دەوڵەمەندیی و دەسەڵاتی زمان و ئەدەبیاتی کۆمەڵگای کوردەواری پێ دەرخستوون، سرنجی هەموو لایەکی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە. هەموو ئەو تایبەتمەندییانە وایان کردووە کە «سوارە» وەک تاقەسواری ئەو مەیدانە ناو و ناوبانگ دەرکا و نووسراوەکانی بینە سەرچاوەی لێکۆڵینەوەی خوێندکارانی گەرمێن و کوێستان. هەر بۆیە تاکو ئێستا چەندین خوێندکار لەم دیو و لەو دیو،«تێز»ی خوێندنی باڵای خۆیان، لەسەر نووسراوەکانی سوارە نووسیوە و زۆر بە گرینگ لێیان وەرگیراوە.

«کتێبی سوارە و پەخشانی کوردی» ، لێکدانەوەیەکی کورتە لەسەر «تاپۆ و بوومەلێڵ»ی کاک سوارە و کۆکراوەی بەشێک لەو نووسراوانەیە کە لەسەر بەرهەمەکانی سوارە نووسراون و پێکەوە لە توێی کتێبێکدا بە چاپم گەیاندوون.

لەنێو نووسراوەکانی سوارەدا شیعری «خەوەبەردینە» زیاتر لە هەموویان ناوبانگی دەرکردووە و تاکو ئێستا چەند کەسێک ئەو شیعرەیان مانا کردۆتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو لێکدانەوانە بە تەواوی مەبەستی شێعری «خەوەبەردینە»یان نەپێکاوە. زۆر لەمێژە خوێنەرانی بە ئەمەگی کورد بە ئاواتی ئەوە بوون یەکێک هەبێ و خەوەبەردینە مانا بکاتەوە و خوێنەرانی خۆشەویست لەو چاوەڕوانییە بێنێتە دەر، ئەو کەسەش دەڵێن کاک سەلاحەددین موهتەدی ئامۆزای شاعیرە. هەرچەند کاک سەلاحەددین جارێک لە چاوپێکەوتنێکی تەلەویزیۆنیدا بە ناوی «کتێبێک لە گفتوگۆدا» لەسەر خەوەبەردینە قسەی کرد، بەڵام لەبەر دەرفەتی کورتی بەرنامەکە نەیتوانی هەموو ئامانجەکانی خەوەبەردینە لێک داتەوە و خوێنەران ڕازی بکا.

کاک سەلاح زۆر جار بەڵێنی ئەوەی داوە لە وەخت و کاتی پێویستدا قسە لەسەر خەوەبەردینە بکا. دیارە کات و ساتەکە هاتۆتە دی و ئەوەتا جارێکی دیکە لە کەشوهەوایەکی ئازاد و دۆستانەدا، بە شێنەیی و بە شێوازێکی ڕێکوپێکتر و تێروتەسەلتر، لەگەڵ پێشەکییەکی مێژوویی سەبارەت بەو هەلومەرجەی «خەوەبەردینە»ی تێدا خولقاوە، هەروەها درکاندنی برێک بابەتی تازەتر، وەک شیعری «کچی بەیان» ـ کە بۆ کێ کوتراوە ـ و... بە تێڕوانینێکی شیاو و زانستییانە «خەوەبەردینە»ی خستۆتە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

هەر وەک کوتم کاک سوارە نووسراوەکانی زۆر نین و ئەوەندەش کە نووسیونی بە تەواوی نەکەوتوونە دەست خەڵک و بە ناتەواوی و پچڕ پچڕ لێرە و لەوێ باسی دەکرێ. وەک شیعری «سوورەقەڵا، دایکی بەڵا»، شیعری «دیواری چین» کە کاک سەلاح بەو چەشنە باسی نێوەرۆکەکەی دەکا:

«سەردەمێکە زەمانە شت زۆر دەڕووخێنێ، دیواری چین سەردەمی ڕووخانێتی».

بەداخەوە کاک سەلاح هیچ ڕوونکردنەوەیەک لەسەر بەسەرهاتی ئەو شیعرە بە دەستەوە نادا و بە سەریدا تێدەپەڕێ. ئەوەندەی من ئاگادار بم، ئەوە هەوەڵین جارە کە شیعری «دیواری چین» وەک شیعری سوارە باسی لێ دەکرێ، هەڵبەت باسی دیواری چین لە شیعری «شەنگە سوار»یش‌دا هاتووە و دەڵێ:

**ڕووخـــــــان کــــــــۆشکی لە پۆڵا**
**دیواری چین و پەیکەری بولهــــــەول**

بە داخەوە شوێنەوار و بەرهەمی زۆربەی شاعیران و نووسەرانی کورد لەبەر نەبوونی ئازادی یا ونبوون یا تێداچوون، کە سوارەش بەدەر لەوان نییە و لە کاتی خۆیدا نووسراوەکانی نەپارێزراون و ئێستا بە شک و گومانەوە باسیان لێ دەکرێ. جێگای خۆیەتی ئەوەش بۆ مێژوو بڵێم: سوارە دۆستی وای هەبووە کە نووسراوەکانی وەک دایکی چاک بۆ لە ئامێز گرتووە و لە فەوتان ڕزگاری کردوون، بەڵام تاکو ئێستا نیشانی هیچ کەسی نەداون.

ساڵی ١٣٨٨ی هەتاوی کتێبێک بە ناوی «خەوەبەردینە ـ سەرجەمی شیعرە کوردییەکانی سوارە ئێلخانی‌زادە» ئامادەکردنی «ئەفشین بەهاری‌زەڕ» چاپ بوو. نووسەر لە لاپەڕە ٩ی پێشەکی کتێبەکەدا بۆچوونی خۆی دەربڕیوە و دەڵێ: «یەک لە دۆستان ئاغای «مەم» لە جەنگەی قسەوباسێ کە لەسەر شیعری سوراه بوو و باسم لەوە دەکرد کە دەمەوێ شیعرەکانی کۆ کەمەوە و ئەگەر کرا لە چاپی دەم، فەرمووی: «من بۆخۆم دۆستی نزیکی سوارە بووم و دەستنووسێک لە شیعرەکانی سوارەم لە لایە کە بۆ خۆی خوێندوویەتەوە و ئەمن پاکنووسم کردووە، پێت خۆش بێ دەتدەمێ و بۆ خۆشم هەر چیم پێ بکرێ، درێخی ناکەم». ئاغای «بەهاری‌زەڕ» لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: «ئەو برادەرە دەفتەرێکی دامێ کە بۆخۆی لەگەڵ سوارەدا خوێندبوویانەوە و هەڵەکانیان ڕاست کردبۆوە و لە برێ جێدا سوارە بۆخۆی چەند وشەو ڕستەی گۆڕیبوو» کارم بەوە نییە کە ئاغای «بەهاری‌زەڕ» چۆنی کەلک لەو دەستنووسەی کاک سوارە وەرگرتووە و چۆن خۆی لە شیعرە فارسییەکانی سوارە بواردووە؟ ئەمە مەبەستی من نییە.

ئەمجا با بزانین ئاغای «مەم» کە بە قەولی خۆی دۆستی نزیکی سوارە بووە و

دەستنووسی شیعرەکانی سوارەی لە لایە، لەبەرچی ڕایگرتووە و بۆ تاکو ئێستا ئەو گەنجینە ئەدەبییەی دۆستەکەی شاردۆتەوە؟ یانی دۆستایەتی ئاغای «مەم» لەگەڵ کاک سوارە، هەر بۆ ئەوەی بووە کە دەستنووسی شێعرەکانی بۆ بشارێتەوە؟ هیچ شک لەوەدا نییە کە ئاغای «مەم» بەشێک لە نووسراوەکانی کاک سوارەی لە لابووە و لەم بارەوە پێوەندی لەگەڵ گیراوە، بەڵام بە داخەوە وەڵامی بۆ زۆربەیان تەنیا ئەوە بووە کە: «لە لام نەماون». بێ گومان ئاغای «مەم» یەکێک بووە لەو ڕووناکبیرە نیشتمانپەروەرانەی سەردەمی سوارە و دەبێ ئاگاداری ڕۆژنامەو بڵاوکراوەکانی کوردیش بووبێ، بە تایبەت لەسەر ئەو نووسراوانەی کە لەسەر کەسایەتی و بەرهەمی ئەدەبیی سوارە نووسراون. دۆستەکانی سوارە تاکو ئێستا بە دەیان وتارو مەقالەیان لەسەر سوارە بڵاو بۆتەوە و هەر یەکەی لایەنێکیان شی کردۆتەوە، بەڵام ئاغای «مەم» نەک هیچ لایەنێکی شاراوەی سوارەی شی نەکردۆتەوە، بەڵکو دەستی بە سەر دەستنووسەکەشیدا گرتووە.

ئێستاش نەچووە بچێ، هیوادارم ئاغای «مەم» دوای ئاشکراکردنی دەستنووسەکانی سوارە کە لە لای خۆی پاراستوونی - یا بڵێین زیندانی کردوون - ئەرکی ڕووناکبیریی خۆی بەجێ بێنێ و هەرچی زووتر بیانگەیەنێتە دەستی خوێنەران و ببێتە هۆی داکوژانی ئەو شەڕەقەڵەمانەی کە لەسەر هێندێک لە شیعرەکانی سوارە گومانیان دروست کردووە، چونکە لە زۆربەی ئەو کۆبوونەوە و بۆنانەی کە سەبارەت بە سوارە بەڕێوە دەچن، هەروەها لە نووسراوە و کتێباندا دێن هەر جارەی بەربینگ بە شیعرێکی سوارە دەگرن و دەڵێن هی سوارە نییە.

دەبێ ئاماژە بەو خاڵەش بکەم کە بەشێکی بەرچاو لەو وتارانەی نێوئاخنی ئەو کتێبە کراون، پێشتر لە کتێبی «سوارە و پەخشانی کوردی»دا بڵاو کراونەوە.

**محەممەد بەهرەوەر**

# کورتەی ژیانی سوارە

کاک سوارە، ساڵی ١٣١٦ی هەتاوی لە گوندی تورجانی بۆکان لە دایک بوو. خوێندنی سەرەتایی لە مەکتەبخانەی تایبەت لە لای مامۆستا شێخ ئەحمەد کەس نەزانی لە گوندی قەرەگوێز دەست پێکرد. سێ کلاسی هەوەڵی ناوەندی لە بۆکان خوێند، بۆ تەواوکردنی ناوەندی دەچێتە تەوریز. ساڵی ١٣٤١ی هەتاوی دیپلۆمی لە دەبیرستانی «لوقمان»ی تەوریز وەرگرت. هەر ئەو ساڵە لە تاقیکردنەوەی زانستگەی تاران وەرگیرا و لە کۆلیجی حقوقی بەشی قەزایی دەستی کرد بە خوێندن.

سوارە، ساڵی ١٣٤٣ی هەتاوی بۆ ماوەی شەش مانگ لە بەندیخانەی "قزلقەڵا"ی تاران کەوتە ژێر بێرەحمانەترین ئەشکەنجە و ئازاری ساواک، بەڵام پاڵەوانانە خۆی ڕاگرت و شیعرە مەشهوورەکەی "سوورەقەڵا، دایکی بەڵا"ی هەر لەو زیندانەدا هۆنییەوە.

سوارە، دوای ئەوەی لە زیندان هاتە دەر، خوێندنی زانستگای درێژە پێدا و ساڵی ١٣٤٧ی هەتاوی خوێندنەکەی تەواو کرد. ساڵی ١٣٤٦ی هەتاوی لە بەشی کوردی ڕادیۆی تاران دەستی بە کار کرد و بوو بە کاربەدەستی دەوڵەت.

ساڵی ١٣٥٤ی هەتاوی بە هۆی تەسادوفی ماشێن لە تاران، لە نەخۆشخانەی "میساقییە" کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی هێنرایەوە گۆڕستانی بنەماڵەکەی لە گوندی "حەمامیان"ی بۆکان.

# سواره و پەخشانی کوردی

**محەممەد بەهرەوەر**

نووسین لە سەر بەرهەمەکانی کاک سوارە پێویستی بە لەخۆ ڕادیتن و شارەزاییەکی زۆر لە سەر ڕابردووی ئەم نووسەرە هەیە، بەلام من پێم وایە هەر کەس لە قەدەر بڕشت و توانای خۆی دەکرێ ڕا و بۆچوونی ـ هەڵبەت بەپێی بەڵگە ـ دەربڕێ.

من نامەوێ باسی ئەوە بکەم کە کاک سوارە لە پلەی هونەری شیعر و شاعیریدا، چ دەورو شێوازێکی بووە و تا چ ڕادەیەک لەم بوارەدا سەرکەوتوو بووە، یان چ ئالوگۆڕێکی بە سەر قۆناخەکانی شیعردا هێناوە. ئەوە ئەرکی توێژینەرانە. تاکو ئێستا بە دەیان کەس لەم مەیدانەدا قەڵەمیان کەوتۆتە گەڕ و بیر و بۆچوونی خۆیان سەبارەت بەم شاعیرە مەزنە دەربڕیوە و لێکدانەوەکانیان لە زۆربەی گۆڤار و حەوتەنامە و وەرزنامەکاندا بلاو بوونەوە.

هەر وەک دەزانن، کاک سوارە تەنیا شاعیر نەبوو، لە نووسینی پەخشانیشدا لێوەشاوەیی و شارەزایی خۆی سەلماندووە. ئەو بە قەڵەمە سحراوییەکەی بەشێکی بەرچاوی لەم مەیدانەش بڕ داوە و بایەخداربوونی پەخشانی کوردی کە لە لایەن بەرەی مامۆستایان: هەژار، هێمن، قزلجی، شوکور مستەفا و... بە هێند دەگیرێ و گەشە دەکا، سوارە برەوی زیاتری پێدەدا و دەبێتە هۆی سەرهەڵدانێکی نوێ لە پەخشان و ئەدەبیاتی کوردی. کە وابوو بەبێ لێکدانەوە و شیکردنەوەی ئاستی تاپۆ و بوومەلێڵ، هەڵسەنگاندنی پەخشانی کوردی، هەڵسەنگاندنێکی ناتەواوە.

بابەتەکانی کتێبی تاپۆ و بوومەلێڵ، دووهەمین شوێنەواری پڕبایەخ و گرینگی کاک سوارەیە کە کاتی خۆی لە ڕادیۆ بلاو دەبوونەوەو کۆی پتر لە شێست بەرنامەیە و هەر بەرنامەیەک لایەنێکی ژیانی کۆمەڵگای کوردەواری ـ بە ناحەز و جوانەوە ـ شی دەکاتەوە و بەرزیی و دەوڵەمەندیی پەخشانی کوردی، بە شێوەیەکی جوان و سرنجڕاکێش دەخاتە ڕوو. بابەتەکانی "تاپۆ و بوومەلێڵ" سالی ١٣٥١ سەرەتا لە ڕادیۆ تاران و لە پاشان لە ڕادیۆ کرماشان و مەهاباد بلاو دەبنەوە، لێرەدا پێویستە ئاماژە بەو خاڵە بکەم کە ئەو سەردەمی کتێب و نووسراوەی کوردی زۆر کەم بوون و ئەوەی هەشبوون تەنیا ژمارێکی کەم لە ڕووناکبیران، ئەویش بە زەحمەت و بە نهێنی وەگیریان دەکەوت و دەیانخوێندنەوە.

کاتێک کاک سوارە، لە ڕادیۆ تەلەویزیۆن بوو بە کاربەدەستی دەوڵەت، تاقمێک لە ڕووناکبیران پێی هەڵبەزینەوە، لەبەر ئەوەی ئەم ناوەندە لە ژێر چاوەدێری توندی دەوڵەتدا

بوو، بۆ کەسایەتی سیاسی، بەتایبەت کەسێکی وەک سوارە جێگای گومان و پرسیار بوو، ئاخر کاک سوارە، بەپێی ڕابردووی سیاسی، دژی ئەم چەشنە دام و دەزگایانە بوو و لە زیندانی قزلقەلادا یەکێک بوو لەو بەندییە بوێرانەی کە وەک "قارەمان" و نەبەز ناوبانگی دەرکرد و قەڵای خۆڕاگری هاوبەندییەکانی پتەوتر کرد و وورەی زیندانییەکانی بردە سەر.

کاک سوارە، یەکێک بوو لەو کەسایەتییە سیاسییانەی، کەسایەتی بە ئەدەبیات کردە باوو ڕابردووی خۆی لەبیر نەبردەوە. هەلومەرجی قۆستەوە و نووسینی بەرنامەکانی تاپۆ و بوومەلێڵی گەلاڵە کردن و لە بڵێنگۆی دوژمن بۆ بەرژەوەندی و قازانجی ئەدەبی نەتەوەکەی ئەوپەڕی کەلک وەردەگرێ و بیروبڕوای سیاسی خۆی ـ هەر وەک لە نووسراوەکانییدا دێنە بەرچاو ـ کردە نێوئاخنی ئەم بەرنامانە.

کاک سوارە، بۆ گێڕانی سیاسەت و نیشتمانپەرستی لە بیانوو دەگەڕێ و بە هەر شێوەیەک و لە هەر شوێنێک دەرفەتی بۆ دەڕەخسا، هەستی نیشتمانپەروەری خۆی دەردەبڕیو ئاوێتەی تام و چێژی بەرنامەکەی دەکرد. لە بەرنامەیەکدا، شیعرێکی نیوەچڵی یاساغی شاعیرێکی گەلەکەی دەکاتە دەسپێکی بەرنامەکە و دەڵێ:

"**ڕۆڵە من بیرم لە تۆ زیاترە...**"، دیارە ئەمە لە کاتێکا دەڵێ کە لە ئێرانی ئەو سەردەمەدا کەم کەس لە خۆی ڕادەدی لەم بوارە بدوێ. "کەڵ بە موو بەند بوو": بەڵام کاک سوارە، هەل و دەرفەت دەقۆزێتەوە و لە درێژەی بەرنامەکەیدا باسی:

تفەنگ، سەنگەر، شۆڕش، برینی گوللە، سەرۆک و شەهید دەکا و بە نیوەچڵی چەند نیوەشیعری نیشتمانیی دیکە لە بەرنامەکەیدا دەگونجێنێ:

"**داری ئازادی بە خوێن ئاو نەدرێ قەت بەر ناگرێ، لە دەوری دەست و تفەنگت گەڕێم کە ڕۆژی خەبات لە حاستی هەڵمەتی تیرت چ ناگرێ بەرگە، پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن شیوەن و گرین**".

ئەم تاپۆیە، تەواو سیاسی و نیشتمانییە و لەو هەلومەرجە ناسکەدا شوێنێکی گرینگی لە سەر گەشانەوەی هەستی نەتەوایەتی گوێگر و خوێنەر داناوە. سوارە، لەم بەرنامە کورتانەی کە لە ڕادیۆ بڵاو دەبوونەوە، دەرد و زام و مەینەت و ئێشی هاوبەشی کۆمەڵگای، سنووری دەستکردی دوژمنی لاسار و داگیرکەری نەتەوەی کوردی وەلا دەنا و زوڵم و زۆری ئەم دوژمنە سوێندخۆرانەی کوردستانی لە هەر بەشێکی ئەم خاکە پیرۆزە لە قاو دەدا. لە بەرنامەیەکی تردا سووتانی گوندێکی کوردستانی عێراق بە دەستی خوێنڕێژانی بەعسی داگیرکەر دەکاتە تابلۆیەک و سرنجی خوێنەران ڕادەکێشێ، هەستی نەتەوایەتی دەبووژێنێتەوەو دەڵێ:

**"ئەگەر هەستی برایەتی لە هەرێمێک کوژایەوە، لە هەرێمێکی تر دەبووژێتەوە."**

بەم شێوە، هەستی هاوڕەگەزی و برایەتی خەڵکی کورد بۆ هاودەردی و یارمەتیدانی گەلی کوردی ئاوارەی ئەو دیو، زیندوو ڕادەگرێ. گەلی کورد لە هەر شوێنێک بن، برا و هاوپشتی یەکن و دابەشکردنیان نابێتە هۆی لێکدابڕانیان.

کاک سوارە، ئاشقە و جوانی پەرست، بەڵام بەپێی نووسراوەکانی زیاتر لە هەموو شتێک ئاشقی زێد و نیشتمانی خۆیەتی. ڕاونان و لە بەندیخانە بوونەکەی بەڵگەی حاشاهەڵنەگرن بۆ ئەم مەبەستە.

سوارە خوڵقێنەرێکی بالادەست و ڕووناکبیرێکی شارەزای زمان و کولتووری کۆمەڵگای کوردەوارییە. ئەم تابلۆیانەی کە لە تاپۆ و بوومەلێڵدا خوڵقاندوونی ڕەنگە لە ئەسر و پەخشانی کوردیدا کەم وێنە بن و قافڵەسالاری ئەم مەیدانەیە. بە یەکەوە سرنج دەدەینە تابلۆی "ئەوین":

"وا دیارە کاتێ گەلی ئادەمیزادیان خۆش ئەکرد، ئاوی ئەوینیان لێ پژاند یا گڵی ئادەمیزادیان بە ئاگری ئەوین هەڵگرساند.

**ئەوینی ئینسان، تەنیا برووسکەیەکی یەزدانییە کە مرۆ ئەباتە لای سەرتری بارەگای فریشتەی خوداوە، ئەوین هەوێنی هەست و هەناسە و هەبوونی ئینسانە.**

**ئەوین پەرەدارترە لەوە کە تەنیا لە نیگای حەز لێ کارییا، یا لە شۆر و شۆقی بە یەک گەیشتنی پیاوێک و ئافرەتێکا بگونجێ."**

کاک سوارە، بۆ بەکارهێنانی وشە و ڕستەی جوان و ڕەسەنی کوردی، پێم وایە یەکێکە لەو مامۆستا کوردی زانانەی کە بە دەگمەن جێگایان پڕ دەبێتەوە. لە نووسراوەکانیدا زاڵبوونی بە سەر زمان و فۆلکلۆری کوردیدا زۆر بەرچاوە و ڕەسەنایەتی و ڕەوانی و بەپێز بوونی نووسراوەکانی بۆ خوێنەر ئاشنان.

قەڵەمی سوارە، هەر وەک چۆن ئەوینی پێ ڕازاوەتەوە، هەر بەم شێوە لە بەستێنی خەم و پەژارە و دەرد و ئێشیشدا، دەکەوێتە گەڕ و بە هێنانی کورتترین ڕستەی کورت و کوردانە، جوانترین پەخشانەکان دەخوڵقێنێ و بە خوێندنەوەیان، هێندەی دیکە زاڵبوونی کاک سوارەت بە سەر زمانی کوردیدا بۆ دەردەکەوێ و کاتێ پەرۆشی و ئازارەکانی ڕۆژگار دەوریان تەنی، خوێندنەوەی ئەم نووسراوە بەهێز و بەپێزانەی کاک سوارە وات لێ دەکا کە شان وەبەر باری گران و کەند و کۆسپی ژیان بدەی و بە شوێن ڕێگاچارەیەکەوە بی. بزانین سوارە خەم و ئازارەکان چۆن دەناسێنێ:

**"بەڵام دەرکی ئادەمیزاد شێوەی کەوڵێکی بچووکی هەیە و هەزار دەریا خەم ئەبا...**

**ئەگەر ئادەمیزاد جادووی لەبیرچوونەوەی نەبوایە، چۆن ئەیتوانی لە ژێر باری خەما خۆی ڕابگرێ؟!".**

پێم وایە، سوارە، بەو قەڵەمە جادووی نواندووە و بە چاوپێکەوتنی ئەم هونەرە بەرزەی هونەرمەند، کە وا لەم چەند دێڕەدا خولْقاندوونی، خەم و پەرارەی ڕابردوو - ئەگەر لە بیریش مابێ - فەرامۆشی دەکا و لە ناخەوە ئافەرین دەنێرێ بۆ ئەم قەڵەمە بەهێز و جوانەمەرگە.

کاک سوارە، ڕێز دادەنێ بۆ ئەو مرۆڤانەی کە لە پێناو سەربەستی گەلەکەیاندا گیانیان دەبەخشن و دەبنە هۆی شەکاوەیی ئاڵای نەتەوەکەیان. ئەو شانازییان پێوە دەکا و بە هەوێنی سەربەرزیی گەلیان دادەنێ و بە شەهیدی سەربەرزیان ناودێر دەکا.

لە زۆربەی وڵاتان، شەهید، هەوێنی شانازیی و ڕەمزی سەرکەوتنە. سوارە، لە ڕستەیەکدا جوانترین تابلۆ بۆ شەهیدی نەتەوەکەی دەخولْقێنێ:

**"لەشی خاوێنی شەهیدێک لە ناو سەنگەرا کەوتبوو و بە خوێنی پاکی بەردی مەتەرێز نەخشابوو."** ڕەنگە تابلۆی وا سرنجڕاکێش و جوان و پڕنێوەرۆک بە بیری کەم کەسدا هاتبێ.

کاک سوارە، کوڕە عەشیرەت بوو، تێکەڵاوی لەگەڵ خەڵک زۆر بوو، ڕەنگە هەر ئەو بابەتە بووبێتە هۆی ئەوەی کە دەرد و ئێش و زامی ئەم گەلە چەوساوە زیاتر هەست پێبکا و هەر زمانی ئەوان بکاتە هەوێنی پەخشانی دەوڵەمەندی ئەدەبی کوردەواری و لەو ڕێیەوە بەشکۆتری بکا.

سوارە، لە هەر شتێک دەدوێ دەڵێی بە سەر خۆی هاتووە و ڕەنگە ڕەمزی سەرکەوتنی کاک سوارە هەر لەمەدا بێ. لە «تاپۆیەک»دا لە خەمی کیژێک دەدوێ کە دایکی لە هێرشێکی فڕۆکەی دوژمندا لە خوێنی خۆی دەگەوزێ، ئەم دیمەنە دڵتەزێنە بەم شێوە دەردەبڕێ:

**"دایکی دوو جار بەرگی سووری کردۆتە بەر، جارێک کە ئەبوو بە بووک و ئەهات بۆ کۆشکی ڕەنگاوڕەنگی بەخت و ئەوین، ئەو جارەی لە زمان دایکییەوە بیستبوو، بەڵام جاری دووهەم خۆی دیبووی کە دایکی جلی سووری کردە بەر و بوو بە بووکی مردن."**

ڕەنگە تاکو ئێستا بە قەڵەمی کەم کەس، تابلۆی ئاوا جوان بۆ مردنی دایک،نەخشابێ. ئەم نووسراوەیە بە وەزن سووک و بە قیمەت گرانە، ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەخا کە سوارە، لە لایەکەوە ڕێز دادەنێ بۆ دایک و لەو لا تروە ئەوەمان وە بیر دێنێتەوە کە بەرەی ژنانیش چەشنی پیاوان لە گۆڕەپانی شەڕ و لە سەر خاکی نیشتمان، خوێنیان دەڕژێ و سەرشۆڕی دوژمن دەسەلمێنن. هەروەها بە هاوبەشیی ئافرەتان گۆڕەپانی خەبات بەربڵاوتر دەبێ و هەستی شۆڕشگێڕی پەرە دەگرێ.

کاک سواره، لای وایە **(ئینسان لە هەموو هەلومەرجێکدا مافی ژیانی هەیە و بە درێژایی مێژوو ژیاوە و هەمبەر تۆفان و با و بۆران و سەخڵەت و سەرما وەستاوە.**

**بۆ پاراستنی مافی ژیان، کەند و کۆسپی پڕمەترسی و هەوراز و نشێوی زۆرت لە بەرن، بە دواداچوونی تووشی ماڵوێرانیی و دەربەدەریت دەکا، بەڵام ڕەوڕەوەی مێژوو ڕاناوەستێ، ماندوو نەبوونی گەرەکە و دۆزینەوەی ڕێگاچارە).**

کاک سوارە، بۆ ڕاقەی ڕووداوەکانی نێوخۆ و دەرەوە ڕووناکبیرێکی شارەزایە و لە ژیان دە کۆڵێتەوە و دەڵێ:

**"تۆ ئەزانی تەنیا یەک جار بەزین، تەنیا یەک جار ترسان، کۆتێک ئەخاتە گەردنت کە هەرگیز لە دەستی ڕزگار نابی. بیر ئەکەیەوە سێ ڕێگا هەیە:**

**یەکەم سەرکەوتن و پڕ بە هەموو دەشت و دۆڵی چیا سەربەرزەکانت نەراندن:**

**ئەی خۆ بەختکارانی پێشوو، من سەرکەوتووم، من ڕۆڵەی حەڵاڵی ئێوە بووم. داری خێرو خۆشی و ئازادی بەری هێنا، دادگەری سەرکەوت!**

**دووهەم، کۆڵنەدان و مردن، کە خۆی چەشنێکی ترە لە سەرکەوتن.**

**سێهەم، بەزین و سەرشۆڕی."**

کاک سوارە، ساڵی ١٩٧٥، واتە ساڵی نسکۆی شۆڕشی کوردستانی باشوور، لە لایەک لە دەرد و مەینەتی گەلی کورد دەدوێ و لە لایەکی ترەوە دڕندەیی داگیرکەران دەسەلمێنێ. ئەو دەرحەق بەم گەلە بەشخوراوە هاوار دەکا و بە پەخشانێکی تەواو سیاسی و کۆمەڵایەتی، ئەرکی نیشتمانپەروەری و ڕووناکبیرانەی خۆی لە کەشوهەوایەکی نەگونجاودا، بە باشترین شێوە گەڵاڵە دەکا. سنوورە دەسکردەکان دەسڕێتەوە و ئەم لێقەوماوانە و بازرە بوونەش بە نیشانەیەک لە زیندووبوونی گەلی کورد دەزانێ و لە نووسراوەیەکدا لەژێر سەردێری بژی! بژی! دەنووسێ:

**"خێوەتی سپاتی مانگەشەو بە سەر دەشتی بێدەنگا هەڵدراوە، هەزاران خێوەتی شینکی بچووک لەم پەڕی دەشتەوە تا ئەوپەڕ ئەتگوت مۆڵی وشتری ماندوون و بۆ پشوودان یخ دراون. لە ژێر هەر خێوەتێکا چەند ئادەمیزاد ئەژین و لە دڵی هەر کامیاندا پەنگاوی بیرەوەرییەک شەپۆل ئەدا، شەپۆلی ڕق، تۆڵە. لێرە هیچ سنوورێک بۆ جیاوازی نەماوەتەوە، تەنانەت گەڕەک و کۆڵان و ماڵ، دەردی هاوبەش، هەموویانی کردووە بە یەک گیان، تەنانەت بە یەک لەش."**

کاک سوارە، غەوارە و بازرەبوونی گەلی کورد بە دەسکەوتێکی ژیاری دەزانێ، بۆ ئیسپاتی ئەم بۆچوونە درێژە بە پەخشانەکەی دەدا و دەنووسێ:

**"خوای گەورە هۆزێکی لەمێژینە و خانەدان، هەموو پیاوی مەردی مەیدان، هەموو ژنی پاکداوێن، سەرچاوەی ئەوین و ژیان، هەموو هەستیار و دەروونجوان، لێبراوە، لە ماڵ و زەوی تاراوە، ئەکرێ بکوترێ بێچارە یا ناوی بنێن ئاوارە!؟"**

شەڕ دیاردەیەکی ناخۆش وماڵوێرانکەرە، بەڵام ئەوە داگیرکەرانن کە شەڕ بە سەر گەلانی چەوساوە بەتایبەت بە سەر گەلی کوردی نەبەزدا دادەسەپێنن، چونکە بە بیانووی شەڕ ئەوپەڕی بێبەزەییان دەرحەق بە ماڵ و منداڵی خۆبەختکارانی ڕێگای ئازادی ئەنجام دەدا و دەستیان لە هیچ چەشنە جنایەتێک نەگێڕاوەتەوە، بۆ ئەوەی ورەی ڕووناکبیران و خەباتکاران بڕووخێنن، بەڵام ورەی پۆڵاینی ڕێڕەوانی ڕێگای ئازادی و سەرچاوەی پشتیوانی لە بننەهاتووی گەلی کورد، نەخشە و پیلانی دوژمنی لە هەموو کاتێکا کردۆتە بڵقی سەرئاو و باسکی بە هێزی ڕۆڵەکانی بەهێزتر کردووە.

کاک سوارە، دژایەتی خۆی هەمبەر شەڕ لە چەند دێڕێکدا و لە زمان دایکێکی کورد، بەم شێوە ڕادەگەیەنێ:

**"دەنگی لای لایەی دایک دێتە بەر گوێم و ئەڕۆم بۆ گەشتێک لە جیهانی جوانی شیعر و مۆسیقادا. شەپۆلی نەرمی دەنگی بەسۆز ئەمبا و ئەمگەیەنێتە جێگایەک کە ئیتر شەڕ نەبێ! کۆلارەی فڕۆکە گەرووی کەوباری چیا و کەڵەشێری بەیانی ئاوایی نەبەستێ."**

کاک سوارە ڕۆڵی هونەرمەند لەنێو کۆمەڵگادا دەخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە، زۆر شارەزایانە بۆچوونی خۆی بەرامبەر بەم چینە دەردەبڕێ و بە نەسرێکی ڕەوان و جوان شی دەکاتەوە، بە لیزگەی وشە شیرنەکانی نەسری کۆمەڵی کوردەواری دەڕازێنێتەوە و لە تاپۆیەکا سرنجی خوێنەرانی بەرنامەکەی بۆ پەخشانی دەوڵەمەندی کۆمەڵەکەی ڕادەکێشێ:

**"باسی هونەریش هەر یەک باسە، هەر باسی جوانی و شکۆیە، بەڵام هەر کەس بە چەشنێ بە تانوپۆی هونەرا ئەچێ و لە ڕوانگەی تایبەتی خۆیەوە ئەڕوانێتە سەر جیهانی بژوێن و هەمیشە بەهاری هونەر. ئەڵێی هونەر کۆشکێکی بەرزە بە هەزار پەنجەرەوە کە هەر کام لەو پەنجەرانە بەرەو جیهانێکی جیاواز ئەکرێتەوە. جیهانێک بە جەنگەڵێکی کاتی پایزەوە کە گەڵاڕێزان ڕووی تێ کردووە و بە لوورەی هەر کزەبایەک گەڵایەک بە سەمای مەرگەوە بەرەو زەوی شۆڕ ئەبێتەوە."**

مەرگ بۆ هەموو بوونەوەرێک، تەنانەت گیا و گژیش ناخۆشە، بەڵام کاک سوارە بە کەڵک وەرگرتن لە وشەی "سەما" کە تایبەتە بۆ شادی و زەماوەند، وەرینی گەڵای وەرزی پایزی، کە بەرەو نەمان هەنگاو دەنێ، لە بیر دەباتەوە و بە وشەی "سەما" کە لە پێش مەرگە، مەرگ لە بیر مرۆڤ نەباتەوە.

سواره، شاعیر و خەڵکی ئاسایی دەخاتە بەر نیگایەکی وردبینانەوە و دەنووسێ:
**"شاعیر لەگەڵ خەڵکی ئاسایی تەنیا جیاوازی لەوەدا نییە کە جادووگەری بە دەسەڵاتی هەرێمی وتارە و ئەتوانێ بە تەردەستی و پسپۆڕی گەوهەری وشە بهۆنێتەوە، بەڵکو گەورەترین جیاوازی ئەمەیە کە شاعیر بە هەستی تیژ و چاوی وردبینەوە زووتر هەست بە مەبەستی ژیان ئەکا و ئەزانێ کام کۆسپ و قۆرت و گرێ دێتە سەر ڕێگا. شاعیر نابێتە شاعیر تا لە پێش هەموو شتێکا نەبێتە کۆمەڵناس، نەبێتە نوێنگەی ئاواتی سبەینێی کۆمەڵو مەکۆی زانیاری دوێنێی کۆمەڵ..."**
کاک سوارە وەک کۆمەڵناسێکی شارەزا و خاوەن بڕوا، لەم چەند ڕستە کورتەدا دنیایەک تێبینی بەنرخ و گرینگ دەخاتە ڕوو. ئەو ئەرکی شاعیر زۆر بە گرینگ دەزانێ و لای وایە شاعیر دەبێ خاوەنی ئەم تایبەتمەندییانە بێ کە ئاماژەی پێکردوون، سەرەنجام ئەم ڕستە جوانو بەنرخەش پێشکێش بە بارەگای هونەر دەکا:
**"هونەرمەند ئەندازیاری کۆشکی ئاواتی بەیانی گەلە."**
مەسەلەی چینایەتی، قسە و باسێکی دووروودرێژی لە سەرە و ئێستاش نەبڕاوەتەوە و ڕەنگە بەم زووانەش تۆوبڕ نەبێ.
کاک سوارە، کە لە چینایەتی دەدوێ، وا هەست پێدەکرێ کە ئەو کوڕی ڕەعیەتە و زوڵم و زۆری دەورانی دەرەبەگایەتی چێژتووە و بە لەش و گیان هەستی پێکردووە. بۆ دەربڕینی ئەم هەستە، کورتەچیرۆکێکی کوردی بە زمانێکی پەتی و ڕەسەن ـ کە دەردەدڵی دایکێکی دێهاتییە بۆ کوڕەکەی ـ بەڵام پڕ نێوەرۆک و دڵتەزێن دەکاتە دیاری بۆ گوێگرانی بەرنامەکەیو دابڕانی خۆی لە خووخدەی دەرەبەگایەتی. دایکی کوڕە پوورە پیرۆزە و ناوی "**چاوەڕوانی**"یە، بە یەکەوە سرنج دەدەینە بەشێک لە چیرۆکەکە:
**"بەڵێ میرزا. ئاغا کردیە سەرمان کە بچێ بۆ دێی ئەوبەری ئەم کێوە و لەوێ هێلکە و مریشک بکڕێ بۆ میوانەکانی ئاغا. نەخۆش بوو. لەشی وەک بڕێشکەی سەر سێڵ لە چەقوچۆڕدا بوو. ددانی ددانی نەدەگرت: پێش ئەوە گزیری ئاغا بێتە سەرمان بە چەند لێفەی گەرم داپۆشیبوو. تەندوورەکەشم بۆ نێڵ دابوو. نازانی ئەو ڕۆژە چ تۆف و سەرمایەک بوو. تفت هەڵاویشتبا لە حەوا دەیبەست. گزیری ئاغا هات و کوتی، ئەبێ زوو بڕوا و زوو بگەڕێتەوە. من کوتم، نەخۆشە و چەقوچۆڕیەتی، ناتوانێ بچێ. گزیری ئاغا کوتی، چارە نییە، فەرمانی ئاغایە، میوانی هەیە. من لەبەری پاڕامەوە،داوێنم بادا، بە سەر دەست و پێیدا کەوتم، وەری نەگرت. بەم حاڵەوە هەستا ڕۆیشت. لالایم گاتێ، پووزەوانەکانی دڕابوون، کاڵەی شڕی لە پێدا بوو. کاتێ گەیشتە سەر ئەم پردەی بەرماڵی خۆمان ئیتر لەبەر چاوم گوم بوو.**

**کرێوە بە باوە ئەیهێنا و ئەبوو بە دیوارێکی سپی و بەرچاوی ڕێبواری ئەگرت. ئەو ڕۆژە دە زستانی بە سەرا هاتووە و من چاوم لەم ئاسۆیەیە کەی ئەگەڕێتەوە. دڵنیام ئەگەڕێتەوە. ئەو منی خۆش دەوێ. دایکی پیر و لێقەوماوی خۆی خۆش ئەوێ.**

**پوورە پیرۆز بێدەنگ بوو و من گریانم پێ بچووک بوو".**

دوایین دێڕی کاک سوارە لە بەرامبەر ئەم دایکە بێ ئەنوا و دڵ بریندارەدا ئەمە بوو.

**"بڵێی لەم کۆشکانەش، ڕۆژێک خۆرەتاو نەتۆرێ؟!."**

بەپێی ئەم نووسراوەیە، کاک سوارە، سەرەڕای سوننەتشکێنی، دژی چینایەتیش بووە و دەتوانین بێژین، هاندەر و ڕێنوێنێکی چاک بووە لەم بوارەدا. دیارە هیچ شتێک بەبێ زەحمەت و تێکۆشان ناگاتە ئەنجام.

کاک سوارە، لە تاپۆیەکی دیکەدا لە سەر کار و جوولانەوە پێ دادەگرێ و دەڵێ:

**"تەنیا یەک شتە کە هەمیشە تازەیە، کار، کار کە جگە لە ژیان مانایەکی تری نییە. ژیانی بێ کار وەک ڕۆژی بێ بەیان، وەک قەسیدەی بێ تەغەززول، وەک هەمیشە لە جێگایەک مانەوە وەهایە!"**

هەر چەند ئەم دیمەنە بەڕواڵەت ئاساییە و لەوانەیە ڕۆژێ چەندین جار لەگەڵی ڕووبەڕوو بینەوە، کەچی هەستی پێ ناکەین و تەنیا ئەوانەی دوور دەڕوانن ئەم جیاوازییە هەست پێدەکەن. بێ گومان سوارە، یەکێکە لەو کەسانە و هەڵکەوتەی سەردەمی خۆیەتی و بەگوێرەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری و فەرهەنگیی ئەو سەردەمی نووسیوە.

تەنز دیاردەیەکی شارستانییە و نووسەرانی بەناوبانگی وەک: چێخۆف، ئاناتۆل فرانس، ئارت بوخواڵد، عەزیز نەسین، لەم مەیدانەدا قەڵەمیان کەوتۆتە گەڕ و بە نووسینی تەنزی سیاسی و کۆمەڵایەتی، زوڵم و زۆرداری زاڵمان و ملهوڕانیان لە قاو داوە. زۆر مەبەست لە دڵی کۆمەڵا هەن کە بە ئاشکرا ناگوترێن دەربڕدرێن، بەڵام لە قالبی تەنزدا تا ڕادەیەک دەردەخرێن و کۆمەڵ وەریاندەگرن، دەنگۆی لێ دەکەوێتەوە و زۆر زوو جێی خۆی دەکاتەوە،بەڵام جێی داخە کە لە نێو کۆمەڵگای کوردەواریدا تەنز شوێنێکی بەرتەسکی بۆ تەرخان کراوە و نووسەرانمان بۆ ئەم ئاسۆیە کەم دەڕوانن. کاک سوارە، لە بەرنامەیەکی تاپۆ و بوومەلێڵدا، بە کورتی ئاماژە بە تەنز و چەشنەکانی دەکا:

**"تەنز، بە چەشنە نووسینێک ئەگوترێ کە لەودا مەبەستی کۆمەڵایەتی، بە شێوەیەکی گاڵتەچییانە دەرئەخرێ. لە ڕاستیدا نووسینی جیددی و ئاسایی لەگەڵ شێوەی تەنز هەر یەک باری کۆمەڵایەتییان هەیە، بەڵام لە شێوەی تەنزدا لە قەشمەری و گەپ و گاڵتە کەڵک وەرئەگیرێ بۆ ئەوەی لە تاڵایی دەربڕینی ڕاستەقینە کەم کاتەوە. تەنز چەشن و جۆری زۆرە و**

**دەتوانین تەنزی کۆمەڵایەتی و سیاسی ناو بەرین.**

**تەنزنووس لە هەموو شتێک بۆ نواندنی مەبەستی خۆی کەلک وەردەگرێ. لە زمانی پەلەوەرەوە، لە زمانی پرسۆنێل و قارەمانی ئەوتۆوە کە لە ناو ئوستوورە و ئەفسانەکانا هەن قسە ئەکا."**

سوارە، هەر وەک لە زانستەکانی دیکەدا شارەزا و خاوەن بیر و ڕایە، لای وایە تەنزیش زانستێکە و گەشەپێدانی بۆ کۆمەڵگای کورد پێویستە. بەیەکەوە سرنج دەدەینە تەنزێکی کوردی بە ناوی:

**"لە گورگی برسییەوە پێشکەش بۆ بەرانی دابەستەی بەرێزا"**

**"پێش هەموو شتێک لە خودای مەزن ئەپارێمەوە کە ژیانی درێژت بکاتە نسیب. بێ گومان لەم مانگە موبارەکەدا زمانم بەڕۆژووە و لە گوناە ئەوەندە دوورم کە باپیرە گەورەم لە ڕشتنی خوێنی کوڕی یەعقووب دوور بوو." گورگ چاک‌وخۆشی لەگەڵ بەران دەکا و دەڵێ:**

**"بەڕاست کاک بەران چۆنی؟ چاکی شوکر؟ پێم بڵێ بزانم خەوت چۆنە؟ دوێشەو باش خەوتی، یام گۆڵە بۆری خوێن تاڵی ئێسک گران هەر بە دەوری گەلەخانەکەتاندا هەڵسووڕا و حەپەی هات. ئەم خۆشیرین‌کردن و کلکەسووتەی سەگیشم بەلاوە زۆر شوورەییـیە کە بۆ پاروو نانێک ئەیکا. جا ئەگەر ئێمە بە یەکەوە باش بوایەین ئادەمیزاد چۆن ئەیتوانی ئەم چەرمەسەرییەمان بە سەر بێنێ؟!**

**بروانە گاجووت بەم هەموو زلییە بە نۆحەیەکی جووتیار وەک مێو و ڕۆن لە سەر خەتی جووت ئەگەڕێتەوە. کاتێکیش لە کێرەیان کرد، دەمبێنی ئەکەن، نەکا دەم بۆ دەنکە گەنمێک بەرێ کە بە ڕەنجی شان و پیلی ئەو هاتۆتە بەرهەم. دڵی بەمە خۆشە کە یەکەم گیاندارێکە یارمەتی خێڵی ئادەمیزادی داوە. تکایە لە زمانی منەوە بەم گایە بڵێ نەبیستووە کە ئادەمیزاد لە ناو خۆیانا ئەڵێن:"جووت‌بەندەی باش ئەو کەسەیە کە گای لاواز بێ و سەگی قەڵەوا" ئەگەر مانای ئەم قسەیەشی لێ پرسی هەر لە زمان منەوە پێی بڵێ کە گا ئەبێ زۆر کار بکا. بوورە و بەیار و چرگەن و جارە فریزو دەربهێنێ، تا ئەو لاواز بێ و سفرەی ئادەمیزاد برازێتەوە، سەگیش کە جگە لە پاسەوانی کارێکی لە دەس نایە ئەبێ تێروتەسەل بێ تا بتوانێ قازانج و سوودی ئادەمیزاد باشتر بپارێزێ. ئەمە پێی دەڵێن: "کار بە نانەزگی".**

کاک سوارە، لەم تەنزەدا، مەتەڵ و کایەی منالانە و زوڵم و زۆری ئادەمیزادی لە گیانداران، بە ڕوانینێکی تیژبینانەوە بیر خوێنەر هێناوەتەوە:

**"دایە مەمدە بە گورگی، گورگ ددانی تیژە، تۆبەی گورگ مەرگە" بەڵێ گورگ ددانی تیژە، بەڵام بەم ددانە تیژانەوە نیوەی ئادەمیزادی نەوسنی تێرنەخۆر، خوێنخۆر نییە، گورگ**

**گۆشتخۆرە، بەڵام ئادەمیزاد گۆشت ئەخوا، گژ و گیا ئەخوا، میوە ئەخوا... تۆ هیچ دڕندەیەک ئەناسی کە قەسابی دانابێ؟"**

کاک سوارە، لە زۆربەی تاپۆکانیدا، باسێکی کۆمەڵایەتی دێنێتە گۆڕێ و دەرد و مەینەتی کۆمەڵگای کوردەواری، ڕاستەوخۆ یان لە سەر بنەمای ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی دەکاتە بەرنامەیەکی سەربەخۆ و سرنجڕاکێش. سوارە ڕووداوەکان ئەوەندە بە جوانی ڕێک دەخا وا دەزانی ڕووداوێکە و بە سەر خۆی هاتووە. لە هەمان کاتیشا چارەسەری گرفتەکان بۆ خوێنەر دیاری دەکا.

**"ئەسکەندەر شاخی هەیە"** چیرۆکێکی سەربەخۆیە و لەودا باسی پیاوێکی تەمەن سی ساڵەی ڕێکوپێک و ماتومەلوول و خەمبار دەکا. لە سەرەتاوە باسی ڕواڵەتی پیاوەکە دەکا، لە پاشان لە زمان کابراکەوە باسی خەم دەکا و دەنووسێ:

**کوتم: "باسی خەم ئەکەی. لات وا نییە ئەگەر بیدرکێنی خەمەکەت لەسەر سووک بێ؟"**

**کوتی:"ئەزیلەی ئەسکەندەر و شاخێتی." کوتم: "ئەمبیستووە" کوتی: "ئەڵێن ئەسکەندەر شاخی هەبوو. هەر سەرتاشێک سەری ئەتاشی بەم ڕازەی ئەزانی: بەڵام هەموویان بە دەستووری ئەسکەندەر ئەکوژران. تا یەکێک لەو سەرتاشانە کە خزمی سەرپەڕی ئەسکەندەر بوو بەرەڵڵا کرا. سەرتاش بە نهێنی ئەژیا و نەشیئەتوانی ڕازی ئەسکەندەر بدرکێنێ، تا تووشی نەخۆشی هات. حەکیمان پێیان کوت، تۆ ڕازێکت هەیە و لە دڵتا بۆتە گرێ. ئەگەر ڕازەکە دەرخەی ڕزگار ئەبی. سەرتاش ناچار چووە قامیشەڵانێکەوە و لەوێ چەند جار لە ژێر لێوەوە کوتی: "ئەسکەندەر شاخی هەیە."**

**با، ئەم دەنگەی کرد بە گەرووی زەل و قامیشەکانا. هەر کات "با" ئەهات یا هەر کات زەلێکی ئەو قامیشەڵانە ئەکرا بە بلوێر و بلوێرژەن فووی پیا ئەکرد، ئەم دەنگە لە گەرووی قامیشەکان هەڵدەستا: "ئەسکەندەر شاخی هەیە!"**

ئەم ئەزیلە پڕە لە مەبەست و وشە و ڕستەی جوان، کە هەر کام لە وانە پێویستی بە لێکدانەوەیەکی تێر و تەسەل هەیە، بەڵام زۆر بە کورتی ئاماژەیەک بە مەبەستی ئەزیلەکە دەکەم.

لەم ئەزیلەدا، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، گەر ئادەمیزاد نەتوانێ بە ئازادی بیر بکاتەوە، تووشی ئەم چەشنە ئازارانە و هەزاران گیروگرفت و کەند و کۆسپی تر دەبێ، هەروەها لە هەموو بوارەکانی ژیاندا دوا دەکەوێ. چونکە ئادەمیزاد بە ئازادی لە دایک بووە و دەبێ ئازادانەش بیر بکاتەوە. بنەمای هەموو پێشکەوتنێک ئازادییە، ئازادی بوار و بەستێنە بۆ پێشکەوتنی باری ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و گەشە کردنی هونەر بە هەموو چەشنەکانییەوە.

کاک سواره، یەکێکە لەو ڕووناکبیرانەی کە بە تەواوی ئاگادارە لە سەر شێوەی ژیانی دانیشتوانی ئاوایی. کۆڕ و کۆبوونەوەکان، گیروگرفتی ڕۆژانە، چۆنییەتی دیوەخانی ئاغا، فەقیری و دەسکورتی و بێنەوایی قەرەکان، گزیری و زۆر شتی تر بە زمانێکی شیرین و پەتی دەگێڕێتەوە و لە دیوەخانی "ئاغا"وە دەست پێدەکا:

**"شەویان شووڕەیی کردبوو بە قسەی پڕوپووچ. هەندێ کوتبوویان کە بەیانی ڕاوی قەل و مراوی و پۆڕ خۆشە و هەندێک لایەنگری ڕاوی کەروێشک بوون. سەری شەو هەندێ لە ڕشاییەکان یا لە سەرمای ماڵەکەیان ڕایانکردبوو یا لە بۆڵەی خێزانیان لەبەر نەکڕینی کەلوپەل و لێنەکردنی زمهەری زستان و کەوتوویی منداڵەکەیان، لە ماڵا تاراندبوونی و ڕوویان کردبووە دیوەخانی ئاغا یا گزیر دەنگی دابوون بەیانی بەفری سەربانی ئاغا بماڵن و هاتبوون بڵێن وەروەرەیان نییە یا بهارێنەوە کە بەیانی ئەچن بۆ شار و منداڵەکەیان ئەبەن بۆ دەرمانگا."**

بە خوێندنەوەی ئەم چەند دێڕە، لە لایەک لایەنگری کاک سوارەمان بۆ دەردەکەوێ لە چینی هەژار و لە لایەکیش لە قاودانی زوڵم و زۆری چینی دەرەبەگ کە بەڕاستی ژیانیان لە کۆمەڵگای کوردەواری کردبووە ژان و کەس نەیدەوێرا لە بەرامبەریاندا بڵێ لەل. بۆ جیاوازی ئەم دوو چینە سرنج بدەنە دیمەنی زستان و خوڵقێنەری کاک سوارە:

**"پاش ماوەیەک دێ دامرکابوو. دەنگی لوورەی گورگ و وەڕەی سەگ تێکەڵ لوورەی بای ساردی زستان ببوو کە بەفری لە کۆڵانەکان ڕائەپێچا و ئەیکرد بە گەردەلوول و چاڵ و قووڵی تێک ئەکردەوە، سەرما وەک گیانی مردووی سەرگەردان خشکەی ئەکرد بۆ کەلێن و قوژبنی ناو ماڵەکانی ئاوایی، بەلام لە دیوەخانی ئاغا کڵپەی سۆبە بە قەلاشکاری وشک، لەشی پیاوی خاو ئەکردەوە و مزگێنی خەوێکی خۆشی پێوە بوو."**

لە شوێنێکی ترا دەنووسێ: **"ئەگەر جووتیار بۆخۆی بچێنێ و بۆخۆی بدرووێتەوە، دەرەبەگ کوا کۆشکی چەند قاتی بۆ بەرز ئەبێتەوە"؟**

کاک سوارە، سەنگەر بە ڕەمزی قەلای هەرمانی گەل دەزانێ و هەر جارەی بە شێوەیەک دەیکاتە نێوئاخنی تاپۆکانی و جوانترین نەسر و پەخشانی کوردییان پێ دەڕازێنێتەوە و ئەدەبیاتی دەوڵەمەندی کوردییان پێ دەوڵەمەندتر دەکا.

هەروەها تۆرەمەی گەلەکەی لە بەرامبەر چەکی ماڵوێرانکەری دوژمندا وەخەبەر دێنێ و بەگژ جەللادەکەیدا دەباتەوە.

مەبەستی لەم کارە، لە لایەک ورە و هێز وەبەرنانە و لە لایەکیش دڕندەیی دوژمنی بۆ شی دەکاتەوە. لە تاپۆیەکدا بە ناوی شەڕگە دەنووسێ:

**"سێ ڕۆژە کە سووری ئیسرافیلی شەڕ لێدراوە، ئەمڕۆ ئاگر لە هەموو ڕۆژێک بەتینتر بوو. وەک بڵێسەیەک کە بەربێتە پووش و پەڵاش ئەیتەنییەوە و ئەهاتە پێشەوە. ئەتکوت ماری سوجەی سوورە و گەرمای هاوین ورووژاندوویەتی، لووەی مەرگ بێ وچان ئەهات، گەرووی تینووی تۆپ و ڕەشاش خوێنی گەشی لاوەکانی قوم قوم ئەخواردەوە، بەڵام سوکنایی نەدەهات، لەو سەنگەرە دا کە منی تێدا بووم. دوو لەشی بێگیان درێژ ببوون. یەکیان دەستی گرتبوو بە زامی سەرسینەیەوە و بە دەرد و ئێشەوە گیانی دەرچووبوو. ئەوی تریان کە تازە مووی ڕیش و سمێڵی بۆر کردبوو، بە دەم بزەیەکەوە هەناسەی دوایی هەڵکێشابوو."**

هەموو کەس پێی وایە کە دوو لایەنی شەڕ، زۆر لێک دوورن و هیچ هاوبەشێکیان لە نێواندا نییە، بەڵام کاک سوارە، لەم تەشبیهە جوانەدا، دژی ئەم بۆچوونە بە شێوەیەکی عالمانە بەیان دەکا:

**"مردن وەک دەوارێکی زل، سپای ئێمە و ئەوانی داپۆشی. مردن تەنیا شتێک بوو کە لە نێوانمانا جیاوازی نەبوو. هەردووک لامان لێی ئەترساین و هەردووک لاشمان بۆی ئەچووین، لەپڕ بیرم کردەوە ئەگەر وەک لە سەر مردن پێکهاتووین و برامان بۆتە یەک، بۆ ژیان وەها بوایەین، ئێستە ئەم لاوە دوژمنە کە لە سەنگەری منا کوژراوە و ئەم هەواڵەی من کە وردەیەک لێرەوبەر گیانی دەرچوو، زیندوو بوون و ئیستە لە جیاتی شەڕ و کوشتار، من باسی تۆم بۆ ئەم لاوە ئەکرد کە ئەکرا دۆست بێ و دوژمن نەبێ و ئەویش بێ گومان باسێکی هەبوو کە بۆ منی بگێڕێتەوە سەبارەت بە دایکی چاوەڕوانی، سەبارەت بە نیگای سڵ و ڕەوەکی چاوێکی کارمامزی."**

ئا لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە کاک سوارە، شەڕی پێ کردەوەیەکی ناحەزە. هەرچەند داگیرکەران، نەتەوەکانی بەشخوراو بە دەسپێکی شەڕ دەزانن، بەڵام ئەوە دوژمنی نەتەوەکانی چەوساوەن کە بۆ مانی خۆیان و شاردنەوەی ڕاستییەکان گێرەشێوێنی دەکەن و شەڕ ساز دەکەن.

کاک سوارە، بۆ ئاگاداری کۆمەڵ لە هۆکارەکانی شەڕ، لەگەڵ شەڕکەرێکی پیرا ئەکەوێتە ئاخاوتن و بەم شێوە مەبەستەکە دەخاتە بەر تۆژینەوە و دەنووسێ:

**"هەموو کەس خەریکی دۆزینەوەی ئەم پرسیارەیە، کە بۆچ شەڕ ئەکا؟ بۆچی ئەکوژرێ؟ بەڵام هیچ کەس دەری ناخا. شەڕکەرێکی پیر لەبەر خۆیەوە ئەڵێ:**

**"شەڕ بۆ ئازادی، مردن بۆ ژیان!" لە ئەنجاما ئەڵێ: "بەڵام لە شەڕ ناخۆشتر ئەمەیە کە تەسلیمبوون و سەرشۆڕکردنمان پێ ناخۆش نەبێ."**

بەڕاستی ئەم هەمووە تەشبیهە جوانانە هەر یەکەی پەڕاوێکن کە ئەکرێ سەدان لاپەڕەیان

له سەر بنووسرێ و جوانی و هونەری شاراوەیان بخرێتە بەرچاو.
کاک سوارە، بە ڕاگەیاندنی ئەم مەبەستە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە پێویستە شەڕکەری نێو سەنگەریش، ئەوە تێبگا کە شەڕ یانی چی و لەبەر چی بەشەڕ دێ. پێشکەوتوویی هەموو گەلێک پێوەندی ڕاستەوخۆی هەیە لەگەڵ ئاستی تێگەیشتوویی جەماوەرەکەی. ئەوەش ئەرکی ڕووناکبیرانە، لێرەدایە بۆمان دەردەکەوێ کە ڕووناکبیر ئەرکێکی قورس و گرینگی لە سەر شانە و دەرکی بەرەی نەخوێندەوار دەباتە سەر و کۆمەڵگای پێ بەختەوەر دەکا، ڕووناکبیری ئەوتۆ دەبێتە هۆی سەرکەوتوویی و ڕزگاربوونی گەلەکەی و ناوی بۆ هەمیشە زیندوویە.
پێم وایە کاک سوارە، لەم بوارەدا ڕچەی شکاندووە و سەبارەت بە ئەرکی خۆی کەمتەرخەمی نەکردووە و لە هەمان کاتا خەڵکیش بە سەرچاوەیەکی لە بن نەهاتووی پشتیوانی ڕووناکبیر دەزانێ و پێی وایە پێوەندی و یەکگرتنی ئەم دوو توێژە دەبێتە هۆی بەختەوەریی ژیانی مرۆڤ.
کاک سوارە، ڕووناکبیرێکی دڵفرەوانە و هونەرمەندی کورد و غەیرەکوردی لا بەڕێزە. لە تاپۆیەکا، باسی ئەم هونەرمەندانە دەکا و دەڵێ کێ نەتوانێ بڵێ **"بێتهۆڤێن"** و **"باخ"** و **"فردەوسی"** و **"عەلی بەردەشانی"** و **"بوو عەلی سینا"** و **"ئێدیسۆن"** مردوون؟! لە پاشان دێتە سەر ژیانی هونەرمەند و پەخشانێکی جوان و هونەرمەندانە بە **"هونەرمەندان"** تەرخان دەکا بە ناوی گۆران و سیحری بەیان:
**"هونەرمەند دوو ژیانی هەیە. ژیانێک لەو کاتەدا کە زیندووە و وەک خەڵکی تر هەناسە ئەکێشێ، ئەبزوێ و لە ناو کۆمەڵا دێت و دەچێت. بە کورتی ژیانێک کە ژیانی لەشە و ژیانی لەش سنوورێکی هەیە و پاش ئەوە گەیشتە سنوور ئەبڕێتەوە و بەرواڵەت مەرگی بەسەرا دێت، بەڵام لێرەدا هونەرمەند و هەموو ئەو کەسانە کە بە چەشنێ کاریان کردۆتە سەر کۆمەڵ و شوێنەواری باشیان لە پاش بەجێماوە، لە خەڵکی ئاسایی و عادەتی جیا ئەبنەوە. مەرگ تەنیا دەستی تاڵانی ئەگاتە لەشیان و گیانیان لە دەسدرێژی مردن بەرزترە. ژیانی پاش مردنی لەش ژیانێکی هەتا هەتاییە و هونەرمەند تا کۆمەڵ هەیە و تا شوێنەواری جوان و باش ڕێزی هەیە، ئەژی."**
**هەڵبەت ناتوانم بڵێم کە هەموو لایەنە بەهێز و پێزەکانی تاپۆو بوومەلێڵم باس کردووە، بەڵام بە قەولی کاک سوارە، کە لە باسی گۆراندا دەبێژێ: "ناتوانین بەڵێن بدەین کە هەموو جوانییەکانی شیعری گۆرانمان باس کردووە، مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی، شاعیری هەرە گەورەی فارس لێرەدا ئەگاتە فریامان و بە جوانترین شێوە دەسکورتیمان ئەشارێتەوە. مەولانا ئەڵێ:**

آب دریا گر کنی در کوزه‌ای   چند گنجد قسمت یک روزه‌ای

آب دریا را گر نتوان چشید   هم به قدر تشنگی باید چشید

**بەڵام ئەگەرچی ناتوانین هەموو ئاوی دەریا هەڵمژین، لانی کەم بە ئەندازەی تینوویەتی ئەبێ بخۆینەوە."**

کاک سوارە، مریدی گۆرانە و ڕێز و حورمەتێکی تایبەتی بۆ دادەنێ و پێنج بەرنامەی لەسەر ئەم شاعیرە مەزنە نووسیوە و بە وردی باسی کردووە و لێرەدا تەنیا بە هێنانەوەی چەند وێنە و نموونەیەک لە بۆچوونەکانی لەسەر مامۆستا گۆران ئەم باسە کۆتایی پێ‌دێنم.

**"گۆران جگە لە دەسەڵاتی هەرە زۆر و هەستی ناسکی لە شیعردا خاوەنی پلەوپایەیەکی تایبەتە کە لە شاعیرانی تری جیا ئەکاتەوە. گۆران دەسپێکەر و دامەزرێنەری شێوەیەکی نوێیە کە پاش خۆی بۆتە ڕێبازی شاعیران و ئەتوانین بڵێین قافڵەسالاری کاروانی شیعری نوێی کوردی مامۆستا "گۆران"ە، بەڵام کاتێ گۆران بوو بە ڕێبواری ئەو ڕێگایە، ڕێگای شوێنی پێی کەسێکی تری بە سەرەوە دیار نەبوو."**

کاک سوارە، تەنیا شاعیر و ئەدیب نییە و لە سەر "زمان"یش خاوەن ڕا و شارەزایە و لە بەرنامەیەکی تاپۆ و بوومەلێڵدا بە تێروتەسەلی باسی زاراوەکانی زمانی کوردی دەکا و جیاوازی ئەم زاراوانە، لە ناوچە جۆربەجۆرەکان شی دەکاتەوە و دەنووسێ:

**"کورد، چوار زاراوەی گەورەی هەیە. کرمانجی ژووروو، کرمانجی خواروو، گۆرانی، کرماشانی.**

**١ـ کرمانجی ژووروو، زاراوەی کوردەکانی تورکیە و ئەرمەنستانی شوورەوی و کوردەکانی سووریەیە، شیمالی کوردستانی عێراق و کوردەکانی غەربی زریەی بچووکی ڕەزاییە و کوردەکانی قووچان و کوردەکانی دەماوەندیش بە کرمانجی ژووروو ئەدوێن.**

**٢ـ کرمانجی خواروو، زاراوەی کوردەکانی جنووبی کوردستانی عێراق و کوردەکانی غەرب و شیمالی غەربی ئێرانە، هەڵبەت لە غەرب، کرماشان و دەوروبەری لێ جیا ئەبێتەوە کە ئەوان خۆیان ئەکەونە سەر زاراوەیەکی تر بە ناوی کرماشانی و لە "شیمالی غەرب"یش دەورووپشتی ڕەزاییەی لێ جیا ئەبێتەوە کە ئەوانیش کوتمان بە زاراوەی کرمانجی ژووروو، یا شیمالی قسە ئەکەن.**

**٣ـ کرماشانی، کە خەڵکی کرماشان و سەرپێل زەهاو و قەسری شیرین و ئێلات و خێلاتی دەورووپشتی ئەو شارانە بەم زاراوە قسە ئەکەن.**

**٤ـ گۆرانی، ئەم زاراوە زۆر لە فارسی کۆن نزیکە و گۆرانی بە سەرا نەهاتووە. لەبەر ئەمە هەندێ ئەڵێن کە ڕەنگە ئەو زاراوە کوردی نەبێ. ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە و گۆرانی بێ**

**گومـان کوردییـه، بەڵام کـوردییـەکی کـۆن و نزیک لە کـوردی مـادی. تۆفـیق وەهبی لە بەشکردنەکـەی خـۆیا ناوێکی لە زاراوەی گۆرانی نەبردووە و بۆ من دەرکـەوتووە کـە چۆن لێکۆڵەر و کـوردناسـێکی وەک وەهبی بەم بێ دەربەسـتـیـیـە بە سـەر ئەم مـەبەسـتـەدا تێپەڕیوە؟**

**زاراوەی گـۆرانی بە زاراوەی"هەورامی"یش ئەناسـرێ، واتە زۆر کـەس لەباتی زاراوەی گۆرانی ئەڵێن زاراوەی هەورامی. لە کاتێکا هەورامی لکێکە لە گۆرانی، بەڵام لەبەر ئەمە لە ئێران و عێراقا ئەو کەسانە کە بە گۆرانی ئەدوێن، زیاتریان لکی هەورامین. ئەم ناونانە باو بووە. کەمـایەتی وەک: سیامە سووری و رۆژبەیانی و زەنگەنەش هەر لە سەر هەورامی ناو ئەبرێن، هەڵبەت ئەمە لە باری زانستی زمانناسی و تەنانەت کۆمەڵناسی کوردیشەوە هەڵەیە، بەشێکی زۆر لە "سیامەسووری"یەکان ئێستە لە ئەفغانستان ئەژین و بە گۆرانی ئەدوێن.**

هـەر وەک دەزانـن کـاک سـوارە بـە گـەنجی واتـە لـە تەمـەنی ٣٨ سـاڵـیدا مـاڵاوایی لە هونەر و ئەدەبیـات کـرد و مـەرگ مـەودای نەدا زیاتر لەوە گـەنجی ئەدەبیـات گـەشـە پێبدا. بەراسـتی خەسـارێکی گـەورە وە ئەدەبیـاتی کوردی کـەوت و کـەلێنێکی پڕ نەبۆوەی لە دوای خۆی بەجێ هێشت. لەم سەردەمەدا، سێ ئەدیب و شاعیـری گەنجی زانکۆدیتوو واتە، سوارە، چاوە و عەلی حەسەنیانی ڕێبازێکی نوێیان گەڵاڵە کردووە و وەک سێکوچکە و بناغەدارێژی ئەم ڕێبـازە ناسـراون. بەداخەوە بە مـەرگی کـاک سوارە، ئەم شـێوازە، نەگەیشـتە هەوارگـەی ئاوات.

خوێندەواری گەنجی شارەزای وەک سوارە، لەم سەردەمەدا زۆر کەم بوون، بەڵام سوارە، لە مـاوەیەکی کـورتدا، بەم شـێـوە نووسـینە و بە قـەڵەمی سیـحراوی خـۆی لە هەمـوو بـوارێکدا لێکۆڵـینەوەی ئەنجـام دا و بیـر و فـامی هۆگـرانی وێژەی کـوردی بۆ مـشـوورخـۆری لە سـەر دابونەریتی گەلەکەی تیژ کرد و بوو بە قافڵەساڵار لەم ڕێگایەدا.

کـاک سـوارە، لە سەر شیـعری کوردی لێکۆڵـینەوەیەکی تێـروتەسەلی هەیە، بەڵام تەنیـا ئاماژە بە دابەشکردنەکەی دەکەین کە پێی وایە شـیعری کوردی لەم چوار فۆرم و قـالبە پێـک هاتووە:

**١ـ شیعری وتاری یا بەیت ٢ـ شیعری هیجایی ٣ـ شیعری عەرووزی ٤ـ شیعری نوێ.**

**سوارە «تاپۆ»یەکی تایبەتی داوە بە بەیت و لە سەر ئەم گەنجینە سەربەمۆرە دەنووسێ: "شـیـعری وتاری" یا "بەیت" بە لای منەوە گـەنجێکی هێـژا و سـامـانێکی گـەورەی زەوق و چێـشـکەی هۆزەکـەمـانە. هەر لە بەر ئەمـەیە کـە "باسـیل نیـکتین" و "خـاچاتوور ئەبوویان" شـاعیری ئەرمەنی ئەڵێن: "فۆلکلۆری کوردی ئەوەندە پڕ و بەرز و خێرومەندە کە هۆزەکانی**

تری هاوسێی کوردیش کەلکیان لێ وەرگرتووە و کەوتوونەتە ژێر تەئسیرەوە."

ئەم کوردناسانە ڕاست ئەکەن، بۆ نموونە بەیتی "خەج و سیامەند" کە "هۆهانس شیراز" شاعیری ئەرمەنی کردوویە بە شیعر، تەنانەت ئەوەندە ناوەڕۆکی بەیتەکەی بە خۆماڵیی زانیوە کە سیامەندی کردووە بە ئەرمەنی و بەم چەشنە بەهرەیەکی لە فۆلکلۆری کوردی کردووە بە نسیبی هۆزی ئەرمەنی.

بەیت شاکارێکی گەورەی کوردییە و زۆرتر باسی ڕووداوە مێژووییەکانی کورد ئەکا و تاکو ئێستا پشتاوپشت هاتووە و سینەی پڕ لە گەنجی بەیتبێژەکان، ئەم گەنجە سەربەمۆرەیان لە فەوتان پاراستووە و گرینگی ئەم بەیتانە زیاتر لە کاتی لێکۆڵینەوەدا دەردەکەوێ.

کاک سوارە، یەکێکە لەو ڕووناکبیرانەی کە سەبارەت بە گرینگی بەیت بە تێروتەسەلی دواوە و شی کردوونەوە، تەنانەت بیروڕای زانایانی لاوەکیشی بە شاهید هێناونەوە:

وێژەناسێکی گەورەی شووروەوی، بەیت لە بەرزیدا ئەخاتە پاڵ شانامەی فیردەوسی و بە یەکێک لە سێ شوێنەواری گەورەی خۆرهەڵاتی ناو ئەبا.

دەتوانم بڵێم کە تاپۆ و بوومەلێڵ دەکرێ وەک سەرچاوەیەکی ئەدەبی کەلکی لێ وەربگیرێ، چونکە زۆربەی باسە ئەدەبییەکانی لە خۆی گرتووە و لێکۆڵینەوەی لە سەر ئەنجام داون.

کاک سوارە، لە چەند «تاپۆ»یەکدا باسی وەزنی "عەرووزی" و "وەزنی بەیتی" دەخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە، تاقمێک لە گوێگرانی بەرنامەکەی، پێیان وایە سوارە دژی شێوەی عەرووزییە و ئەم شاعیرە بەناوبانگانە وەک: نالی، خانی، بێکەس، پیرەمێرد، وەفایی، بە نموونە دێننەوە: کە "بۆچ ئێمە لامان وایە شیعری کوردی ئەبێ بگەڕێتەوە سەر شیعری بەیتی کە شێوەیەکی سەرەتاییە و ناتوانێ واتەی قووڵی شاعیرانە لە خۆیا جێ بکاتەوە؟".

کاک سوارە، لە وەڵامدا بەم شێوە بۆچوونی خۆی دەردەبڕێ و دەنووسێ:

"عەرزتان ئەکەین کە ئێمە بە هیچ بارێ دژی شێوەی عەرووزی نین، تەنیا ئەوە نەبێ کە تایبەتییەکانی ئەو شێوە و چەشنی پەیدابوونی لە وێژەی کوردیدا ئەکەین و ئەڵێین کە شێوەی عەرووزی لە پێشا نەبووە و کاتێ هاتە ناو وێژەی کوردییەوە کە زیاتر لە هەزار ساڵ بوو لە وێژەی هاوسێکانی کوردا جێگیر ببوو. لە ڕاستییا داخواز و نیازی کۆمەڵ نەبوو کە ئەو وێژەیەی کرد بە باو. بەڵکو پێداویستی کەمایەتییەکی ئەشراف و ئاریستۆکرات وەک دەرەبەگی زل و چینەکانی تری حەساوە و تێروتەسەل بوو کە نیازی بە وێژەیەکی دوور لە تێگەیشتنی چەوساوەکان بوو بۆ خەڵەتاندنیان و گێژکردنیان. ئەمە ئیتر وەک ڕۆژ ڕووناکە کە "بەیت" هی خەڵک بوو و خەڵک لێی تێئەگەیشت، بە گوێ لێ بوونی ئەگریا یا

پێنەکەنی، یا هان ئەدرا و نەبزووت: لە کاتێکا کە بە شیعری مینیاتۆری و پڕ پێچ و ڕازاوەی عەرووزی کە باسی واتەیەکی بەرزتر لە وزەی دەسکورتی فامی ئەوانی ئەکرد هەر تەقەی سەریان ئەهات و زاریان تاک ئەبوو وەک وێردێکی جادووکارانە بیبیستن. شاعیری عەرووزی ئەیگوت:

**بۆ لە سەر چەشمەیی چەشمم نەچکێ قەترەیی خوێن**

وشەکان هەموو فارسین، جگە لە "بۆ" و "لە" کە دوو "قەید"ی بچووکن.

کاک سوارە، لە درێژەی باسەکەیدا دەنووسێ:

"شاعیران ناچار بوون سەر و گوێی وشە بشکێنن و لە قالبی داڕێژراوی عەرووزا جێگای بکەنەوە. لەبەر ئەمەیە کە ئەڵێن "در تنگنای قافیه خورشید خر شود" ئەگونجێ ئەمەش کە ئەڵێن "یجوز للشاعر ما لایجوز لغیره" هەر لە بەر ناچاربوونی شاعیر بێ لە پەیڕەوی کردنی عەرووز، کە وەها بوو کورد بێچ وێژەی خۆی بخاتە چوارچێوەیەکی داتاشراوی دەستی گەلێکی ترەوە، کە زۆر تەسک و تەنگ و پرستیرە. ئایا کەس هەیە کە قەدی وەک موو و بەژنی وەک چنار و چاوی وەک ئەستێرە و برژانگی وەک شیر و برۆی وەک کەوان و زولفی وەک زڕێی پێ جوان بێ؟ ئاخۆ ئەگەر ئافرەتێک بەم شکڵ و سەروسیمایەوە بێتە خەونی کەسێک لێی ناترسێ؟

"حاجی قادر" لە غەزەلێکا ئەڵێ:

**پێم خۆشە غەزەل فەرشی قودوومی عوقەلا بێ**
**نەک بێتوو لەبەر کەن جوهەلا لەفز و مەعانی**

کاک سوارە دەڵێ:

"لەگەڵ ئەوەشا کە "حاجی" بەلامەوە بەڕێزە، ناچارم بپرسم "جوهەلا کێن؟ ئەو کەسانەی کە دەرەبەگ ڕێگای خوێندنی لێ بەستوون؟ ئەو کەسانەی کە تێناگەن لەم هەموو پێچ و قەمچە کە شاعیران ئەیدەن بە شعرەکانیان... ئاخۆ ئەمانە جوهەلان؟! ئایا دانەری بەیتی "سەیدەوان" کە شان لە شانی "تۆتێللۆ" و "هامێلت" ئەدا جاهیلە؟".

کاک سوارە، لە سەر غەزەلێکی حاجی قادر کە باسی دەهان و میان دەکا دەنووسێ:

"دەهان" و "میان" کوردی نین و ئافرەتێک کە "دەهان" و "میان"ی دیار نەبێ، یەک لەبەر بچووکی و یەک لەبەر باریکی، جوانییەکەی لە کوێدایە؟ بە لای منەوە ئەمە نەخۆشییە... "ئاهۆ"یەکە وێژەی کوردی گرتوویە و ئەبێ تێبکۆشین لەوە ڕزگاری کەین. گۆران ئەڵێ: ئەی قژ زەرد، ئەی بەژن و باڵا کەڵەگەت.

زۆر ساکار و زۆر جوان و نزیک لە لێکدانەوەی زۆربە و قسەی ڕۆژانەی خەڵک.

کاک سواره زیاتر له سەر باسی عەرووز دەڕوا و له نووسراوەیەکی ترا دەڵێ: "بێ گومان بیستووتانه که ئەڵێن فلانه شاعیر یا فیساره هونەرمەند خاوەنی مەکتەبێکی تایبەته و ڕێگا و شوێنێکی تایبەتی خۆی له هونەرا دۆزیوەتەوه. دۆزینەوەی ڕێگا و شوێنی تایبەت یانی چی؟ مەگەر هونەر بۆ نواندنی جوانی و دەرخستنی دزێوی نییه؟ هەموو هونەرمەندێک ئەبێ کاری ئەمه بێ و هەرکەس ئەمه کاری بوو، هونەرمەنده و لەگەڵ هونەرمەندی ترا نییه. بەڵێ وەهایه، هونەرمەند پردێک هەڵئەبەستێ له نێوان کۆمەڵ و ڕاستەقینەدا و ئەیەوێ ئەم دووانه به یەکەوه پەیوەند بدا و به یەکیان بگەیەنێ. واته کاری ئەمەیه که کۆمەڵ تێبگەیەنێ که ڕاستەقینەی دەورویشتی چییه؟ ژیان به چ بارێکا کەوتووه؟ بەڵام ئاخۆ هەموو ئەندازیارێک وەک یەک پرد دروست ئەکەن؟ که وەها بوو ئەبوایه پردەکانی تەواوی جیهان یەک چەشن بوایەن. کەچی ئێمه ئەبینین که پردێک له ئاسن و بتۆنه و ئەویتر له قوڕ و قسڵه، سێهەمیان له دار و پەردووه، یەکێک ڕاسته، یەک کەوانییه، یەک زۆر له ڕووبارەکه بەرزتره و یەکێک نەوییه. هەر کام لەمانه بۆ ئامانجێک لەبەر چاو گیراون. جێگای وا هەیه هاتوچۆی زۆر به سەرا نییه، باری قورسی بەسەرا ناڕوا. ئەگەر له دار و پەردووش بێ، قەیدی نییه. یەکێک له ناو شاره و جگه لەمەی که پرده، مەکۆی خەڵکه و جێگای گەشتی ئێوارانه، ئەبێ جوان بێ، با دراوێکی زۆریش بۆ ڕازاندنەوەی بدرێ. یەکێک کەوانییه، چونکه ئەندازیارەکه به گوێرەی لێکدانەوەی ڕەقی و نەرمی خاکەکه، وای باش زانیوه که کەوانی دروست بکا و زۆری بۆ نەبەت. شاعیریش وەهایه. هەر کام چەشنێ ئەدوێ. گاهێ به حەماسه، کاتێ به وشەی نەرمی دڵدارانه، دەمێ به ڕازاندنەوەی تەبیعەت و ژیان، تەنانەت گاهێ به توانج و تەوس!! هەموو ئەم کارانەش بۆیه ئەکا خەڵک تێبگەیەنێ. له ڕاستیدا شێوەی هونەری هونەرمەند بۆ کورتکردنەوەی نێوان خەڵک و ڕاستەقینەیه.

ئەڵێن حافز خاوەنی شێوەیەکی تایبەته، هەروەها سەعدی، شکسپیر، هومێر، فیردەوسی، گۆران، لئیۆناردۆ داوێنچی، موتزارت، پیکاسۆ و زۆر هونەرمەندی تر. ئەوانه که پاڵیان داوه به لووتکەی بەرزی ناو و نیشانەوه له هونەرا لاساییکەرەوەی خەڵکی تر نەبوون. له تەواوی شیعری شاعیرانی کوردیدا بگەڕێی، زۆرتر له چەند شاعیرت دەس ناکەوێ که لاسایی کەسیان نەکردبێتەوه و خەڵک کەوتبێته شوێن شێوەی ئەوان. ئێمه له شیعری کوردیدا چەند شێوەی دیار و تایبەتیمان هەیه. شێوەی بەیتی، شێوەی هیجایی، شێوەی عەرووزی، شێوەی نوێ. لەو ناوەدا تەنیا شێوەی عەرووزییه که پاش پاکران و ئامادەبوون به هۆی گەلانی ترەوه گەیشتۆته دەستی ئێمەو ئەگەر ماڵی خەڵک خۆر نەبین، ناتوانین به خۆماڵی بدەینه قەڵەم. که وەها بێ هەر له پایەوه به لای منەوه شاعیری

**عەرووزی شاعیر نییە، چونکە جگە لەوە کە کەوتۆتە شوێن شێوەی شاعیرێکی تر، شاعیرەکەی پێشووش کورد نەبووە. کورد نەبووە یانی چی؟ یانی لە باری ژیان و خەم و خۆشی و مێژوو و خوو و ڕەوشت و خواست و ویستی کورد نەشارەزا بووە. بەم چەشنە شاعیری عەرووزی هەرگیز نەیتوانیوە پردێک هەڵبەستێ لە نێوان کۆمەڵ و ڕاستەقینەدا. چونکە ڕاستەقینەی وڵاتی سەرسەوزی کورد و ئابووری تایبەتی ئەم وڵاتە ئەوە نییە کە شاعیری عەرووزی باسی ئەکا، من ئەڵێم بە هیچ بارێک بە شێوەی عەرووزی ناکرێ باسی ڕاستەقینەی ژیانی کوردەواری بکرێ، ئەبینین کە شاعیری وەک پیرەمێرد و نالی ئەم کارەیان کردووە و باشیش سەرکەوتوون، بەڵام شێوەی نوێ باشتری ئەکا، هەراوترە، دەست و پێی شاعیر بە کۆت و زنجیری "مفاعلاتن و مفتعلن" نابەستێ.**

هەر وەک لە پێشا ڕامگەیاند، کاک سوارە، تاپۆ و بوومەلێڵی لە سەروبەندێکدا نووسیوە کە کەم کەس دەیوێرا لەم بوارە بدا، لە بەر ئەوەی ئەم بەرنامەیە لە ئێران بڵاو دەبۆوە، هەلومەرجی ئەو کاتە دەرفەتی ئەوەی پێ نەداوە کە بە تەسەلی باسی شاعیرانی مەزنی کوردی ئێران، وەک مامۆستا هێمن و هەژار بکا و بە گەلیان بناسێنێ.

سوارە لە درێژەی باسەکەیدا ئاوا بە وردی دەدوێ:

**" ئەگەر دۆزینەوەی ڕێگای تایبەت نیشانەی گەورەیی و سەربەخۆیی شاعیر بێ، بۆ گەلیش وەهایە. واتە ئەگەر نەتەوەیەکیش ڕێگا و شوێنی وێژەیی تایبەتی خۆی هەبوو و دەستی بۆ هاوسێکانی درێژ نەکرد تا وێژە و هونەریان لێ بخوازێتەوە، ئەم گەلە لە وێژەدا سەربەخۆ و مەزنە.**

**قسەی دواییم ئەمەیە کە دڵم ئەسووتێ لە سەر کانیاوێکی خوڕۆشان کە لە ژێر نووری بەفری کۆێ دێتە خوارەوە دانیشم و بەردەمم دەشتێکی خەملیوی بە شەست پەڕ و شەوبۆ و شلێرە بێ و داوێنی چیای ئەو بەرم وەک نۆبووک تارای سووری داری ئەرخەوانی بە سەردا دابێ و من لەم حاڵەدا ناچار بم بیر لە دەشتێکی قاقڕی ڕەملێن بکەمەوە کە "قەیس"ە شتێی تێدا وێڵ بوو. ئەوە من و ئێوەش نازانم!"**

تاپۆ و بوومەلێڵ، لە ماوەیەکی کورت دا لە نێو ڕووناکبیرانا لایەنگری پەیدا کرد و بوو بە مەیدانی ڕەخنە و ئاڵوگۆڕی بیر و ڕا دەربڕین. گوێگرێک ئەم پرسیارە ئاڕاستەی نووسەری بەرنامەی تاپۆ ئەکا و ئەنووسێ:

**"جیهان و کەون لە گۆڕاندایە بەتایبەت بەپێی گۆڕانی جیهان خواست و ویستی ئادەمیزادیش ئەگۆڕێ و کاروباری کۆمەڵایەتی و ئەوەی وا پێی ئەکوترێ زانیاری کۆمەڵ و کۆمەڵناسی لەگەڵ چەرخ و خولی جیهانا ئەگۆڕێ. واتە ئەو شتە کە ئەمڕۆ باوە و کۆمەڵ**

نیازی پێی هەیە، بەیانی کۆن ئەبێ و لە ڕیزی نیاز و پێداویستەکانی گەل و کۆمەڵ ئەخرێتە کەنارەوە و شتێکی تازە جێگای ئەگرێتەوە. ئەم گۆڕانە وەنەبێ هەر لە هونەرا بێتە پێش، بەڵکو لە هەموو بارو لانێکی ژیانی ئینسانیشا خۆی ئەنوێنێ. دوێنێ کابرای فەیلەسووف و فیزیکزان کاتێ هەستی کرد کە لە گەرماوەدا سەنگایی هەموو شت کەم ئەبێتەوە، بە لەشی ڕووت لە گەرماوەکە هاتە دەر و سەرخۆشانە ئەڕانی:"دۆزیمەوە... دۆزیمەوە!" پاش ئەو زانایەکی تر لە ژێر دارە سێوێکا دانیشتبوو، سێوێکی گەیشتوو لە لقی دارەکە بۆوە و کەوتە سەر کۆشی. بیری کردەوە لە لکی دارەکەوە تا سەرزەوی فەزایەکی بەتاڵە و لە دارەکە بەرەو سەرووتریش بەتاڵە و جگە لە هەوا هیچی تری تێدا نییە. کە وەهایە بۆچ ئەو سێوە بۆ فەزای ژوور ناچێ و ئەکەوێتە سەر زەوی؟ بە بیر کردنەوە بۆی دەرکەوت کە ئەبێ کێشەیێک لەم زوویمەدا هەبێ وا هەر شتێک لە بەرزاییەکەوە بەری دەیەوە ئەکەوێتە سەر زەوی و لەو ڕۆژەوە کە "نیوتون" ئەم ڕازەی دۆزییەوە یاسای کێشەری گشتی واتە قانوونی جازیبەی عموومی پەیدا بوو. ئەو ڕۆژانە بۆ ئادەمیزاد زۆر بە بایەخ بوون و پێداویستی ئادەمیزاد بوو کە سەر لەم ڕازە دەربێنێ. بەڵام ئەمڕۆ هەموو منداڵێکی پۆلی ناوەندی ئەم کەشفە زانستییە گرینگانە ئەزانێ، کە وەهایە هەموو شت لە گۆڕاندایە و هەموو شت پاش ماوەیەک کۆن ئەبێ و جێگای خۆی ئەدا بە شتێکی نوێ. ئەی لەبەر چی باسی کۆن و نوێ لە شیعردا نابڕێتەوە؟ بۆچ بەم شێوەیە کە شێوەی باوی ڕۆژگاری ئێمەیە ئەڵێن شێوەی نوێ؟ جا چ نەقلاشی بێ، چ بەیکەرسازی، چ وێژە؟ ئاخۆ باشتر نییە ئەم شەڕی کۆن و نوێیە ببڕێتەوە، وەک لە زانستگا بڕاوەتەوە؟

کاک سوارە، وەڵامی ئەم گوێگرە لە تاپۆیەکدا بەم چەشنە دەداتەوە:

" لە زانستا تاقیکاری هەوێنی بنەڕەتییە و هەموو شت لە سەر ئەو بناغە دائەمەزرێ. واتە زانا ناچارە ئەسڵە زانستییە کۆنەکانی قەبووڵ بێ و بەپێی ئەوان بجووڵێتەوە. یەکەم کەسێ کە بەرد و ئەستێی دۆزییەوە، بناغەی دانا بۆ دۆزینەوەی ئاگر و ئاگر بوو بە بناغەیەک بۆ زۆر شتی زانستی کە ئەمڕۆ هەیە. بەڵام بناغەی هونەر لە سەر عاتیفە دائەمەزرێ و ئەشزانین کە عاتیفەی هەموو کەس چەشنێک نییە."

کاک سوارە، ئەڵێ: "لە کاتێکا هونەر ئەگۆڕێ و لە پایەشەوە ئەگۆڕێ. دوێنێ هونەری شیعر و وێژەوانی بۆ پێهەڵکوتنی ئەمیر و پایەبەرزان و بەدەسەڵاتان بوو تا شاعیر بەخشش و سیلەیەک کە بە گوێنی شیعرەکە وەری ئەگرێ خۆی بەخێو کات، بەڵام ئەمڕۆ بۆتە چەکێک کە ئەکرێ سێدارەیەکی بۆ خنکاندنی دوژمن لێ ساز بکەی. ئیتر شیعری پێهەڵکوتن باوی نەماوە. لەبەر ئەمە ئەڵێن شیعری کۆن و شیعری نوێ، بەڵام بە لای منەوە

**ئەگەر شاعیرێک بتوانێ لە قالبی عەرووزیشا واتە و مەفهوومێکی ئەمرۆیی دەربڕێ، شعرەکەی نوێیە و کۆنی قالب نابێتە کۆنی شیعرەکەی.**

کاک سوارە، شارەزای زۆربەی زانستەکانە و یەکێک لەم زانستانە، شانۆگەرییە. هەرچەند ئەم مەسەلە لەو سەردەمەدا کەمتر باسی لێ کراوە، بەڵام سوارە بە لێکدانەوەیەکی وردبینانە بایەخی شانۆگەری و پێتەویستی ئەم هونەرەمان بۆ شی دەکاتەوە و لەگەڵ زانستی ئەمرۆ لەبەر یەکیان ڕادەنێ.

پێشینەی تئاتر و شانۆگەریەکان کە چۆن و لە کەیەوە لە نێو کۆمەڵ پەیدا بووە و بە کوێ گەیشتووە و لەنێو کۆمەڵی کوردا ئەم هونەرە ئەمرۆ لە چ پلەیەکدایە، بۆ شی دەکاتەوە:

**"شانۆگەری لەگەڵ نووسینی نومایشنامە جیاوازییان لە باری زەمانەوە هەیە، واتە پێش ئەوە کە نووسین و خەت هەبێ، شانۆگەری و نیشاندانی مەبەستێکی کۆمەڵایەتی یا ئایینی بە چەشنێکی نزیک لە تئاتری ئەمرۆ هەبووە و ئەم نیشاندانە دەگەڕێتەوە بۆ هۆی هونەری جادووکارانە کە کوێمان دایکی هەموو هونەرێکی ئەمرۆ بووە و هەر بەشێکی هونەر کە بیگری لە ئاکامی پەرەگرتنی ئەو شێوە جادووکارانەی هونەری پێشوودا پەیدا بووە. تەنانەت پەیکەرە دروستکردن و ئارشیتێکتی و تئاتری ئەمرۆ."**

کاک سوارە، پێی وایە ئادەمیزادی بەروو، کە شکلی دڕندە یا ماری لە قوڕ و بە وێنەیەکی سەرەتایی دروست کردووە، ئەمە پەیکەر ساز کردن بووە. بۆ تئاتر و شانۆگەریش بەم پرسیارە دەست پێدەکا:

**"ئەپرسین تئاتر چییە؟ ئاخۆ تەنیا بۆ تەفەننون و سەرگەرمکردن پەیدا بووە و بەهرەیەکی کۆمەڵایەتی نییە و بە ناوی پێتەویستێکی ژیان خۆی نەنواندووە؟ وەڵام ئەمەیە تئاتر یانی نواندنەوەی ئەو ڕاستەقینە کۆمەڵایەتیانە کە ئامبازی ژیانی مرۆڤن و بە چەشنێکی هونەرمەندانە واتە بە هێزی عاتیفە و بە هۆی جووڵە و قسە و حاڵەتەوە و بە کەڵک وەرگرتن لە وێنەسازی بۆ تەبیعەتێ کە داستانی ڕووداوە تئاترییەکەی تێدا هەڵکەوتووە.**

**تئاتر بۆ ئادەمیزادی بەروو، شتێکی خەریککەری تەفەننونی نەبووە، بەڵکو بەشێکی پێتەویستی ژیانی ئەو بووە، کە وەها بوو بەهرەی کۆمەڵایەتی هەبووە. ئادەمیزاد ئەگەر ویستبێتی خۆی ساز بکا لەگەڵ دوژمنێکا شەڕ بکا لە پێشا بۆ ئەو کارە تەمرینی کردووە.**

**تاقمێ لە خێڵەکە بوون بە دوژمن و تاقمێکی تر ویستوویانە ئەو دوژمنانە کە بەڕواڵەت کراون بە دوژمن، بشکێنن و لە ناویان بەرن. ئەمە خۆی بۆتە مایەیەک بۆ شانۆگەری بێ ئەوە پیمەسێک "نومایشنامە" لە کارا بێ.**

**لە سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش لەدایکبوونی عیسادا، نومایشنامەی نووسراو لە ناو**

**یۆنانیینەکانا پەیدا بووە. لە سەرەتاوە تراژیدی ئاینی بە چەشنی سروود، هەر وەک لە ئێرانی کۆنا سروودی ئاگر "نمایشی ئەهورامەزدا" هەبووە. لە یۆنانی سەدەی شەشی پێش لەدایکبوونا دەستی پێکرد. بۆ نموونە سروودێ کە بۆ ڕێزگرتنی خوای شەراب دیونیسووس لە جەژنە ئاینییەکانا، سروودی قوربانی کردنی ئاسک، ئەمانە هەموو لەو سروودە تراژیکە ئاینیانەن... "تی پیس" گەورەترین تراژیدی نووسی ئاینی ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی بەر لە میلاد کە ئاڵوگۆڕێکی لەو چەشنە نومایشنامە ئاینیانەدا پێکهێنا و دیالۆگی هێنا ناو سروودەکانەوە."**

کاک سوارە، لە پاشان دەڵێ:

**" ئاخۆ ئەم چەشنە شانۆگەرییە زۆر لە بەیتە کوردییەکان ناچێ کە هەندێکیان بە قسە و پەخشان بوو و برێکیان بە شیعر و هەڵبەست؟ بەیتخوان لە کاتی خوێندنەوەی پەخشانەکەدا هەوڵی ئەدا بیری گوێگر ئامادە بکا بۆ پەردەیەکی تر لە بەیتە نومایشنامەکە و ئەمجارە دەستی ئەکرد بە خوێندنەوەی بەشە هەڵبەستەکە."**

کاک سوارە، ئەم نموونەی لەبەر بایخدار بوونی بەیتە کوردییەکان هێناوە و پێی وایە شان لە شانی نومایشنامەکانی سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش لەدایکبوونی عیسا دەدەن و لە ئاخریدا دەنووسێ:

**" بەداخەوە لە ناو کوردا تا ئەم دواییانە نومایشنامە نەنووسراوە، بەڵام شانۆگەری هەبووە، زۆرتری یارییەکانی کوردستان کە بەگەڵ ئەکرێن، چەشنە نومایشنامەیەکن. یەکێک لەوانە "میرمیرێن"ە کە نومایشنامەیەکی کومێدییە و بۆ ڕەخنەگرتن و قەشمەری کردن بە زۆردار ساز ئەکرێ. هۆی ئەمە کە بۆچ لە ناو کوردا نومایشنامە نەنووسراوە ئاشکرایە و لێدوانی ناوێ."**

کاک سوارە، تاپۆ و بوومەلێڵی کردۆتە هەمبانەبۆرینە و هەموو بابەتێکی تێدا جێ کردۆتەوە، وەک ئەدەبیات، شیعر و شاعیری، هونەرمەندایەتی، تەنز، زاراوەکانی زمانی کوردی، مەسەلەی چینایەتی، ژیانی نێو کۆمەڵی کوردەواری، سیاسەت، ئەوین و جوانییەکانی، بەیت، شانۆ و نومایشنامە و ... لە تاپۆیەکدا بە ناوی **"ڕاسپێری هونەر"** بە تێروتەسەلی لە سەر ئەو باسە دەنووسێ:

**" زۆر کەس لە خۆی ئەپرسێ کە ئایا هونەر وێنەی زانست، پێتەویستی ژیانی ئادەمیزادە، یام نە، ئایا هونەر لە کۆمەڵا چ نەخشێکی بە دەستە و ڕاسپێری چییە؟ ئاخۆ هونەر بۆ ئادەمیزاد لەو شتانەیە کە ئەگەر نەبێ زیان ئەگەیەنێ بە مرۆڤایەتی؟**

**لە زۆر کەسمان بیستووە کە بۆ نموونە "هونەری شاعیری" بێبایەخ ئەدەنە قەڵەم و**

**تەنانەت تاقمێکیش هەن کە شیعر و شاعیری بە ڕاگر و گنخێنەر و خنکێنەری کۆمەڵ ئەزانن، ئەوانە بێ‌ئەوە بیر بکەنەوە کە هونەر و زانست دوو لقەدووانەی کۆششی مێشک و ناوەزی ئادەمیزادن، لانی لایەنگری زانست ئەگرن و ئەڵێن زۆر خوو بە هونەر گرتن و زۆر پەرژانە سەر هونەر ڕێگای بەرەو پێش چوونی زانست ئەگرێ، لە کاتێکا ئەگەر مێژووی خەباتی ئادەمیزاد لە هەوەڵی پەیدا بوونی کۆمەڵی "کلان"یەوە تا ئەمڕۆ بزانن هەرگیز بڕوایان وەها نابێ کە هەیە."**

کاک سوارە، لە درێژەی ئەم باسەدا چەند نموونەیەک دەخاتە بەرچاوی خوێنەر:

**"ئادەمیزاد جیاوازی هەرە گەورەی لەگەڵ گیانداری ترا ئەوەیە کە بەدیهێنەری هونەرە، هونەر هەمیشە لە درێژایی مێژووی ژیانی ئادەمیزاد چرایەک بووە بۆ ڕۆشنکردنەوەی بەر پێی زانست، هونەر پردێکە لە واقعیەوە هەڵبەستراوە بۆ حەقیقەت. تەنانەت ئاین و ئوستوورەی "ماوراتولتەبیعە" بەرهەمی پەلجەی یەزدانی و خوڵقێنەری هونەرن."**

کاک سوارە، ئەفسانەکانی باوی ناو کۆمەڵی کوردەواریش بە بەرهەم و داهاتێکی زەوقی ئادەمیزاد دەزانێ کە لە ڕاستەقینە بێ‌بەهرە نییە. "قالیچەی باڵدار"، "چەکمەی خۆش ئاژۆ"، "دراکۆڤان" (dracovlan)، "کڵاوی سەخری جن"، "هەڵفڕین و تەنوورەی دێو"، "چەرخ و فەلەکی پیرەژن"، هەموو نوێنەری هەڵپەی بێ‌وچانی هونەرن بۆ دۆزینەوەی ڕێگای زاڵبوون بە سەر فەزا و ئاسمانا و دەرچوون لە کێشەر و پێوەندی خاک، بەتایبەت "چەرخ و فەلەکی پیرەژن" تەواو باری سەنعات و زانستی تێیا بەهێزە، ئێستە وا باشە لە هەر کام لە سێ وشەی "چەرخ" و "فەلەک" و "پیرەژن" ورد بینەوە، تا دەرکەوێ کە ئیستعارە و ئیماژ و سەمبول سازی چ کارێکی کردووە.

چەرخ لە مێژە بە نیشانەی بزووتن و حەرەکە ئیستعارەیەکە بۆ زانستی مکانیکی و فیزیکی چەرخی چاڵاو کە بە کوردی پێی ئەڵێن کۆل و بیر، هەڵبەت کۆل بە تەنیا بە کەرەسەی بووزووتەنیینیش ئەڵێن، چەرخی چاڵاو ڕەنگە یەکەم دەزگایەکی سنعاتی بووبێ کە بە شەر کردوویە بە خزمەتکاری خۆی، تەنانەت ئێستەش لە هونەری نەقاشییا لە سەبکی "ئەمپرسێونیسم"ەوە تا شێوە نوێیەکان "چەرخ" بە ئیستعارە و سەمبۆل دانراوە بۆ سەنعەت، کە وا بوو "چەرخ" واتە و مەفهوومێکی ئیستعارەییە بۆ زانستی میکانیکی، "فەلەک" واتە ئاسمان ئەو فەزا بەرینەیە کە ئادەمیزادی سەرزەوی ئەلکێنێ بە ئەستێرە گەشەکانەوە و بیری هەستیارانەی بەشەر هان ئەدا بۆ پشکنین و سەردەرهێنان و زانستی کورتە و وزەی فڕینی بیرو خەیاڵی زۆر و بەربڵاوە، بیر ئەکاتەوە کە چەند سەیر ئەبوو بیتوانیایە بە چەرخێک واتە کەرەسەیەکی میکانیکی بە سەر ئەم ڕێبازە بێ‌گرێ‌وگۆڵەی فەلەکەدا باڵ بگرێتەوە.

شاعیرێکی ئێرانی ئەڵێ:

**"شنیدستم که هر کوکب جهانی است جداگانه زمین و آسمانی است"**

کاک سوارە، لە درێژەی باسەکەیدا دەنووسێ:

"بەڵام بزانین "پیرەژن" لەم کارەساتەدا نەخشی چییە؟ پیرەژن ڕەمزی ئادەمیزادێکی پڕ تاقیکاری و سارد و گەرم چێشتووە و ئەم ئادەمیزادە ئەشێ کە ڕێبواری سەفەرێکی پڕ مەترسی بێ.

**هۆیەکی تریش کە پیرەژن بۆ ئەم گەشتی فەزایە لەبەر چاو گیراوە کە پیرەژن لە ئابووری کۆمەڵا پێکهێنەری بەرهەم و داهاتێک نییە و ئەگەریش لە ناو بچێ و بێ‌سەروشوێن بڕوا زیانێک لە کۆمەڵ ناکەوێ، هەر ئەو ئاواتەیە کە لە پێشا هونەر نوێنەری بوو ئێستە لەم چەرخەدا کە ئێمە تیا ئەژین لە چەشنی ئاواتێکی ئەفسانەیی دەرچوو و بۆتە کارێکی زانستی. فەزا بە هەموو ڕەمز و ڕازێکییەوە کەوتۆتە بەر تیشکی زانست، بەڵێ هەر وەک لە هەوەڵەوە کوتمان زانست و هونەر دوو لقەدووانەی تێکۆشانی گیان و ئاوەزی ئادەمیزادن و نەوەک هونەر هەر تەنیا ڕێگای بەرەو پێش چوونی زانست ناگرێ، بەڵکو ئەو ڕێگایە کە بەتەم ومژو تۆز و خۆڵ داپۆشراوە ڕوون ئەکاتەوە."**

لە وڵاتی ئێمە بەتایبەت لەنێو کۆمەڵی کوردەوارییا، ماڵوێرانی، دەربەدەری، هەتیوباری، دابونەریتی ناحەز و کۆن، دەنگۆی جەماوەر لە سەر ڕووداوی بچووک لەنێو ئاواییی، زۆربەی شوێنەکانی بە یەک گەیشتنی خەڵک دەگرێتەوە. خودا نەکا یەکێک شتێکی لێ بقەومێ، وەک قیلی کەوای سپی پێوەی دەنووسێ و هێندەی تر بارگرانی دەخاتە ئەستۆی. زۆر ڕووداو هەن کە بەڕواڵەت ئاساییێن، بەڵام هونەرمەندی شارەزای نێو کۆمەڵ، لەم ڕووداوە سادانەش کەلک وەردەگرێ.

کاک سوارە، یەکێک لەو کەسانەیە کە سەرەڕای شارەزاییەکی زۆر لە سەر ژیانی کۆمەڵگاکەی خۆی، خولقێنەرێکی لێوەشاوە و ڕووناکبیرێکی زاڵە بە سەر وشەی ڕەسەن و فۆلکلۆری کوردیدا، کۆمەڵی کوردەواری، یەکێکە لەو گەلانەی کە بۆ چارەڕەشی و لێقەوماوی قافڵەساڵارە. هەروەک مامۆستا هەژار دەڵێ:

**مەڕوانە کەساس و لێوبەبارم، نە کەمم**
**بەرزم لە هەژارییا، چیای سەر بە تەمم**
**هەر کەس لە سەرێکەوە خوداپێداوە**
**من خاوەنی شەشدانگی کوڵ و دەرد و خەمم**

کاک سواره، به قەڵەمە سیحراوییەکەی، بۆ بەیانی ژیانی کۆمەڵگاکەی لە ئەزیلە و نێوونیتکە و ئەفسانەش کەلک وەردەگرێ و بە زمانێکی پوخت و پاراو و ڕەسەن لە تاپۆیەکدا باسی کەسێک دەکا بە ناوی **"گەوەرە شێت"**. گەوەر بۆ شێت بووە و خەڵک چۆنی باس دەکەن، جێگای سرنجە و با بزانین هونەرمەند بەم قەڵەمە جوانەی خۆی چ هونەرێکی پێشکەش بە بارەگای هونەر کردووە:

**"گەوەر ئافرەتێکی شێت و سەرگەدان بوو، کەس نەیدەزانی سێ وەرزی دیکە بۆ کوێ ئەچێ و چۆن ئەژی، لە کانی ژنان، لە سەر خەرمانان، لە مزگەوت و حوجرەی فەقێیان، لە هەموو شوێنێک باسی گەوەرە شێتیان دەکرد. ئەوانەی وا تەمەنیان زۆرتر بوو ئەیانکوت گەوەر تەمەنی لە سی تێناپەڕێ، زۆر حەستەم بوو کەسێ ڕواڵەتی تێکشکاوی گەوەر ببینێ و بڕوا بەم قسەیە بکا.**

**... ئەتکوت بە نووکی گاسنی ڕۆژگار، چیمەنی سەرسەوزی تەوێڵ و گۆنای هەزار کووزی خوار و چەوتی تێ کراوە، بەتایبەت نیگای بێ گیان و بێ دەربەستی کە نەتئەزانی تەوس و تواڵجی پتر تێدایە یا ڕق و تووڕەیی. هەرگیز نەبوو کە تۆ گەوەر ببینی و تروسکەی بێ تین و تیژتێپەڕی زەردەخەنەیەک لە سەر لێوی نەبێ، بەڵام ئەو زەردەیە زوو هێلانەی وشک و چۆڵی بەجێ ئەهێشت و ئەبۆوە بە پەیکەرەی خەم و دەرد. هەموو مێژووی ژیانی ئادەمیزاد، هەموو سەرکەوت و تێشکانێک لە یەک کاتی کورتا ئەوەندە مەلی نیگای تۆ لە چاوتەوە هەڵئەفڕێ و بگاتە سەر وشکارۆی ڕوخساری ئەو، وەک برووسکەی شەوێکی بە هەوری بەهار، ڕۆشن ئەبوو و ئەگوڕاوە."**

داستانی گەوەر، هەر بەوەندە نابڕێتەوە، دیارە بەرداشی زەمان وە سەری پەڕیوە و تووشی ئەم ڕۆژە ڕەشەی کردووە. بۆ ئەنجامی ئەم ڕووداوە گوێ دەدەینە وتووێژی کاک سوارە، لەگەڵ گەوەر.

"کێشێکی بەهێز کێشامی و لە پاڵ دەستیا دایمەزراندم، بێ ئەوە ڕووی وەربگێڕێ و بزانێ من کێم، کوتی:

-"تۆش لە تەنیایی وەڕەز بووی؟"

هیچ دەنگم نەکرد، درێژەی دا:

-"بەڵێ ئادەمیزاد زۆربەیان تەنیان، لەگەڵ ئەوەشا کە بەڕواڵەت هەزار هەڤاڵ و خزم و کەسوکاریان هەیە."

لام سەیر بوو کە ئافرەتێکی شێت ئەم قسانە بکا، بە ئەسپایی و بە چەشنێ کە نەیسڵەمێنمەوە پرسیم:

-"تۆش تەنیای؟"

بە تەوسەوە ڕوانی بۆم و دیتم کە لە نزیکەوە ئەکرێ جارێ جوانییەکی نەماو لە زەوی پڕ لە خاڵ و خەوشی دەموچاویا بەدی کەی.

گوتی:

-"ئەو ساڵەش هەر ئەم وەرزە بوو کە ئەو ڕۆیشت و من تەنیا کەوتمەوە."

بە دوودڵییەوە پرسیم:

-" ئەو کێ بوو؟"

دیار بوو بیرەوەری تاڵی هاتۆتە خرۆش و سەرڕێژ ئەکا. کەمێک چاوی بە دەور و پشتییا گێڕا و کاتێ دڵنیا بوو کەسێ بە دەور و پشتمانەوە نییە، گوتی:

-"کوڕەکەم، کوڕەی نازار و خۆشەویستم!"

دەنگی ئەتکوت لە ژێر چاڵێکی بێ بنەوە دێتە دەر، کپ و خەماوی بوو. لە سەر قسەکەی ڕۆیشت:

- " باوکم دەوڵەمەند بوو، زیاتر لە دیوەخانی ئاغا بوو، بەهارێکی سەوزی خەیاڵاوی کە یەکەم بەهاری گەنجی من بوو، فەقێ مارف هاتە ئاواییەکەمان و هێندەی پێ نەچوو کە من و ئەو دڵمان دا بە یەک. هاوین هات و گەرمای ئەوینی ئێمەش لەگەڵ گەرمای هەوا هەر هات و زۆرتر بوو، بەڵام باوکم ئامادە نەبوو من بدا بە فەقێیەک کە بە واتەی ئەو نەیدەزانی کوڕی کێیە و لە کوێوە هاتووە. لایەکم ئەوین بوو کە بانگی ئەکردم بۆ بەهەشتی خەیاڵاوی هەمیشە بەهار، ئەو لای ترم باوکم بوو کە لە بەر چاوم ببوو بە ڕواڵەتێکی دزێو و هەڕەشەی لێ ئەکردم کە هەنگاو نەنێم بۆ لای ئەو گوڵزار و بەهارە کە ناوی ئەوین بوو. گوتم کە من گەنج بووم، گەنجێکی تازەساڵ و نەمدەزانی لەم ناوەدا چی بکەم.

با سەرت نەهێنمە ئێش، من پاش دوو ساڵ ببووم بە دایکی کوڕێک کە لەگەڵ فەقێ مارف ئەتکوت سێوێکن و کراون بە دوو کوتەوە، بەڵام فەقێ مارف هەر ئەوەندە مێردی من بوو، پاشان ڕۆیشت و منی تەنیا بەجێ هێشت. کاتێ کوڕەکەم ببوو بە هەشت ساڵە، لەپڕ نەخۆش کەوت، من پارەم نەبوو کە بیبەمە لای دوکتۆر، باوکیشم لێم بەرقدا کەوتبوو و ماوەی ئەو دە ساڵە قسەی لەگەڵ نەکردبووم، تەنانەت ئەو ڕۆژەش کە چوومە لای داوام کرد پارەیەکم بداتێ، بە تواڵجەوە گوتی ئەم کوڕە باوکی هەیە، بۆ داوا لە فەقێ ناکەی پارەی دوکتۆر و دەرمانی بۆ بدا؟ پاڕانەوە و گریانی من دڵی وەک بەردی باوکمی نەرم نەکرد، کاتێ گەڕامەوە، گۆشەجەرگم، سۆمای چاوم لە جێگاکەیا..."

وا دیار بوو نایەوێ لەمە زیاتر قسە بکا، چونکە بێدەنگ بوو و چاوی بڕییە گۆڕستانی

**ئەوپەڕی. ڕووبارەکە تاوی بە سەرکشابوو و لە پێکەنینی تواڵجاوی ئافرەتێکی کوڕمردوو ئەچوو.**"

کاک سوارە قسەی زۆر پێ بوو بۆ نەتەوەکەی، بەڵام مەرگ مۆڵەتی نەدا. بە قەولی خۆی کە دەڵێ:

**بە قسە خۆشە مەترسی مردن**
**تاڵە ئەو هەستی بە مردن کردن**
**مەرگە دێ و دوا بە هەموو شت دێنێ**
**هەموو ئاواتێ لە دڵ دەستێنێ**

بەداخەوە ئەم گەنجە بەتوانا و خاوەن شێوە نوێیە تاوێری مەرگ وەبەر خۆی دا، ماڵئاوایی لە گەل و هونەرکرد و شێوازەکەی بۆ نەگەیشتە هەوارگەی ئاوات.

# سـواره

**عەزیز کەیخوسرەوی**

لە تاریکی و شەوەزەنگی سامناک و پڕ مەترسیدا، کە ئالی زالی شەو وەک گەلای داری خەزەلوەر چەمۆلەی کلۆلی و چارەڕەشی لە خەلکی ولاتەکەمان نابوو، ئەستێرەیەکی پڕ تریفە لە ئاسمانی هونەر و ئەدەبیاتی کوردەواریدا ئەنگووت. شاعیرێکی خاوەنهەست کە وەک ئەستێرەیەک بە تیشکی جوانی خۆی پەردەی شەوەزەنگی هەلدڕی و لە زەنویری زێڕئاژنی سای زرینگانەوەی شەو بە خوڕ زەمزەمەی هەلبڕی. شیعرە جوانەکانی کە گەرمتر لە پڕشنگی تاوی بەهاری و بەتینتر لە ڕوانینی بە تاووتینی زاوا و ناسکتر لە ڕوومەتی بووکی شمشالی ڕەشمالی دۆلی هەلدڕی و لە بورجی خاپووری مێژووی ئەدەبدا، کە بە ڕاستی وەکو ئاوێنەی جیهاننوما، نیشاندەری تەواوی خۆشی و تالی ڕابردووی گەلەکەمانە، پەچەی قورسی نیسیانی لە سەر ئەدەب دۆستان لادا، شنەی نەرمەلاوێنی دەمبای خستە نێو کۆڕی ئەدیبان و ئەددب دۆستان و لەشی نەحەساوەی ڕێبوارانی لە ڕێگای دوور و پڕ سەختلەتی بێپسانەوە و گەڕانەوەی ئەدەبیی کوردەواریدا حەساندەوە.

ئەو ئەستێرەگەشە، شۆڕەسواری مەیدانی ئەدەبی کورد، کاک سوارە ئیلخانیزادە کوڕی ئەحمەدئاغا، کوڕی حاجی بایزئاغای کوڕی حاجی ئیلخانییە کە لە سالی ١٣١٦ی هەتاویدا لە گوندی "تورجان"ی سەر بە ناوچەی بۆکان هاتە سەر دنیا.

کاک سوارە خوێندنی سەرەتایی لە بۆکان دەست پێکرد، لە کاتی مێرمندالیدا زۆر بزۆز و وریا بوو، بەلام بەداخەوە لە تەمەنی ١٣ـ ١٤ سالیدا چەرخی چەوت و چەپگەردی ڕۆژگار لە گەلی هاتە کایەوە و هەوەلین نەیاری خۆی لە ئاستی دەربڕی، نەخۆشی شەپلە (فەلەج) پای پڕهێزی کە لە کاتی ڕاو لە چڕوچیاکانی ولاتەکەیدا یارمەتیدەرێکی باش بوو، لە هێز و تەوژم کەوت. ماوەی دوو سال لە ژێر چاوەدێری دوکتۆرێکی ئەلمانی لە دەرمانگای بۆکان بوو.

شەوق و عەلاقەی بە زانست و فێربوون بە ڕادەیەک بوو، کە لەو ماوەیەدا لە قەرەگوێز لە لای مامۆستا مەلا محەممەد ئەمینی ئەشعەری کوڕی حاجی مەلا دەرسی دەخوێند. دوایەش گەڕاوە شاری بۆکان و لە قوتابخانەی شاری بۆکان و لە قوتابخانەی ناوەندی (دبیرستان) وەکو قوتابییەکی (مستمع آزاد) وەرگیرا و تا پۆلی پێنجەمی ناوەندی لەوێ خوێندی. چونکو لەو کاتەدا لە بۆکان کە شارەدێیەک بوو ڕێگای خوێندنی زیاتر نەبوو، بە ناچار لە

باوەشی گەرمی خاوخێزانی دوور کەوتەوە و ئاوارە و پەڕیوەی تاران بوو. شاری بەگرمە و دووکەڵ و پڕ لە هاژە و هاڕەی ژیانی ماشێنی و خەڵکی بێبەش لە نەشە و شنە.

کاک سوارە کە لە بەرتاوی گەرمی بەردەواری عەشیرەت گۆش کرابوو و تەنیا بە جامی ئاوی کانیاوی دێیەکەی کوڵی دڵی پڕزۆخی دادەمرکا و بۆنوبەرامەی سەرسەکۆی کاگڵی ئاوپڕژاوی نیشتمانی جوانی، پێ لە بۆندارترین عەترەکانی هەندەران خۆشتر بوو، بە هەر کووچە و شەقامێکی تاراندا کە بە شەلەشەل ڕادەبرد، شەپۆلی خەم و خەفەت بەرەو دڵی دەهات. هەموو ئەو تایبەتمەندییە جۆراوجۆرانەی ژیان وەکو پەردەی سینەما لە لاپەڕەی خەیاڵدا نەخشیان دەبەست و پلەی بەرزیان دەدا بە ئاسەواری بێ خەوش و گەردی و ڕەنگی سوور و شینیان دەدا بە شیعر و عاتیفەی گەشی. شوێنی ئەم کار تێکردنەش لە شیعرە بەرزەکانیدا بەتایبەتی لە: "شار"، "خەوەبەردینە" و "کچی بەیان"دا بە ڕاشکاوی بەرچاو دەکەون.

کاک سوارە لە بەر دەست کورتی و نەبوونی بابی لە تاران دەچێتە ماڵی حاجی ڕەحمان ئاغای مامی و خوێندنی نێوەندی و زانستگا لە بەشی «حقووقی قەزایی»دا درێژە پێدەدا. هەمیشەش ژیانێکی ساکاری بووە و بە دەست ئێشی لاقییەوە ناڵاندوویە.

«سوارە»ی لەش بەبار لە بزووتنەوە سیاسییەکانی خوێندکارانی زانستگادا بەشداری دەکرد و هەر بەو بۆنەوە لە لایەن ڕژیمی پاشایەتی ئەو سەردەمەوە گیرا و بۆ ماوەی دوو ساڵ لە زیندانی «قزڵقەڵا» زیندانی کرا. بەو حاڵەشەوە زۆریان جەزرەبە و ئازار دا، بەڵام بە شاهیدی هاوالآنی زیندانی، خۆڕاگرییەکی زۆری لە خۆ نیشان دا و تەنانەت ورەی بە زیندانییەکانی دیکەش دەدا.

دوای ئەوەش کە دوو ساڵ لە تاریکەتاراوگەکەدا زەمانی تەریکی تێپەڕاند، بە هیوا بوو بگرمێنێ هەوری بەهاری و گشت بەندییەکان لە زیندانی بەردینی غارا ڕەها بن، داخەکەم بە چاوی خۆی نەیدی کە چۆن هەوری ڕەشپۆشی بەگرمە و ناڵە نیازی هەزاران گەزیزەی بە نازی وەدی هێنا و ئاوپڕژێنی کوڵی دڵی پڕزۆخی ڕۆڵە کوژراوانی گرتە ئەستۆی خۆی. پاش بەسەرچوونی دەورەی تەریکی، درێژەی بە خوێندن دا و لیسانسی حقووقی قەزایی وەرگرت. هەر چەند دەیتوانی دەفتەری وەکالەت دابنێ کە کارێکی پڕداهات بوو، یاخۆ لە دادگوستەری دابمەزرێ، بەڵام لە بەر ئەوەی هەستی بەوە دەکرد کە لە ڕەوتی هیچ کام لەو کارانەدا ناتوانێ دەردێکی گەلە چەوساوەکەی دەرمان بکا و لە لای ترەوە شەوقێکی زۆری لە سەر شیعر و ئەدەب و فۆلکلۆری نەتەوایەتی گەلەکەی بوو، هەر کە پێشنیاری دامەزران لە دەزگای ڕادیۆی پێکرا قەبووڵی کرد و سەرەڕای ئەوەی نێوەرۆکی بەرنامە ڕادیۆییەکانی بە

دڵ نەبوون، لە بەشی شیعر و ئەدەبدا دەستی بە کار کرد. کاک سوارە بەرنامەیەکی ڕادیۆیی بە ناوی "تاپۆ و بوومەلێڵ" دەنووسی و هەر خۆشی بەڕێوەی دەبرد. لەو بەرنامەدا وەلامی شاعیران و نووسەرانی لاو و تازەکار و نەناسراوی کوردی دەداوە. بۆ باشتر کردنی بەرهەمەکانیان ڕێنوێنی دەکردن. جگە لە مانەش ئەدەب و فۆلکلۆری کوردی لەو بەرنامەدا شی دەکردەوە و لە سەریان دەدوا. شاعیر و نووسەرە کوردەکانی ئەو سەردەمە چ لە ئێران و چ لە دەرەوەی وڵات کەلکێکی زۆریان لێوەردەگرت. دەنگێکی زۆر گیرای بوو، زۆر بە جوانی و ڕێکوپێکی شیعرەکانی دەخوێندنەوە و بەرنامەکانی بەڕێوە دەبردن، هەر بۆیەش سەرنجی گوێگرانی بەرنامەکەی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا.

کاک سوارە هەر لە تافی لاوێتییەوە، لەو کاتەوە کە لە قوتابخانەی ناوەندی دەرسی دەخوێند، شیعری دەگوت، ئەو کاتەش کە خوێندکاری زانستگا بوو، هەروەها سەردەمێک کە لە زیندانی تاغووتدا بوو و دوای ئازاد بوونی لە زیندانیش شیعری داناوە، کە شیعرەکانی دوایی بە هۆی بەرەوژوور چوونی پلەی زانست و ئەزموونی کۆمەلایەتی لە باری نێوەرۆکەوە، هەتا دەهات قوولتر و پڕ ماناتر دەبوون و نیشاندەری هەستکردنی شاعیر بە دەرد و ژان و ئازاری کۆمەڵ بوو. لە هونەری شاعیریدا ڕێبازی گۆڕانی گرتۆتە پێش. شیعری خەییامیشی وەرگێڕاوەتە سەر کوردی.

کاک سوارە کە زۆربەی تەمەنی کورتی ٣٨ ساڵەی خۆی بۆ خزمەت بە زمان و ئەدەبی کوردی تەرخان کردبوو، ساڵی ١٣٥٤ی هەتاوی لە نەخۆشخانەی میساقییەی تاران بە نەخۆشی سەرەتان مرد و داخ و کەسەرێکی زۆری بۆ ئەدەبدۆستان و هونەرپەروەرانی کورد بەجێ هێشت.

تەرمی پیرۆزی لە ناوچەی بۆکان بە خاک سپێردرا، سەد بریا مابا و سروەی بەهاری ئازادی گەلەکەمانی بە چاوی خۆی دیبا.

جگە لە کۆمەڵە شریتی بەرنامەی ...تاپۆ و بوومەلێڵ، ئەم ئەسەرانەشی لێ بەجێ ماون:

١- خەوەبەردینە

٢- قەل و هەڵۆ: وەرگێڕاوی "عقاب" کە شیعری "پوشکین"ە و دوکتور «پەرویز ناتیل خانلەری» کردوویە بە فارسی.

٣- بانگەوازی پەنجەرە.

٤- تۆ دەریامی.

٥- کچی بەیان.

٦- شار.

٧ـ دیمەنی بەفر و زستان.
٨ ـ مردوو، وەرگێڕاوی شیعری پیترۆس دووریان شاعیری هەرمەنی لە فارسییەوە بۆ کوردی.
٩ـ هەواره.
١٠ـ خێڵی درۆ.
١١ـ چەند پەخشانی وەک: داستانی چەکوش وەشێنی ڕۆڵەکوژراو ٢٠٠ لاپەڕە.
ـ داستانی لاس و خەزاڵ ٢٠٠ لاپەڕە.
ـ داستانی ئافرەت ١٠٠ لاپەڕە.
ـ لێکۆڵینەوە لە سەر بەیتی برایمۆک و سەیدەوان کە هیوادارم هەموو ئەو ئاسەوارانە کۆ بکرێنەوە و لە چاپ بدرێن، کە خزمەتێکی زۆر بەرزە بە ئەدەبیات و کەلەپووری نەتەوەکەمان.

## شار

**گوڵم!**
**دڵم پڕە لە دەرد و کوڵ،**
**ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت.**
**ئەڵێم بە جامی ئاوی کانیاوی دێیەکەم،**
**عیلاجی کەم کوڵی دڵی پڕم، لە دەردی ئینتیزارەکەت.**
**وەڕەز بوو گیانی من، لە شار و هاڕەهاڕی ئەو،**
**لە ڕۆژی چڵکنی نەخۆش و تاوویاوی شەو،**
**ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت،**
**لە شاری چاو لەبەر چرای نیئۆن شەوارەکەت،**
**بڕۆمە دێ، کە مانگەشەو بڕژێتە ناو بژەم،**
**چلۆن بژیم لە شارەکەت،**
**کە پڕ بە دڵ دژی گزەم؟**
**لە شارەکەت، کە ڕەمزی ئاسن و منارەیە**
**مەلی ئەوین غەوارەیە.**
**ئەڵێی لە دەوری دەست و پێم،**
**ئەوەی کە تێل و تان و ڕایەڵە،**
**کەلەپچەیە،**

لە شارەکەت کەمەندی دووکەڵە
کە دێتە دەر لە ماڵی دەوڵەمەند،
وە تیشکی بێگوناهی خۆرەتاو ئەخاتە بەند.
لە هەر شەقام و کووچەیەک شەپۆری شینە دێ بەرەو دڵم،
دەستی گەرمی ئاشنا نییە کە ئەیگوشم،
دەستی چێوەییە.
لە شارەکەت زەلیلە شێر، گوڵم
باوی ڕێوییە،
بە هەر نیگایەک و پەتایەکا
ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت، گوڵم
ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت،
گوڵم، هەرێمی زۆنگوزەل
چلۆن ئەبێتە جارەگوڵ
لە شاری تۆ، لە بانی عەرشە قۆندەرەی دراو
شارەکەت ـ
ئاسکە جوانەکەم!
تەسکە بۆ ئەوین و بۆ خەفەت هەراو.
کێ لە شاری قاتڵی هەژار،
گوێ ئەداتە ئایەتی پەڕاوی دڵ؟
منێ کە کۆشی تاوی گەرمی بەردەوارەکەی عەشیرەتم،
بە دارەتەرمی کووچە تەنگەکانی شارەکەت،
ڕانەهاتووە لەشم.
بناری پڕبەهاری دێ
ڕەنگی سوور و شینی ئەدا
لە شیعر و عاتیفەی گەشم
ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت گوڵم،
ئەڵێم
بڕۆم
لە شارەکەت

# ئاوڕێک وە سەر سوارە

**ح. بەفرین**

گۆڤاری "سروە" ماوەیەک لەمەوبەر دەرگای لە سەر شاعیرێکی بلیمەت و بەهرەمەندی وەک "سوارە ئێلخانی" کردەوە، منیش بەجێی خۆیم زانی هەوڵ بدەم بە کورتی هەندێک سیما و لایەنی شیعری نوێی ئەم شاعیرە نەمرە بە خوێنەری "سروە" بناسێنم.

کاتێ دەچینە سەر باسەکە بەر لە هەموو شت ئەم پرسیارە سەر قوت دەکاتەوە: شیعری نوێی "سوارە" لە چ ئاستێکدایە و تا چەند توانیویەتی دەستی نوێکردنەوە بۆ گەردنی بەرزی شیعری کوردی بەرێ؟

بە بڕوای من بۆ ئەوەی ئاسانتر لەگەڵ "سوارە"ی شاعیر ئاشنا بین، پێویستە ئاوڕێکی کورت لە شیعری نوێی کوردی بدەینەوە.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، لە کوردستانی عێراق شیعری کوردی شەپۆلی بزووتنەوەیەکی نوێخوازی تێ کەوت. سەرەنجام "گۆران"ی نەمر بە هۆی لێهاتوویی و توانایی بێسنووری خۆی جڵەوی ئەو بزووتنەوەیەی گرتە دەست و ڕەگ و ڕیشەی شیعری نوێی لە باخی شیعری کوردیدا چەسپاند، بەم کردەوە مێژووییەی گۆران زەمینە بۆ گەشەسەندن و پەرەگرتنی شیعری سەردەم خۆش بوو کە دوای جەنگی جیهانی دووهەمیش زۆر چرۆی نوێ و تازەغونچەی تر چاویان پشکووت، شاعیرانی وەک ع.ح. ب کامەران موکری، دیلان، جەماڵ شاربازێڕی، هەر یەک لە لای خۆیەوە پەرەی بە نوێکردنەوەی شیعری کوردی دەدا. لەگەڵ ئەوەش هیچ کام لەو شاعیرانە، بڕستی ئەوەی نەبوو لەو ڕێبازە گشتییە دەرچێ کە "گۆران" دەقی پێوە گرتبوو. ئەم کێشەیە تا چەند ساڵ پاش مردنی "گۆران"ی نەمر مایەوە، پاشان بەپێی پێداویستییەکانی ژیان شێعری نوێ شێوەی سەردەمی خۆی وەرگرت و بەرەو پێش هەنگاوی گرتە بەر،بەڵام لە کوردستانی ئێران هەر چەند هەژار و هێمن وەک دوو شاعیری گەورە و بەهرەمەند، لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە، بەشداریی نوێکردنەوەی شیعریان کرد، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانیش بڕستی ئەوەیان نەبوو لەو دەقی ڕێبازە دەرچن کە خووی پێوە گیرابوو. کەچی هەر دوای مردنی "گۆران" لەم ناوچەیەدا شیعری نوێ بەرەو بیر و بۆچوونێکی تر هەنگاوی هەڵگرت کە "سوارە ئێلخانی" بە ڕابەر و پێشەوای ئەو دەستپێکردنە دەناسرێ و دیار و ئاشکرایە ئەگەرچی بە مردنی ئەو شاعیرە جوانەمەرگە ئیتر ئەو گڕ و بڵێسە گەرم و بەتینە وەک گەرووی ئەمان هەڵیلووشیبێ کپ و خامۆش بوو، وەک بڵێی ئەم جۆرە بەهرە و

برسته هەر لە "سوارە"وە ودشابێتەوە و بە جوانەمەرگ بوونی ئەو چرا وەکوژێنەی لێکرا.

هەر چەند من نالێم ئەم چرایە بۆ هەمیشە کوژاوە، بەڵام ئەوەندە هەیە حاڵی حازر کپ دەبینرێ و هەنگاوێک بەرچاو ناکەوێ درێژە بەو ڕێگا سەختە بدا.

ئەگەر دەسبەرداری ئەم باسە کورتە بین و بگەڕێینەوە بەرەو ماڵی خنجیلانە و جوانی شیعری "سوارە" لە گوڵبژێرێکی شیعرەکانیدا بەتایبەتی: خەوەبەردینە، کچی بەیان، خێڵی درۆ، هەڵۆ و بانگەوازی پەنجەرەدا، دەبینین کە دەنگ و ڕەنگی تایبەتی "سوارە"یان پێوەیە. ئەو جۆرە تاقیکردنەوە و ڕۆشنبیری و شارەزاییەی لەم شیعرانەدا بە ڕاشکاوی پرشنگ داوێ، ئاوڕدانەوەیەکی تازە و بیر کردنەوەیەکی نوێیە سەبارەت بە ژیان و لێکدانەوەی خەمی سەردەم، پێم وایە شاعیرێکی وەک سوارە توانیویەتی بە تەواوی بناغە و بنچینەیەکی ڕێکو ڕەوانی، دوای "گۆران" بۆ شیعری نوێی سەردەم دابین بکا، تەواوی ئەو دەق و خووەی هەرەس پێ بردووە کە شیعری کوردی تا ئەو دەم عادەتی پێوە گرتبوو. "سوارە" بەر لە هەموو کەس پەی بەو ئەرکە مێژووییە بردووە و بە کردەوە سەلماندوویەتی کە شیعر کاتی ئەوەی هاتووە ڕووبەڕووی ڕووداوەکانی سەردەم بێتەوە، هەڵبەت ئەم بەرنامە ڕوون و ئاشکرایەی "سوارە"ی نەمر لە چەشنە تاقیکردنەوە و شارەزایی و بۆچوونێکی تازەبابەتەوە، سەرچاوەی گرتووە. لە پێناو پاراو کردنی دەرد و ئازاری خەڵکدا. لێرەدا ئەگەر لە شیعری "کچی بەیان" ورد بینەوە هەست دەکەین بەرپرسی شیعر لە ئاستی ڕووداوەکانی ژیان، بەرپرسیاری شاعیر بەرامبەر ئەرکی شیعر بە خۆ دەگرێ. بە ڕادەیەک ئەم بەرپرسییە قووڵ دەکرێتەوە کە دوێنێ و ئەمڕۆ و بەیانی یەکتر تەواو دەکەن، بە درێژایی ڕابردوو بە بەرینی ئێستا، بە قووڵی داهاتوودا ئەم گەشبینییەی شاعیر دەکێشێ و پەل داوێ:

**پێم ئەڵێی: شەو کرە، چیاچرە**<br>
**ڕاستە گیانەکەم**<br>
**ڕێگامان دوورە، سەختە، قاقرە**<br>
**خۆشەویستەکەم**<br>
**لە پەنجەرەی نیوەتاکی بوومەلێڵەوە**<br>
**چاوی من لە دیەنی کچی بەیانییە**<br>
**لە حەنجەرەی زەمانەوە**<br>
**گوێم لە زمزمەی زوڵاڵی خێزە وردەکانی کانییە**

لە ڕوانگەی پێگەیشتوویی و تێگەیشتوویی شاعیریەتی "سوارە"وە ئەنجامی لێکدانەوەی خەمی ئاشکرا و نهێنی، مرۆڤ بەوە دەگا کە دەربڕینی دەردەداری ئێستای ژیانو

سەردەمی ئێستا لە سووچی پرسیارێکەوە سەرەتاتکێ لەگەڵ نەبووندا دەکا. بۆ ئەو ئامێزە ساردوسڕەی لە ئاستی گەورەیی بوونی ئەم سەردەمە جەنجاڵەدا واڵای کردووە:

**تۆ بڵێی ئەو خەوە هەستانی بێ؟**

**یانە ئەو قافڵە وەستانی بێ؟**

دەبینین "خەوەبەردینە" ئەو ئەنجامی دەرک پێکردنەیە کە شاعیر فەلسەفەی ژیانی پێ یەکلایی کردۆتەوە، تێیدا سروشت و ژیانی کۆمەڵایەتی دوو شتی لە یەکچوون. لەو بزووتنەوە نەسرەوتەدا وەک دوو کەناری دەریایەک کە بڕانەوەی بۆ نییە، ئەم شیعرە شاکارێکی نەمردووی شیعری کوردییە.

لام وایە، شاعیرەتی "سوارە" ئەوەندە گوڕوتینی ناسکی بیری لە "خەوەبەردینە"دا ماندوو کردووە، بۆ کۆڵکردنی ئەو ڕووداوە گەورەیەی ژیان لە پێناو پەڕاندنەوەی لە گەرداوی نەزانییەوە بۆ سەر خاکی تێگەیشتن، هەر ئەوەشە چەشەیەکی فەلسەفی داوەتێ و لەم سەردەمە جەنجاڵەدا لێکدانەوە تەنها خەمی "خەوەبەردینە"یە وەک ئەوەی ژیان بە کۆتایی تاریکییەوە هەڵواسرابێ:

**ئەزانم ئەوانەی کە پاراوی ئاون بژارن**
**ئەزانم لە ڕێگا مەترسی**
**گەلێ ژەنگ و ژارن**
**بەڵام کاکە**
**ئەو گشتە**
**عەقڵی خەسارن**
**لە ناو ئەو هەموو ئاوە**
**هەر چاوەیەک باوی هەنگاوی،**
**خۆشە**
**بە تەنیا ئەوە شارەزای کۆسپ و کەندالی ڕێیە**
**هەوەڵ مەنزڵی زێیە ئاواتی بەرزی زرێیە**
**ئەزانێ لە هەڵدێرە هاتی بە هێزی**
**لە ئەسکوند و چالایە هەڵدان و گێژی**
**پەرۆی شینی سەر شانی دەریایە ژینی کەرێزی**
**ئەزانێ لە پێ ناکەوێ**
**پێیە، پێلاوی ئاسەی پیاسەی لە پێ بێ**

**نەوەستان ئەوەستێ بە دەستی**
**کە خاراوی ئێش و سواوی سوێ بێ**
**لە هەر شوێنێ ڕاماوە، داماوە کاری کراوە**
**ئەزانێ ئەبێ**
**هەر بڕێ و باژوێ تا بڕێ**
**تا بێنێ**
**هەناوی بە هەنگاوە**
**نەسرەوتنە، کوولەکەی ڕۆحی ئاوە**

شاعیرێکی گەورەی وەک "سوارە ئێلخانی" هەر بە وەندە مەیسەر نابێ، بەڵکو بە ئومێدی ئەوەی لە دەرفەتی تردا بتوانم زۆر مەسەلەی شیعری بەرزی ئەم شاعیرە جوانەمەرگە نەمرە بە وردی باس بکەم.

**تێبینی:**

سەبارەت بە وەی "سوارە ئێلخانیزادە" بەجێیە یا "سوارەی ئێلخانی" من پێم وایە "ئێلخانی" دروستە. زۆر لەو نووسەر و شاعیرانەی کوردستانی ئێران کە من دیومن و ئاشناییم پێیان بووە، "ئێلخانی" بە ڕاست دەزانن نازانم بنەماڵەی شاعیر خۆیان ڕایان بە کامیانە. ڕوونکردنەوەی ئەمەش زۆر پێویستە لە مەسەلەی ئەدەبدا و هەر وا شتێکی سەرپێیی نییە.

# سواره له بەر تیشکی نووسراوەکانیدا

ئەحمەد شەریفی

بۆ ناسینی هەرچی باشتری سواره و بیروباوەڕی دەبێ ئاوڕێک وەسەر دەورانی ژیانی و چاخێکی که تێیدا ژیاوه بدەینەوه.

سواره له ساڵی ١٣١٦ی هەتاوی له دایک بووه، لەو سەردەمەدا له موکریان بیری کوردایەتی تازه بڵێسەی سەندبوو، هەست و بیری کوردایەتی به هۆی شێعرەکانی حاجی قادر کۆیی، خانی و مەلای گەورەی کۆیه له موکریاندا چرای خۆیبوونی کوردی داگیرساندبوو و تەنانەت هێندێ کەس ببوونه پێڕەوی ئەم بیروباوەڕه و لەسەر ئەم تەشک و چەشنه خەریکی شیعردانان بوون که ئالاهەڵگری ئەم قۆناغه و ئەم بیر و قوتابخانەیه له موکریاندا،دەتوانین خاڵەمین بەرزەنجی، سەیید کامیل ئیمامی، هەژار، هێمن، هەباس حەقیقی و... دی بزانین. جووڵانەوەی کورد له تورکیه و بەتایبەتی له عێراق کارێکی گرینگیان کردبووه سەر کوردەکانی ئێران و ئەوانیش وه جموجووڵ کەوتبوون.

پێکهاتنی حیزبی بۆرژوامیللی هیوا له کوردستانی عێراق به سەرۆکایەتی ڕەفیق حیلمیو پەیوەندگرتنی ئەم حیزبه لەگەڵ ڕووناکبیرانی موکریان ئەوەندەی دیکه ئاوری بیری کوردایەتی له ناوچەکەدا خۆش کرد و بوو به هۆی وەی که "کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان ژ.ک" له چینی هوردەبۆرژوای میللیی کورد له موکریان پێکبێ، خوالێخۆشبوو مەلا حەسەن قزڵجی دەیگێڕاوه که پێش پێکهاتنی ژ.ک له مەهاباددا دوو تاقمی تر هەبوون و له سەر شانی ئەم دوو دەستەیه حیزبێک به ناوی "حیزبی ئازادیخوازی کوردستان" پێکهات و کاتێ سوپای سۆڤییەت له ساڵی ١٣٢٠دا هاته کوردستانەوه و ئەم حیزبه له بەیاننامەیەکدا پشتیوانیی لەم هاتنه کرد و پاشان ئەندامانی ئەم حیزبەش تێکەڵ کۆمەڵەی ژ.ک بوون. هاتنی سوپای سۆڤییەت بۆ کوردستان بەتایبەتی ناوچەی موکریان گرینگییەکی زۆری هەبوو که هێشتا لەم بارەیەوه توێژکارییەکی ئەوتۆ نەکراوه.

سوپای سۆڤییەت بیروباوەڕی یەکسانی و کمونیستی له موکریاندا بڵاو کردۆتەوه، بووه به هۆی وەی که هوردەبۆرژوای تازەپێگەیشتووی کورد وەخۆ کەوێ و دەست بداته جموجووڵ و بیری کوردایەتیش وەک چەکێک بگرێته دەست، بەڵام سەرەڕای وەی که بیری کوردایەتی له ژێر تیشکی باوەڕی کمونیستیدا ژیابۆوه، وه جموجووڵ کەوتبوو، هوردەبۆرژوای کورد نەیدەوێرا ڕاستەوخۆ پاڵ وه باوەڕی کمونیزم بدا و تەنانەت زۆر جاریش حاشای لێ دەکرد، له

گۆڤاری نیشتمان ئۆرگانی ژ.ک دا، پێڕەویکردن لەم بیر و حاشاکردن لەم وشەیە بە جوانی دەردەکەوێ، پێم وایە ئەویش چەند هۆی سەرەکی هەبووە، کە لە لایەکەوە موکریان لەو کاتەدا لە ژێر بارودۆخی دەرەبەگایەتیدا بوو و نەدەکرا حیزب و کۆمەڵەیەک لەو زروفە تایبەتییەدا نەیاری چینی دەرەبەگ و فیۆداڵ بێ و تەنانەت ژ.ک لە گۆڤاری نیشتمان و نامیلکەکانی کە لە «لاجان» بڵاوی دەکردنەوە دڵنەوازشی لە ئاغاواتەکان دەکرد. لە لایەکی دیکەوە شێخ و مەلا وەک چینێکی سەرەکی خاوەن دەسەڵات لە موکریاندا دەوریان دەگێڕا، بەرژەوەندی وان لەگەڵ باوەڕی یەکسانی و کمونیستیدا و بەتایبەت وشەی کمونیستدا هەرگیز ڕێک نەدەکەوت و ئاویان بە جۆگەیەکدا نەدەڕۆیی. لەو کاتەدا شێخ بە دەگمەن و مەلا بەتایبەتی، بەتەنیا چینی خوێندەوار و ڕووناکبیری کوردستان بە گشتی و موکریان بەتایبەت دەژمێردران. ئەوان هەر تەنیا پیاوی ئاینی نەبوون بۆ کۆمەڵگای کوردەواری، بەڵکوو سەدەیەک بەرەوە ئەوان ڕێبەرایەتی زۆربەی هەرە زۆری جووڵانەوەکانی کوردستانیش بوون و زۆر جار دژی حاکمەکانی تاران و پاشاکانی تورک ڕاپەڕیون و سەرۆکایەتی گوندی و دێهاتییان وەئەستۆ گرتبوو، خاوەنی دەسەڵاتێکی سەرەکی بوون و تەنانەت پاش و پێش هەر دوو شەڕی نێوگەلان سەرۆکایەتی جووڵانەوەی بیری کوردایەتی هەر لەسەر شانی شێخ و مەلاکانی کوردستان بوو.

وەک گوتم شێخ و مەلا نەک هەر تەنیا پیاوی ئاینی بوون بەڵکو چینی خوێندەواریش بوون و زۆربەی هەرە زۆری شاعیرەکانی کوردستان و بەتایبەت موکریانیش هەر لەم چین و توێژە هەڵکەوتبوون و تەنانەت بەشێکی سەرەکی پێکهێنەران و لایەنگرانی "ژ.ک"یش وەک خوداڵێخۆشبوو عەبدولڕەحمان زەبیحی، مەلا قادر مودەڕیسی، هەژار، هێمن، خاڵەمین، مام هەباسی حەقیقی، سەیید کامیل، حاجی ڕەحمان ئێلخانی و... هەموویان یان ڕاستەوخۆ مەلا بوون یان لە قوتابخانەی مەلایەتیدا گووڕابوون و شاگردی ئەم مەکتەبە بوون. جا لەم ڕووەوە "ژ.ک" کە ئاڵاهەڵگری بیری کوردایەتی لە موکریاندا بوو لە لایەکەوە پێی خۆش بوو کە پێڕەوی لە باوەڕی کمونیزم بکا و لە لایەکی ترەوە لەبەر ئەو دوو هۆ سەرەکییەی کە باسمان کرد ڕاستەوخۆ نەیدەوێرا توخنی کەوێ، یان لانیکەم لە بیچمی زاهیر و ئاشکرادا لایەنگریی لێ بکا، بەڵام لە هەموو ژمارەکانی گۆڤاری نیشتماندا وتاری جۆربەجۆری سەبارەت بە سۆڤییەت و سەرۆکانی کمۆنیزمدا تێدایە و کاتێ ئینسان دەیخوێنێتەوە لایەنگریی ئەم کۆمەڵەیەی لە سۆڤییەت بۆ دەردەکەوێ، بەڵام ڕاستەوخۆش حاشا لە کمۆنیزم و ئەم قوتابخانەیە دەکا.

کاتێ "ژ.ک" هەڵدەوەشێتەوە بە گشتی دەباڵ حیزبی دێموکراتدا نوقم دەبێ و گۆڤاری کوردستان ئۆرگانی کۆمیتەی ناوەندی "حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران" بڵاو دەبێتەوە.

پێم وایه هەر لەبەر ئەو دوو هۆ سەرەکییە واتە "دەرەبەگایەتی و دەسەڵاتی پیاوانی ئاینی" گۆڤاری کوردستانیش سەرەڕای لایەنگری لە سۆڤییەت و چاپکردنی وێنەی لێنین لە ژمارەی یەکەمی خۆیدا، ناوێرێ ڕاستەوخۆ خۆی لە قەرەی قوتابخانەی کمۆنیزم بدا، بەڵام بیری کوردایەتی وەک دروشمێکی سەرەکی دەبێتە تێئۆری ئەم حیزبە و لەم ڕێگایەشدا خەبات دەکاو بۆ هەوەڵین جار لە مێژووی کوردستاندا کۆماری کوردستان و دەوڵەتی میللی کورد لە موکریان دا پێک دێنێ، سەرۆکایەتی کۆمار و دەوڵەتی میللی کورد لەسەر شانی چینی دەرەبەگ و پیاوانی ئاینی و هوردەبۆرژوای موکریانە و گوندی و چینی ڕەنجبەری شار و دێ لە دەوریان هالاون و پێکهێنەرانی هێزی پێشمەرگە و وردەکاربەدەستی تری دەوڵەتی میللی کورد و کۆماری کوردستانن.

بلاوکراوەکانی حیزب باوەڕ و بیری کوردایەتی گەشە پێدەدەن و بارودۆخی ئێران و کوردستان زرووفێک دەڕەخسێنێ کە لە موکریاندا مەدرەسە و قوتابخانە لەسەر شێوەی نوێ پەرەی پێدەدرێ و کوڕ و کچ ڕوو دەکەنە قوتابخانە و خوێندەواری کە هەتا دوێنێ پاوان و ئینحسارەن مافی کوڕی دەرەبەگ و پیاوانی ئاینی بوو دەکەوێتە کۆشی هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگای موکریان و ئەمجارە تەنانەت کچیش هەقی هەیە بخوێنێ و لە کوڕ جێ نەمێنێ.

شاگردانی ئەم قۆناغە بیروباوەڕێکی تیژتری کوردایەتییان هەیە و سەرەڕای لایەنگری لەم بیرە، ژێرخانی فکریشیان پێویستە. ئەم بەرەیە و تازە پێگەییوانە ڕاستەوخۆ خۆ لە قەرەی کمۆنیزم دەدەن.

لە دەورانی حکوومەتی میللی دوکتۆر محەممەد موسەدیقدا، ئەم چین و بەرە تازەپێگەیشتووانەی کورد کە لە موکریاندا بە لایەنگرانی حیزبی تودەی ئێران دەناسران، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم نەوە نوێیەی کورد لە لایەکەوە لایەنگرییان لە بیری کمۆنیزم دەکرد و لە لایەکی دیکەوە هۆگری بیروباوەڕی کوردایەتی بوون، بەڵام هێشتا سەرۆکایەتی کلاسیکی حیزبی دێموکرات ڕاستەوخۆ نەیدەوێرا خۆ لە قەرەی کمۆنیزم بدا، هەر ئەوەیە کە لە دەورانی حکوومەتی میللی دوکتۆر موسەدیقدا کە ئازادی هەیە و باڵی نەشکاوە، حیزبی دێموکرات بە سەرۆکایەتی نوێیەوە دەبێتە هاوپەیمانی حیزبی تودەی ئێران و کادرەکانی کارئازمودەتر دەبن، بە چەشنێ ڕاستەوخۆ لە جووڵانەوەی جوتیارانی چۆمی مەجیدخان کە دژی دەرەبەگایەتی ڕاپەڕیون لایەنگری دەکا و سەرۆکایەتی ئەم جووڵانەوەیە وەئەستۆی خۆی دەگرێ.

بەڵێ ئەوجار کاک سوارە یەکێکە لە شاگردان و پەروەردەی ئەم زرووف و قۆناغەیە و کەوتۆتە ژێر بار و تیشکی کوردایەتییەکی نوێخوازانە و ناسیونالیستانە، ئەگەر چی لە

بنەماڵەیەکی دەرەبەگدا چاو دەکاتەوە، بەڵام تێکەڵ هۆردووی وردەبۆرژوای ڕووناکبیری کورد لە ژێر تیشکی کوردایەتی ناسیونالیستانە دەبێ و پاشان ئەم بیر و ئەندێشەیە لە تەواوی ئاسار و شوێنەوارەکانیدا خۆی دەنوێنێ.

هەر لەم ڕێبازەوەیە کە شیعری جوان و پاراوی "دووی ڕێبەندان" دادەنێ و لەم پارچە هۆنراوەدا کاک سوارە پەسەند و ستایەشی بیری کوردایەتی ناسیونالیستی کورد و پێشەوا قازی محەممەد و کۆماری کوردستان و دەوڵەتی میللیی کورد دەکا.

پاش ڕووخانی حکوومەتی میللی دوکتۆر موسەدیق ئاڵوگۆڕێکی گرینگ بە سەر بارودۆخی ئێران و کوردستاندا دێ و ئەم ئاڵوگۆڕە، موکریانیش دەگرێتەوە و هەموو چەشنە جووڵانەوەیەکی سیاسی و ڕامیاری لە سەراسەری وڵاتدا قەدەغە دەکرێ و جموجۆڵی سیاسی لە نهێنیدا پەرە دەستێنێ و بۆ بەرگری لەم پەرەسەندنی بارودۆخی ڕامیارییە لە وڵاتدا، ساواک، پۆلیسی تایبەتی ڕژیم، پێکدێ و بە قەولی خۆیان لە ترسی نەفووزی شووڕەوی لە ئێراندا، ئەمریکا ڕاستەوخۆ دەست لە کاروباری ئێران وەردەدا و لەم بارەوە ئامریکاییەکان بە عەناوینی جۆربەجۆر بە کوردستانیشدا بڵاو دەبنەوە،بەڵام سەرەڕای ئەم زەبروزەنگەی ڕژیم، جموجۆڵی سیاسی لە کوردستاندا و بەتایبەتی لە موکریاندا لە ئارادایە و حیزبی دێموکرات وەک تەنیا ڕێکخراوی سیاسی لە کوردستاندایە و بەرەیەکی نوێخواز لە لاوانی کورد دێنە مەیدانی خەباتەوە.

لاوان و گەنجانی کورد سەر لە زانستگاکانی تاران و تەورێز دەردێنن و لە زانستگەکاندا بە وەزعێکی بەربڵاوتر و زانستی تر لەگەڵ بیروباوەڕی قوتابخانەی سۆسیالیزم و کمونیزم ئاشنا دەبن، ئەوان ئیدی کەمتر گوێ دەدەنە سەرکردایەتی کلاسیکی کورد و چەند کۆڕ و کۆمەڵی مارکسیستیانە دەگوورێن،بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئێستا حیزبی دێموکرات بە باوەڕی ناسیونالیستانەیەوە وەک ئاڵاهەڵگری بیری کوردایەتی لە ئارادایە.

لە کوردستانی عێراق پاش ڕووخانی ڕژێمی شایەتی و هاتنە گۆڕی کۆماری عێراق و گەڕانەوەی سەرکردەی کورد، مەلا مستەفا بارزانی، جارێکی تر شەڕ بۆ بەدەستهێنانی مافی کورد دەست پێدەکاتەوە. زۆربەی کادرەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانیش لەم خەباتە چەکدارانەدا بەشداری دەکەن و ڕژێمی ئێران خۆی لە جووڵانەوەی کورد هەڵدەقوتێنێ و یارمەتیی ڕووکارانەی جووڵانەوە دەدا، کادر و ئەندامانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دەکەونە بەر مەترسییەوە، دووبەرەکی لە نێوان سەرکردایەتی پێکدێ و قۆڵی لایەنی چەپیان دەگەڕێنەوە کوردستانی ئێران و نزیکەی دوو ساڵان لە کەژ و چیاکانی کوردستان و بەتایبەتی موکریاندا دەژین و دەست دەدەنە شەڕی پارتیزانی. سوارەش وەک ڕووناکبیرێکی

کورد پەیوەندی لەگەڵیان هەیە و لە نووسراوەکانیدا یادی ئەو قارەمانانە دەکا و تەنانەت لە شیعری «تۆ دەریامی» زۆر بە توندوتیژی پەلاماریش دەکاتە سەر حیزبی بەعسی عێراق و لە چیرۆکی "خاڵەی ڕێبوار"دا ڕێز لەو پارتیزانانە دەگرێ و لە نەهێنیدا پەلامار دەباتە سەر ئەمریکا و ڕژێمی ئێران و ساویلکە خۆماڵییەکانی کوردستان. ئەم جموجووڵەش سەرەنجام بە چەندین هۆوە تووشی نوشست دەبێ، بەڵام دەبێتە هۆی دەستاوەردێکی گرینگ بۆ ڕێبوارانی ڕێگای خەبات.

ئێران بە پەلە بەرەو قۆناخی سەرمایەداری کۆمپرادۆر دەڕواتە پێشەوە و نوێنگەکانی ئەم سیستیمە لە موکریاندا خۆ دەنوێنن و فەرهەنگی بێسەروبەری ڕۆژئاوا بەسەر هەموو کاروباری وڵاتدا زاڵ دەبێ، سەرەڕای ئەوەش قوتابخانە و مەدرەسە و زانستگە ژمارەیان زۆر دەبێ و کۆمەڵێکی هەراوتر لە لاوان و گەنجانی کورد خۆ دەکوتنە فێرگە جۆربەجۆرەکانی خوێندن بە چەشنێ کە ژمارەی خوێندکاران لە پلەی بەرزدا لە ئەژماربەدەر دەبێ، لە کاتێکا لە دەورانی حکوومەتی میللی کوردستاندا گۆیا تەنیا یەک نەفەر لیسانسی هەبووە،بەڵام سوارەو هەزاران سوارەی دی خوێندنی بەرز تەواو دەکەن و بیروباوەڕی زانستی فێر دەبن و کۆڕ و کۆمەڵی سۆسیالستانە و مارکسییانە پێکدێنن کە پاشان زۆربەی ئەم کۆڕ و کۆمەڵانە لە "کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران"دا یەک دەگرن، بەڵام سوارە کردەوەی ئەم کۆڕ و کۆمەڵانە نابینێ و لە ١٣٥٤/١٠/٢٤ دا چاو لە سەر یەک دادەنێ و بە وەزعێکی گوماناوییەوە دەمرێ.

ئەمە بە کورتی بارودۆخی ئێران و کوردستان بوو کە سوارەی تێدا ژیابوو و لەم بارودۆخە ئیلهام و کەڵکی وەرگرتبوو بۆ شیعر و نووسراوەکانی، ئەمما ئەوەی کە هەتا ئێستا سەبارەت بە سوارە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی کوردستان و دەرەوەدا نووسراون و بڵاو کراونەوە هەر تەنیا سوارەیان وەک شاعیرێکی کورد ناساندووە، لە حاڵێکا نە سوارە هەر تەنیا شاعیرێکی باش و پێشڕەو بوو بەڵکو نووسەرێکی خامەڕەنگین و بێهاوتاش بووە کە دەرد و ڕەنجی کۆمەڵ و کۆمەڵگای خۆی بە باشی ناسیوە و لەم دەرد و ڕەنجانە لە شوێنەوارەکانیدا دواوە: "ئەگەر هەموو خەڵکی وڵاتەکەم تێروتەسەل و دڵخۆش بن هیچ خەمم نییە"[1] لێرەدایە کە بیروباوەڕی بەرزی سوارە سەبارەت بە کۆمەڵگاکەی وەدەر دەکەوێ و خەمی خۆی نییە و خەمی هەژاران و ڕەنجدەرانی وڵاتەکەیەتی: "دێتەوە بیرم کە پیرێژنێک لەو پەڕی وڵات خەمبارە، یا لاوێک لە گۆشەیەکی ترا زوڵمی لێ دەکرێ مێشکم داغ دەبێ"[2] ئەمە لە کاتێکدایە کە وڵاتی ئێران بە گشتی و کوردستان بەتایبەتی بە وڵاتانی سەرمایەدارییەوە لکاوە و شا لە زوڕنای "بسوی تمدن بزرگ" دەدا،بەڵام ڕاستییەکەی شتێکی ترە.

هەژاری، بێ کـاری، بێنانی و ....، بەشی زۆربەی هەرە زۆری چین و توێژەکـانی ئێـرانە و تاقمێک لە هەمـوو مـافێکی ژیان بەرخوردارن. سوارە دە فکری ئەم تاقـمەدا نییـە، خەم بۆ زۆربەی هەرە زۆری کۆمـەڵی کۆمـەڵگای ئێران دەخوا کە بۆ نانی شـەوێ موحتـاجن و ئەگەر نانیـان هەیە دۆیان نییـە و ئەگەر دۆیان هەیە نانیـان نییـە و بەوپەڕی دڵسـۆزییـەوە دەخەمی گەلو کۆمەڵانی هاوولاتیـدایە و بە گڕ بووق و کەڕەنای شایەتیدا دەچێتەوە: "بە کۆڵانێکا تێنەپەڕم و ئەمدی نەخۆش و دەردەدار کەوتوون بۆ پارەیەکی کەم، بەشی ئەوەندە کە نانێکی پێ بکڕن دەسـتیـان گرتۆتەوە،لەشم ئەلەرزێ"[٣] سوارە ئەوەی لە کاتێکا بە چروچاوی ڕژێی شـایەتیـدا کـوتاوە کـە بەداخـەوە زۆر کـەس لە شـاعیـران و نووسـەران بە بەژن و بالای"تمدن بزرگ"یاندا هەڵدەگوت و لە پیک و مـاپییکیـان دەدا کە لە ئێـراندا برسـییـەتی و بێ کـاری فـەوتاوە، بەلام سـوارە نەدۆڕاوە و بە بیـرێکی جوانـەوە دەڕوانێـتـە کـۆمـەڵگاکـەی و هەمـوو شتێکی هەر بۆ خەڵک و کۆمەلانی خەڵک دەوێ.

"برای خۆشـەویستم هیـوادارم بزانـی وەزیفـەت چەند گرینگ و ئەرکی سـەرشانت چەند گرانە، لەوڕۆبەدوا هەمـوو کات و سـاتی ژیانت هی خەڵکە، ئەگەر ڕۆژێک لە پێناوی گەلدا نەبێ، ئەو ڕۆژە لە ژیانت بە فـیـڕۆ چووە. هەناسـە کـێـشـانت، ڕێگا ڕۆیشـتـنت، دوانت، بە کورتی هەموو شتێکت دەبێ سوودێکی کۆمەڵی تێدا بێ"[٤] دە فکری کۆمەڵدا بوون و هەموو شتێ بۆ کۆمەڵ ویسـتن پیشـەی سوارە بووە: "هەر شتێ بۆ کۆمەڵی ئادەمیزاد باش بێ ئەوە جوانە"[٥].

سوارە تەنیا و تەنیـا دە فکری کۆمەڵگای کورددا نییە، هەمـوو شتێکی بۆ هەمـوو کەس دەوێ و دژی چەند بەرەکی و دوژمنکارییە" پیاو ئەتوانێ کارێ بکا کە دوژمنی نەبێ و هەموو کەس خـۆشـیـیـان بوێ"[٦] دوژمنایەتی و نەیاری بە سـوود و قـازانجی کـۆمـەڵ نییـە و دوژمن کەلکی لێ وەردەگرن. سوارە ئامۆژگاریی چین و کۆمەلانی خەڵک دەکا کە تۆوی دوژمنایەتیو نەیاری لەبەین بەرن و کارێ بکەن کەس دوژمنی کەسی تر نەبێ و هەموو یەکتریان خۆش بوێ و ئەم پەند و ئامۆژگارییە کاتێ دەکا کە لە کۆمـەڵگای ئێراندا، ڕژێی سەر بە ئیمپریالیزمی جیهانیی شا، بە هەموو بیـر و توانایەوە تێدەکۆشا تۆوی دووبەرەکی و دوژمنایەتی لـە نێوان گەلانی ئێراندا بلاو کاتەوە و وەزعێکی وا پێکبێنێ کەس باوەڕ بە کەس نەکا تا خۆیان لە ئاوی قوڕاو ماسی بگرن و بە کەیفی خۆیان دەسڕەنجی زەحمەتکێشان و داهاتی وڵات بخۆن و لە سایەی کار و تێکۆشانی کرێکاران و ڕەنجبەرانی ئێران کۆشک و تەلاری ڕەنگاوڕەنگ ساز کەن و لە ئەورووپا و ئەمریکا خەریکی کەیفونەهەنگی خۆیان بن.

سوارە سـەرەڕای زیندان و ئەشکەنجـە و ئازارێکی کـە لەسەر کوردایەتی و مرۆڤویستی

دیبووی دیسان دەستی لە دژایەتی لەگەڵ ڕژیم هەڵنەگرت و ڕێنیشاندەرە و لە نووسراوەکانیدا بە ئاشکرا و نەهێنی، ئەم دژایەتییە دەردەبڕێ و لایەنگری لە کۆمەڵانی خەڵک دەکا و "هەر شتێ بۆ کۆمەڵی ئادەمیزاد باش بێ"[٧] ئەو بە "جوانی" دەزانێ و مرۆڤی خۆش دەوێ و هەموو شتێکی جوان و باشی بۆ کۆمەڵ دەوێ و کۆمەڵیش بە لای "منەوە بەو کەمایەتییە ناڵێن کە سوودێکیان هەیە و جیا لە سوودی گشتی هونەرێکیان هەیە بەپێچەوانەی هونەری کۆمەڵ چینی پێکهێنەر واتە ئەو کەسانەی کە زۆربەن و هەمیشە ڕوویان لە ژیانی مرۆڤایەتی و بەرزکردنەوەی پلەوپایەی ژیانی ئینسانییە، بە لێکدانەوەی من کۆمەڵ بە وان ئەگوترێ. ئەوانن خەمیان وەک تەمومژی سەر چیا و شادییان چەشنی پێکەنینی هەوەڵ زەردەی خۆرەتاوە، ئەوانن کە هونەریان ئێسک سووکە و لە دڵ نزیکە و خوێن شیرینە"[٨].

لایەنگری لە چینی هەژار و ڕەنجدەر لە زۆربەی شوێنەوارەکانی سوارەدا خۆ دەنوێنێ و لایەنگرییان لێ دەکرێ و بە هونەرە جوانەکانیان هەڵدەڵێ، ئەوەش لە سەردەمێکدایە کە سوارە پارێزگاری لە مافی ئەم چینە دەکا کە لە کوردستاندا کەمتر کەس دەیوێرا توخنی شتی وەها کەوێ، بەڵام سوارە "کۆمەڵ لەسەر ڕێگای ڕاستە و هەرچی لە نێو کۆمەڵەوە هەستێ و باس‌و خواس و ویستی کۆمەڵ بکا جوانە ئەوەی بە هەڵە دەچێ تاکە و کۆمەڵ کەم وا هەیە ڕێگای چەوت بگرێتە بەر"[٩] دەزانێ، ئەوەی بە هەڵە دەچێ تاکە و بێ گومان ئەم "تاکە"ش ئەو کات زۆر کەسی دەگرتەوە و لە سەرەوەی هەمووان شا بوو کە خۆی بە دەمڕاستی دەمڕاستان دەزانی و کۆمەڵ و چینی پێکهێنەری کۆمەڵی هەر بە مرۆڤیش حیساب نەدەکرد.

سوارە ڕێگاچارە بە خەبات و بەربەرەکانی دەزانێ و ڕێنوێنی کۆمەڵ دەکا "ئێمە ئەگەر مل بۆ زۆردار دادەنوێنین مردووین و ژیانی بێ سەربەستی وەک لەشی بێگیان وایە"[١٠] کۆمەڵ دەبێ بۆ سەربەستی و ئازادی خەبات بکا و تێکۆشێ و کەڵە و تۆوی دووبەرەکی وەلانێ و خۆیان ببنە خاوەن ماف و هەقی ڕەوای خۆیان وەدەست بێنن "دەکرێ باشتر بین، بەڵام نەک هەر کەس لەبەرخۆیەوە، بەڵکو هەموو بەیەکەوە، ئەگەر دە کەس دەست بگرن بە دەستی یەکەوە، با هیچ کامیان مەلەش نەزانن دەتوانن لە چۆمێک بپەڕنەوە، چۆمەکە ڕایان نادا، چونکە ئیتر ناترسن و بە یەکتر پشت ئەستوورن"[١١] بۆ سەربەستی و ژیانی باشتر دەبێ دوژمن لەنێو بچێ "دوژمنی ئێمە لەنێو هەناوی خۆماندا دەژی. دوژمنی ئێمە ترس و خۆپارێزییە، ئەبێ حەول بدەین، لە پێشدا دوژمنی نێو دڵی خۆمان بکوژین"[١٢]. کاتێ ئەمن‌و تۆ دەبین بە ئێمە و خۆپارێزی وەلانرێ کۆمەڵ دێتە سەر ڕێگای ڕاست و بە خەبات دەتوانێ مافی ڕەوای خۆی بە دەست بێنێ "ئەمڕۆ ڕۆژێکە کە دەبێ بە گیان و دڵ تێکۆشین، وڵات لەم کەمتیارانە و چەقەڵانە پاک کەینەوە"[١٣] چەقەڵ و کەمتیارێک کە سوارە لێیان

دەدوێ چینی دەسەڵاتداری ئێران لە دەورەی شادایە و کۆمەڵێکی کە "هەمووتان ڕۆڵە کوژراوو برا سەربڕاو و ماڵ سووتاون"، خەڵک و گەلانی ئێرانن و هانیان دەدا کە دەبێ خەبات و بەربەرەکانی بکەن چونکە "ساڵهایە... وڵاتی ئێمە داگیر کراوە، بێگانە بە سەرمانا زاڵ بووە، ساڵهایە کە بزەیەک نەهاتۆتە سەر لێومان، هەمیشە ترساوین دەستە دەستە بڕۆینە بەر تیغی سەربڕ و خوێنی ئاڵی لاوەکانمان ڕژاوە"[١٤] و زیندانەکانی دەورانی شایەتی ئێران شاهیدێکی باشن بۆ قسەکانی سوارە و هەزاران ئێرانی و کوردیان تێدا کۆت و زنجیر کرا و بە سەدان کەسیان تێدا شەهید کرا. بەتایبەتی پاش تێکچوونی کۆماری کوردستان و ڕووخانی حکوومەتی میللی دوکتۆر موسەدیق و تێکشکانی جووڵانەوەی ساڵەکانی ٤٧ ـ ١٣٤٦ی کوردستان بە هەزاران کورد گیران و کەوتنە بەر ئەشکەنجە و ئازار و لە سێدارە دران و تیرباران کران. ئێستاش خوێنی لاوانی کورد و سەرۆک کۆمار قازی محەممەد و هاوالانی لە چوارچرای مەهاباد هەر دەهاژێ و خوێن لە جۆگەکانی بێ دادگای جەلدیاندا بە گۆلاوە، بەلام سەرەڕای ئەو هەموو خوێنڕژان و کەللەپژانە کوورەی خەبات هەر دەگاڵێنێ و مرۆڤی کورد "ئێوە شەڕتان زۆر دیوە بریندار و کوژراوتان زۆر چاو پێکەوتووە، هەرگیز ورەتان بەرنەداوە"[١٥] و بێ ورەبەردان دەبێ تا گەیشتن بە ئامانجی کورد خەبات بکرێ و نابێ لە مردن بترسن "مردن ئەوە نییە کە گیان لە لەش بچێتە دەر، ئەوە مردنە کە هەستی پیاوەتی و تۆڵە نەمێنێ"[١٦]. گەل لەسەر تۆڵە سەندنەوەی خوێنی سووری شەهیدانە و بە کردەوەش گەلانی ئێران ئەمەیان نیشان دا و بە گژ حکوومەتی سەرەڕۆی پەهلەویدا چوونەوە و تەسلیم نەبوون "گەل تەسلیم نەبووە، چاوەڕوانی دەستێکی ئاڵاهەڵگرە"[١٧] و ئەو دەستەش دەستی پۆڵایینی کرێکاران و جووتیارانە کە نەترسترین چینی کۆمەڵگای ئێران و کوردستانن.

"دەستێکی کە ئاڵای شۆڕش و خەباتیش هەڵگرێ نابێ بترسێ و لە مەرگ باکی هەبێ، فیدای ڕێگای ئازادی هەرگیز نامرێ، ئەگەر ئەمڕۆ ڕواڵەتی لە پێش چاومان لاچووە لەنێو دڵماندا ئەژی"[١٨] و شەهیدانی ڕێگای نیشتمان هەرگیز نامرن و "مەرگ لە بەرامبەر ویستی پیاوانەوە پەست دەبێ، مەرگ هی ئەو کەسانەیە کە هیوای ژیانیان نامێنێ و مل بۆ مردن کەچ دەکەن"[١٩]. سوارەی شۆڕەسواری قوتابخانەی بیری کوردایەتی موکریان لەسەر ئەم باوەڕە پاکەیە کە "ئەگەر شەرەف نەما، گیان بە کاری چی دێ، ئەگەر یەکیەتی نەما، ئەگەر بیری پاراستنی دۆست نەما، باشترە گیانیش نەمێنێ"[٢٠] سوارە بە گژ ساویلکەی بیرکورتی کۆمەڵدا دەچێتەوە کە هەموو کاروبارێک تەنیا بە قەزا و قەدەری ئاسمان دەزانن و لە بەرامبەر تەنگ و چەڵەمە و چەوسانەوە و مافخوراویدا دەست لەسەر ئەژنۆ دادەنێن و ڕوو لە ئاسمان دەکەن و دەیانەوێ بە پاڕانەوە و لالانەوە بەلای چەوسێنەر و وڵات داگیرکەر

لە بەین بەرن "ئەوان لایان وایە ئەم دەردە نەبێ هەر دەبێ، بەرگێکی ئەبەدییە و بە بەژنی وان براوە، وا ئەزانن کە ئەم بەشە لە ئاسمانەوە هاتۆتە خوار بۆ وان و کاری ئاسمانیش هیچی لەگەڵ ناکرێ".[٢١]

سوارە ئەمجار ڕێگای ڕاست نیشان دەدا کە ڕاستییەکەی ئەوەیە کە "ئێمە لەسەرمانە ڕەسم و شوێنەواری باشی کۆن بپارێزین و ئەم داب و دەستوورانە کە بە کاری ئەمڕۆ نایەن لەبەین بەرین"[٢٢] چونکە لەسەر ئەم باوەڕە جوانەیە کە "ڕاسپێری ئادەمیزاد ڕووخاندنی باری نالەباری ژیانە و دامەزراندنی بناغەی جوانییە"[٢٣] و دامەزراندنی بناغەی جوانیش بێ خەبات و بەربەرەکانی لەگەڵ دێوەزمەی داگیرکەر و چەوسێنەر بەدی نایە و ئەرکی خەباتیش لەسەر شانی هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵە، "ئێستا وڵاتی ئێمە بۆنی خوێن دایگرتووە، لە هەموو لایەک لوورەی چەقەڵ و کەمتیار بەرز بۆتەوە".[٢٤]

ئینجا زۆر بە وردبینییەکی تایبەتییەوە، بارودۆخی ساڵەکانی ژیانی شی دەکاتەوە و وەزعی کۆمەڵگای ئێران و کوردستان دێنێتە بەرچاو "بیر بکەنەوە لە هەموو ئێراندا بنەماڵەیەک هەیە کوڕی نەکوژرابێ، یان تالان نەکرابێ و ماڵی نەسووتابێ!؟"[٢٥] و لەم ڕێبازەشدا ڕێگای چارە بۆ سەرکەوتن دەستنیشان دەکا و خەبات دژی حکوومەتی سەر بە ئیمپریالیزمی ئامریکا دەزانێ "هەر تەنیا پیاوی شەڕکەر بەس نییە پیاوی ژیر و بە ئاوەزیش پێویستە"[٢٦] و دەیەوێ چەک و قەڵەم وێک خا و شانبەشانی یەک دژی چەوسێنەر خەبات و بەربەرەکانی بکەن و "پاکی بەسەر پیسیدا سەرئەکەوێ، جا یا بە دەستی من یا پاش مردنی من بە دەستی کەسێکی تر کە هاواڵی منە"[٢٧] و ئەگەرچی "لە شەڕکردن بێزارم، شەڕ پەڵەیەکی ڕەشی مێژووی ئادەمیزادە،"[٢٨] بەڵام سەردرای وەش "تا دوژمن هەیە، تا کەسێک پەیدا نەبێ تەیار و وریا بێ"[٢٩] و بۆ گەلی کورد هیوایەکی گەورەی بە جووڵانەوەکەی هەیە کە ئەو کات و سەردەم لە کوردستانی عێراقدا بە سەرۆکایەتی بارزانی نەمر لە گۆڕێدا بوو "هیوام بە دوارۆژی شۆڕشی چیا زۆر بەتینە"[٣٠] و بۆ سەرکەوتنی ئەم شۆڕشە و هەموو خەبات و شۆڕشێک ڕێنوێنی دەکا و دەستێک بە تەنێ تەقەی نایە و تەنیا کۆمەڵانی گوندیو چەوساوەی شار ناتوانن ئاڵاهەڵگری سەرکەوتنی خەبات بن بەڵکو "ئەبێ خوێندەوار پێنووس بنێتە لاوە و دەست بداتە شمشێر"[٣١] و چەک و لە مەیدانی خەبات و بەربەرەکانی چەکدارانەدا بیسەلمێنن بەو "کەسانەی لایان وایە خوێندەوار و زانست لەگەڵ ئازایەتی نایەتەوە، نیشان بدەن بە هەڵە چوون، زانا و وێژەوان ڕاستە کە لاشەرن، بەڵام کاتێ شەڕ بەردەرگای پێگرتن بە گیان و دڵ بەشەڕ دێن، چونکە ئەوان بەپێچەوانەی کەسێک کە بە شەڕکردن خووی گرتووە، ئەزانن بۆچ بەشەڕ دێن و چ ئەپارێزن"[٣٢] و چینی خوێندەوار و

رووناکبیری کۆمەڵ باش ئەوە دەزانن کە "ژیان لە نێو کتێبا نییە، لە دەرەوەیە"[٣٣] و هاودەنگ لەگەڵ ڕەنجبەران و چەوساوەکانی کۆمەڵ دژی ڕژێم و حکوومەتی سەرەڕۆ و دژی میللی و کەڵەی دەربەگایەتی و ڕێوشوێنی نارەسەن ڕادەپەڕن، رووناکبیر لەسەر شانێتی کە بۆ چینی چەوساوەی روون کاتەوە "ئەو کارەی ئێمە دەیکەین شەکەتیی بۆ ئێمەیە و بەهرە و داهاتیش بۆ ئاغا و ئاغای ئاغایە"[٣٤] لێرەدا سوارە هەر تەنیا بە گژ حکوومەتی ملهوڕی شایەتیدا ناچێتەوە بەڵکو ملە لەگەڵ ئاغاکەی حکوومەتی شا واتە ئامریکا و هەموو وڵاتانی سەرمایەداری چەوسێنەر و داگیرکەر دەکا "لە بیرت چۆتەوە ئاغا زلەش حیساب کەی، ڕەنگە تۆ هەرگیز ڕواڵەتیت نەدیبێ، ئەو لە ئێمەوە زۆر دوورە، چەند دەریامان نێوانە"[٣٥].

بە توندی بە گژ فەرهەنگی ڕواڵەتگۆڕاوی بابردووی ڕۆژئاوایەوە دەچێ، فەرهەنگێکی بێ سەرەوبەرەی کە لە لایەن ڕژێمی شاوە پڕۆپاگەندەی بۆ دەکرێ بۆ وەی کۆمەڵانی خەڵک فریو دەن و دە خەوەکەرویشکەیان کەن. "ئەو تۆفانە کە لە پشت دەریاوە دێ باری نەگبەت هەڵئەڕێژێ و لە گولزاری شارا هەموو گوڵێکی قەتڵوعام کردووە، ئەم تۆفانە کە لەوپەڕی چەند دەریاوە دێ چی ئەهێنێ؟ نەگبەت، درۆ، گوڵی کاغەزی ـ تریا...؟ بەڵام چی دەبا؟ گوڵی گەشی پیاوەتی و ئەوینی بەڕاستی"[٣٦] بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ ئەم تۆفانە فەرهەنگییە نارەسەنە کە بەتایبەت لە شارا دەست ئەڕژێنێ و بیروباوەڕ و فکر لە ڕیشە دەردێنێ، کۆمەڵانی خەڵک و چەوساوەکان و خوێندەوارانی بۆ خەبات هان دەدا و بە ڕووناکبیری شار دەڵێ کە "دەست لە شارا ئەڕژێ، وەک خەنجەرێکی دەبان کە هەمیشە لە کالان دا بێ"[٣٧] و خەبات و بەربەرەکانیش هەر تەنیا بە قسە نابێ و کردەوەی پێویستە و شۆڕشگێڕ نابێ لە مەرگ بترسێ "زیندووی ترسەنۆک ڕۆژێ سەد جاران دەمرێ"[٣٨]، دیارە ئەم ڕاستیش دەردەخا کە ئادەمیزاد هەر ئەبێ بمرێ چ لەسەر کەل بێ و چ لەنێو ئاوایی، چ لە پاڵ ماڵ و منالیا، کە وایە، وا باشترە پیاو وەک گورگ بە شوێن خشپەوچرپەدا بچێ، نەک وەک کەو سەری بکاتە ژێر بەفرەوە بۆ ئەوەی هیچ نەبینێ"[٣٩] و لە کەژ و چیاکان و کۆڕی خەباتدا نیشان بدەن کە ڕۆڵەی ڕاستەقینەی کۆمەڵ و خەبات و ڕەنگی سوورن "وەک هەڵۆی بەرزەفڕی چیا، دڵم دەخوازێ باڵ بگرم و هەرد و هەور و نەوی بەجێ بهێڵم و لەو سەرەوە گاڵتە بە دێوەزمەی مەرگ بکەم و بڵێم دیتت، دیتت ئەی مەرگ تەنانەت تۆشم بەزاند"[٤٠] بەم چەشنە، سوارە بەڕاستی لە ژیانی کورتیدا گاڵتەی بە مەرگ کرد و ژیانی بە "قۆناغێکی کەمخایەن و کورت لە نێوان دوو نەبوونی درێژ و بێبەستێنا"[٤١] زانی و وەک هەڵۆی بەرزەفڕی چیا کەم ژیا، بەڵام جوان ژیا، ژیانی کەمخایەنی سوارە لە باری ئەوین و دڵداریشەوە خۆی عالەمێکی هەیەو داستانێکی دوورودرێژە. سەرەڕای ئەو هەموو بیروباوەڕە کوردانەی کە هەیبوو، کە

وەک شەم بۆ کورد دایسا و لە کوردایەتییا دامرکا، بەڵان لە ژیانی کەسیی و تایبەتی خۆیدا تووشی بە تووشی ئەوینێکی کوردانە و کچەکوردێک نەهات. کچێکی ئازەری دڵی هەستاند و بووە دایکی بابەکی کوڕی و زۆریش تێکۆشا ڕوقیای ئازەری بکاتە ڕووناکیی کوردی، بەڵام گیا "لەسەر پنجی خۆی دەڕوێ" و بەپێچەوانەی ئەوە تەقەلایەکی بێ سوودە و کاتێ زێد و گوندی خۆی بەجێ هێشت و بۆ خوێندن ڕووی کردە تاران یان بە گوتەی خۆی "پەروەردەی چیا و کەژم، بۆ ماوەی هەشت ساڵ هاتمە شار تا خوێندنی زانستگەم تەواو کەم، لە شارا کەوتبوومە شوێن ئەوینێکی وەک کابرای ڕاوچی بە تۆڕەوە چەندەی ماسی گرت منیش هەر ئەوەندەم بە چەنگ هێنا"[٤٢] لە تاراندا گیرۆدەی زولفی ئەگریجەخاوێکی، چاوڕەشی ئێسک سووکی لەبەردڵان و لە دەستان خۆشیی فارس دەبێ و یەک دڵ نا سەد دڵ ئاشقی دەبێ، عیشقێک کە بوو بە هۆی لۆمە و تانووتی دۆستان و ئاشنایانی، بەڵام چ بکا، شاعیرە و ئاشق بووە. ئەوینی خودایی سوارە پیادەیە و ئەوینی کچی ڕوو هەڵماڵدراوی تارانی سوارە و قەت بەیەک نەگەین و لەم عیشقەدا سەرنەکەوت و شوێنی ئەم ناکامییە لە زۆربەی نووسراوەکانی ئەم دەورانە عاشقیەتییەدا بەرچاو دەکەون "ئەوینی ڕواڵەت گۆڕاوی شار و دووکەڵ و هەڵمی بەیان و ئێوارە وەک شەرای مەرگ شاریان داپۆشیبوو، تاراندمی"[٤٣] و "وەک کەسێک بیهەوێ لە گۆلاوێکی لیخندا ماسی ئاڵووالا بگرێ، من لە نێو لێڵاوی شاردا کەوتبوومە شوێن ئەوینێکی گەش[٤٤] و پێی وایە "لام وابوو کە ئەوین وەک دەسەڵات وایە کە بکرێ بەزۆر بەدەستی بهێنێ"[٤٥] ئەمجارە ڕاستەقینە قبووڵ دەکا "ئەمن ئەویندارم، بەڵام ئەویندارێکی تێشکاو"[٤٦] و "گوڵی هەستی جوان لەنێو شۆرەکاتا ناڕوێ، ئەوینی بەڕاستیش لەنێو دڵێکا کە سەرێکی هەیە و هەزار سەودا پەروەردە نابێ،"[٤٧] بەڵام سەرەڕای تێشکاوی و بەپێچەوانەی واقعییەت و ڕاستەقینە، سوارە بەم ئەوینە وەفادار ما و لەگەڵ خۆی بردییە ژێر خاکەوە. زۆری پێ خۆش بوو، ڕۆژێک لە ڕۆژان لەگەڵ ئەم دڵبەرە چاوڕەشەی بگەڕێتەوە کوردستان و لە مێرگ و مەزرای گوندی قەرەگوێز و کووچە و شەقامەکانی شاری بۆکان و مەهاباددا بیگێڕێ و قسەی ئەویندارانەی بە گوێیا بچرپێنێ، بەڵام دێوەزمەی مەرگ مۆڵەتی نەدا بە زیندوویی سەر ئەم کارەی بکا خۆ مەرگیش ناتوانێ تاسە بتارێنێ.

سوارەی ڕەحمەتی زۆری پێ خۆش بوو پاش کۆتایی هاتنی خوێندنی بگەڕێتەوە بۆ یەکێک لە شارەکانی کوردستان و خزمەت بە هاوولاتیا نی بکا، بەڵام "کاتم وا بە دەرس خوێندنەوە گیرابوو کە نەمتوانی بگەڕێمەوە بۆ وڵات و دیسان لەگەڵ بەهاری سەوز و هەوای پاک و ئاسمانی پڕشنگدار و بەترووسکەی لادێ تێکەڵ بمەوە...، دڵم پارچەیەک بوو لە

بەیانی پڕ زەردەخەنەی ئاواییییە بچووکەکەمان کە لە باوەشی چیایەکی بەرزا ئارامی گرتبوو"[48] سوارە بەم ئاواتەی گەیی و پاش مردنی لە ١٣٥٤/١٠/٢٤ لە بیمارستانی میساقییەی تاران، تەرمەکەی گەڕاوە شاری بۆکان و لەگەڵ پێشوازییەکی مەزنی کۆمەڵانی خەڵک لە گۆڕستانی گوندی «حەمامییان» تەسلیم بە خاک کرا.

سوارە تا کاتێ مابوو، زۆر کەم شیعر و نووسراوەکانی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاوکرایەوە، ئەوەندەی ئەمن بزانم لەم گۆڤار و ڕۆژنامانەدا شوێنەواری سوارە بڵاو کراونەوە:

١) چەندین پارچە هەڵبەستی لە گۆڤاری کوردستاندا کە لە تاران دەردەچوو چاپ کراون.

٢) کورتە چیرۆکێکی بە فارسی بە ناوی "آهو ـ ئاسک" لە ڕۆژنامەی "خاک و خون"دا کە لە تاران دەردەچوو بڵاو بۆتەوە.

٣) هەڵبەستی بانگەوازی پەنجەرەی بە کوردی و فارسی لە گۆڤاری "خوشە" کە لە لایەن شاعیری پایەبەرزی ئێران «ئەحمەد شاملو»وە دەردەکرا، چاپ کراوە.

٤) شیعری "هەڵۆ هەر بەرزە"ی مامۆستا هەژاری وەرگێڕابووە سەر زمانی فارسی و ئەویش هەر لە گۆڤاری "خوشە"دا بە نازناوی "پ ـ ئەهورا" بە چاپ گەیاند.

٥) شیعری "تۆ دەریامی" لە ژمارە "١"ی گۆڤاری دیاری لاوان، کە لە لایەن یەکیەتی لاوانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقەوە دەردەکرا چاپ بووە.

٦) وتارێکی سەبارەت بە شاعیرێکی هەرمەنی نووسیبوو بڕیار بوو "ئەلک خاچاتوریان" بیکاتە ئەرمەنی و لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی ئەرمەنیدا چاپ کرێ. نازانم چی بە سەر هات، بەڵام نوسخە کوردییەکەی ئەم وتارە لە لای من هەیە.

پاش مەرگی سوارە، نووسراوە و شیعرەکانی ڕەنگێکی تریاندایە و زۆرتر چاپ کران، بەڵان پێم وایە هەتا ئێستا داستان و چیرۆکەکانی هیچ کامیان چاپ نەبوون و هیوامە هەموویان کۆکرێنەوە و خێرەومەندێکی کورد لە چاپیان بدا و ڕۆحی سوارەیان پێ شاد و کتێبخانەی کوردییان پێ بیووژێنێتەوە.

١ ـ چیرۆکی چاپ نەکراوی "ئافرەت"

٢ ـ هەر ئەو سەرچاوەیە

٣ ـ چیرۆکی ئافرەت

٤ ـ هەر ئەو سەرچاودیە

٥ ـ چیرۆکی چاپ نەکراوی "لاس و خەزاڵ"

٦ ـ هەر ئەو سەرچاوەیە

٧ ـ لاس و خەزاڵ

٨ ـ چیرۆکی چاپ نەکراوی "سەیدەوان"
٩ ـ هەر ئەو سەرچاوەیە
١٠ ـ چیرۆکی چاپ نەکراوی "چەکوش وەشێنی رۆڵە کوژراو"
١١ ـ چیرۆکی چاپ نەکراوی "خاڵەی رێبوار"
١٢ ـ چەکوش وەشێنی رۆڵەکوژراو
١٣ ـ هەر ئەو سەرچاوەیە
١٤ ـ هەر ئەو سەرچاوەیە
١٥ ـ لاس و خەزاڵ
١٦ ـ چەکوش وەشێنی رۆڵە کوژراو
١٧ ـ هەر ئەو چیرۆکە
١٨ ـ هەر ئەو سەرچاوەیە
١٩ ـ هەر ئەو چیرۆکە
٢٠ ـ لاس و خەزاڵ
٢١ ـ خاڵەی رێبوار
٢٢ ـ ئافرەت
٢٣ ـ چەکوش وەشێنی رۆڵە کوژراو
٢٤ و ٢٥ و ٢٦ ـ چەکوش وەشێنی رۆڵە کوژراو
٢٧ ـ هەر ئەو چیرۆکە
٢٨ ـ لاس و خەزاڵ
٢٩ ـ هەر ئەو چیرۆکە
٣٠ ـ چەکوش وەشێنی رۆڵە کوژراو
٣١ ـ لاس و خەزاڵ
٣٢ و ٣٣ ـ لاس و خەزاڵ
٣٤ و ٣٥ـ خاڵەی رێبوار
٣٦ـ زولاڵترین پێکەنین
٣٧ـ زولاڵترین پێکەنین
٣٨ ـ لاس و خەزاڵ
٣٩ ـ خاڵەی رێبوار
٤٠ ـ لاس و خەزاڵ

# ده ساڵ دوای کاک سواره

سەلاحەددین موهتەدی

لە ژمارەی یەکەمی "مامۆستای کورد"دا وێڕای بڵاوکردنەوەی شیعری "هەڵۆی بەرزەفڕ" بەڵێن درابوو کە لە ژمارەی دووهەمدا لێکدانەوە و لێدوانێک لە بارەی "سوارەی ئێلخانیزادە"وە پێشکەشی خوێنەران بکرێ و داواش لە من کرابوو کە ئەو ئەرکە بگرمە ئەستۆ و بەڵێنەکە بێنمە دی.

من زۆرم داوا لێ کراوە و لەمێژە بە تەمام لە سەر سوارە بنووسم: چەند ساڵ لەوە پێش، لە گۆڤاری "نووسەری کورد"دا کە لە کوردستانی ئازادکراو دەردەچوو لە سەر داوای نووسەرانی شۆڕشگێڕ، شیعری "خەوە بەردینە"م لەگەڵ پێشەکییەکی کورت ـ کە میوانێکی سەرقاڵی وەکو من لە سووکە سەفەرێکی سەرپێییدا لە دەستی دێ ـ بڵاو کردەوە. کورتە باسێک بوو لە سەر ئەدەبی شۆڕشگێڕانە و شیعری نوێی کوردی لە کوردستانی ئێران و گرێدرانی لەگەڵ خەباتی سیاسی و چینایەتی و سەرەنجام شوێن و شوێنەواری سوارە لەو گۆڕان و گۆڕینە گرینگەدا.

زۆر جاریش لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا لە سەری دواوم و هەر جار گۆشەیەکیم بەپێی توانا لێ شی کردۆتەوە، بەڵام بەداخەوە هەرگیز دەرفەتێکی وام دەست نەکەوتووە کە ماوەیەکی باش بە ئارامی و ئاسوودەیی دانیشم و خۆم بە تەواوی تەرخان کەم بۆ وەدیهێنانی ئەو ئارەزووە پیرۆزە خۆشەویستەم،........ .

گێڕسانەوە و حەسانەوەش تەنیا خەونی خۆش و خەیاڵی خاوی سەر پڕ سەودایە! وا ئێستاش "مامۆستای کورد" هەروەک "نووسەری کورد"ـماڵیان ئاوا ـ ناهێڵێ چیدی بە تەمای "کۆمەڵێکی ئازاد و کاتێکی ئارام" کارەکە وەدوا خەم و ناچارم دەکا بەرکولێک ـ هەر چەند بەکەموکووڕی و کاڵوکرچیش بێ ـ پێشکەشی خوێنەری خوێندەواری تامەزرۆی بکەم.

لە سوارە دوان بۆ من، وەبووژێنەوەی بیر و بۆنی تەمەنی سی و چەند ساڵ بە یەکەوە بوونی بەردەوامە کە لە یەکەمین ساڵەکانی ژیانمانەوە لەنێو یەک بنەماڵەدا دەستی پێکرد و بە کۆچی بێ وادەی سوارە لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٦ (ڕێبەندانی ١٣٥٤)دا دوایی پێهات.

لە خۆشاردنەوە و هەڵاتهەڵاتی منداڵانەڕا هەتا خۆشاردنەوە و هەڵاتهەڵاتی سیاسەت و کوردایەتی، لە بووکی جوانی کوردستان[١] ڕا هەتا شاری بەگرمە و دووکەڵ[٢] لە بەچۆکەوە دانیشتنی سەر بەڕەی قوتابخانە لە خزمەت مامۆستای پیاوچاکی چاویلکە شکاوی دڵسۆز و

توندە تەبیاتڕا هەتا سەر کورسی و پشت مێزی دارگوێزی فێرگەی حقووق لە زانکۆی تاران: چەند جار و چەند ساڵ پەککەوتن و تێهەڵچوونەوە، پێشمەرگایەتی من و گیرانی ئەو، گیرانی من و کڕ مانەوەی ئەو لە بەشی کوردی ڕادیۆی تاران و بەناچار لە توێی سەد پەردەی ڕەمز و ڕازدا پێداهەڵکوتن بە ئازادی و بەرابەری و بەختەوەری ئینسان!

تا دوا دیدارم لەگەڵ لەشی ساردەوەبوویدا لە مردووشۆرخانەی تاران و بەیەکەوە هاتنەوەمان بۆ کوردستانی تازیەبار و کۆبوونەوەی بێوێنەی جەماوەر و وتاری سیاسی و شیعر و شیعار و... سەرلەنوێ گیرانەوەی من هەر لە نێو مەجلیسی پرسە و سەرەخۆشیدا لە مەهابادی مەزن!

**من و مەجنوون لە مەکتەبخانەیی عیشقا دەرس خوێن بووین**
**ئەمن خەتمی کەلامم کرد لەوەللەیلا بەجێ ما ئەو!!**

سەرتاسەری ژیانی سوارە تراژیدی و کێشەیەکی بێپسانەوە بوو کە لەشی بیمار و دەردەداری لە دژی ئێش و ئازار و گیانی نائارام و بێقەراری لە دژی کۆت و پەیوەندی سیاسەت و ئەخلاقی سەردەم دەستیان دابوویە و سەرەنجام هەر تک "پاڵەوانەکە"ش تێکشکان!

سوارە لە دێی قەرەگوێز لە بیست کیلۆمەتری جنووبی شاری بۆکان لە ساڵی ١٩٣٧-١٣١٦ لە دایک بووە. هەر منداڵ بوو کە عیسمەت خانمی دایکی لە سەر منداڵ چوو، ئەحمەد ئاغای باوکیشی کە جاران دەوڵەمەند و دەست ڕۆیشتوو بوو لە سەرەتای هەرزەکاریی سوارەدا و زۆر پێش دەورەی ئیسلاحاتی ئەرزیی زەمانی شا، زۆربەی مڵکەکانی لە دەست بۆوە و دێیەکەی خۆی قەرەگوێزی بەجێ هێشت و ماڵی هاتە بۆکان.

هەر لەو سەروبەندە و لە سەرەتای هاوینی ساڵی ١٣٥٤/ ١٩٧٥دا سوارەی چالاکی، لاوچاکی، ئازای، زیرەکی دەنگخۆشی خەتخۆش، تووشی ئازارێکی نەناسراوی کوتوپڕ هات و چریکەیەک لە پشت و ڕانی ڕاستی وەستا و سەرەڕای ڕان و دەردێک کە بە هیچ دەوا و دەرمانێک سوکنایی نەدەهات سێ ساڵی ڕەبەق - نیوەی لەشی لە گەچدا - لەسەر جێ کەوت.

هەژار کوتەنی: ئەوە چەرخی بە هەموو ژینیدا!

سوارە کە لە کۆڕی دیوەخانی ئاوەدان بە شەوچەرەی شیعر و ئەدەبی کوردیدا تۆشەی تەسەلی هەڵگرتبوو، غەرامی کەم دەوامی عومری لاویش[٣] دەماری دڵداری بزواندبوو، سێ ساڵەی سەر تەختی خەستەخانەی لێ بوو بە لانکەی سەرەتای گڕوگاڵی شاعیری.

سوارە ئەو جارەش کفنی دڕی و لە یەکەمین هەوارگەی شیعرەوە گۆچان بەدەست کەوتەوە ڕێ بەرەو دنیایەکی نوێ.

مەیلی ڕاو و سواری و سێباز و مەلە جێی خۆی دا بە عیشقی خوێندن و خوێندنەوە و شیعر و سیاسەت! بەڵام بە وەفاتر و بەردەوامتر، گەرموگوڕتر و گوڕجوبڕتر لە گشت، سۆزی دڵداری و هەستی جوانپەرستی بوو کە بە ساغی و نەخۆشی، بە گەنجی و گەڕاوەیی لە زیندانو لە مەیدان هەرگیز وازی لە سوارە نەهێنا و قەتی بەجێ نەهێشت!

دوای سێ ساڵ نەخۆشی تازە کەوتەوە ڕەوتە وەک منداڵان دارەدارەی دەکرد و هێشتا برینی ئەوینی "کچی کرمانجی دێهاتی"[٤] ساڕێژ نەبێوو کە کەوتە داوی دڵدارییەکی نوێ و ئەمجار بە دندووک پێوە بوو!

کیژە ئازەرییەکی ماڵ لە بۆکان لێی بوو بە دۆست و دەزگیران و بۆی بوو بە ڕاوکەی شیعرو غەزەل دانان. ڕاوگەی ڕۆژانە و ژوانی شەوانە سەرەڕای تانە و لۆمەی کەسوکار و دۆست و ئاشنا گرێی لە گەردنی جووتەی گراوان توند کرد و سەرەنجام سوارە بە دەستتەنگی و قەرزوقۆڵە نیوە بە دزی و نیوە بە ئاشکرا ژنی هێنا! (١٩٦٢). هەر چەند دڵی هەوەسباز و هەرزەکار و سەری سەودایی و سەرەڕۆی سوارە بەوەش دانەکەوت و تا تەڕایی و تینی تێدا ما مەیلی جوانی و جەماڵی نەنا، بەڵام ڕوقیا - کە سوارە بێهوودە هەوڵی دەدا ناوی کوردی "ڕووناک"ی بە سەردا ببڕێ - بەڕاستی وەفای عاشقێنی بردە سەر و چاردە ساڵ دەستتەنگیو سەرسەنگی سوارەی قەبووڵ کرد و تا دواهەناسەی ژیان دەستی لێ بەرنەدا. بەتایبەت کە کوڕە تاقانەکەیان "بابەک" لە ١٩٦٨ بوو بە هەوێنی ئەوینی دژوار و پڕ کارەساتیان.

ئەو کچە فارسەش کە سوارە نازناوی "پ.ئاهوورا"ی لە ناوی ئەوەوە وەرگرتبوو، لە چەند ساڵەی ئاخری ژیانیدا جارجار لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بە نەناسراوی شیعر و نووسراوەی - زۆرتر بە فارسی - پێ بڵاو دەکردەوە، هەرگیز بۆی نەبوو بە هاوسەرێکی ڕەسمی، تەنانەت بۆی نەبوو بە دڵدارێکی هەتا سەر و وەک پەری نێو شیعرەکانی سوارە لە شەقەی شاباڵی داو لەو سەری دنیا، لە سەرزەمینی ئەفسانەی سەرمایە - ئامریکا - نیشتەوە و بوو بە دواتاڵاوی گەرووی ژینی کورتی سوارە.

سوارە لە ١٩٦١ بوو بە ئەندام لە "یەکیەتی خوێندکارانی کورد لە زانستگاکانی ئێران"دا کە سێ ساڵ پێشتر پێکهاتبوو، نەک تەنیا قوتابیان بەڵکو جەماوەرێکی زۆری لە تێکۆشەران و نیشتمانپەروەرانی کورد لە خۆی کۆ کردبۆوە و چالاکی و خەباتێکی سیاسی و بەرین و ڕێکوپێکی لە سەرتاسەری کوردستان و شارە گەورەکانی ئێراندا بەڕێوە دەبرد. سوارە لە ١٩٦٢ لە تاقیکردنەوەی گشتی زانکۆی تاراندا بەشداری کرد و سەرکەوت و لە فێرگەی حقووق / قانوون وەرگیرا.

لە شەوی پێش نەورۆزی ساڵی ١٩٦٤ (سەرەتای ١٣٤٣) پەلامارێکی گەورەی گرتن و

ڕاونان لە لایەن دەزگای پۆلیسی سیا شا - ساواک - ڕووی کردە جەماوەری گەلی کورد و ڕووناکبیرانەوە. سوارەش کەوتە بەندیخانەی قزلقەلعەی تاران یا وەک خۆی لە شعرێکدا دەڵێ: "سوورەقەلا! لانکی بەلا! کە پێش سازبوونی" زیندانی ئەوین" گرتووخانەی سیاسی ئێران بوو.

لە بەرامبەر هەڕەشە و جەزرەبەی "قزلقەلعە"دا کە ناوبانگی ڕەشی دڵی سووری دەلەرزاند، سوارە بە خۆڕاگری و بەرگری ناوبانگی دەرکرد. پێش کەوتنە بەندیخانەوە هەر تک جوانەمەرگ "سوارە ئیلخانیزادە" و "سمایل شەریفزادە" لەگەڵ چەند تێکۆشەرێکی دیکە باڵی چەپ و شۆڕشگێڕی یەکیەتی خوێندکارانیان پێکهێنا و دەستیان کرد بە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە لە سەر مێژوو، ئەدەب، کۆمەڵناسی و سۆسیالیزم.

بە دوای هاتنە دەری سوارە و هاوڕێکانی لە زیندان و گەڕانەوەی هەندێک لەو تێکۆشەرانەی لە تەجرەبەی شۆڕشی چەکدارانە لە کوردستانی عێراقدابەشدارییان کردبوو، بۆ کوردستانی ئێران و گێڕانەوە و توێژینەوەی ئەنجام و ئەزموونەکانی ئەو شۆڕشە و دەرخستنی هۆیەکانی ناتەبایی و ناتەواوی، هەر وەها لەگەڵ پێگەیشتنی نەسلێکی نوێ لە لاوانی کوردی کە تازە پێیان دەنا زانکۆکانەوە و داواکاری زانینی زۆرتر و بزووتنەوەی بنەڕەتی تر بوون، حەرەکەتێکی سیاسی فیکری - هونەری نوێ لە نێوەڕاستی شەستەکانەوە لە نێو ڕووناکبیرانی کوردستانی ئێراندا پێکهات و پەرەی سەند کە بە خێرایی شێوەی سیاسی - تەشکیلاتی بەخۆیەوە گرت و کومیتەیەکی سیاسی بۆ سەرکردایەتی بزووتنەودکە بە نهێنی پێکهات.

ئەو کومیتەیە کە سوارەش تێیدا بەشدار بوو لە ساڵی ١٩٦٧-١٣٤٦ لەگەڵ "کومیتەی ئینقلابی" کە لە لایەن شۆڕشگێڕانی شەهید "سولەیمان موعینی"، "سمایل شەریفزادە"، "مەلا ئاوارە" و چەند تێکوشەرێکی پێشکەوتنخوازی دیکە پاش جیابوونەوە لە سەرکردایەتی کلاسیکی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران پێکهاتبوو، پەیوەندی گرت و پەیمانی بەست. ئەو یەکگرتنەوەیە کە خەباتی چەکداری لەگەڵ چالاکی سیاسی و فیکری تێکەڵ کرد، بوو بە سەرەتای گۆڕانێکی گەورە و گرینگ بۆ دواڕۆژ ی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران چ لە ناو و چ لە نێوەڕۆکدا.

جگە لە دوو ساڵ شەڕی پێشمەرگانە بەبێ یارمەتی بێگانە و تەنیا بە پشتیوانی جەماوەری زەحمەتکێشی کوردستانی ئێران - لە کاتێکدا سنوورەکانیان لێ داخرابوون، جگە لەوەی هەزاران کەس بەپێی فەرمانی "دادگای زەمانی جەنگ" و لە سەر ئەمری ژەنەڕاڵ نوودیسی - فەرماندەی گاردی شاهەنشاهی، حاکمی عەسکەری و قەسابی کوردستان - لە

جەللادخانەی "جەڵدیان" کەوتنە بەر پەلاماری پرسیار و پشکنین و ئەشکەنجە و سێدارە و تیرەباران، بەڵام بە ورەبەرزی و یەکگرتوویی و بەرەنگاری بەکۆمەڵ دڵی دەوڵەتی داگیرکەریان لەرزاند و لاپەڕەیەکی پڕ لە شانازییان لە مێژووی کورد و کوردستان نەخشاند، جگە لەوەی کە ئەو حەرەکەتە سیاسی ـ نیزامییەی کوردستان بوو بە ڕچەشکێن و لە ساڵی داهاتوو ١٩٦٩ـ ١٣٤٨ لە مەڵبەندی شیمالی ئێران لە سیاهکەل دووپات کرایەوە و سەرانسەری وڵاتی تەکاندا.

جگە لەوانە، لەو چەند ساڵەدا بە دەیان پارچە هەڵبەستی نوێ، چیرۆکی کورت، شانۆگەری، وێنەگەری و لێکۆڵینەوەی زانستانەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی لە لایەن ڕووناکبیرانی شۆڕشگێڕەوە بە نهێنی بڵاو کرایەوە، کە لە سەرانسەری کوردستان لە نێو خوێندەوارانیدا دەست بە دەست دەگەڕا و ڕوونووس دەکرا.

سوارە وەکو شاعیر و نووسەر و ڕەخنەگر لەو بزووتنەوەدا دەورێکی بەرز و بەرچاوی هەبوو. هەموو ئەو ڕووداو و کارەساتانە لە سەردەمێکدا دەهاتنە سەر شانۆی کۆمەڵ کە ئاڵوگۆڕێکی گرینگ لە وڵاتی ئێراندا لە ئارادا بوو:

ڕیفۆرمە سیاسییەکەی حکوومەتی شا لە سەرەتای شەستەکاندا و بەتایبەت "ئیسلاحاتی ئەرزی" و "مافی ئافرەتان" بوو بە هۆی ئەوە کە "دەرەبەگایەتی" وەک شەرێکێکی بێکەلک و بارگران و تەوەزەل و دواکەوتە لە سەرکردایەتییە چەندقۆڵییە کۆنەکەی کۆمەڵی ئێران وەلا بندرێ و ڕێگە تەخت بکرێ بۆ بورژوازی تازە پێداکەوتووی چاوچنۆک و بەهەڵپەی پشت ئەستوور و چاوسووری سەرمایەداریی جیهانی کە لە سەر شان و باهۆی هێزی کاری هەرزانی میلیۆنەها ژن و پیاوی هەژار و بێ زەویوزار، لە گوند و لە شار، عەرەبانەی سوودخۆری و زێدەخوازی بێسنووری خۆی بە خێرایی لێخوڕێ و بەرەو سەپاندن و چەسپاندنی دەسەڵاتی تاقانەی بۆرژوازی باژوێ.

بەرهەمی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەم ئاڵوگۆڕە لە گەلێک مەیدان و مەجالدا خۆی نواند: خوێندنگا و زانکۆکان ژمارەیەکی زیاتریان خوێندکار وەرگرت، فابریکە و کارخانە پەرەیان سەند. خانووبەرە دروستکردن، ڕێگاوبان کێشان، فڕۆکەخانە و بەندەرگا بنیات نران، لە سەر چۆم و زێی گەورە بەند هەڵبەستن و بنکەی بەریلاو و مەزنی سوپایی و سەربازخانە دامەزراندن هەزاران هەزار کرێکاری تازەی بە خۆیەوە خەریک کرد.

لە نێوان دوو چینی سەرەکی، یانی دەوڵەمەندانی خاوەن سەرمایە و دەسەڵات و کرێکارانی والادەستی هەژاردا، توێژێکی مام ناوەندی فرە ژمارەی هەمەپیشەی دەم هەراشی سەربزێو پێکهات کە وەک ئاژین بووە نێو هەموو کون و کەلەبەرێکی کۆمەڵی نوێ و تانوپۆی

تەونی تازەی سیستمی سەرمایەداری پێکەوە لکاند.

لە جەنگەی نزمبوونی وشیاری سیاسی - چینایەتی کرێکاران و نەبوونی ڕێکخراوەی سەربەخۆی کرێکاریدا و لە بەرامبەر تەماعکاری و پارەپەرستی بورژوازی دەسەلاتدار و ملهوڕی و دیکتاتۆر بییەتی دەزگای سیاسی بەڕێوەبەردا، وردەبورژوازی کە تازە بای باڵی خۆی دەدا و سەری لە سیاسەت و سەرودەری دەخورا، بۆ ماوەی دوو دەیە بوو بە شۆڕەسواری مەیدانی خەبات و نوێنەری ڕادیکالیسمی شۆڕشگێرانە! لە ژێر تەئسیری ئەو وەزعە گشتییەدا کوردستانیش تەکانێکی تازەی خوارد:

بە درێژایی دەیەی شەست بیرکردنەوە لە ڕێبازی نوێ سەر تا پای سیاسەت و شیعر و هونەری کوردی خستبووە ژێر پرسیارێکی ڕەخنەگرانە و چاوپێداخشاندنەوەیەکی سەرلەنوێ. هەر وەک خەباتی سیاسی و تێکۆشان بۆ ڕزگاری میللی نێوەڕۆکی چینایەتی و کۆمەڵایەتی پەیدا کرد و شێوە و ڕەوت و سەرکردایەتی و چوارچێوەی سیاسی و تەنزیمی کۆن کەوتە بەر پلاری ڕەخنە و پەلاماری ڕووخاندن، لە بواری هونەر و ئەدەب و شیعریشدا کەلەپووری کۆن لە سەر شاباڵی شەپۆلی واقعییاتی تازەی کۆمەڵایەتی، گورجانە بەرەو گۆڕان و گەشە ڕۆیشت و "شیعری نوێ" بەتایبەت لەگەڵ "سوارە ئێلخانیزادە" و فاتیح شێخولئیسلامی"دا گەیشتە لووتکەی هەرە بەرزی خۆی. گۆڕانی کۆن و گووڕانی نوێ لەگەڵ دەسپێکرانی دەیەی شەستدا دەستی پێکرد و شاعیرە گەنجەکانی ئەو سەردەمە لە لایەکەوە چاویان لە گشت ڕابوردووی شیعر و ئەدەبی کوردی، بەڵام بەتایبەت لەو گەنجینە بەنرخەی "کلاسیزمی نوێ"وە بوو کە بە درێژایی بیست ساڵ ۱۹۲۰ - ۱۹٤۰ زەبروزەنگی دیکتاتۆری و سەرەڕای زمانئامان و کوردی قەدەغەکرانی دەورەی سەڵتەنەتی ڕەزاشا پەهلەوی و بە هەوڵ و هیممەتی ئەدیبی زانا و شاعیری نیشتمانپەروەر حەسەنی سەیف «سەیفولقوزات»ەوە ڕچەی بۆ شکا و بە هۆی شاعیرانی مەزن و مەشهووری ئەم مەکتەبە "هەژار" و "هێمن" لە گشت کوردستانی گەورەدا نوێنەری کرا و لە لایەن هەموو ئەو شاعیرانەی لە سەرەتای دەسپێکرانی شەڕی جیهانی دووهەم لەگەڵ دامەزران و گەشە کردنی "کۆمەڵەی ژ.ک"دا سەریان هەڵدا وەک "خاڵەمین"، سەید کامیل"،"حەقیقی" و باقی بوێژانی دەورەی جومهووری کوردستانەوە پەیڕەوی کرا.

ئەو مەکتەبەی دەکرێ بە "مەکتەبی موکریان" لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا ناو ببرێ، هەر چەند بەپێی پاراستنی وەزنی عەرووزی و ڕیعایەتی کێش و قافیە و دارشتنی شیعر لە قاڵبی دوو نیوەبەیتی هاوتادا هەر لە سەر شێوەی کلاسیکی شیعری کوردی دەڕۆیشت، بەڵام چ لە نێوەڕۆک و ئامانجەکانی گوتن و چ لە شێوازی بەیان و هەڵبژاردنی وشەدا خۆی لە مەکتەبی

"کلاسیکی کۆن" جیا کردەوە:

ڕۆمانتیزم و خەیاڵبافی عاشقانە و سۆزی سۆفییانە بۆ دڵداری نادیار و نەناسراو و لۆرانەوە جێی خۆی دا بە ناتورالیزم و جوانی تەبیعەتی کوردستان دەرخستن، ئاهەنگی بەزمو ڕەزمی کوردەواری گێڕانەوە و بە ئازادی و سەربەخۆیی گەلی کوردا هەڵکوتن، لە واقعییەتی وەزعی کۆمەلایەتی نێوخۆ دوان و خەڵک هاندان بۆ گۆڕانی ئەو وەزعە تاڵ و دژوارەی کە تێیدا دەژیان کە زۆر جار بە هۆی تێکەڵبوون لەگەڵ خەباتی جەماودر مایە و جەوهەری ڕیالیزمی تێدا بەدی دەکرا.

هەر وەک ئەدیبانی زانای کوردناس و کوردینووسی گەورەی وەکو قازی کاکە حەمەی قزلجی، حاجی ڕەحمان ئاغای موهتەدی، مەلا ئەمجەد قەلایی، عەبدولڕەحمان زەبیحی و حەسەن قزلجی ڕێبواری ئەو ڕچە و ناوداری ئەو نێوە و ڕۆڵەی هەڵکەوتووی ئەو دەورەن لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا.

شاعیر و نووسەرانی "کلاسیزمی نوێی موکریان" لە باتی ئاخنینەوەی نووسراوەکانیان بە وشەی عەرەبی و فارسی یا وشەسازی و داتاشینی لۆغەتی تازەی کوردی، دەستیان کرد بە کەلک وەرگرتن و بەکارهێنانی وشەی کوردی پەتی و ڕەسەن. چونکەزۆربەی زۆریشیان یا ڕاستەوخۆ خەڵکی دێهات بوون یا هەر لەو سەرچاوەوە ئاویان دەخواردەوە و لەگەڵ کاری ڕۆژانە و بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و ژیانی خێلاتی دا بە تەواوی تێکەلاو بوون، زۆر شارەزایانە توانییان لە دەریای بێپایانی وشە و تەعبیر و مەتەڵ و ئامرازی کار و ژیانی کۆمەڵی لادێی کوردەواریدا بە مەیلی خۆیان گەنج و گەوهەری بەنرخ دەرخەن و هونەر و ئەسەری خۆیانی پێ بڕازێننەوە و دەوڵەمەندی کەن. سوارە لە میراتی ئەم مەکتەبە، گەلێکی بەهرە پێگەیشت و چ بە هۆی پێداچوونەوە و سەردەرچوون لە ئەدەبی کلاسیکی کوردی و چ بە هۆی موحیتی ژیانی خۆیەوە لەگەڵ وشەی پەتی و پاکی کوردیدا شارەزایی و ڕاهاتوویی یەکجار زۆر بوو، بۆ کەلک وەرگرتن لەو دەسەلاتەشی تا بڵێی بەتوانا بوو.

بێ گومان شارەزایی لە ئەدەبی کلاسیک بۆ هەر شاعیرێک شەرتی پێویستە، بەلام گۆڕینی ڕچەی کۆن و دامەزراندنی ڕێبازی نوێ پێویستی بە ئاگاداری و دەستپێڕاگەیشتن بە گەلێک سەرچاوەی دیکە هەیە و شاعیرانی گەنجی کوردستانی ئێران بۆ گەیشتن و نیشتنەوە لە سەر بانی هەواری تازەی شیعری کوردی بە دوو باڵ دەفڕین:

یەکەمیان شیعری نوێی فارسی بوو کە ئەویش لە بیست ساڵەی حکوومەتی ڕەزاشادا لە لایەن "نیما یوشیج" باوکی شیعری نوێی فارسییەوە بە ئارامی و ئەسپایی و لە سایەی ئاشنایی لەگەڵ ئەدەبی ڕۆژئاوایی و بەتایبەت زانینی زمانی فەرەنسییەوە بناغەی بۆ

دامەزراو لە سەرەتای چلەکان و ڕووخانی دیکتاتۆری ڕەزاشادا لەگەڵ پەرەسەندن و ئاشکرا بوونی خەباتی سیاسی، بە هەموو ئێران ناساندرا و بە خێرایی لە سەرانسەری جامیعەی خوێندەوار و ڕووناکبیردا ـ سەرەڕای بەربەرەکانی و پێچەقاندنی سەرسەختانەی شیعری کلاسیکی فارسی ـ بە فراوانی پەیڕەوی کرا و سەرەنجام بە هۆی شاعیرە گەورەکانی ئەم چەرخەی ئێران وەک "ئەحمەد شاملوو"، "م. ئومید" ،"سیاوەش کەسرایی"، "نادر نادرپوور"، "فرووغ فەرڕوخزاد" و... بە یەکجاری لە مێژووی تووڵانی و ڕەنگینی شیعر و ئەدەبی فارسیدا سەقامگیر بوو.

دووهەمیان شیعری نوێی کوردی بوو کە لە سەرەتای شەستەکاندا و لە لایەن ڕێبەری شیعری نوێی کوردی "گۆران" و بە هۆی "بەهەشت و یادگار" و "فرمێسک و هونەر"ەوە کە خۆیان لە سەرەتای پەنجاکاندا چاپ و بڵاو کرابوونەوە، بە نەسلی نوێی شاعیرانی کوردستانی ئێران ناسێندران و تەئسیرێکی گەلێک گەورەی کردە سەر شێوە و ڕواڵەتی شیعری نوێ و بەتایبەت لە بەرامبەر شیعری نوێی فارسیدا تای تەرازووی بۆ شاعیرە گەنجە نوێخوازەکان ڕاست کردەوە.

ڕادەی ڕێز و خۆشەویستی گۆران لەو ژمارەتایبەتییەی ڕۆژنامەی کوردستان دەردەکەوێ کە بە بۆنەی بیستنی خەبەری مەرگی ئەو ئەستێرەگەشەی ئاسمانی ئەدەبی کوردییەوەدەرچوو. لە کاتێکدا لە کوردستانی عێراق پەردەی پیلانێکی بێدەنگی بە سەر ناو و کاری گۆراندا دەکێشرا، لە کوردستانی ئێران سەرتاپای ژمارەیەکی ئەو ڕۆژنامەیە ـ کە لە تاران لە لایەن دەزگای دەوڵەتەوە دەردەچوو بە هۆی تێکۆشان و تەئسیری ئەدیب و شاعیر و نووسەرە پێشکەوتخوازەکانەوە تەرخان کرابوو بۆ لاواندنەوە و پێداهەڵکوتنی گۆران و لێدوان و لێکۆڵینەوەی بەرهەمەکانی. لەو ژمارەیەدا بۆ ستایشی گۆران چوار پارچە هەڵبەستی بەرز لە لایەن مامۆستا هێمن، سوارە، فاتیح و عەلی حەسەنیانییەوە چاپ و بڵاو کرایەوە.

سوارە لە پێشدا شیعری بە شێوەی کلاسیک و لە سەر وەزنی عەرووزی دەگوت، کاتێکیش دەستی دایە تێکشکاندنی کێش و قافیەی کۆن و شێوەی نوێی دەست پێکرد، هەرگیز وازی لە شێوە کلاسیکەکە نەهێنا و هەر کاتێک پێی خۆش بایە و لە هەر شوێنێک پێی وابایە کە کێش و قافیەی قەدیمی بەکارهاتووترە، خۆی لێ نەدەبوارد.

سوارە لە شیعر کوتنیشدا هەر وەک باقیی کارەکانی ژیانی کەم تاقەت و بەپەلە بوو، زوو وەڕەز دەبوو، زوو وازی دێنا و زۆر جار شیعرێکی بە نیوەچڵی دەهێشتەوە و هەرگیز نەدەگەڕاوە سەری، ئەوەشی کە تەواو کردبایە پێیدا نەدەچۆوە و هەڵەی ڕاست نەدەکردەوە و هەر بە ڕەشنووس و شپرزەیی دەستاودەست بڵاو دەبۆوە و خۆی هەرگیز پاکنووس و کۆی

نەدەکردنەوە!

تەنیا شیعری "خەوەبەردینە" هەڵاوارده و هەڵبژارده بوو!

چەند ڕۆژ هەموو کاتی خۆی بۆ تەرخان کرد، پڕۆژەی ڕێکخستنەکەی زووتر باس لێ کردبوو، دەیزانی چ دەڵێ و چۆنی دڵێ. خۆی بۆ خوڵقاندنی شاکارەکەی ئامادە کردبوو. سەرەڕای ئەوەش کاتێک گەیشتە تەواوکردنی ئەو بەندەی کە دەڵێ:

**بەلام داخی جەرگم!**
**لەگەل هەر بەهارێ**
**کە دائەچلەکن سەوزەلانی**
**لە خاکینەخەونی گرانا،**
**لە دلما، خەم و داخی ئەو دەردە سەوزە:**
**کە دەردی گرانی**
**هەموو ڕێبوارێ**
**وەنەوزە!**

چەند ڕۆژێک بەینی کەوت و چی تازەی لێ زیاد نەبوو، زۆر کەس لە هاوڕێیان و ئەدیبان دەترسان بە دەردی باقیی بەرهەمەکانی بچێ و بە نیوەچڵی و جوانەمەرگی بمێنێتەوە، بەلام ئەو جارەیان سوارە خۆی مەیلی لەسەر بوو، ئاردزووی دەکرد تەواوی کا و کردی!

لێدوان و لێکدانەوەی "خەوەبەردینە" پێویستی بە نووسراوەیەکی سەربەخۆ هەیە، بەلام دژواری و چەتوونی شیعرەکە دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆی لە یەک جیا:

یەکیان شاردنەوەی نێوەڕۆکە کۆمەلایەتی و زانستی و فەلسەفییەکەیەتی لە ژێر چەتری دێوجامەی ڕەنگاوڕەنگدا لە ترسی چاوی پیسی دێوەزمەی سانسۆر و ساواک، دووهەمیان ئارەزووی شاعیر بۆ خولقاندنی شاکارێکی شیعری کە هەموو دەسەلاتی هونەری و شارەزایی خۆی لە سەر وشە و تەعبیری کوردی تێدا دەرخا. بێ گومان لە هەر دووک مەبەستیشدا سەرکەوتوو بووە.

خەوەبەردینە ئاوێنەیەکی بالانوێنە کە بە زمانی شیعر و لە قالبی تەمسیلدا، کاکلە و پوختەی بۆچوون و هەلسەنگاندن و ڕەخنە و پێشنیار و تێبینی نەسلی نوێی ڕووناکبیرانی کوردستانی ئێران لە نێوەڕاستی شەستەکاندا دەنوێنێ، ڕێبازە جیاواز و هێزە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵ ـ نەک بە شێوەیەکی ستاتیک و ڕاوەستاو، بەلکو لە کاتی کردەوە و جەنگەی بزووتنەوەیاندا ـ دێنێتەبەر باری تاقیکردنەوە و ناساندن، تێگەیشتن و پێگەیشتنیان یا هەلەو لادانیان، وەک چارەنووس ئەنجامێکی دیالێکتیکی، بە سروشتی چینایەتی و

ڕەوشتی کۆمەڵایەتییانەوە گرێ دەدا، بەڵام وەنەبێ نێودڕۆکە کۆمەڵایەتییەکە یا فرەبوونی وشە و تەعبیری کوردی ڕەسەن تەنیا لایەنی پەسند کراوی خەوەبەردینە بن، بەڵکو پێش هەموو شتێک جەوهەری زەوق و چێژەی هونەری یانی سەلیقەی شاعیرانە، وەسفی بێ وێنە لە تەبیعەت، نواندن و وێنواندن (تەسویر و تەشبیە)، باریک بینی و وردەکاری هونەرمەندانە، تێکەڵکردنی ژیرانەی سنووری واقعییەت و ئەفسانە، ڕامانی فەیلەسووفانە و سەرەنجام ئەو دیمەنە نایاب و ڕەنگینانەی سەر لێواری دیار و نەدیار کە دیداریان ئینسان لە نێوان سەرخۆشی و سەرگێژەدا ڕادەگرێ، گشت ئەو شتانەن کە خەوەبەردینەیان کردۆتە ناسراوترین مەتنی شیعری نوێی کوردی لە کوردستانی ئێران. هەموو ئەو کەسانەی خەوەبەردینە دەخوێننەوە ڕەنگە لە هەموو ئیشارە و کینایە و ڕاز و نهێنییەکانی نەگەن یا هەموو وەکو یەکی بۆ نەچن، بەڵام بێ گومان هەموویان لە جوانی و ڕەوانی و ڕازاوەیی‌یەکەی زەوق و لەززەتی خۆیان وەردەگرن.

خەوەبەردینەش وەک زۆربەی شیعرە نوێیەکانی سوارە هەر چەند تەرتیب و شێوەی لە مێژینەی شیعری کوردییان شێواندووە و ڕەنگ و ڕواڵەتێکی تازە و تایبەتییان هەیە، بەڵام وازیان لە وەزن نەهێناوە و هەموو لەتێک یا هەموو بەشێک لە شیعرەکە سەرەڕای کورتی و درێژی، یانی سەرەڕای ژمارەی تەقتیعەکان، سەرجەم لە یەک وەزنی دیاریکراو پەیڕەوی دەکەن یا جاری وایە چەند برگە بەیەکەوە و چەند برگەیەکی دیکەش بەیەکەوە وەزنێکی تەقتیعییان هەیە، بەڵام جگە لە وێنە، سوارە لەو ئاخریانەدا کەوتبووە سەر ئەو باوەڕەکە باشترین وەزنی تەبیعی بۆ شیعری کوردی ئەو هەوایەیە کە بەیتە کۆنەکانی لە سەر داندراوە و بە تەما بوو ئەسپی خۆشبەزی تەبعی شاعیرانەی بەرەو تاقیکردنەوەیەکی نوێ بازوێ، بەڵام هێشتا لەو ئەزموونە تازەدا چەند هەنگاوێکی سەرەتایی زیاتر هەڵنەهێنابۆوە کە بزووتنەوە چەکداریییە شۆڕشگێڕانەکەی ٦٨ ـ ٦٧ تێکشکا. هەزاران تێکۆشەری کورد لە بەندیخانەی جەلادیان و لەژێر فەرمانی دادگای "زەمانی جەنگ"دا بە ئیعدام یا زیندان یا شاربەدەر مەحکووم کران یان لانیکەم بۆ ماوەیەک کەوتنە بەر ئەشکەنجە و جەزرەبەی کومیتەی پرسیارو پشکنینی ئەو ئۆردووگا خوێناوییە و سەدان کەسیش توانییان خۆ دەرباز کەن و لە سنووری دەستکرد تێپەڕن و بگەنە کوردستانی عێراق، ژمارەیەکی زیاتریش لە شارە گەورەکانی ئێراندا خۆیان شاردەوە یا هەر ناویان نەهاتە گۆڕێ و لە سەر جێی خۆیان کڕومات مانەوە. سوارە لەو دەستەی دوایی بوو.

هەر چەند پارچە هەڵبەستی "کچی بەیان"یان وەک خۆی پێی دەگوت "حەنجەرەی زەمان"ی لە سەرەتای سەردەمی جەڵدیاندا گوت – ١٩٦٨– و بۆ تێکۆشەرانی ئەو بەندیخانە

خوێناوییەی بە دزی پێشکەش کرد، بەڵام ئەوە ئاخرین پەلەقاژەی جیددی ی بەجەرگانە بوو لە مەیدانی خەبات و بەرەنگاریدا. دوایین شیعری سوارە "تۆ دەریامی" کە لە ئاخرین ساڵی ژیانی و لە خەستەخانە گوتراوە تەنیا نیوەئاوڕێکی لاواز و بێهێزە بۆ ڕابوردوویەکی پڕ لە بەرزی و شانازی لە لایەن شاعیرێکی هەستیاری هەمیشە عاشق، بەڵام نەخۆش و ماندوو و مەئیووسەوە!

حەوت ساڵەی دوایی ژیانی سوارە تێکشکان و توانەوەی تەدریجی گیان و لەش بوو لە نێو قەفەزی کار و ژیان و ڕۆتین، لە ژێر دەستی دوژمنێکدا کە نەیدەتوانی بیگەزێ و نەیدەویست ماچی بکا!

هەموو نەخۆشی و ناخۆشییەکۆنەکان سەریان هەڵدابۆوە: لەش بیمار و دەردەدار، گیان بێ قەرار و پڕئازار، تەبیات تا بڵێی توندوتیژ و ئەخلاق لابار و نالەبار، لە خۆی و لە خەڵک و لە بوون و لە ژین بێزراو و بێزار!

تا بە هەزار پینەوپەڕۆی دوکتۆر و پسپۆر و ئەویش بە زۆری خزمەکانی و بڕێک دۆستی دڵسۆزی وەک مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی گەیشتە ئاخر و ئۆخری ١٩٧٥ و ئیتر چیدی بڕ نەکرد!

زۆربەی ئەو شتانەی لەو حەوت ساڵەی دواییدا کوتوونی یا نووسیونی و بە ژمارەو قەوارە کەمیش نین یا ئەنجامدانی بەرنامەی ڕۆژانە بووە و بەجێگەیاندنی وەزیفەی ڕۆتین یا زۆر زۆر بە خشکە و ئەسپایی تێگرتنی پلارێکی بێ تین! بەڵام تەبعی شاعیرانەی سوارە و کوردییە جوان و ڕەوانەکەی و هەوێنی هەرماوی ئەوینی ئازادی ئینسان، بەرهەم و نووسراوەکانی ئەو حەوت ساڵەشیان کردووە بە کەلەپوورێکی بەنرخ و بەکەڵک بۆ دەفتەری مێژووی ئەدەبی کوردی و جێی خۆبەتی هەر کەس هەرچی لە بەردەستدا بێ یا پێی بزانێ بۆ لە چاپدان و بلاوکردنەوەی دریغی نەکا، بەو شەرتەی وەک ئەو شتانەی تا ئێستای یەکجار هێندە تێکەڵ بە هەڵە و چەوتی نەبن.

خۆ ئەگەر هەموو لایەکیش یارمەتی من بدەن و نوسخەیەک لەو بەرهەمانەی بە دەستیانەوەیە بەرێی بکەن بۆ ئەو خوێندنگایەی سوێد کە وا ئەم گۆڤارە دەردەکا، ئەوسا دەتوانم ئەو دوابڕیار و بەڵێنییەم بۆ یادی خۆشەویستی سوارە بێنمە دی کە سەرجەمی دیوانو بەرهەمەکەی لەگەڵ لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەی پێویست بۆ هەر کامیان و ناساندنی زەمینەو زەمانی کوترانیان بلاو بکەمەوە.

لە سەر بڕێک لە شیعرەکانی سوارە کە لەو چەند ساڵەی دواییدا لە گۆڤارە کوردییە کانی ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی عێراق یا ئەوانەی لە ناوچەی ڕزگارکراوی کوردستاندا دەردەچن چاپ

کراون و ئەو نووسراوانەی لەسەر شیعر و ژیانی ئەو بلاو بوونەتەوە و ئەو شیعرانەی لە گۆڤاری هیوای سەر وە ئەنیستیتوی کوردی پاریس و ژمارەی یەکەمی گۆڤاری مامۆستای کوردی ستۆکهۆلمدا چاپ کراون و هیچ کامیان بێهەلەوپەلە نین و بڕێکیان هەر شیعری سوارەش نین، قسەم زۆرە، ئاخۆ لە فرسەتێکی ترا بەختیار نەبم کە بیانلێم؟!

---

١ـ شاری بۆکان وەکو بووکان جوانە! هەژار، بەرەو موکریان.

٢ ـ نیشتەجێی شاری بەگرمە و دووکەڵ! سوارە، خێڵی درۆ (مەبەست تارانە)

٣ـ نۆبەرەی شیرینی داری غەرامی کەم دەوامی عومری لاویم! گۆران، شیوەنی گولاڵە.

٤ ـ هەزاران فۆرم و پۆزی خانمەکانی لەندەن و پاریس

فیدای دەسرۆکەیی هەوری کچی کرمانجی دێهاتی

(خاڵەمین)

# چاو خشاندنێک بە سەر شیعری "شار"ی سوارە

**باوکی تارا**

ماوەیەکی زۆر بوو کە ناوبانگی ئەم هۆنراوەیەی کاک سوارەم بیستبوو. لە هەر کەس باسی ئەم هۆنراوەیەی کاک سوارەم دەپرسی، بە تامو چێژێکی تایبەتی و زۆرەوە بۆی باس دەکردم و لێی دەدوا.

بەم بۆنەیەوە تاپۆیەکی گەلێک مەزن و دیمەنێکی زۆر جوان و ڕازاوە لە باری ئەم هۆنراوەیەوە لە بیرمدا نەخشی بەستبوو، تاکو سەرەنجام ئەم کارەی کاک سوارەم دی و پاش وردبوونەوەیەکی زۆر هاتمە سەر ئەو بڕوایە کە ئەم هۆنراوەیەی کاک سوارە بخەمە بەر باس و لێکۆڵینەوە و بە پێوانەیەکی باوەڕپێکراوی جێگیر بیپێوم.

هەر چەندە هێندێک شت هەر کە جێ کەوتن بۆ ئەو کەسانەی کە بابەتەکە یا وەکو مەسەلەکەیان بۆ جێ کەوتووە وەک باوەڕێک دەردێن، لە هەر کۆڕ و کۆمەڵێکدا دوان لە بارەیانەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەمەتەقە و گفتوگۆیەکی پەرەئەستێن دەست پێ بکا.

ئەوەی کە باسی ئەو باوەڕەجێگیربووە دەکا لە هێندێک کاتدا دەدرێتە بەر گوللەی تاوانباری و بوختان بۆ هەڵبەستن.

ئەوانەی کە باوەڕیان بە پێوانەی زانستی هەیە و باوەڕەکانیان جامخانە نییە و لەوە ناترسن کە پێوانەی زانستی وەک بەرد بیشکێنێ و لە نێوی بەرێ، بێ گومان گوێ نادەنە تیروتانە و لە گۆڕەپانی دوان و لێکۆڵینەوە و پێواندا، پێوانە زانستییەکان بە خزمەت دەگرن.

جا هەر لە بەر ئەمە ڕەخنە بە هۆیەکی سەرەکی و کاریگەر دەزانن و بە چاوی وردەوە دەڕواننە ڕەخنە و وەک کۆڵەکەی ڕاگری کارەکانیان باوەڕیان پێیەتی، بێئەوەی کە بە هیچ جۆرێ بیروڕای تایبەتی و غەرەز و مەسەلە کەسییەکان تێکەڵاو بکەن.

جا هەر چەندە کە هەڵبەستی «شار»ی سوارە وەک باوەڕێک جێگیر بووە کە چاک و پاکو پوختەیە وا لێرەدا دەیخەینە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە، بەو هیوایەی کە لێکۆڵینەوەیەکی پاک بێ و دوور لە هەر جۆرە توورەییەک مەسەلەیەکی کەسی بێ و لە لایەن لایەنگرانییەوە نەکرێتە نیشانەی تیروتانەی نازانستانە!

هەڵبەستی شاری کاک سوارە تێڕوانینێکی گشتی و هەموو لایەنەیە، بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگای شار و لادێ، لە ڕوانگە و بۆچوونی تایبەتی شاعیرەوە.

جا با بزانین سوارە چۆن دەڕوانێتە ژیانی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگای شار و لادێ:

هۆنەر بەم جۆرە دەست پێدەکا و دەڵێ:

**گوڵم! دڵم پڕە لە دەرد و کوڵ**

**ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت**

هۆنەر تووڕەیە لەو شار و کۆمەڵگایەی کە گوڵەکەی تێیدا دەژی و بەو چوارچێوەژیانەی کە یارەکەی هەڵیبژاردووە ڕازی نییە! بەس کە وا بوو هۆنەر نە لە یارەکە تووڕەیە و نە لەوەی کە چاوەڕوانی یارەکەیەتی، ژیانی شار و چوارچێوەی شارنشینی ئەوی تووڕە کردووە. لە کاتێکدا کە لە بەیتی دووهەمی هەڵبەستەکە یا بەپێچەوانەی ئەم ڕایەی خۆی، تووڕەییەکەی دەخاتە پاڵ شتێکی دیکە، نە شار و چوارچێوەی شارنشینی.

جا با بزانین ئەم هۆیانە چین کە هۆنەری تووڕە کردووە و یا لە بنەڕەتەوە هۆنەر بۆچی یارەکەی خۆی لە چینێک هەڵبژاردووە کە بۆچوونەکانیان بە هیچ جۆرێک یەک ناگرێتەوە!

هۆنەر دەڵێ:

**ئەڵێم بە جامی ئاوی کانیاوی دێیەکەم**

**عیلاجی کەم کۆڵی دڵی پڕم**

**لە دەردی ئینتیزارەکەت**

هەستیار لە سەرەتای هۆنراوەکەیدا دەری دەخا کە دڵی پڕە و کەوتۆتە کەفوکوڵ و تووڕەیی لە شار! بەڵام لە دێڕی پێنجەمی هۆنراوەکەدا هۆی تووڕەییەکەی دەخاتە پاڵ شتێکی دیکە کە بریتییە لە چاوەڕوانی یارەکەی.

بۆ چارەسەر کردنی ئەم چاوەڕوانی و تووڕەییە تەنیا دەرمانێک کە دەیبینێ بریتییە لە جامی ئاوی کانیاوی دێیەکەی.

هەرچەند کە سەرەتای هۆنراوەکە لەگەڵ دێڕی پێنجەمیدا لە نێوەرۆکەوە یەک ناگرنەوە و بۆ [illegible]اری هۆنەر هەر یەکەی هۆیەکی جیاواز دیاری دەکەن.

ئەم جۆرە هۆنراوەیە زۆرتر بە شێوەی کلاسیکە و نیشانەی کەم هێزی هۆنەرە لە شێوەی داڕشتنی هۆنراوەی نوێدا. کۆمەڵێک بەیتی سەربەخۆ لە هۆنراوەیەدا زۆرتر بە دەردی غەزەل و هۆنەرانی کلاسیک دێن تا شێوەی نوێ.

سەرەڕای ئەمە، ئایا جامی ئاوی کانیاوی دێیەکەی بەڕاستی چارەسەری دەردی ئەو دەکا؟

ئایا گوڵەکەی ئامادەیە لەگەڵ ئەودا بارگەی بۆ هەوارێکی تر تێک بنێ و لە دێدا ببێتە هۆی ئارامی و دامرکاندنەوەی کەفوکوڵی دڵی هۆنەر؟

هەستیار دیسان هۆی ماندوویەتی و تووڕەبوونی خۆی لە چاوەڕوانی بۆ گوڵەکەی لادەباو دەیگوێزێتەوە بۆ شار و شێوەی تازەی شارنشینی و دەڵێ:

**وەرەز بوو گیانی من لە شار و هارەهاری ئەو**
**لە ڕۆژی چڵکنی نەخۆش و تاوویاوی ئەو**

هۆنەر تووڕەیە لە جموجووڵی شار و دەنگەدەنگ و هەرا و هاواری نێو شار. ئایا دەکرێ لە شوێنێک مرۆڤ هەبێ و جووڵانەوە و هەوڵ و خەبات و تێکۆشان نەبێ بۆ درێژەدان بە ژیان و دابینکردنی پێویستییەکانی ڕۆژانەی و کەرەسە و شتومەکی داهاتوو؟

ئایا هۆنەر نازانێ کە یەکێک لە پێویستییەکانی ژیان لە هەر کوێ بێ، جووڵانەوە و هاوارە بۆ دابینکردنی ژیان؟

بێ گومان ئەوە چاک دەزانێ. پەس کە وا بوو بۆچی لەم کارە سەرەتاییەی مرۆڤ کە پێویستترین هەنگاوە بۆ دابینکردنی ژیان تووڕەیە؟

جا لە بەر ڕۆشنایی تووڕەییەکەی هۆنەر، ئێمە تەنیا دەتوانین وا بیر بکەینەوە کە هۆنەر لە ژیانی شار و جموجووڵی و شێوەی ژیانی کە بە هۆی پێشکەوتنی مەکینە و کەرەسەی بەرهەمهێنانەوە گۆڕاوە و بەرەو ئاڵۆزی زۆرتر چووە و چین و توێژە کۆمەڵایەتییەکانی لە یەک جیا کردوونەوە و سنووری نێوان هەژار و دەوڵەمەندی دیاری کردووە و بە هێڵکێشان بە نێوان ئەم چینانەدا دژایەتی نێوانیانی دیارتر و ڕۆشنتر کردۆتەوە، لەشکری زۆرداری و چەوسانەوە شاری کردۆتە مەڵبەندی هێز و توانای خۆی بۆ دۆشینی هەژاران و چەوساوەکان و دەیانەوێ لە شار قەڵغانێ دروست بکەن تا وەکو بەرگری دەستی تاوانی ساماندارانی پێبکەن و بە هۆی کەرەسە و مەکینەی پێشکەوتوو چەکی زۆرداری و قەڵای چەوسانەوە بڕووخێنن تووڕەیە؟

بەڵێ هۆنەر لەم دۆخەی شار تووڕەیە و ترسی لە تەقینەوەی ئەم کارەساتەیە. چونکەخۆی لە لووتکەی خۆبەزلزانین و لە دیوانی لە نێو خۆدا ژیانا دەژی و دەترسێ کە زریانی ئەم تەقینەوەدیە ئەویش ڕامالێ. جا لە بەر ئەوەیە هۆنەر دەگەڕێتەوە سەر بازنەی تەسکی بیری کۆنی خۆی و چاوی بڕیوەتە گاجووت و یەرەقی دێ بۆ بەرگریکردن لە تەقینەوەی دژایەتی شار.

هۆنەر بێزار و تووڕەیە لە شەو و ڕۆژی شار، بۆ؟ چونکەڕۆژی چڵکن و شەوی نەخۆش و بە تاو و یاوە!

هۆنەر ڕوونی نەکردۆتەوە کە بۆچی ڕۆژی شار چڵکنە؟ ئایا شار خۆی لە خۆیدا ڕۆژ چڵکن دەکا یا کاردانەوەی ئاسایی و سروشتی ئەو هەموو هەوڵ و خەباتەیە بۆ ژیان و دژایەتی و زۆرانبازی چینەکانە کە سەرمایەداران و چەوسێنەران بە هەموو توانایانەوە کەوتوونە هاژین و شکانی لەشی چینەهەژارەکان و شاریان بە ئاکاری دژ بە مرۆڤایەتی خۆبان

چڵکن کردووه؟ ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە مەگەر خەباتی هەژاران و کۆڵەواران بۆ بەدەستهێنانی مافی ڕەوا و سەرەتایی خۆیان دژ بە چەوسێنەران دەکرێ ناوی چڵکی لێ بنرێ؟

بۆچی هۆنەر لەم زۆرانبازییە تووڕەیە و ئەمەی کردۆتە بەهانە بۆ ئەوەی خۆی لە شار دەرباز بێ و ڕا بکا؟

ئایا چاکتر نەبوو هۆنەر هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بەم زۆرانبازییەدا بە ڕاشکاوی ڕوون کاتەوە. هەرچەندە کە بە ڕا کردنی لە شار و بەجێهێلانی گۆڕەپانی خەبات، هەڵوێستی "دووربوون" لە گەل و هەژاران"ی خۆی ڕوون کردۆتەوە. جا هۆنەر وردە وردە دێتە خوارەوە و بە درێژی هۆیەکانی تووڕەبوونی خۆی دەردەبڕێ. هەرچەندە کە بە ڕۆشنی دەریان نابڕێ، بەڵام ناچار دەبێ کە دەستیان بۆ درێژ بکا و لە تەم و تۆزدا دەریانخا.

بەدوای ئەم هۆ دەربڕینەدا دەڵێ:

**ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت**

**لە شاری چاو لەبەر چرای نیئۆن شەوارەکەت**

**بڕۆمە دێ کە مانگەشەو**

**بزێتە ناو بزەم**

مرۆڤ لە سەرەتاوە کە سەیری ئەم بەشەی هۆنراوەکە دەکا، هەستێکی زۆر ناسکی ڕۆمانتیکانە بە سەریدا زاڵ دەبێ و وشەی جوان و ناسک و گوندی ئاوەدان لە بەر چاوی دەکەونە سەما، بەڵام کاتێک بە وردی دەڕوانێتە هۆنراوەکە و لەگەڵ واقیعدا بەراوردی دەکاو دەکەوێتە هەتڵەکردنی، بێ گومان بەپێچەوانەی بۆچوونی هۆنەرەوە دەبینێ کە نە چاو لە چرای نیئۆن دەکەوێتە شەوارە و نە چاوی شەویش بەم چرایە شەوارە دەبێ. ئەگەر مەبەستی هۆنەر ئەوەیە کە ڕواڵەتی ڕازاوەی شار سەرپۆشێکە لە سەر زام و چڵکەکانی هەژاری و چینایەتی، بێ گومان تاریکی شەو، ناتوانێ تیشکی چرایە ون بکا و واقیعە لەوە زۆر بەهێزترە، هەرچەندە کە مەبەستی هۆنەر ئەوە نییە و لە دێری دوای هەڵبەستەکەیدا مەبەستی سەردکی خۆی دەردەبڕێ. دەبێ ئەوەش بڵێم کە ئەم وێنەی هەڵبەستییە هەم هەڵەیە و هەم لاوازە.

بە دوای ئەمەدا دەبێ بڵێم کە گوندەکانمان ئەوەندە ئاوەدان و گەشەکردوو نین کە مانگەشەوی بزێتە نێو بزەی جووتیاری ماندوو ئەویش بە تایبەت لە سەردەمێکا کە هۆنەر ئەم هەڵبەستەی وتووە!

بۆ کەسێ کە ژیانی لادێی بە هەموو لایەنەکانییەوە نەوێ و دوور بێ لە ئازار و دەرد و چەرمەسەری، ژیانی دێ و بەدەستهێنانی پاروو نانێک کە بە دواکەوتووترین کەرەسەی سەرەتایی وە دەست دێ نەبینێ و سروشتی جوان و دەست لێنەدراوی دێی بوێ، ئەم وتەیەی هۆنەر، ئایەتی دڵە.

ئەی خۆ هۆنەر بۆخۆی کوڕی دێیە و بەپێی قسەی خۆی دەردەکانی دێ چاک دەناسێ، پەس چۆنە کە وا ڕۆمانتیکانە یەخە بۆ خێر و چاکەی دێ دادەدڕێ و خۆی بۆ دێ دەکێشێ و دەیهەوێ گوڵەکەی و گوڵانی تر بەرەو دێ بەرێتەوە، ئاخر بۆچی؟ لەبەر چی؟ هۆیەکانی ئەم کارەی هۆنەر هەر ئەوانەیە کە لەمەوبەر دیاریمان کردن.

جا ئەوسا هۆنەر ڕوو دەکاتە گوڵەکەی و دەڵێ:

**چلۆن بژیم لە شارەکەت کە من دژی گزەم**

نازانم گزە چییە بە لای هۆنەرەوە؟ ئایا ئەو هەموو زوڵم و زۆر و جیاوازییە چینایەتییەی سەردەمیەتی کە لە کۆمەڵگاکەیدا دەیبینێ؟

ئەگەر ئەوەیە کە نابێ لێی ڕاکا و دەبێ لە بەرامبەریدا ڕابوەستێ و چارەسەرییەکی بۆ بدۆزێتەوە، ئەگەر ئەوە نییە و سیمای سواڵکەرەکان و دەستفرۆشەکانی قەراغ شەقامەکان و قاچوقولی ڕووتی منداڵانی شارەکە وەک گزە لەبەر چاوی هۆنەر خۆی دەنوێنن بێ گومان دەبێ بزانێ کە ئەوە بەرهەمی جۆرە دەسەڵاتدارییەکە لەو دەمەدا بە سەر کۆمەڵگاکەیدا زاڵە و چرۆی ئابوورییەکی نابەرابەر و چەوسانەوەی چینایەتییە. بۆ کوێ دەڕوا؟ خۆ هەموو شوێنەکانی تری ئەم وڵاتە هەروەک یەک وایە و هیچ جیاوازییەک لە نێوانیاندا نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە لە دێدا چەندین بەرابەر خراپتر دەبینرێ و لە هەر دوو جۆریدا ئەرکی سەر شانی هۆنەر ڕاکردن لە ڕاستەقینە نییە بەڵکوو ڕاوەستان و خەبات و چارەسەرکردنە.

دیسان هۆنەر دێتە سەر دیاریکردنی هۆیەکانی ڕاکردنی خۆی و دەڵێ کە لە شاردا مەلی ئەوین غەوارەیە.

مەگەر فەرهەنگی شار دوورە لە خۆشەویستی و هەست و نەستی مرۆڤایەتی؟

مرۆڤەکانی شار دڵیان مردووە و هیچ جۆرە هەست و نەستێکیان لە دڵدا نەماوە؟

ئایا هەموو چین و توێژەکانی دانیشتووی شار وەک یەک لە یەک ڕوانگەوە دەڕواننە ئەوین و خۆشەویستی؟ بێ گومان نەخێر! ئاخر بۆچی هۆنەر سنووری دیاریکراوی نێوان چینەکانی شاری ناوەتە لاوە و بێ جیا کردنەوەیان لە یەک، هەموویانی وەک گلۆڵەیەکی ئاڵۆز لە یەک ئاڵاندووە و شک لەوەدا نییە کە خاوەن کارخانە و کرێکار وەک یەک و لە یەک ڕوانگەوە ناڕواننە ئەوین و خۆشەویستی و هەستی مرۆڤایەتی. چونکەلە دوو ڕوانگەی

جیاوازەوە دەڕوانێتە هەموو شتێک. ئەو وەک کەرەسە و کالای دەبینێ و دەیەوێ بیخاتە خزمەت گەرانی سەرمایەی خۆیەوە و ئەم بێزار و تووڕە لە سەرمایەداری و سوودی ناجوامێرانە بردن بۆ ڕووخانی هەوڵ دەدا. پەس بۆچی هۆنەر بە دارێک کەوتۆتە گیانی شار و شارنشین و فەرهەنگی شار و هەموویان وەک یەک دارکاری دەکا؟ بێ گومان ئەمەش دوو هۆی سەرەکی هەیە:

یەکەم ئەوەی کە هۆنەر بە چاوێکی تیژ و زانستانەوە ناڕوانێتە کۆمەڵگای شار و ژیانی شارنشینی و پەیوەندەکانی نێوانیان ناناسێ و تێیان ناگا. دەڵێی بە ئەنقەست خۆیان لێ دوور دەخاتەوە.

هۆنەر تووڕەیە لە هەموو نیشانەکانی شار و شارنشینی. کەرەسە و مەکینە و هۆیەکانی گەشەکردنی شار و شارنشینی بە دوژمنی خۆی دەزانێ و لە هەر کوێیەکدا بۆی بلوێ بە گۆچانی تووڕەیی وردیان دەکا و لەنێویان دەبا و لە هەر کوێدا کە بۆی نەلوا وا دەزانێ قوڵ و زەنجیرن و ئەویان بەستۆتەوە وەک ئێرە کە دەڵێ:

**ئەڵێی لە دەوری دەست و پێم**
**ئەوەی کە تێل و تان و رایەڵە**
**کەلەبچەیە**

جا ئەوسا ڕوو دەکاتە یارەکەی و بۆ ئەوەی قسەیەکی کردبێ، دووکەڵی ماڵە دەوڵەمەند کە ڕۆژ دەخاتە بەندەوە، بە هۆیەکی تر دادەنێ بۆ ڕاکردن لە شار و دەیکاتە مایەی تووڕەیی خۆی!

کاک سوارە لێرەشدا هەروەک شوێنەکانی تری هۆنراوەکەی ڕوونی نەکردۆتەوە کە بۆ لەم دووکەڵە تووڕەیە؟ ئایا لەبەر ئەوەیکە ئەو دووکەڵە بەرهەمی ڕەنجی هەژارانە یا وەکو ئازاری خۆی دەدا هەوای پاکی شار چڵکن دەکا و نایەڵێ قوڵ لەنێو قوڵی دڵدارەکەی لە شاردا پیاسە بکا؟

ئەوسا لە لووتکەی خۆبینی و دوورەپەرێزییەوە کە بۆخۆی هەڵیبژاردووە، دەست دەکا بە گلەییکردن: لە شارەکەی تۆدا باوی شێر نییە و ڕێوی باویەتی!

کاک سوارە لێرەدا ڕەنگە مەبەستی ئەوە بێ کە خۆی وەک هۆنەرێک دیار نییە و ڕێز و نرخی خۆی نادرێتێ. بە بڕوای من دەبوایە کاک سوارە قەفەسی تەسکی دوورەپەرێزی و خۆبینی بشکێنێ و بە نەعرەتە دڵی ڕێوی و لاش خۆران بترەکێنێ، هەتا شێربوونی خۆی بسەلمێنێ.

هۆنەر ئەمە دەکاتە هۆیەک بۆ ڕاکردنی خۆی! کاک سوارە دەبوایە بیزانیبێ کە ئەوە

بۆخۆیەتی کە دەبێ قۆڵی لێ هەڵماڵێ و بچێتە نێو گەلەوە و ڕیزی گەل بگرێ و لە نێویدا بتوێتەوە تا جێگای تایبەتی خۆی بکاتەوە لە نێو گەلدا، نەک کە خەڵکی بێن و بڵێن فەرموو قوربان، تۆ سەرکردە و سەرودرمان بە!

ئەی ئەرکی سەر شانی ئەو چییە لەو شارەدا؟ مەگەر خۆی نییە کە لە دەست تاوویاوی ڕۆژی چڵکنی شار هاوار دەکا و بە گاسنی تووڕەیی خۆی هەڵدەکۆڵێ! بەڵام چ هەڵکۆڵینێ؟ هەڵکۆڵینێ تەنیا بۆ ڕاکردن و دەربازبوونی لە شار.

هۆنەر بە هەموو توانا و گیانییەوە لە شار و شارنشینی بێزارە و هەر شتێک کە بۆنی شاری لێ بێ بە خراپی دەزانێ و وەک مەلەوانی کوندە لە دەست بەربوو هەر هەڵەداوانی دێیەتی.

لە سرنج و ڕوانینێ تووڕەیە و بە نەخۆش و تای دەزانێ و بێزارانە هاواری تووڕەبوونی خۆی لە ئاستی بەرز دەکاتەوە و لێی دوور دەکەوێتەوە بێ ئەوەی ڕۆشنی کاتەوە کە هۆی ئەم هەموو گرفتارییە چییە کەوا لە شاردا ڕوو دەدا؟

خوێنەر دێتە سەر ئەو باوەڕەکە هۆنەر لە شێوەی تازەی شارنشینی و گەشە کردنی کەرەسەو مەکینە و خانووسازی و هۆیەکانی بەرهەمهێنان و ئابووریی شار تووڕەیە و هیچ گومان لەوەدا نییە کە ئەمانە خۆیان ڕاستەوخۆ کار دەکەنە سەر فەرهەنگ و جۆری بیرکردنەوەی خەڵک. چونکەهۆنەر هەست بەو ئاڵوگۆڕە بنەڕەتییە دەکا و دەزانێ کە چین و توێژەکان لە خوارەوەی کۆمەڵگا لە سێبەری ئەواندا گەشە دەکەن و بەرەو لەنێوبردنی تانوپۆی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی و ئیستکباری دەڕۆن. هەر لەبەر ئەوە لێیان تووڕەیە و بە دوژمنی خۆی و بە لەنێوبەری بیری کۆن و بچووکی دێخوازی خۆیانی دەزانێ.

هەر لەبەر ئەمە هەموو خراپەیەکی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەداتە پاڵیان و لێیان هەڵدێ و لە هەمان کاتدا دەردەکەوێ کە تووڕەییەکەی هۆنەر لە شار بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە نرخی ئەو نازانن و مەودای نادرێ کە دەست لە نێو دەستی یارەکەی لە شەقامەکاندا بگەڕێ و هۆنراوەی ناسک بهۆنێتەوە! بەڵام باوەڕی یەکەم زۆرتر جێگای بڕوایە چونکەهۆنەر بە هیچ جۆرێ دەری ناخا.

بۆچی شار هەرێمی زۆنگ و زەلە و ئەو هەموو کارەسات و ڕووداوە دڵتەزێنانەی شار لە کوێوە هاتوون.

پەس لە سەردتای هۆنراوەکەیدا تووڕەیی خۆی لە شار دەداتە پاڵ ئەوەی کە چاوەڕوانی یارەکەیەتی و ئەمە تاوانی شارە، لە هێندێک شوێنی دیکەدا شار بە دوژمنی ئەوین و ئاشنایی دەزانێ بێ ئەوەی کە ڕوونی کاتەوە بۆ؟

هۆنەر شار بە هەرێمی زۆنگ و زەل دەزانێ و باوەڕی وایە کە هەرگیز نابێتە جارەگوڵ.

ئایا بەڕاستی کاک سوارە نەیزانیوە کە هەر پێکهاتن و خولقان و گۆڕانکارییەکی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و... هتد بە چەندین هۆوە بەستراوەتەوە؟ ئایا ئەوەی نەزانیوە کە گۆڕان و گەشەکردن ڕاستەوخۆ بەسراوە بە هۆیەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و...؟

ئەگەر زانیویەتی چۆن وا بە ڕاشکاوی شار بە هەرێمی زۆنگ و زەل دادەنێ و باوەڕی وایە کە هیچ کات ناگۆڕێ و بەرەو چاکبوون و گەشەکردن ناڕوا.

کاک سوارە لە بازنەی تەسکی خۆبینین و ویستی دێخوازی و بیروباوەڕ و نەزیلە کۆنەکانی خویدا گیری کردووە کە ئەم بازنە تەسکەی بۆ ناشکێ و بێ ڕەچاوکردنی هۆیەکان و قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی، زۆر توند و وشک پێ لە سەر باوەڕی هەڵەی خۆی دادەگرێ و دەڵێ:

**گوڵم هەرێمی زۆنگ و زەل**

**چلۆن ئەبێتە جارەگوڵ؟**

چلۆن شار بۆتە هەرێمی زۆنگ و زەل و نابێتە جارەگوڵ و گۆڕانی بە سەردا نایە؟ بۆچی دێ نێرگسەجارە و بەروبۆی بەهاری و ئەوین و ئاشنای دەبەخشێ؟

ئەگەر لە شار هەرێمی زۆنگ و زەلە بێ گومان دێش هەروایە. چونکەکاروباری ئابووریو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی شار بازنەیەکی بەسراوی خڕ نییە کە تەنیا لە چوارچێوەی خۆیدا بخولێتەوە و بێ گومان لادێش دەخاتە ژێر سێبەر و دەسەڵاتی زاڵ و توانایی خۆیەوە.

جا ئەوەدەم کاک سوارە هاوار دەکا کە لە شاری قاتڵی هەژار کێ گوێ دەداتە ئایەتی پەڕاوی دڵ! جێگای خۆیەتی کە پرسیار بکەین، ئەو ئایەتی پەڕاوی دڵ چییە؟ ئەگەر باسی زولف و بسک و ڕەنگ و ڕووی تەنیا گوڵەکەی هۆنەرە، بەڕاستی کاک سوارە ڕاستی وتووە، لە شاری قاتڵی هەژار کەس گوێ ناداتە ئەو ئایەتە چونکەخەمی نان گەورەترین خەمی ژیانی مرۆڤی هەژارە و لەو شارە هەژارکوژەدا دەبێ ئایەتی دڵ بەستە بۆ زامە چڵکنەکانی هەژاران و برسییەکان بڵێ و پەنجە لە سەر کێم و دەردی دانێ وەک پزیشکێکی پسپۆڕ چارەسەری بکا.

وەک هۆنەرێ دەڵێ:

**ئاخۆ کەی بێ سۆزی دەروون بە خاتری پارووە نان**

**نەسووتێت و بۆ کوڕووزی نەگرێ ئاسمـــان**

بەڵێ لەو شارەدا ئایەتی دڵ ئەوەیە و خەڵکی شار باوەشی بۆ دەکەنەوە و لە ئامێزی دەگرن!

ئەوسا هۆنەر کۆتایی بە هۆنراوەکەی دێنێ و دەڵێ، من کە پەروەردەی هەواری بە سەفا و ڕەنگینی کوێستان و گوندم، ناتوانم لە شارەکەی تۆدا بژیم، دەگەڕێتەوە تاوەکو بناری پڕ بەهاری کوێستان ڕەنگی شین و سوور بدا لە لەشی هۆنراوە و هەستی! بۆ دواجار پەیامی خۆی لەو هەموو هاوارە دەردەبڕێ و دەیگەیەنێ کە ئەو گوندی تەنیا لەبەر خاتری بەهاری دەست لێنەدراو دەوێ، نەک بۆ ئەوەی کە ئەوەی بکاتە مەڵبەندی گۆڕانکاری و گەشەسەندن و ئاوەدانکردنەوە. بێ ئازار و دوور لە گرفتاری لە سەر سەوزەگیای بەهاری و لەگەڵ دەنگی کەو و بولبولدا هۆنراوەی ناسک و ڕۆمانتیکانە بۆخۆی و دڵدارەکەی بهۆنێتەوە. دەبێ بڵێم کاک سوارە لێرەدا بەڕاستی لەگەڵ خۆی ڕاست دەکا و بێ پەردە قسەی دڵی خۆی دەکا!

لە کۆتاییدا دەبێ ئەوە بڵێم کە ئەم هۆنراوەی کاک سوارەم تەنیا لە ڕووی نیوەرۆک و پەیام و مەبەستەوە خستۆتە بەر لێکۆڵینەوە. چونکە گرینگترین بەش و هەوێنی هەر هۆنراوەیەک پەیام و مەبەستی ئەو هۆنراوەیە.

هەرچەندە کە لە بارەی زمان و ڕواڵەت و ڕەسەنبوونی وشەکانییەوە بێ کەموکووڕی نییە. بۆ نموونە ئەگەر سەیرێکی ئەم بەشەی هۆنراوەکە بە وردی بکەین، دەبینین کە دەلەنگێ و بە تەواوی مانا نابەخشێ و وشەیەک کە هەڵبژێردراوە لاواز و بێ دەسەلاتە لە گەیاندنی مانادا، وەک دەڵێ:

**بە هەر نیگایەک و پەتایەکا**
**ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت، گوڵم**

تا ئێرە کە دەڵێ:

**لە شاری تۆ لە بانی عەرشە قۆندەرەی دراو**

دیار نییە کە قۆندەرەی دراو لە سەر عەرشە یا وەکو هێنی خاوەن دراو.

هەر وەها لە بارەی ڕەسەن نەبوونی وشەوە دەتوانین سەیرێکی ئەم وشانەی خوارەوە بکەین: ئینتیزار، گوناه، عەرش، قۆندەر، عیلاج و... هتد.

لە کۆتاییدا پێویستە بڵێم کە هۆنراوەکەی کاک سوارە لە جێگای خۆیدا جوانە و خاوەن هێندێک تایبەتمەندی چاکی خۆیەتی.

# ڕەخنە لە سەر ڕەخنەی شێعری "شار"ی سوارە ئێلخانیزادە

## (١)

**مارف ئاغایی**

دەگێڕنەوە: کیژێک شوو بە پیاوێک دەکا و پاش ماوەیەک چارەنووس هەڵیاندەگرێ و لە وڵاتێکی دیکە دەیانگیرسێنێتەوە. ساڵ دێن و دەچن هەتا ڕۆژێک کابرایەکی خەڵکی گوندی ژنەکە ڕاستی ئەو ژنە دێ و پاش تۆ خۆش و من خۆشێکی زۆر، باسی ماڵ و حاڵی باب و براکانی لێ دەپرسێ و پیاوەکە لە وڵامدا هەڵدەداتێ و دەڵێ مزگێنیم دەیە "خرپۆ"ی برات بووە بە کوێخا، ژنە دەست بە شین و گریان دەکا و دایدەداتە بارانی فرمێسکان. خەڵکەکەی دەوروبەر پێیان سەیر دەبێ و دەڵێن ئەو کابرایە مزگێنیت دەداتێ ئەتۆ دەگری؟ ژنە دەڵێ ئێوە نازانن من لە چی دەناڵم، دیارە گوندی ئێمە کەسی تێدا نەماوە کە "خرپۆ" بۆتە کوێخا!

ئێستاش کە من دەمەوێ وڵامی ڕەخنەی بەڕێز "باوکی تارا" بنووسمەوە ڕەنگە زۆر کەس گریانی بەم حاڵە بێ، بەڵام من هەر دەینووسم بەڵکو هەر نەبێ ئەم فرمێسکانە شتێکیان لێ ساغ بێتەوە.

لە سروەی ژمارە٥٥ لاپەڕەی ١٤ هەتا ١٩دا وتارێک بڵاو بۆتەوە لەژێر سەردێڕی "چاوخشاندنێک بە سەر شێعری "شار"ی سوارەدا کە ڕەخنەی لەم شێعرەی کاک سوارە ئیلخانی زادە گرتووە. ئەوە یەکێک لە ئاواتەکانی خوێندەوارانی کوردە کە ڕۆژێک شێعرەکانی کاک سوارە بخرێنە ژێر تیشکی هەڵسەنگاندنەوە و من پێم وایە ئەگەر ئەو ڕەخنەیە توانیبێتی ببێتە سەرەتایەک بۆ ئەو کارە جێگای ڕێز و بایەخە.

قەرار نییە هەموو ئاسەوارەکانی کاک سوارە بە چاوی بەستراوەوە قەبووڵ بکەین، بەڵام ئەگەر ڕەخنەشی لێ دەگیرێ دەبێ ڕەخنەکە بەهێز بێ و هەوڵ بدرێ بە چاوێکی وردبینانەوە بەرهەمەکانی هەڵسەنگێنرێن. من پێم وایە "باوکی تارا" لە نووسینی ئەو ڕەخنەیەدا پەلەی کردووە و باش لە واتای شێعرەکە ورد نەبۆتەوە و ئەو شەرحەی کە ئەو لە شێعرەکەی داوەتەوە بۆتە شتێکی سەربەخۆ کە فڕی بە شێعرەکەوە نەماوە. بۆ ئەوەی بێبەڵگە قسەم نەکردبێ دێڕ بە دێڕ دەگەڵ ڕەخنەگر بە سەر شێعرەکەدا دەچمەوە و بیروڕای ڕەخنەگر و هەروەها ڕوونکردنەوەی خۆم پێشکەش دەکەم، بەو هیوایەی کە زانایەکیش قەڵەم بگرێتە دەست و

هەڵەکانی هەر دووکمان ڕاست بکاتەوە. شیعرەکە ئاوا دەست پێدەکا:

**گوڵم:**

**دڵم پڕە لە دەرد و کوڵ**

**ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت**

ڕەخنەگر دەڵێ (هۆنەر نە لە یارەکە تووڕەیە و نە لەوەی کە چاوەڕوانی یارەکەیەتی، ژیانی شار و چوارچێوەی شارنشینی ئەوی تووڕە کردووە... لە حاڵێکدا لە دێڕی پێنجەمی هۆنراوەکەدا بەپێچەوانەی ئەم ڕایەی خۆی هۆی تووڕەییەکەی دەخاتە پاڵ شتێکی دیکە کە بریتییە لە چاوەڕوانی یارەکەی)

**ئەڵێم بە جامی ئاوی کانیاوی دێیەکەم**

**عیلاجی کەم کوڵی دڵی پڕم، لە دەردی**

**ئینتزارەکەت**

من پێم وایە ڕەخنەگر بە باشی لەو چەند دێڕە ورد نەبۆتەوە. ئەو ئینتزارەی کە شاعیر لێی دەدوێ ڕاست لە خزمەت واتای شیعرەکەدایە و هیچ دژایەتییەکی دەگەڵ مانای دێڕەکانی سەرەوە نییە. سوارە نالێ کە من لە دەردی ئینتزاری شار تووڕەم، بەڵکو ڕەوتی مانای شیعرەکە بەو شێوەیە:

لە دێڕی یەکەمدا باسی دڵی پڕی خۆی دەکا و لە دێڕی دووهەمدا بە دردۆنگییەوە قسەی دڵی خۆی دەکا و دەڵێ: "ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت" بەڵام هەر خێرا دێتەوە یادی کە ئەگەر لە شاری یارەکەی بڕوا ئینجا دڵی بۆ شتێکی دیکە پڕ دەبێ و ئەویش دووری یارە. شاعیر بە ناسککاری ییەکی زۆردوە ئەوە دەگەیەنێ کە ئاگای لەو دەردە ئینتزارە هەیە کە دەبێ لەگوند بیکێشێ و بۆیە بەر لەوەی کە ڕۆیشتنەکەی قەتعی بکا دەرمانی ئینتزارەکە دەدۆزێتەوە و بە یارەکەشی دەڵێ ئەگەر پێت وایە دەردی ئینتزارم پێ ناکێشرێ، من بە ئاوی کانیاوی دێیەکەم عیلاجی دەکەم. کاک سوارە پێمان دەڵێ کە لە ئەوینێکی پاکی شاعیرانەدا تەنیا خەیاڵی ڕۆیشتن دەردی چاوەڕوانی دەگەڵە، بەڵام با لە لایەکی دیکەشەوە بۆ مەسەلەکە بچین. "ئینتزارەکەت" مانایەکی دیکەش دەدا. سوارە خۆی و گوڵەکەی لێک جیا نازانێ و سنوورێک لە نێوان خۆی و ئەودا ناهێڵێتەوە و دەڵێ ئەو ئینتزارەی کە ئەتۆ هەتە "ئینتزارەکەت" کە دەتوانێ زۆر شت بێ بۆ وێنە شۆڕش و خەبات دژی پاشایەتی و... لێرە چارەی ناکرێ و دەرمانەکەی لە گوندە. لە لایەکی دیکەوە دەری دەبڕێ "کوڵی دڵی پڕی خۆمی پێ عیلاج دەکەم" کە لێرەدا دەڵێ ئینتزاری تۆ هەمان ئینتزارێکە کە لە دڵی منیشدایە و ئەو ئینتزارە موشتەرەکە یا ئەو "دەردە موشتەرەکە" دەبێ لە گوندەوە چارەسەر بکرێ کە ڕەنگە

کاک سواره بە سرنجدان بە شۆڕشی سەرکەوتووی چین کە لە گوندەوە بەرەو شار چوو و بەتایبەت کە نیزامەکەشی فئۆدالی بووە لە ئێرانیشدا لە سەر ئەو بڕوایە بووبێ کە دەبێ لە گوندەوە بەرەو شار دەست بە جووڵانەوە و خەبات بکرێ ئەڵبەتە لێرەدا بێ ئەوەی شیعرەکەم شی کردبێتەوە مۆرکی سیاسیبوونم پێوە چەسپاند، بەڵام لە درێژەی باسەکەدا ئەو مەسەلەیە بە وردی ڕوون دەکرێتەوە. لێرەدا تەنیا ویستم خوێنەر ئاگادار بکەم کە وێدەچێ کاکڵی مانای شیعرەکە ئەوە بێ. لە هەر حاڵدا ئەگەر ئەو مانایەش بدا پێوەندییەکە هەر پتەو و قایمە و لە هیچ کوێ نەپساوەتەوە.

پاشان ڕەخنەگر دەنووسێ:

(هۆنەر بۆچی یارەکەی خۆی لە چینێک هەڵبژاردووە کە بۆچوونەکانیان بە هیچ جۆرێک یەک ناگرێتەوە)

تۆ بڵێی ڕەخنەگر چ تاریفێکی بۆ "ئەوین" هەبێ. کەی ئەوین سنووری ناسیوە. مەگەر ئەویندار لە پێشدا دەچێ لە کۆمەڵدا پرس‌وجۆی بنەماڵە و چین و بیروڕا و... یارەکەی دەکاو پاشان ئەگەر لە هیچ بارێکەوە جیاوازییان نەبوو عاشقی دەبێ؟

کێ دەتوانێ گازندە لە شێخی سەنعان بکا کە بۆ کچی کافر لە ئیسلام وەرگەڕا؟ "مەم سەوداسەری زینێک دەبێ کە تەنیا بە خەون دیویە، فەرهاد عاشقی شیرینێک دەبێ کە هێندی ئەرز و ئاسمان کەندوکۆسپی لە ڕێگادایە. سیامەندی ڕووتەڵە خەجێکی هەڵدەگرێ کە جودا لە جیاوازی چینایەتی زۆر و دەسەڵات و بنەماڵەیەکی حەوت برایی دەکا بە دوژمنی خۆی، خەج پاش سیامەند ژیانی بێ‌مانا دەزانێ و خۆی دەکوژێ و...

کام یەک لەو ئەوینانە چوارچێوەیان بۆ دیاری کراوە. ئەو ئەوینەی ڕەخنەگر باسی لێ دەکا هەر ئەو ئەوینەیە کە شاعیر لە درێژەی شیعرەکەیدا گلەیی لێ دەکا.

ڕەخنەگر دەنووسێ: (ئەم جۆرە هۆنراوەیە زۆرتر بە شێوەی کلاسیکە و نیشانەی کەمهێزی هۆنەرە لە شێوەی داڕشتنی هۆنراوەی نوێدا. کۆمەڵێک بەیتی سەربەخۆ لە هۆنراوەیەکدا زۆرتر بە دەردی غەزەل و هۆنەرانی کلاسیک دێن تا شێوەی نوێ).

بەڵام هیچ کام لە دێڕەکانی ئەم پێنج دێڕەی ڕەخنەگر باسی لێ کردووە نە تەنیا زیادی نین بەڵکو هەر کامیان کۆڵەکەیەکی بەهێزن کە ئەگەر وەلابچن مانای شیعرەکە ناتەواو دەبێ. ڕەخنەگر پێی وایە مێحوەری عەموودی ئەو کۆپلەیە کە دەبێ ماناکەیان پێکەوە پێوەندی بدا کزە، لە حاڵێکدا ئەگەر لێی ورد بینەوە دەبینین هەر دێڕەی درێژەی مەنتقی دێڕی پێش خۆیەتی کە پێشتر باسمان لێ کرد و نامەوێ دووپاتی بکەمەوە.

پاشان ڕەخنەگر دەڵێ: (ئایا گوڵەکەی ئامادەیە لەگەڵ ئەودا بارگەی بۆ هەوارێکی تر

تێک بنێ و لە دێدا ببێتە هۆی ئارامی، کەفوکولی دڵی هۆنەر؟)

شاعیر داوایەکی وای لە یارەکەی نەکردووە. ئەو کە دەڵێ دەردی ئینتزارت چارە دەکەم، مەبەستی ئەوەیە کە ئەگەر بڕواتە گوند تەنیا دەچێ، دەڵێ "ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت" ناڵێ "وەرە پێکەوە بڕۆین" دیارە لە حاڵەتی دووهەمیشدا بۆ چارەسەر کردنی ئینتزاری یارەکە دەچێتە گوند.

**وەڕز بوو گیانی من لە شار و هارەهاری ئەو**

**لە ڕۆژی چڵکنی نەخۆش و تاوویاوی شەو**

١ـ ڕەخنەگر دەنووسێ: (هۆنەر لە ژیانی شار و جموجووڵی و شێوەی ژیانی کە بە هۆی پێشکەوتنی مەکینە و کەرەسەی بەرهەمهێنانەوە گۆڕاوە و... سنووری نێوان هەژار و دەوڵەمەندی دیاری کردووە و... هەژاران و چەوساوەکان دەیانەوێ لە شار قەڵغانێ دروست بکەن و بە هۆی کەرەسە و مەکینەی پێشکەوتوو چەکی زۆرداری و قەڵای چەوسانەوە بڕووخێنن، توورەیە؟)

ڕەخنەگر لەو شوێنە و چەند شوێنێکی دیکە لە چوارچێوەی هەڵسەنگاندن و ڕەخنەگرتن هەورازتر چووە و دەستی کردووە بە قسە بۆ هەڵبەستن و بوختان کردن کە ئەو کارە دەگەڵ قسەکەی خۆی کە لە پێشەکی ڕەخنەکەدا دەیلێ:

(هاتمە سەر ئەم بڕوایە کە ئەم هۆنراوەیەی کاک سوارە بخەمە بەر باس و لێکۆڵینەوە و بە پێوانەیەکی باوەڕپێکراوی جێگیر بیپێوم) یەک ناگرێتەوە.

لە کوتیی ئەم شیعرەدا وا دەردەکەوێ کە سوارە دژی تێکۆشانی هەژاران و لایەنگری دەوڵەمەند و زۆردارانە. بۆ مەگەر ڕەخنەگر لە درێژەی شیعرەکەدا چاوی بەو چەند دێڕە نەکەوتووە:

**لە شارەکەت کە مەندی دووکەڵە**

**کە دێتە دەر لە ماڵی دەوڵەمەند**

**وە تیشکی بێگوناهی خۆرەتاو ئەخاتە بەند**

لێرەدا کاک سوارە کامە چین بە تاوانبار دەزانێ؟ دیارە کە ئەو کەسەی لە ئاست تیشکی بێگوناهی خۆرەتاودا هەستێتەوە بە بڕوای شاعیر چییە؟ بەڵام گرێمان سوارە لە هەموو خەڵک توورە بوو و وەڕەزیی خۆی سەبارەت بە هەژارەکانیش دەربڕی و گوتی من دژی ئەو شێوە ژیانەی ئێوەم. ئەو دەمیش تەنیا ئەرکی خۆی بەجێ گەیاندووە. مەگەر شاعیر ئەو کەسە نییە کە بە چاوێکی ئاوەڵا دەڕوانێتە کۆمەڵ و لە هەر شوێنێک چەوتی ببینێ وەدەنگ دێ و هاوار دەکا. شاعیرێک کە لەگەڵ ڕەوتی ئاسایی ژیان بڕوا و بەڵێی بۆ بڵێ شاعیر نییە. شیعر

بەپێچەوانەی ڕەوتی ڕووبار مەلە دەکا. شاعیر هێندێک جار بۆ ئەوەی خەڵک وشیار بکاتەوە شیعر دەکاتە زدربەیەکی توند و لە سەری چینێکی خەڵکی ڕادەکێشێ. لەو ڕێگایەدا ڕەنگە زۆر بێڕوحمانە دەگەڵ خەڵک بجووڵێتەوە، بەڵام دەگەڵ خۆی سادقانە جووڵاوەتەوە. شاعیر دەبێ چی لە دەروونداید هەڵیڕێژێتە سەر کاغەز و هاوار لە گەروویدا نەخنکێنێ. سوارە ئەو دەم کە لە شار وەڕەز بووە دەبێ بە هەموو توانای خۆی شار و شارستانییەت لەبەر فەرهەنگی بێگیان و پڕ لە درۆودەلەسەی بکوتێ بڵێ من وەڕەز بووم لەو شارەی کە ڕۆژەکەشی نەخۆشە. ئەوە نە تەنیا بۆ شاعیر عەیب نییە بەڵکو بەجێگەیاندنی ئەرکە. کاتێک فایق بێکەس لە کورد تووڕە دەبێ و ئەو تووڕەییە دەچێتە قالبی شیعرەوە ئاوا دەڵێ:

**میللەتێکن بۆ نەمانی یەکتری هەر هەوڵ ئەدەن**
**داخەکەم ورد و درشتی شێت و شەیدای ئانەیە**

"لاپەڕەی ١٥ی دیوانی فایق بێکەس"

ڕەنگە ڕەخنەگر فایق بێکەس بە دژی هەژار و ڕووت و ڕەبەنی کورد و دوژمنی میللەتی کورد دابنێ، بەڵام بەپێچەوانە، ئەو شیعرە لەو پەڕی کورددۆستی و کوردپەروەریدا نووسراوە. شاعیر خەڵک وریا دەکاتەوە و لەو کارەدا زۆر بێڕوحمە.

تەنانەت ڕوحمی بە خۆشیدا نایە چونکەتەواوی کورد دەکوتێ لە حاڵێکدا خۆشی کوردەو جگە لەوەش ترسی لە دەروونیدا نییە کە ئەو شیعرەی چۆن بۆ لێک دەدەنەوە، بەڵام بێکەس هەموو دەم لە سەر ئەو بڕوایە نامێنێتەوە و دیسان لە هەلومەرجێکی تایبەتیدا ڕوو دەکاتەوە میللەتی کورد و دەڵێ:

**شەجاعەت پیشەیی کوردە، مەعاریف ڕەسمی پێشوویە**
**کەرەم ئەڵبەتە باعیس بۆ ژیانی میللەتی کوردە**
**دڵم خوێنڕێژ و سەرگێژە، دوو چاوم پڕ لە ئەسرینە**
**عیلاجی دەردی "بێکەس" هەر ژیانی میللەتی کوردە**

"دیوانی فایق بێکەس لاپەڕەی ٢٣"

چ مەنتقێک ئەو دوو خاڵە ڕووحییەلێک دەداتەوە جگە لە مەنتقی شیعری. ئەو میللەتە پیس و نۆکەر و شەیدای ئانەیە بۆ ئێستا بوو بە "شەجاعەتپیشە"؟

ڕەخنەگر بەر لە وەی کە بەم توند و تیژییەهەڵکوتێتە سەر شیعرەکەی کاک سوارە دەبوایە هەوڵ بدا سەبکی ئەم شیعرە بناسێ و بەم پێوانەوە هەڵیسەنگێنێ. شیعری "شار" یەکێک لە

جوانترین شیعرەکانی ڕۆمانتیکی کوردییە. ئەو قسەیەش وەنەبێ من پێی گەیشتبم. لە سروەی ژمارە ۷ لاپەڕەی ٧٤دا کاک "فەرهاد پیربال" دەڵێ: "بە ڕای من بەرزترین و ناسکترین شیعری ڕۆمانتیکی کوردی ئەم شیعرەی «شار»ی سوارەیە. هەر وەها کاک حەمەسەعید حەسەن لە وتوویژێکدا کە بەم زووانە سروە بڵاوی دەکاتەوە دەڵێ: "ئەو شیعرەی سوارە «شار» بالاترین نموونەی شێعری ڕۆمانسی کوردییە."

ئێستا کە سەبکی ئەم شیعرە ڕوون بۆوە دەبێ بزانین تایبەتمەندییەکانی سەبکی ڕۆمانتیک چین و لە چ دەورانێک و چۆن پێک هاتوون. ڕەخنەگر پێویستە بزانێ کە "شاتۆبریان"، "ویکتۆر هۆگۆ"، "لامارتین" و شاعیران و زانایانی گەورەی دنیا لە دوای سەدەی هەژدەهەمەوە بەو سەبکەیان نووسیوە. یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی هونەرمەندانی ئەو سەبکە ئەوەیە کە ئەویینداری سروشت و گوند و ژیانی پاک و دوور لە فڕوفێڵن، بەڵام ئەم هونەرمەندانە تەنیا بە جوانی و خۆشی هەڵنالێن و لە پەنا وێنەکاندا مانای دیکەش دەگەیەنن. شار لە حاڵێکدا کە دەربڕی هەستی شاعیرێکی لە شار بێزراوی، ئەوینداری گوندە، بە شێوەیەکی دیکەش مانا لێدەدرێتەوە. سوارە کەسێکە کە خەڵک فێر دەکا دژی چارەنووسی ئاسایی خۆیان هەستنەوە و ئیزن نەدەن زۆرداراانی پاشایەتی تیشکی تاو نەخۆش بکەن. سوارە بیر لە ڕێگای چارەدەکاتەوە و وەک ئولیۆت دەڵێ: "ئێمە بیر لە کلیل دەکەینەوە، هەر کەس لە زیندانی خۆیدا بیر لە کلیل دەکاتەوە" سرزمین ایران، قسمت پنجم: آنچه رعد گفت".

دیسان دەگەڕێمەوە سەر قسەی ڕەخنەگر کە دەڵێ شاعیر پێشکەوتی مەکینە و شاری پێ خۆش نییە.

لێرەدا باسی شیعری سوارە لە سەر پێشکەوتی مەکینە نییە. ئەوەی کە شاعیر لە بەرابەریدا ڕاوەستاوە ئەوەیە کە نابێ هەست و عاتیفەی مرۆڤایەتی و باری ژیان و پاکی و سەداقەت دە پەنا پێشکەوتی مەکینەدا فیدا بکرێن. شاعیر، موهەندیس نییە کە باس لە مەکینە بکا. گەورەترین گراوی ئەو خەڵکە و تەنیا فکر و خەیاڵی ئەو گراوییە کە بە ناوی "گوڵم" بانگی دەکا.

وتمان ئەو شیعرە باس لە پێشکەوتی مەکینە ناکا و دژایەتی دەگەڵ ئەو نییە، بەڵام چونکەڕەخنەگر بەو باریدا لێکی داوەتەوە و سوارەی لە شیعری شاردا وەک کەسێک بە خوێنەر ناساندووە کە پێشکەوتی مەکینە و جیابوونەوەی هێڵی نێوان هەژار و دەوڵەمەندانی پێناخۆشە. دەمەوێ لێرەدا ئەوە بگەیەنم کە ئەگەر بمانەوێ لە باری پێوەندی پەدیدەکانەوە بۆ یەک بچین، ئەو شیعرە لە خزمەت پێشکەوتی مەکینەشدایە، بۆ؟ شاعیر کۆمەڵ هان دەدا لە

باری سیاسییەوە ئاڵوگۆڕێک لە حاڵەتی شاردا پێکبێنن و گازندە لە باری ئێستای شار دەکا. کاتێک ئەو ئاواتانەی شاعیر وەدی بێن و ئاڵوگۆڕەکە پێکبێ، دیارە لە وڵاتدا ئازادییەکی زۆرتر دەبێ و خەڵک بە دڵێکی شاد و دوور لە بەند و تێل و کەلەپچە و گزە و فروفیڵ خەریکی فێربوونی ڕشتە جۆراوجۆرەکانی ئەدەبی و زانستی دەبن، زیاتر لە شارستانییەت حاڵی دەبن و ئەوە پێشەکی هەمان پێشکەوتێکە کە ڕەخنەگر ئاشیرەی پێکردبوو یانی ئەو ژیانەی شاعیر داوای دەکا پێشکەوتی مەکینە و شارستانییەتیشی تێدایە. شتێکی دیکەی کە دەبوایە ڕەخنەگر سەرنجی پێبدا باری سیاسی ئەو سەردەمەیە کە شاعیر شیعرەکەی تێدا نووسیوە: ئەو شیعرە لە زەمانێکدا نووسراوە کە زمانی شاعیر، بۆ گەیاندنی مەبەست زمانی سەمبول، ئوستوورە و ئیستعارە بووە. سوارە بە زمانی ئیستعارە مێژوو تۆمار دەکا و بە ڕاستی کە ئەوە ڕاستترین مێژوویەکە کە نووسراوەتەوە. لەو شیعرەدا بە زمانی تەشبیە و ئیستعارە و ڕەمز و ئیما زۆر قسەی ئازادیخوازانە نووسراون کە شیعرەکە بەرزتر دەکەنەوە و بەرەبەرە ئاشیرەیان پێدەکەین. ڕەخنەگر نە دەبێ بە سەر ئەو بارەی شیعرەکەدا باز بدا:

**ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت**
**لە شاری چاو لەبەر چرای نیئۆن شەوارەکەت**
**بڕۆمە دێ کە مانگەشەو**
**بڕێتە ناو بزەم.**

ڕەخنەگر دەڵێ: (ئەگەر مەبەستی هۆنەر ئەوەیە کە ڕواڵەتی ڕازاوەی شار سەرپۆشێکە لە سەر زام و چڵکەکانی هەژاریی و چینایەتی، بێ گومان تاریکی شەو، ناتوانێ تیشکی چرایە ون بکا و واقیعە لەوە زۆر بەهێزترە و... بە دوای ئەمەدا دەبێ بڵێم کە گوندەکانمان ئەوەندە ئاوەدان و گەشەکردوو نین کە مانگەشەوی بڕێتە نێو بزەی جووتیاری ماندوو...)

من دەبێ دیسان دووپاتی بکەمەوە کە بۆ ئەوەی بتوانین ئەو شیعرە لێک بدەینەوە دەبێ بچینەنێو ڕۆحی شاعیرەوە، دەبێ بزانین مەبەست لە چرای نیئۆن و مانگەشەو لەو هەڵسەنگاندنەدا چییە و شاعیر چی دەوێ؟

لێرەدا چرای نیئۆن بە مەزهەرێک دانراوە کە نوێنەری تیشکێکی هەڵخەڵەتێنەرە. ئەو نوور و تیشکە پاکە نییە کە شاعیر مەبەستییەتی. شاعیر بە دوای پاکیدا دەگەڕێ و بۆ نوورێکی خاوێن و گەش و سروشتی چاو دەگێڕێ، بەڵام چرای نیئۆن ئەوە نییە، بەپێچەوانە چاو شەوارە دەکا و ڕەنگی واقیعی لەبەر چاو ون دەکا، نوورەکەشی نوورێکی دەستکردە، ئەو نوورە لەجیاتی نووری واقیعی لە شاردا بە خەڵک ناسێنراوە و خەڵکیش پێیان جوانە و

فریویان خواردووه. شاعیر دیسان دەیەوێ بچێتەوە گوند. بۆ ئەو کارە دەکا؟ شاعیر لە سەردەمی منداڵییەوە، بە نووری خاوێنی مانگەشەو دڵی کراوەتەوە. ئەو ئاشقی گوندە، چونکەئێستا فڕوفێڵ بە سەر ژیانی خەڵکیدا زاڵ نەبووە. لەوێدا هەست بە ئازادی دەکا و بە پاکی، دیسان مەسەلەکە دێتەوە سەر باری ڕەمز و ئیستعارە. لە شاردا خەریکن بە چرای نێئۆن چاوی خەڵک شەوارە بکەن، بەڵام لە گوندەکاندا خەڵک نووریکی واقیعی دۆزیودتەوە ـ ئەو لە گونددا کاتێک بە بەشی زۆری ئاواتەکانی دەگا بزەی دێ و مانگەشەو دەزێتە نێو بزەی. ڕەخنەگر دەڵێ ئەم وێنەیە "هەم هەڵەیە و هەم لاواز" بەڵام هەر وەک باسمان کرد هیچ لاوازی و هەڵەیەکی تێدا نییە و ڕەخنەگریش بەڵگەیەکی بۆ سەلماندنی قسەکەی نەهێنابۆوە.

# ڕەخنەلە سەر ڕەخنەی شیعری "شار"ی سوارە ئێلخانی زادە

## (٢)

**مارف ئاغایی**

**چلۆن بژیم لە شارەکەت**
**کە پڕ بەدڵ دژی گزەم**

ڕەخنەگر دەڵێ: (نازانم گزە چییە بە لای هۆنەرەوە؟ ئایا ئەو هەموو زوڵم و زۆر و جیاوازییەچینایەتییەی سەردەمییەتی کە لە کۆمەڵگاکەیدا دەیبینێ؟ ئەگەر ئەوەیە کە نابێ لێی ڕاکا و دەبێ لە بەرامبەریدا ڕابوەستێ).

نەخێر گزە ئەوە نییە کە ڕەخنەگر نووسیویە. گزە ئەو فرۆفێڵەیە کە لە شاردا شاعیر چاوی پێکەوتووە: ئەو بارودۆخەیە کە شاعیری هێناوەتە سەر ئەو بڕوایە کە دەبێ لەو قۆناغەدا شوێنێکی دیکە بۆ دامەزراندنی ویستەکانی هەڵبژێرێ، شوێنێک کە پاکی و سەداقەتی لێ بیارێ. ئەو شیعرە وشیارکردنەوەی تێدایە، بەڵام ڕاکردن لە هیچ کوێدا باسی لێ نەکراوە.

پاشان ڕەخنەگر دەڵێ: (گزە "چییەکە شاعیر باسی لێ دەکا و بۆ بەرەو دێ دەڕوا؟" سیمای سواڵکەرەکان و دەستفرۆشەکانی قەراغ شەقامەکان و قاچڕووتی منداڵانی شارەکە وەک گزە خۆ دەنوێنێ).

سوارە ئەگەر قاچوقولی ڕووتی هەژارانی پێ گزە بێ لە شارەوە بەرەو گوند نەدەڕۆیشت. مەگەر قاچوقولی ڕووت و هەژاریی لە شاردا زۆرترە یا لە گوندێکی وڵاتی کوردەواریدا؟ ئەو قسەیەی ڕەخنەگر لە شیعرەکەدا پشتوانەیەکی نییە.

**لە شارەکەت مەلی ئەوین غەوارەیە**

ڕەخنەگر دەڵێ: "مەگەر فەرهەنگی شار دوورە لە خۆشەویستی و هەستونەستی مرۆڤایەتی"؟

دەمەوێ لە وڵامی ئەو قسەیەی بەڕێز باوکی تارادا ئاشیرە بەو مەسەلەیە بکەم کە ئەوینو خۆشەویستی و دۆستایەتی و دوژمنایەتی و... هەمووی ئەوانە نیسبین. هەر کەس بەپێی دابونەریت و ئاکار و کردەوەی خۆی و کۆمەڵەکەی فێری ئەو واژە پڕ مانایانە دەبێ (وئەڵبەت هێندێک کەس لەو سنوورانەدا نامێنێتەوە کە باسێکی جیایە). سوارە لە گوندەکانی کوردستاندا گەورە بووە. لە وڵاتێدا کە ئەو ژیاوە ئەوین لە شیری دایک پاک و

خاوێنتر بووە. فروفێڵ لە ئارادا نەبووە. کیژ لە سەر خۆشەویستی کوڕ و بەپێچەوانە گیانیان بەخت کردووە، بەڵام ئێستا بە سەر ژیانێکدا کەوتووە کە لەوێدا ئەوین ئەو مانایەی نەماوە. پێشکەوتی شارستانییەت خەریکە ئەوین لە نێو چەرخی ماشێنەکانیدا لەتوپەت بکا. مەلی ئەوین ناتوانێ بە ئازادی بفڕێ و غەوارە دەکرێ و ئەوانە شاعیر تووڕە دەکەن. ئەگەر قەرار بێ لە شارستانییەت قسە بکەین سوئێد زۆر لە وڵاتی ئێمە لە باری سەنعەتەوە پێشکەوتوترە، بەڵام کاتێک «بەڕۆژ ئاکرەیی» کە یەکێک لەو شاعیرانەیە کە ماوەی چەندین ساڵ لە ئێراندا ژیاوە دەچێتە وڵاتی سوئێد پاش ماوەی ساڵ ونیوێک ئەو شیعرە دەنووسێ:

**"دان پیانان"**

**لە وشکەسەرمای ئەم نامۆییەدا**
**لێوەکانمان**
**بە گۆرانییەک گەرم دەکەینەوە**
**شەو کە دێت و خۆر وەدەر دەنێ**
**لە پێخەفی یادەکانمانا گرمۆڵە دەبین**
**کە پێستی شەویش بە دەستی خۆر**
**تووڕ هەڵدەدرێ**
**چاوەکانمان لێک دەنێینەوە:**
**لێرە ژیان**
**دەفتەرێکی دڕاوی بەر ڕەشەبایە**
**(١١,٩٠ Stockholm)**

شاعیر ژیانی وڵاتێکی بەڕواڵەت پێشکەوتووی وەک سوئێد بە دەفتەری دڕاوی بەر ڕەشەبا لێک دەداتەوە، بەڵام ئێمە حەقمان نییە ڕەخنەی ئەوەی لێ بگرین کە بۆ وا دەڵێ.

ڕەخنەگری بەڕێز دەبێ هەوڵ بدا شاعیرەکان فێری ڕاستی و پاکی دەگەڵ هەستی شاعیرانەیان بکا. شاعیر لەحزەیەک لە زەمان تۆمار دەکا و دەبێ لەو تۆمارکردنەدا درۆ دەگەڵ خۆی نەکا.

سوارە کە لە شاردا لە ساڵەکانی ڕەشی ژیاندا دەڵێ مەلی ئەوین غەوارەیە ئەوە لەو پەڕی ڕاستیدا قسەی کوتووە. هیچ شاعیرێکی گەورە دەگەڵ هەستی خۆی درۆی نەکردووە. ئەو ئەوینی خۆی دەردەبڕێ و بێزارییەکەشی ڕادەگەیەنێ بێ‌ئەوەی ترسی هەبێ.

سوارەی شاعیر ئازادە کە لە ئەوین بدوێ و بێ باکانە بە خەڵکی شار بڵێ کە ئێوە مەلی ئەوینتان غەوارە کردووە و لەو حاڵە تووڕەییەدا ئەوەش بە شیعرەکەوە زیاد بکا:

**ئەڵێی لە دەوری دەست و پێم**
**ئەوەی کە تێل و تان و رایەڵە**
**کەلەبچەیە**

لە نێو کۆمەڵێکی ئاوەها شاعیر هەست دەکا خۆی زیندانی کردووە و هاوار دەکا ئەو کەلەبچە و تێل و تان و رایەڵە بپسێنن و بە شوێن ئەوینی واقیعیدا بن. تەسلیمی رەوتی ئاسایی ژیان و چارەنووس مەبن و خۆتان رزگار بکەن. ئەگەر ئێمە شاعیر بە پێشرەوی کۆمەڵ بزانین دەبینین کە لە راستیدا کۆمەڵیش هەروا کەوتۆتە بەندی رایەڵ و کەلەبچە.

**دەستی گەرمی ئاشنا نییە کە ئەیگوشم**
**دەستی چێوییە**
**لە شارەکەت زەلیلە شێر، گوڵم**
**باوی رێوییە**

ئیتر لێرەدا سوارە بە ئاشکرایی بە خەڵک دەڵێ کە ئێوە ئەوەندە لە هەستی من دوور کەوتوونەوە کە هەست دەکەم دەستەکانیشتان گەرموگوڕییان تێدا نەماوە و بێ گیان بوونە و وەک شتێکی دارینیان لێ هاتووە، خوێنی رەگەکانتان ویشک بووە و ئێستا من ئەگەر هەر ئاوا بمێننەوە دەمەوێ بڕۆم. پاشان گازندە لە باری سیاسی بە شێوەیەکی ئاشکرا دێتە گۆڕێ، لێرەدا لە نێوان خوێنەر و شاعیردا پەردەیەکی ئەوتۆ نامێنێ. ئەو هاوارە بە خەڵک دەڵێ کە لە شارەکەتاندا شێر زەلیلە. ئیتر مانا لەوەی روونتر نابێ. کاتێک لە زەمانی دەسەڵاتی پاشایەتیدا بڵێین "باوی رێوییە" هیچ قسەیەک لە پەنا پەردەدا نامێنێ. ئەودەم رووناکبیرەکان لە گۆشەی زینداندا بوون و هەرچی ئازا و شێرانە دەژیا یا ئاوارەی شاخ و کێو بوون یا لە دەرەوەی وڵات نیشتەجێ بوون یا لە نێو بەندیخانەکانی رژێمی پاشایەتیدا بوون. سوارە بۆ دەیەوێ لە شار کە "باوی رێوییە" بڕوا و بچێتە گوند؟

ئەگەر رەخنەگر هەوڵی دابێ بۆ ناسینی زەمانی نووسینی ئەو شیعرە دەیزانی کە لەو سەروبەندیدا لە گوندەکانی کوردستان هێندێک لە رووناکبیرە ئازادیخوازەکانی کورد لە دژایەتی دەگەڵ رژێمی چەپەڵی پاشایەتی هەستابوونە سەر پێ و سوارە خۆی وەک یەکێک لە ئەوان دەزانی. ئەوەیە کە شاعیر دەیەوێ بۆ گوند یانی ئەو شوێنەی کە شێرەکانی لە ئامێزی خۆی گرتووە بگەڕێتەوە، بەڵام رەخنەگر دەڵێ: (کاک سوارە لێرەدا رەنگە مەبەستی ئەوە بێ کە خۆی وەک هونەرێک دیار نییە و رێز و نرخی خۆی نادرێتێ).

کاک سوارە لە هیچ یەک لە بەرهەمەکانیدا "من"ی تاکە کەسی بەکار نەهێناوە. ئەو لە هەموو بەرهەمەکانیدا بە زمانی رەمز و ئیستعارە دەگەڵ خەڵک دەدوێ. ئەو جار سوارە

دەیەوێ بچێتە دێ، بۆ مەگەر لە باری ئەدەبییەوە خەڵکی دێ گەیشتبوونە ئەو ڕادەیەی کە لە شیعری کاک سوارە حاڵی بن و بایەخی بۆ دابنێن. ئەوە ئێمە لێی حاڵی نابین و ناتوانین ڕێزی پێویستی بۆ دابنێین مەخوازە خەڵکی دێ! کە وا بوو چۆن دەتوانین بڵێین سوارە لەبەر ئەوە هەڵدەهات کە بایەخی ئەدەبییەکەی نەزانراوە. ئەگەر ڕەخنەگر زیاتر لە سەبکی کاک سوارە ورد ببایەوە بۆی دەردەکەوت کە ئەو شاعیرە لە خزمەت هەستی پاکی خۆیدایە و بۆ چەپڵەلێدان و ئافەرینی خەڵک شیعر نانووسێ. سوارە لەو شاعیرانەیە کە دەبێ ڕەخنەگر ببێتە پردی نێوان ئەو و خەڵک و بۆخۆشی ئەو ڕاستییە دەزانێ.

پاشان ڕەخنەگر دەڵێ: (ئەرکی سەرشانی شاعیر چییەکە نایەوێ خەڵک وشیار بکاتەوەو لە لایان بمێنێتەوە) هەروەها درێژەی پێدەدا و دەڵێ: (سوارە بێزارانە هاواری تووڕەبوونی خۆی لە ئاستی شار بەرز دەکاتەوە و لێی دوور دەکەوێتەوە، بێ ئەوە ڕۆشنی کاتەوە کە هۆی ئەم هەموو گرفتارییە چییەکە وا لە شاردا ڕوو دەدەن؟) ،بەڵام دیسان ڕەخنەگر باش لە شیعرەکە ورد نەبۆتەوە دەنا هێندە کەم لوتف نەدەبوو. مەگەر وشیار کردنەوەی خەڵک چییە؟ ئایا گرێ پووچکەی گرفتاری لەوە زیاتر باسی لێ دەکرێ. سوارە زۆر بە ڕۆشنی و ئاشکرایی دەڵێ "ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت" چونکە: لێرە تیشکی خۆرەتاو لە بەندی دووکەڵی دەوڵەمەنددایە، گزە و فرۆفێڵ لەوپەڕی خۆیدایە، خەڵک بە چرای نێئۆن فریو دەخۆن، قۆندەرەی پووڵ و پارە هەتا عەرش بەرز کراوەتەوە، لە هەموو کۆڵانێک شەپۆڕی شین دێ و شێر لە بەند دایە و ڕێوی دەسەڵاتی بەدەستە و...

ئایا لەوە زیاتر خەڵک ڕێنوێنی دەکرێ. ئەگەر ئێمە دەڵێین شیعر نابێ دروشمی پەتی بێ، مەبەست ئەودیە کە سوارەش نابێ بڵێ "بمری زۆردار و بژی کرێکار" لە حاڵێکدا هەر ئەو قسانە لە قالبی شیعردا وتراون. ڕەخنەگر چاوەڕوانی دروشمە لە شاعیر، بەڵام شاعیر ئێزن دەدا هەتا وێنە شیعرییەکانی قسەی دڵی بگەیەنن و خوێنەریش لێکی بداتەوە.

ڕەخنەگر دەنووسێ: "وا دەردەکەوێ کە تووڕەیییەکەی هۆنەر لە شار بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە نرخی ئەو نازانن و مەودای نادرێ کە دەست لە نێو دەستی یارەکەی لە شەقامەکاندا بگەڕێ و هۆنراوەی ناسک بهۆنێتەوە!"

لە تەواوی شیعرەکەدا سوارە بە شێوەیەکی لە ئەوین دواوە کە هیچ ڕەنگی ئەوینی نێوان کوڕ و کچ نادا. تەنانەت کەس لەو شیعرەدا پێهەڵاگوتنی کیژێکی وەبەر چاو ناکەوێ و دەتوانێ ئەو گوڵەی سوارە کیژێکی واقیعی نەبێ، بەڵام ڕەخنەگر نە تەنیا بە دڵنیاییەوە دەڵێ یارەکەی کیژە و واقیعییە بەڵکو زۆر ئەولاتریش دەڕوا و دەڵێ سوارە لە داخی ئەوەی دەچێتە دێ کە نایەڵن کیژە خۆشەویستەکەی دەست لە نێو دەستی بنێ و پێکەوە لە شار

بگەڕێن. بە بڕوای ڕەخنەگر سوارە لەو بارەوە لە گوند ئازادترە و لەوێ دەتوانێ دەست لە نێو دەستی کچێکی کورد نێ و کەسیش نەڵێ پشتی چاوت بڕۆیە. سوارە ئەو گوڵەی وەک مەزهەری خەڵک هەڵبژاردووە و کەسێکە کە خۆی بە گیان و دڵ عاشقی بووە و خۆشی دەوێ، بەڵام هەموو ئەوینێک تایبەت بە کیژ نییە.

لێرەدا ڕەخنەگر دەبوایە سەرنجی دابێ کە ئەو گوڵە کیژێکی ئاسایی و یا هەر کیژ نییە. لەو شیعرەدا خەڵک لە گوڵەکەیدا خۆ دەنوێنێ و گوڵەکەی لە خەڵکدا. ئەو دووە لێک ناکرێنەوە. دەردی سوارە دەردێکی فەردی و تاکەکەسی نییە بەڵکو دەردێکی گشتییە و لێککردنەوەی ئەم دووە سەر لە خوێنەر دەشێوێنێ. تەنانەت "من"یش لە شیعری سوارەدا "من"ێکی جیا و هەڵبڕاو لە کۆمەڵ نییە و "من"ێکی کۆمەڵایەتییە.

ئەو شیعرەی کاک سوارە باسی دڵداری نێوان کیژ و کوڕێک نییە. بەڵکو خۆشەویستی نێوان شاعیرێک و میللەتێکە دەنا لانیکەم لە شوێنێکدا بە یارەکەی دەگوت وەرە با بڕۆین و پشت لە خەڵکێکی ئاوا بکەین و بە ژیانی خۆمان ڕابگەین.

ئەگەر ئەوینی کاک سوارە هەر کیژێک بوایە ئەوە زۆر بە ئاسانی چارەسەر دەکرا، بەڵام ئەو لە کۆمەڵ تووڕەیە و دەڵێ:

**گوڵم، هەرێمی زۆنگ و زەڵ**
**چلۆن ئەبێتە جارەگوڵ**
**لە شاری تۆ، لە بانی عەرشە قۆندەرەی دراو**

ئەو مانایە دەگەڕێتەوە سەر ئەو بیروڕایەی کە لە سەرەتادا وتمان ڕەنگە بناخەی شیعرەکەی لە سەر دامەزرابێ. شاعیر پێی وایە لە نیزامێکی ئاوادا شار ناتوانێ ببێتە جارەگوڵ مەگەر ئەوەی کە جموجۆڵەکە لە گوندەوە دەست پێبکا.

من بەوە دەڵێم هاوارێک بۆ وشیاری و بێداری، من بەوە دەڵێم گازندەیەکی دڵسۆزانە و هەستانەوەیەکی دلێرانە، بەڵام ڕەخنەگر پێی وایە کاک سوارە بڕوای بە ئاڵوگۆڕ نییە. ئەگەر بڕوای بە ئاڵوگۆڕ نەبوایە هاواریشی بۆ نەدەکرد. ئەگەر بڕوای بە پێشکەوتی کۆمەڵ و بە دەریا گەیشتن نەبوایە "خەوەبەردینە"ی کە دەرسی پێشکەوتنە نەدەنووسی:

**کێ لە شاری قاتڵی هەژار**
**گوێ ئەداتە نایەتی پەراوی دڵ؟**
**منێ کە گۆشی تاوی گەرمی بەردەوارەکەی عەشیرەتم**
**بە دارەتەرمی کووچە تەنگەکانی شارەکەت**
**ڕانەهاتووە لەشم[1]**

ڕەخنەگر دەڵێ: (ئەو ئایەتی پەراوی دڵ چییە؟ ئەگەر باسی زولف و بسک و ڕەنگ و ڕووی تەنیا گوڵەکەی هۆنەرە، بە ڕاستی کاک سوارە ڕاستی وتووە، لە شاری قاتڵی هەژار کەس گوێ ناداتە ئەو ئایەتە)

من نازانم کاک سوارە لە کوێ باسی زولف و بسکی کردووە هەتا ئایەتی پەراوی دڵی ئەو شتانە بن. ئێمە دەبێ لە سەر شیعری کاک سوارە قسە بکەین یا لە سەر خەیاڵی خۆمان؟ ڕەخنەگر بۆخۆی کاناڵێکی بۆ ئەو شیعرە کێشاوە و لە هەر شوێنێک لە چوارچێوەی بیری خۆیدا نەماوە ڕەخنەی لێ گرتووە.

کاک سوارە لە پەخشانی "زولالترین پێکەنینی جیهان"دا ئەڵێ: "شار، گیان و ڕەوانی نەخۆشە. ئەسپەک لە سەری داوە گێژ و وڕە"... "تۆفانێک لە پشت دەریاوە دێ و باری نەگبەت هەڵئەڕێژێ لە گوڵزاری شارا هەموو گوڵێکی قەتڵعام کردووە... ئەم تۆفانە لەوپەڕی چەند دەریاوە دێ. چی ئەهێنێ؟

نەگبەت، درۆ، گوڵی کاغەزی، تریا، وە چی ئەبا گوڵی گەش و پیاوەتی و ئەوینی بەڕاستی."

ئێستا ڕەنگە بۆ ڕەخنەگر دەرکەوتبێ کە سوارە دژی مەکینە نییە و لەبەر دڵداریش لە شار هەڵنایە! بەڵکو...

ڕەخنەگر لە کۆتایی وتارەکەیدا دەنووسێ هەر چەند تەنیا لە ڕووی نێوەرۆکەوە ئەم شیعرەی شی کردۆتەوە، بەڵام (لە بارەی زمان و ڕواڵەت و ڕەسەنبوونی وشەکانییەوە بێ کەموکووڕی نییە. بۆ نموونە ئەگەر سەیرێکی ئەم بەشەی هۆنراوەکە بە وردی بکەین، دەبینین کە دەلەنگێ و بە تەواوی مانا نابەخشێ و وشەیەک کە هەڵبژێردراوە لاواز و بێ دەسەڵاتە لە گەیاندنی مانادا، وەک دەڵێ:

**بە هەر نیگایەک و پەتایەکا**

**ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت، گوڵم**

بە بڕوای من لێرەدا پەتا دوو مانای هەیە کە هیچیان هەڵە نین. یەکەمیان: لە سەرەتادا شاعیر باسی شاری نەخۆش و تاو و یاو دەکا و لێرەش کە دەیەوێ دەگەڵ یارەکەی بدوێ بە هەر ڕوانینێک کە پەتایەک دەبینێ جارێک مەسەلەی ڕۆیشتن لە دڵیدا زیندوو دەبێتەوە "پەتا" چەشنە نەخۆشییەکە. یا ڕەنگە شیعرەکە ئاوا بووبێ: "بە هەر نیگایەک و پەتایەکە" یانی هەر ڕوانینێکی ئێوە نەخۆشییەکی تێدایە.

گوایە "پەتا" مانای بە دزی ڕوانین و ورد ڕوانینیش دەدا کە بەو شێوەیە کاک سوارە دەتوانێ ئەو مانایەشی لەبەر چاو بووبێ و لە هەر حاڵێکدا مانا دەدا.

دیسـان ڕەخنەگر ئەو دێڕە بۆ وێنە دێنێتەوە:

**لە شاری تۆ لە بانی عەرشە قۆندەرەی دراو**

و دەڵێ: "دیار نییە قۆندەرەی دراو لە سەر عەرشە یا وەکو هێنی خاوەن دراو"

ئیتر کە ئەوە دیار نەبێ هەر هیچ شتێک دیار نابێ. سوارە وەک شاعیرێک هەقی هەیە بۆ ئەشیا گیان قایل بێ. قسەیان دەگەڵ بکا و بە بۆچوونی خۆی کەسایەتییان بداتێ. پووڵ و پارە لە لای شاعیر کەسایەتییەکی باشی نییە. بۆ ڕەخنەگرتن لە کۆمەڵ دەیەوێ لەوە بدوێ کە لە شارەکەتاندا پارە لە مرۆڤی واقیعی زۆر بەڕێز و حورمەتترە و بۆ ئەوەی مەبەستەکەی بگەیەنێ دەڵێ ئێوە نە تەنیا خودی پارەی (کە بەلای شاعیرەوە زۆر بێ نرخە) بەڵکو کەوش و قۆندەرەی ئەم پارەیەشتان تا بانی عەرش بەرز کردۆتەوە و بایەختان بۆ داناوە. ئەو تەشبیهە هیچ لاوازییەکی تێدا نییە. ڕەخنەگر پێی وایە دەبێ سوارە مەبەستی کەوشی "خاوەن دراو" بووبێ، بەڵام دیسان دێینەوە سەر ئەم مەسەلەیە کە لە ڕەخنەگر بپرسین ئەتۆ ئەو خاوەنەت لە کوێ بۆ "دراو"ی کاک سوارە دیتەوە! یا ئەگەر مەبەستی ئەوەیە کە بڵێ "قۆندەرەی دڕاو" مەبەستی سوارەیە، ئەوەش کە شتێکی ڕوونە سوارە لە شاری ئاوادا لە سەر ئەم بڕوایە نابێ کە کەوشی شڕ و دژی هەژاران ئەو بایەخەی پێدراوە. جگە لەوەش "هەراو" قافیەکەی "دراو"ە نەک "دڕاو".

پاشان ڕەخنەگر دەڵێ: (لە بارەی ڕەسەن نەبوونی وشەوە دەتوانین سەیرێکی ئەم وشانەی خوارەوە بکەین: ئینتزار، گوناه، عەرش، قۆندەرە، عیلاج و...)

بەکارهێنانی ئەم وشانە لە زمانی کوردیدا هەڵە نییە و ئیتر عیلاج و گوناهو ئینتزار ئەوەندە کوتراوە کە هەموو کوردێک بە کاریان دێنێ. تەنانەت خودی ڕەخنەگر لەم وتارەدا وشەی ئاوای بەکار هێناون و منیش لە وڵامیدا دەڵێم لە بارەی ڕەسەن نەبوونی وشە دەتوانین سەیرێکی ئەم وشانەی خۆت بکەین! قەفەس ـ واقیع ـ ڕەفتار ـ گوفتوگۆ ـ مەسەلە و...

بەڵام من پێم وایە ئەو لە کاتی نووسینی وتارەکەیدا هەر پێی وابووە ئەو وشانەش کوردین چونکەلە منداڵییەوە قسەی پێکردوون و بۆی ئاشنان و نە عەیبە و نە هەڵە.

---

١ـ لە دێڕی سێهەم هەتا پێنجەمی ئەو کۆپلەشیعرەی سەرەوەدا بە بڕوای من شاعیر یەکێک لە جوانترین وێنەکانی شیعری نوێی کوردی خوڵقاندووە، بەڵام چونکەڕەخنەکانی باوکی تارا تەنیا لە نێوەرۆکی شیعرەکەیە و ئەوەی دووپات کردۆتەوە منیش لە سەرەتاوە باسی "لایەنەکانی دیکەی ئەو شیعرەم نەکردووە، بەڵام هیوادارم ڕۆژێک ئەو کارەش بکرێ و لە بابەت زمان و هەست و وەزن و تایبەتمەندییەکانی دیکەی ئەو شیعرەش بە وردی قسە بکرێ هەتا گەورەیی ئەو

شیعر و شاعیره زیاتر وەروو بخا. لێرەدا تەنیا ئاشێره بە یەک شت دەکەم و ئەویش ئەوەیە کە شیعری شار لە حالێکدا کە لە سەر شێوەی نویَ دارێژراوە وەزنی عەرووزە و لە سەر وەزنی "مفاعلن، مفاعلن"ە و هەتا کۆتایی شیعرەکە ئەو وەزنە پارێزراوە کە ئەوە گەورەیی سوارە لەو بابەتەوە دەگەیەنیَ کە نەیویستووە پێوەندی نێوان شیعری کلاسیک و شیعری نویَ بە شێوەیەک بپچڕێتەوە کە خوێنەر و شاعیرەکان تووشی سەرلێشێواوی بکا. دارشتنی شیعری نویَ لە سەر وەزنی عەرووز کاری کەم کەسانە.

# وەڵامی ڕەخنە

عەلی ڕێبوار

پێشەکی

کوا قەرەتاژدین، چەکۆ و عەرفۆ لە کوێن
بێنە هانام وەک پڵنگی چنگ بەخوێن
"هێمن"

لە وڵاتی ئێمە ئەدیبان بە گشتی و شاعیران بە تایبەتی لە ڕەخنەگرتن دڕدۆنگن. پێشینیان کوتوویانە: "پیاو ئەگەر زاری بە شیری سووتا فوو لە دۆش دەکا"! بەداخەوە لە نێو ئێمەشدا ڕەخنە ئەو شیرە کوڵیوەیە کە نووسەر و شاعیران لە دۆش دەترسێنێ. نامەوێ پاکانە بۆ بەرهەمی کز و لاوازی ئەو شاعیر و نووسەرە بێبەهرانە بکەم کە لەمەوپێش گێژداخ کراون‌و لە داهاتووشدا دەکرێن. نەقد یا ڕەخنەی باش، شاعیر و نووسەر ئەغیار دەکاتەوە و ڕادەی چاوەدێری خوێنەران دەباتە سەر. یاسای سروشتی ـ گوڵبژێر ـ (انتخاب اصلح) دەبێتە هۆی وەستانی لەڕ و لاوازەکان و پێشکەوتنی پیتۆڵ و زۆرزانەکان.

ئیتر بەرخۆڵەی چڵمنی نێو تێری سەر پشتی کەری شوانان، ڕەنگە بگەنە هەواری هەزاربەهەزاری ئەدەبیاتی گەلان، بەڵام بەرگەی تەزووی سەرمای شەوانی کوێستان ناگرن و شەکەخەزاڵان بە بۆنەی خەزاڵان تێروتەسەل نابن! ئەدی بۆ شاعیر و نووسەری ئێمە لە ڕەخنەی تۆقیون؟ چون بەداخەوە لێرە لە پێشدا کەوڵیان دەکەن دوایە قەباڵەیان دەخوێننەوە! جا حەقیانە فوو لە دۆی نەقدی باش بکەن و کەوڵیان نەدەنە بەر دەست "قەباڵە وەخوێنان" ئەوەتا شک دەبەم هەن سواری لە ئەسپی دادەبەزێن، کەوڵی لە حاجەت دەخەن و قەباڵەکەشیان پێ ناخوێندرێتەوە!

باوکی تارا کێیە؟ لە چ تەمەنێکدایە؟ جگە لە ڕەخنە نووسین چ چالاکییەکی دیکەی هەیە؟ و مەبەستی لە ڕەخنە نووسین چییە؟

جوابی ئەو پرسیارگەلە بە بڕوای من بۆ هەموو خوێنەرانی دەستەگوڵی ئەمجارەی باوکی تارا پێویستە. لە چاوخشاندنێک بە سەر شیعری شاری سوارەدا (سروەی ٥٥) ئەو برادەرە کارێکی کردووە سەرما بە هەتیو، با بە دەواری شڕی ناکا. کاکم بۆ ڕەخنەکردن! لە جامخانەی! شیعری شاردا پاچی هەڵگرتووە و خشت بە خشت دەیهێنێتەوە خوار و وەک

باری بووکێ بە چاومانی دادەدا، بەڵام ئەو بەربووکە لە پیکیش دەدا و لە ماپیکیش!

ڕەخنە دەگرێ و لە پەنادا هەر چەشنە ڕەخنەیەک لە سەر نووسراوەکەی خۆی بە تیروتانەی نازانستانە! لە قەڵەم دەدا. بە بڕوای کاکم ئەوانەی باوەڕیان بە پێوانەی زانستی هەیە بە چاوی وردەوە دەڕواننە ڕەخنە و بە هیچ جۆرێ بیروڕای تایبەتی و غەرەز و مەسەلە کەسییەکان تێکەڵاو ڕەخنە ناکەن. قسە لە سەر وەیە ڕەخنەی باوکی تارا نە زۆر زانستانەیە و نە بێغەرەز. هیوادارم بەڕێوەبەرانی سروە ئەو مافەی بۆ بێحورمەتی بە سوارە داویانە بە باوکی تارا بۆ ڕوونکردنەوەی هێندێک ڕاستی و پێشێل نەکرانی حەق بیدەن بە منیش. جا لە شەش لاپەڕەی سروەی پتر گرت باقیەکەی بۆ خۆیان وەکیل بن...

**"لاسەشۆڕێک بووم غەنیمی دوژمنان**
**ئێستە ئەنگاوم بە تیری چڵکنان"**

"هێمن"

"چاوخشاندنێک بە سەر شیعری «شار»ی سوارە" سەردێڕی ڕەخنەیەکی دووروودرێژە، لە سەر ئەو شیعرە، لە نووسینی "باوکی تارا" ناوێک. ڕەخنەی باوکی تارا شەش لاپەڕەی سروەی ٥٥ی داگیر کردووە تا پێمان بڵێ سوارە (بە بڕوای وی!) لەگەڵ شارستانییەت دژایەتی هەبووە و لەو شیعرەدا گەڕانەوەی سەر لادێ و ژیان و دابونەریتی کۆنی کۆمەڵایەتی پێشنیار کردووە! کاکڵی مەبەستی باوکی تارا هەر ئەوەندەیە! باقیەکەی درێژدادڕییەکی بێکەلک و پڕغەرەزە لەگەڵ کەسایەتی شاعیر. نیازم نەبوو بە شێوەی ئەو برادەرە شەش لاپەڕەی سروە ـ بۆ سەپاندنی خۆم ـ داگیر بکەم، بەڵام "حافز" کوتەنی:

**جای آنست کەخون موج زند در دل لعل**
**زین تغابن کەخزف میشکند بازارش**

باوکی تارا لە سەرەتای ڕەخنەکەدا بە گفتولفتێکی حەسرەتاوی دەڵێ "ماوەیەکی زۆر بوو کە ناوبانگی ئەو هۆنراوەیەی کاک سوارەم بیستبوو. لە هەر کەس باسی ئەم هۆنراوەیەی کاک سوارەم دەپرسی بە تامو چێژێکی تایبەتی و زۆرەوە بۆی باس دەکردم و لێی دەدوا..." "بەم بۆنەیەوە تاپۆیەکی گەلێک مەزن و دیمەنێکی زۆر جوان و ڕازاوە لە بارەی ئەم هۆنراوەیەوە لە بیرمدا نەخشی بەستبوو..." گوایە ئەو کەسانە کڵاوێکی گەورەیان ناوەتە سەر باوکی تارا یا خود هیچ لە شعر نەگەیشتوون، بەداخەوە باوکی تاراش درەنگی پێ زانیوە تا بەرگری لە ناوبانگی بەناحەقی! ئەو شیعرە بکات و سەمی قاتڵی ئەو شیعرە بە خەڵکی

بناسێنێ! ئیتر بۆچ درەنگی پێ زانیوە دەکرێ چەند هۆی هەبێ: یا تازە فێری کوردی و شیعری کوردی بووە یا لە هەندەرانڕا هاتووە و تازە تووشی "شار"ی بووە.! (چونکە ئەو شیعرە پێش ١٣٥٤ دانراوە. لە ژمارەی ٤ی سروەی ساڵی ١٣٦٤یشدا بە ژیاننامەی شاعیرەوە چاپ کراوە. ئەی بۆچی باوکی تارا وا درەنگ تووشی "شار"ی بووە؟ خوا دەزانێ)، بەڵام زەرەر لە نیوەش ڕا بگەڕێتەوە هەر قازانجە، هەر بۆیە باوکی تاراش قۆڵی هەڵکردووە تا ئەو کۆمەڵە کوردینەزانە لە شیعر ناحاڵییە (کە بە فریویان بردبوو) ڕێنوێنی بکا و ببێتە چاوساغیان بۆ کۆڵانەکانی شاری سوارە. دەرکاوەرکیان پێ بکا و بۆیان لە بنی کوولەکەی دا تا حاڵی بن ئەو "تاپۆگەلێک مەزنە" چ مۆتەیەکە.

ئەنجا با بزانین پێوانەی باوەڕپێکراوی (زانستانەی!) چاوساغەکەمان چییە؟ و بۆ دەدرێتە بەر گوللەی تاوانباریی و بوختان؟ (از کرامات شیخ ما اینست)!

پێوانەی (زانستی) باوەڕپێکراوی باوکی تارا بە قسەی خۆی خرکەبەردێکی لەدەستانخۆشە!

"ئەوانەی باوەڕیان بە پێوانەی زانستی هەیە و باوەڕەکانیان جامخانە! نییە و لەوەی ناترسن کە پێوانەی زانستی وەک بەرد بیشکێنێ و لە نێوی بەرێ. کە واتە شار لێرەدا جامخانەیە (خوالێخۆشبوو مامۆستا هەژار بە ـ کۆشکی بلوورین-ی تەعبیری" قصر آبگینە"ی ڕازاندەوە تا باوکی تارا بیکاتە جام + خانە و باسی ڕەسەن نەبوونی وشەش بکا!)و نەقدی ئەوتۆش بەردێکە و ئەو جامخانەیە دەڕووخێنێ! جا کابرا: لەو ڕووخاندنە چ ئامانجێکی هەیە و دەیەوێ لە جیاتیانی چ سازکا خۆی دەزانێ!

ئیزن بدەن لە بەر تیشکی لێکۆڵینەوەی! باوکی تارا لەو شارەدا بگەڕێین و وشیار بین چاوساغەکەمان لە لایەن لایەنگرانی سوارەوە نەکرێتە نیشانەی تیروتانەی نازانستانە! (لێش دەدا و هاواریش دەکا)!؟ خوا یار بێ و باوکی تارا داواکار لە وتارێکی دیکەدا دێڕ بە دێڕ شوێنی هەڵدەگرم و تەواوی هەڵەکانی ئەو چاوساغە بە چاوی دادەدەمەوە، بەڵام لێرەدا تەنیا دەمەوێ لەسەر مەبەست و ئامانجی باوکی تارا لەو گێرەشێوێنییە بدوێم:

* * *

باوکی تارا لە وتارەکەی خۆیدا نوێنەری پرۆلیتاریای مەزن و شۆڕشگێڕی! شارییە لە بەرانبەری شاعیرێکی بورژوای تێروتەسەلی لادییی. ئەو باوەڕەوای شاگەشکە کردووە کە "دۆن کیشۆت"ئاسا لێی سواری کەرە شەلەی مانیفێستی! خۆی بووە و هەڵیکوتاوەتە سەر ئەو "شوالیە" دەرەبەگە "دێخوازەی ڕۆژی شاری پێ چڵکن و نەخۆشە و شاری پێ قاتڵی هەژارە. ڕۆیشتنی شاعیر لەو شارە ـ بە ڕاکردن لە قەڵەم دەدا و حەقی پێنادا لەو شارەی ـ

بچێتە دەر (لە بێرلەنی ناوەندی ئاڵمانی ڕۆژهەڵات"یش دا برادەرانی هاوبیری باوکی تارا سی ساڵی ڕەبەق دیواریان کێشا و بە تووڕەییـیەوە هاواریان دەکرد. خەڵکینە دووکەڵە هەتانە! کەرەسە و مەکینەیە هەتانە ـ هۆیەکانی بەرهەمهێنان و ئابووری شارە، هەتانە (ل ١٨ی سروە) بەرەو لە نێوبردنی تانوپۆی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی و ئیستیکباریش! دەڕۆن ـ ئیتر بۆچ لەو شارەی هەڵدێن؟ برایانی باوکی تاراش تەنیا بەوە تووڕە بوون سوارە قۆڵ لە قۆڵی دڵدارەکەی لە شاردا پیاسە بکا. (ل ١٨) خوا لێیان خۆش نەبێ "جارەگوڵ"یان هەبوو و نەیاندەزانی بە کاری چ دێ؟ چەند و چوونی ئەو شارە بچن لە باوکی تارا یا "تێریش هۆنێکێر" (دیکتاتۆری پرۆلیتاریای ئەڵمان) بپرسن کە چل‌وپێنج ساڵ لە بێرلین داسی بە چەکوچی ڕەقاندەوە!

تا ئێرە تایبەتمەند ییەکانی شاری پەسندی باوکی تارامان ناسی: شاری پێشکەوتنی مەکینە! چین و توێژە کۆمەڵایەتییەکان ـ هەژار و چەوساوە ـ سامانداری و کەرەسە ،مەکینەی پێشکەوتوو، چەکی زۆرداری و قەڵای چەوسانەوە. شاری پاکانە بۆ ڕۆژی چڵکن و دووکەڵ (ل ١٦) سەرمایە و خەبات... هەڵبەت لەو شارەدا دەبینێ مەلی ئەوین غەوارەیە! خوێنەرانی بەڕێز خوا وەکیلی ئەو شارە لەگەڵ بێرلینی "هۆنێکێر" پێک بگرن (لە مجلەی کهکشان ـ ژمارە ٩ ـ ل ١٠ تا ١٣ ـ یا هەر سەرچاوەیەکی ئەوتۆی دی.) تا بزانن:

**دانەی فلفل سیاە و خال مهرویان سیاە**
**هر دو جانسوزند اما این کجا وآن کجا**

بە بڕوای باوکی تارا : "هۆنەر بە چاوێکی تیژ و زانستانەوە! ناڕوانێتە کۆمەڵگای شارو ژیانی شارنشینی و پەیوەندەکانی نێوانیان ناناسێ و تێیان ناگا... هۆنەر تووڕەیە لە هەموو نیشانەکانی شار و شارنشینی. کەرەسە و مەکینە و هۆیەکانی گەشەکردنی شار و شارنشینی بە دوژمنی خۆی دەزانێ و لە هەر کوێ بۆی بلوێ بە گۆچانی تووڕەیی وردیان دەکا و لە نێویان دەبا و لە هەر کوێدا بۆی نەلوا وا دەزانێ قول و زنجیرن (یانی غل و زنجیری فارسی)... و ئەوەیان بەستۆتەوە. تۆ بڵێی ئەوانەی لە وڵاتانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتدا شووشان دەشکێنن و ماشێنان دەسووتێنن و دیواران دەڕووخێنن، خۆپێشاندان و مانگرتن ساز دەکەن و تێلوتان و ڕایەڵ هەڵدەبڕن (وەک بێرلینەکەت ـ تەواوی یەکیەتی سۆڤییەت ـ چین ـ ژاپۆن ـ فەلەستینی داگیرکراو ـ ئافریقای جنووبی و...) هەمووان هەر لە قوماشی سوارەن و هەڵەن؟ یا خود دوژمنی شار و شارنشینی و شارستانییەتن؟ ڕەنگە ئەوانیش بەچکە فیئۆدال بن و بۆ بەردەوارەکەی عەشیرەت "خۆ بکوتن؟

***

کورتی بیرپنەوە: باوکی تارا بەپێچەوانەی دروشمی خۆی، وتارەکەی پڕە لە "بیروڕای تایبەتی و غەرەز و مەسەلە کەسییەکان" باوکی تارا لە تەواوی وتارەکەیدا شوعاری پڕوپووچ و منداڵ هەڵخەڵەتێنی چەپییە نەخۆشەکان بۆ لایەنگری لە کرێکار و چەوساوە و دژایەتی لەگەڵ چەوسێنەر و سەرمایە! بەرەڵلا دەکا. ئەو شوعارانەی ساڵەهای ساڵ بنێشتە خۆشکەی هونێکێر چائۆشێسکۆ، برژنێف و ستالین و... بوون و هەزاران کەسیان لە خاک ڕاکرد تا ئێستا بە سەرشۆڕی دوکانەکەیان تەختە کەن و خڕی کەنەوە و بە زیندوویی کونەمشکیان لێ ببێتە قەیسەری و بە مردووی گۆڕەوشاریان دەن و گۆڕ بە گۆڕیان کەن و لە زبڵدانی مێژوویان باوێن. (ئاوا دەبێ شوعار!) ئەوانە بوون بیروڕا تایبەتییەکەی کە باوکی تارا حاشای لێ دەکا. (دیارە ئاشەکەی زۆر سوێرە!).

غەرەزی هەیە: غەرەز لەگەڵ کەسایەتی شاعیر: پێی وایە ناکرێ کوڕی دەرەبەگێک لایەنگری زانست و پێشکەوتن بێ و حەتمەن شیعرەکەی بە دژی چینی چەوساوەی وەک باوکی تارایە! مەسەلە کەسییەکان تێکەڵ دەکا: (مەنزووری "مسائل شخصی"یە!): ئارەزووی مرۆڤێک، شاعیرێک، بۆ چوونەوەی باوەشی سروشت و دیمەنی جوانی لادێ دەکرێ مەسەلەیەکی کەسی بێ. شاعیرێکی خۆشی نەدیتووی بەندیکراو ـ دوورخراوە ـ بێ کار ـ نائومێد لە دوایین مانگەکانی ژیانیدا ئارەزوو دەکا بچێتەوە ئەو جێیەی باشترین بیرەوەرییە کانی ژیانی کورت و خەمباری لێ هەڵگرتووە تا لەوێ بمرێ:

**شنیدم که‌چون قوی زیبا بمیرد**
**فریبنده‌زاد و فریبا بمیرد**
**شب مرگ تنها نشیند به موجی**
**رود گوشه‌ای دور و تنها بمیرد**
**گروهی برآنند کاین مرغ شیدا**
**کجا عاشقی کرد آنجا بمیرد**

بەڵام مامۆستا هێمن گوتەنی: " بە مردووییش نیشانەی گوللەیە ئەو کەللە پڕشۆڕە"

ئەو شاعیرە حەقی نییە بۆ یارەکەی خۆی ڕوون کاتەوە بۆ بەجێی دەهێڵێ و دەچێتەوە دێی؟ هەموو ڕۆیشتنێک ڕاکردنە؟ (بۆریس پاسترناکی دەناسی؟) برا تۆ خۆت پاش سێزدە ساڵ لە سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی و تێکچوونی ڕژێمی شای نیگریس زاتت نییە ناوت لە پای نووسراوەی خۆت بە تەواوی و دروستی بنووسی تا خەڵک بتناسێ و بزانێ کردەوە و وتارت چەند لێک نزیکن یا دوور؟ (یا نازناوتە؟!)

سوارە ئەو شیعرەی لە تاریکترین ساڵەکانی دەسەڵاتی ڕژێمی شای فەوتاوا داناوە. شاری

سوارەی "بێرلینی" تۆ نییە. ڕۆژی ئەو "شارە" بە دووکەڵی بەرهەم هێنان (تولید) چڵکن نەبووە. شاری سوارە شاری خەسارکردنە. گزەی ئەو شارە لە چەپ و ڕاستەوە قۆڵی پیاوی دەگرن و بێ سەروشوێنی دەکەن. تاو و یاو و چرای نێئۆنی شەوەکانی هەینی "کابارەکانی تاران". هارە هاڕی ماشێنی دەوڵەمەندەکانە لە شەقام. تێل و تان و ڕایەڵی، هەر ماڵە و سیخوڕێکی، ساواکییە. دووکەڵەکەی لە ماڵی دەوڵەمەندەوە هەڵدەستێ نەک لە کارخانەی پڕۆلیتاریای ڕۆژهەلاتی! شێرە زەلیلەکەی شاعیرێکی نەقوستانی دڵپاک بوو باو باوی ڕێوی سرمەخۆری ڕژێمی شای بوو.

شاری سوارەی هەرێمی زۆنگ و زەلی کابارە و کازینۆ و تریا و تریاک و هیرۆئین و فەساد و بێبەندوباری بەردەم و سەردەمی خۆی بوو. قۆندەرەی دراو پووڵ و پارتی بوو و زیندانی ئینفرادییەکان بۆ ئەوین تەسک و بۆ خەفەت هەراو بوون. سوارەی بێچارەجارەگوڵی بێرلینی نەدیبوو تا ئاواتی بۆ بخوازێ. هەر بە وڵاتی خۆی دەزانی و ڕووی لە قوبلەی ڕۆژهەلات وەرسووڕاندبوو.

ئەوەیە شاری سوارەی کاکی برا. شارە بەقوڕێگیراوەکەی بەرهەمی بیری تۆ پەسندی هیچ کەسێکی ئاقڵ نییە و مەلی ئەوین لێی غەوارەیە. جا تۆ کە ڕێگای ئەو دوو شارەت لێ گۆڕاوە ئەو هەرا و هەنگەمەیە چییەسازت کردووە و ئەو کۆشکە بلوورینە (جامخانەکەت) بۆ دەڕووخێنی؟

ئەمن وەک تۆ نامەوێ بیروڕای خۆم داسەپێنم بە سەر خوێنەراندا. بەردی پێوانەی زانستانەش! ناهاوێمە جامخانەی "شار"ان. چون تەنانەت ئەگەر جامخانەش بن ئێستا "موزە"ی ناساندنی چاخێک لە مێژووی ئەو وڵاتەن. تۆ حەقت نییە بۆ هەڵکردنی ئاڵای بڕوای خۆت ئاڵای خەڵکی بهێنییە خوارەوە. ئەمنیش بۆیە ئەو زوڵمەت لێ دوویات دەکەمەوە تا بزانی چەند کارێکی ناشیرنە!

بەڵام چەند ڕەخنەیەک لە وتارەکەت:

١ـ لە تەواوی ئەو وتارەدا "سوارە"ت بە زەمانی حاڵ دواندووە. وەک پێت وابێ سوارە ئێستاش ماوە! ئەگینا دەکرا و دەبوا فیعلەکانت "گذشتە" یا ڕابردوو بوایەن. وەک: ئایا هۆنەر نازانێ... بێ گومان ئەوە چاک دەزانێ...(ل ١٥٦)... چونکەخۆی لە لووتکەی خۆبەزل زانین و لە دیوانی لە نێو خۆدا ژیانا دەژی و دەترسێ... (ل ١٦). سوارە لە ١٣٥٤ کۆچی دوایی کردووە.

٢ـ پێت وایە تووڕەیی مرۆڤ لە چەند شت " ضد و نقیض"ە؟ بۆ پیاو ناکرێ لە چەند شت تووڕە بێ؟

٣ـ لە تەواوی ئەو شیعرەدا سوارە بە دڵدارەکەی پێشنیار ناکا دەگەڵی کەوێ. یاخود ناگەیەنێ یارەکەی ئەو چوارچێوەی هەڵبژاردبێ و . (ل ١٥ ـ ستوونی ١ و ٢).

٤ـ لە ستوونی ٢ی ل ١٧دا فەرمووتە: هۆنەر تووڕەیە لە هەموو نیشانەکانی شار و شارنشینی و کەرەسە و مەکینە بە دوژمنی خۆی دەزانێ... بۆی بلوێ لە نێویان دەبا... برا بەو کارەی تۆ دەڵێن "تەحریف"! لە کوێی شیعری شاردا باسی مەکینە و کەرەسە و شتی وا کراوە. بۆچوونی تۆ هەڵەیە و دەیدەیە پاڵ سوارەوە. هیوادارم قەت نەبیتە مێژوونووس!

لە بابەت بۆچوونی هەڵەوە تکایە پێشەکی "ڕازی تەنیایی ـ ئەحمەد هەردی ـ چاپی دووهەم" بخوێنەوە تا بزانی بە زیندوویی سەری هاوبیرێکت چی لێ کردووە. هەروەها مامۆستای کورد ـ ژمارە ٦ـ بلوێرژەنی بۆ کێ؟.

٥ـ باسی ئەرکی سەرشانی هونەرمەندت کردبوو؟ ئەرکی تۆ چییەوەک ڕەخنەگرێک؟

٦ـ لە باری ڕەسەن نەبوونی وشەوە سەیری "شار"ت کردووە. سەیرێکی نووسراوەکەی خۆشت بکە! چونکەـ غوونە ـ کە دەلەنگێ؟ نەخشی بەستبوو ـ زانستانە! ـ هەستیار!! ـ مەکینە "ڕەنگە پێت ـ کوردی بێ" سەرمایەداران؟ واقعیە، لە هەموانیش سەیرتر جامخانەکەت. تازە پێویستە بزانی نەسری تۆ هی ساڵی ٦٩یە شیعری سوارەی هی پێش ٥٤.

٧ـ لە ستوونی ٢ی ل ١٥دا فەرمووتە: ئەم جۆرە هۆنراوەیە زۆرتر بە شێوەی کلاسیکە (چەند بە قێز و بێزەوە) و نیشانەی کەمهێزی هۆنەرە لە شێوەی داڕشتنی هۆنراوەی نوێدا! لە مامۆستا هێمنی خوالێخۆشبوویان پرسی فەرمووی: شیعر ئەگەر شتێکی تازەی پێ بێ با کلاسیکیش بێ نوێیە و..." ئەوە لە بابەت شێوەی داڕشتنەوە. خەریک بووم داوای شیعرێکی نوێت لێ بکەم، بەڵام ئەو شیعرەی "ئاراستەی"! وتارەکەت کردبوو وەبەر چاوم هات و حەیفم دێ دووپاتی نەکەمەوە:

**ئاخۆ کەی بێ سۆزی دەروون بە خاتری پارووپە نان**
**نەسووتێت و بۆکرووزی نەگرێ ئاسمان**

مەولەوی دەڵێ: آفتاب آمد دلیل آفتاب.

نازانم ئەو هێنە هی خۆتە یا شاعیرێکی پەسندت، بەڵام پیاو لە بەیتێک شیعردا قوڕوو پێوە داوە! سوارەش نەماوە تا بزانێ سۆزی دەروون چۆن دەسووتێ؟ ـ بە خاتری پاروویە نان؟ ـ خوا هەڵناگرێ بۆکرووزی ئەو شیعرەش گەییوەتە ئاسمان! وشەی ڕەسەنیش هەر باسی ناکرێ سۆز ـ دەروون ـ بە خاتری ـ نان ـ ئاسمان... جا هەتا ئەو شیعرەی تۆ لەوێ بێ کێ "گوێ دەداتە ئایەتی پەراوی دڵ"؟ کەس!.

ئەدی وەزنەکەی؟

٨ ـ زرووفی زەمانی و مەکانی شیعری سوارەت بە تێکڕا لەبەر چاو نەبووە.

هیوادارم بە چاوێکی پڕ سەرنجەوە بڕوانیتە "طرح"ی پاڵ نووسراوەکەت تا بزانی ئەو ئینسانە بە بڕوای تۆ قەڵای خشتچنی کام بیری کۆن و ویشکە؟ و لە شوێن پەپوولەی کام ئاواتا وێڵە؟ خۆزگە "طرح" چاڵاوێکیشی لەبەر پێی کێشابایەوە.

٩ـ ڕەخنەم لە سەر دێڕ بە دێڕی نووسراوەکەت هەیە ئەگەر داواکاری هەبوو دەینووسم دەنا پێم وایە ئەوەندە بەس بێ.

سوارە یا هەر شاعیرێکی دی لە ڕادەی توانینی خۆیدا کاری کردووە و بەرهەمی ماوە. ئەمانان ئەگەر پێمان وایە کاری ئەوان هەڵەیە یا کەموکووڕی تێدایە دەکرێ قۆڵ هەڵکەین و تەواوی کەین.

١٠ـ ئەگەر بەڕاستی پێت وایە: هەڵبەستی شاری کاک سوارەش تێڕوانینێکی گشتی و هەموو لایەنەیە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگای شار و لادێ، لە ڕوانگە و بۆچوونی تایبەتی شاعیرەوە (ل ـ ١٥) یا "هۆنراوەکەی کاک سوارە لە جێگای خۆیدا جوانە و خاوەن هێندێک تایبەتمەندی چاکی خۆیەتی" ئەی چۆنە هەر یەکلایەنە هەڵتسەنگاندووە و لە باری ئابوورییە وە بۆی چووی؟ چۆنە هێندێک لە تایبەتمەندییە چاکەکانیت نیشانی خوێنەر نەداوە تا بیر لە غەرەز و مەرەزی تۆ نەکاتەوە؟!

# بەرەو شار

## سەلاح عەرەبی (ئاشتی)

هەر لە کۆنەوە کوتوویانە: "مانای شیعر وا لە دەروونی شاعیرا: واتە واتای ڕاست و دروستی شیعر بە تەواوی هەر ئەو کەسە دەیزانێ کە دەیهۆنێتەوە.

من لام وایە ئەم وتەیە هەر لە زمانی شاعیرانەوە داکەوتووە و بلاو بۆتەوە و بە بەرژەوەندی خۆیان کەلکیان لێ وەرگرتووە و ئێستاش هەر دەیلێن و دەیلێنەوە و کردوویانەتە "بنێشتەخۆشکە".

بەلام ئەو مەبەستە نابێتە بەلگە بۆ ئەوە کە کەس مانای شیعر نازانێ یاخۆ هەقی لێکدانەوەی نییە. دیارە بە درێژایی مێژووی ئەدەب، شیعرناس و شیعرنەناس هۆنراوەیان شی کردۆتەوە و بە پێودانی زانستی یاخۆ بەپێچەوانە بیروڕایان دەربڕیوە. جا بەحەق یا ناحەق. بەڕاست یا بەهەلە!

ڕاستییەکەی ئەوەیە لەم ولاتەی ئێمە کاتێک شاعیر زیندووە. لێکدانەوە و شیکردنەوەی شیعرەکانی باش و قڕە و دمەتەقەیان کەمتر لە سەرە، ئەمما هەر کە شاعیر سەری نایەوە، بەتایبەت ئەو کەسەی کە پێش مەرگی، بە هۆی هەلومەرجی دژوار و ئەستەم، بواری چاپ و دەرفەتی بلاوکردنەوەی هۆنراوەکانی، ئەویش دوور لە هەلە و پەلە نەبووبێ، توێژێنەران و ڕەخنەگران تووشی سەرلێشێواوی دەکا و هەلیش بۆ هەلپەرەستان دەڕەخسێنێ.

کاک سوارە یەکێک لەم ئامرادانە بوو کە تەنیا بە دەسنووس و بە هەلکەوت و لە کەلێندا لە تریبوونی ڕادیۆوە شیعرەکانی خۆی بلاو دەکردنەوە.

جا بەختەوەرانە کاکە سوار بۆخۆی، بە دەسخەت و قەلەمی خۆی، لێکدانەوەیەکی لە سەر شیعری "شار" کردووە و سالی ١٣٥١ی کۆچی لە بەرنامەی «تاپۆ و بوومەلێل»دا کە لە ڕادیۆ تارانەوە تۆمار دەکرا. بلاوی کردۆتەوە[(١)].

ئەمما بە ڕاشکاوی دەتوانم بلێم "کاک سوارە بەپێی قۆناخی ئاستەنگی ئەو سەردەمە زیاتر کۆبە و پەراوێزی لێ ناوە و "گەلێکی ڕیس و گوریس بۆ هێناوەتەوە".

"مالم قەبرە" سەرەڕای ئەمەش نووسراوەکە بەلگەنامەیەکی بەکەلکە و دەتوانێ زۆر لایەنی هۆنراوەکە دەربخا و لە پەردەدا زۆر مەبەستی گرینگی نواندووە و دەکرێ ولامێکی کەم و پوختی ڕەخنەگری بەڕێزی بێ. لێرەدا پرسیارێک دێتە پێش. بۆ کاک سوار وا کەم و پوخت لە سەری دواوە؟ وا خۆم وەلامی دەدەمەوە.

"چونکەوەک ئاگامان لێیە، لەم سەردەمەی ژیانی سوارە، قارەمانی پێشووی "سوورە قەلآ"دا، "کەڵ بە موو بەند بوو". هەر بۆیە مەبەست ڕوون و ئاشکرا نەدەکوترا و دەکەوتە ژێر پەردەی ڕەمز و ڕازەوە، زمان و شێوەی سەمبولیک دەهاتە کایە و تەنیا پیاوی وریا و زیرەک دەیتوانی "موو لە ماست دەرکێشێ".

جا هەر بۆیە هاتمە سەر ئەو باوەڕەکە ڕوونکردنەوەیەکی سیاسی - ئەدەبی و ئەدەبی - مێژوویی بکەم، بەڵکو بتوانم بە دەرخستنی زەمان و زمانی شیعرەکە وەلآمێکی هەموو لایەنەی ڕەخنەگری خۆشەویست بدەمەوە و تا ڕادەیەکی تەواویش خوێنەری خۆشەویست لە شک و دوودڵی ڕزگار کەم و بە شنەبای حەقیقەت هەوروهەلآ ڕادرێ و خۆرەتاوی پاک دەرکەوێ.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم پوختەی مەبەستەکانی ڕەخنەگری هێژا وەبیر بێنمەوە. بڕوانە "سروە"ی ژمارە٥٥ ، لاپەڕەی ١٤، ١٩... شاعیر تووڕەیە لە شێوەی تازەی شارنشینی! هەوڵ و خەبات بۆ بەرەو پێش چوونی کۆمەڵی بە لاوە خراپ و نەنگە! خۆبەزلزان و کوڕە عەشیرەت و ترسەنۆکە! دوورەپەرێزە و لە گەلەکەی تاق بۆتەوە" و هتد...

ئازیزان!

ڕەخنەگری دەروەست دەبێ هەمیشە لە سەرەخۆ و بە پارێز هەنگاو هەڵێنێتەوە و ورد بڕوانێ. لێکدانەوەی زانستی بکا و بە سەر ویستی دەروونی خۆیا زاڵ بێ و بە مەیلی خۆی مانا دانەتاشێ، ئالێرەدا دەبێ بزانێ کە شیعر دەگەڵ نووسراوە یاخۆ مەقالەیەکی تەواو سیاسی جیاوازیی هەیە. شێعر پەیڕەوی لە مەنتیقی تایبەتی خۆی دەکا و بریتییە لە ئیحساس و هەستی دەروونی شاعیر بەرامبەر بە ڕووداوەکانی دەوروبەر، کە بە گوێرەی بۆچوون و توانا و ئاوەز و تێگەیشتنی شاعیر دەهۆندرێتەوە.

شیعر فۆرمۆلیکی ڕامیاری و ئابووری نییە و ئەم جەغزە بەرتەسک و بەرتەنگانەی هەڵبواردووە و ڕێ و شوێنێکی تایبەت بە خۆی گرتۆتە بەر،بەلآم بەداخەوە ڕەخنەگری بەڕێز ئەو مەبەستەی لە بیر کردووە و تەنیا لایەنێکی شیعرەکەی وەک هەڵوێستێکی تەواو سیاسی خستۆتە بەرباس، ئەویش بەپێی بۆچوونی خۆی! ڕەخنەگر ئەگەر بیهەوێ بیانوو بگرێ، پەڕەکایەک دەکا بە کێوێک و بەپێچەوانە!

شیعرناس دەبێ قازی و داوەرێکی دادپەروەر بێ، یانی لایەنی بەهێز و جوان و ڕازاوە و لایەنی کز و دزێو و ساکاری کارەکە دەربخا و سەرجەم تێکوڵ و کاکڵ لێک جیا کاتەوە و ئەوسا هەڵوێست بگرێ و حوکم بدا.

بیروڕای تایبەتی و غەرەز هەر ئەو کارە دەکا کە تەنانەت، "سەرما بە هەتیو، با بە

دەواری شڕی ناکا"، بۆیە سوارە فریاڕەسێکی دەوێ کە ئەم شیعرەی لەباتی وەخوێنێ:

**لە جگەرگۆشەیی شیعرم مەدە مەعنایی خەراپ**
**بێخەتا کەس نییە رازی کە لە ئەولادی درێ**

جا ئەگەر وایە با لە پێشا سەرنجێک بدەینە سەردێڕی ڕەخنەکە:

**"چاوخشاندنێک بە سەر شیعری "شار"ی سوارە"**

ئەم ڕستەیە لە باری ڕێزمانی کوردییەوە ناتەواوە.

لە زمانی کوردیدا فیعلی "چاو پێخشاندن" یا "چاو بەسەر خشاندن"مان نییە. کورد دەڵێ: "چاو پێداخشاندن". "چاو بەسەرداخشاندن"یش دەڵێن و ئەگەر نەڵێین هەڵەیە دەتوانین بێژین کەمتەرخەمی نووسەر یا وێژەرە. وەهەر حاڵ ئەگەر نووسەر ئاوڕێکی لە ڕێزمانی کوردی دابایەوە تووشی هەڵەی ئاوا زەق و بەرچاو نەدەبوو و دەینووسی:

"چاو خشاندنێک بە شیعری "شار"ی سوارەدا" یا وەک ئیشارەی پێکرا دەیتوانی ئا بەم شێوەیش بنووسێ:

"چاو خشاندنێک بە سەر شیعری "شار"ی سوارەدا".

ئەگەر چی ڕەخنەگر ـ ڕەخنەگری ڕاستەقینە ـ هەرگیز ئیزنی ئەوە نادا بە خۆی کە بە سووک بڕوانێتە "شیعر" و لەباتی لێکۆڵینەوە و وردبوونەوە و هەڵسەنگاندنی زانستی تەنیا چاوێکی پێدا بخشێنێ و پاشانیش بێترس و پارێز حوکمی لە سەر دەربڕێ.

ڕەخنەگر دەبوو لە پێشدا بۆ شیکردنەوەی ئەم شیعرە دوو کاری بنەڕەتی بکردایە: یەکەم: سەردەم و هەلومەرج، ئەو قۆناخەی شیعرەکەی تیا وتراوە و بڵاو کراوەتەوە ڕوون کاتەوە، دووهەم: زمان و کێشی شیعرەکە بخاتە ڕوو، جا پاشان بچێتەسەر مانا و مەبەستی ئاشکراو ڕوونی هۆنراوەکە ـ بەتایبەت کە فەرموویەتی: "... تاکو سەرەنجام ئەم کارەی سوارەم دیت و پاش وردبوونەوەیەکی زۆر هاتە سەر ئەو بڕوایە کە ئەم هۆنراوەیەی کاک سوارە بخەمە بەرباس و لێکۆڵینەوە و بە پێوانەیەکی باوەڕپێکراوی جێگیر بیپێوم". کەچی بەداخەوە خۆی لەم کارانەی سەرەوە پاراستووە و کەمتر خۆی لە قەرەی پێوانەی باوەڕپێکراوی جێگیر داوە.

وەک لە بەیاز و دەسنووسەکان دەردەکەوێ. شیعرەکە لە نێوان ساڵەکانی ١٣٥٠ ـ ١٣٥١ی کۆچی هۆنراوەتەوە و بڵاو بۆتەوە.

ئەم ساڵانە سەردەمی چاک هەڵدان و گەشەکردنی سیستمی سەرمایەداری لە ئێران بوو... تا زەمان پتر بەرەوپێش دەڕوا، سیستم گەلیش زۆرتر تووشی ئاڵوگۆڕ دەبن، تەنانەت خێراتر لە پێشوو، ئەویش بە هۆی وریایی و چوونە سەری پلەی زانیاریی کۆمەڵ.

ڕەخنەگر لای وایە سوارە تێپەڕبوونی قۆناخی دەرەبەگی بۆ قۆناخی سەرمایەداری کە یەکێک لە پێویستەکانی زەمانە بە خراپ و هەڵە و چەوت دەزانێ،بەڵام لە ڕاستیدا دەتوانین بێژین: "ئەو، گەشەکردنی سیستمی سەرمایەدارییە بە نیشاندان و دەرخستنی مەزهەرەکانییەوە کە بریتین لە: چرای نێئۆن، دارتێل و دووکەڵی کارگا گەورەکانی و هتد... دەخاتە ڕوو. لە پیشەسازی تووڕە نییە، بەڵکو بێزاربووە لە بەشێکی فەرهەنگی سەرمایەداری.

شەو و ڕۆژ خەڵک خەریکی کار و کوێرەوەرین و دێن و دەچن، ماندوو، شەکەت، لەبەر هارەهارِ ئاگایان لە یەکتر نەماوە. "ورکەبورژوا " خۆ دەکوتێ و پەلەیەتی بۆ بوون بە "کەڵەبورژوا ". کرێکار ڕۆژ بە ڕۆژ پتر دەچەوسێتەوە و گیرفانی ساماندارەکان بەحری بێبنە. لەم قۆناخە ئاستەنگەدا کەس کرێکاری مسکین و هەژار بەسەر ناکاتەوە و توێژی ڕۆشنبیر بەکردەوە جووڵەی لێ براوە و "هەر شەویلکەی لە کارایە" دیسانیش شاعیر هەر تووڕە نەبێ؟ ژیان و ئینسان و ئەوین مانای خۆیان لە دەست داوە. شاعیر دەڵێ، ئینسانە و ئەویندار، بەڵام گوڵەکەی پەیمان شکێنە و هەموو شتێک لە زێڕ و جل و خشڵ و دراودا دەبینێ. چاوی بە شەوارە کەوتووە و شۆقی چرای نێئۆن چورتەی لێ بڕیوە. گۆی هەتاو کە گەرما و ڕووناکی ڕاستەقینە دەبەخشێ لای ئەو بزرە، بەڵێ شاعیر دەبێ ڕقی هەڵستێ ئەویش لە تاقە گوڵەکەی کە نەهاتۆتە جێ ژوان و پەیمانی بەجێ نەهێناوە. یاخۆ بەڕواڵەت هاتووە، بەڵام بەدڵ لە تەک ئەویندارا نییە شاعیر بیانوو بە یار دەگرێ و کوڵوکۆی دەروونی وەک تاوە بارانی بەهار هەڵدەڕێژێ، بەڵام نەک بە ڕاشکاوی، یار دەترسێنێ، بێتوو ئەمجار پێ لە بەڵێنی خۆت بنێی دەڕۆم، جێت دێڵم کەچی نا، دڵنیا نییە، بیری تەنوورە دەکا، چەواشەیە، ئاسکخەیاڵی دڵناسک، دڵی هەر ئاورینگان دەدا. ئای کوڕە حەیرانی ماڵوێران، نابێ یارکۆڵێ لە خۆ بکەی. ئەگەر گراوی بتۆرێ، دەتارێ کە تۆراش!؟

شاعیر ما و دنیایەک خەم و پەژارە، ئەو جار خۆی کام داوی پێ ئەپسا و بۆ نەگەڕایەوە دێ؟ خۆ ئەو کوڕە عەشیرەت بوو، کۆچکراوی تاوی گەرمی بەر دەوارەکەی گەورەماڵ!!

داخوا گەڕانەوە بۆ گوند هەر خەون و خەیاڵ نەبوو؟ بۆ چما شاعیر نەیدەزانی زەمان گۆڕاوە؟ یان نەخێر، پاشی ئەم گشتە ئەزموون و چەرمەسەرییە هێشتا لە دەروونیا ساخ نەبێوە و بە تەواوی نەخش و کری دەرەبەگی وەلا نەنابوو؟!

چما ئاوای لێک بدەینەوە ڕەخنەی تێ ئەچێ! کاکە سوارە دەبوو بەرەوپێش چوونی ڕەوڕەوەی مێژوو فەرامۆش نەکا و پێبەپێی ئەم فکری پێ بگا و ئیتر بە چادر و چیغ و ڕەشماڵی دەورانی دەرەبەگی نەنازێ! بۆچی؟

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە پێویستە ئاورێک لە قۆناخی ژیانی شاعیر پێش وتن و

بڵاوکردنەوەی شیعرەکە بدەینەوە. سوارەی کوڕە عەشیرەت، وەک شاعیرێکی پێشڕەوی نوێ‌وێژی نوێخواز هەستی نیشتمانپەروەری هانی دا و کەوتە ڕیزی شۆڕشگێڕان، بە نهێنی کاری کرد و هەوڵی دا و پاش ماوەیەک وێڕای هاواڵەکانی کەوتە بەندیخانە، ئەشکەنجە درا، بێحورمەتی پێکرا، بەڵام سوارەی بە زیپک و زاکوون بوو بە قارەمانی "سوورە قەڵا"[1]. دەگێڕنەوە: "... بەڵێ، تەنانەت پیاوکوژان و ئەشکەنجەکەرانی"ساواک"[2]دانیان بە جوانمێری و ئازایەتی ئەم شاعیرە شۆڕشگێڕەدا دێنا و ئەیانوت: سوارە نموونەی غیرەت و ئازایەتی و خۆڕاگرییە" ئەو ماوەیەش تێپەڕی، سوارە دەگەڵ زۆربەی ئاواڵەکانی لە بەندیخانە ڕزگاریان هات! هاتەوە، دیسان زەمان ئاژوای...!

هەتا ڕۆژێک کە سوارە شینی "شەنکە سواری"[3]ی گێڕا، شینێکی ڕووەو شۆڕشگێڕی، شیعرێکی بەهێز و پتەوی ئەدەبی کە لە خەمی "ڕووباری چووکی بە فیڕۆ چوو"دا هۆنییەوە و پتر تووشی قەیرانی ڕووحی و تووڕەیی مەیلەو شۆڕشگێڕانە بوو. خۆ گنخاندنی ئاواڵەکانی و گوێ نەدان بە هاواری "شەنگەسوار" بوو بە بیانوویەک کە بێژێ:

**ئەمڕۆ هەر شەویلکە لە کارایە**
**دەس پیرەڵۆکی ئارەقی بەرپشتێن**
**دڵ هەمانەی کۆلوانە**
**سەر گرکەتاڵە**
**دەمار بێ‌خوێن!**

سوارە تاق بۆوە. لە "خێڵی درۆ"[4] هەڵبڕا، بەڵام سەرگەردان. قەیرانی فکری بەرەو هەڵدێری برد و بەداخەوە سەرەنگرێی پێدا؟ بەڵام هیچ بەڵگەیەک بۆ هەڵدێران و کەوتنی بە دەستەوە نییە...؟

بۆیە سوارەی پێشکەوتنخواز نەدەبوو کای کۆن بە با بکا، چونکەتازە قۆناخی دەربەگی تێپەڕیبوو.

دیسان ئەگەر لە ڕوانگەیەکی دیکەوە بڕوانینە مەسەلەکە بۆمان هەیە بڵێین لەو سەردەمەدا دەکرا کاکە سوار بڕوای بە خەباتی چینی کرێکار نەبووبێ و زیاتر بڕوای بە خەبات و تێکۆشانی شانبەشانی دێنشینان و جووتیاران بووبێ".

لە لایەکی ترەوە دەکرێ بێژین: "شار ناوەندی دەسەڵاتداری ناحەزانی کاک سوارە بووە و بۆیە لە دەروونا هێزێک، هێزی ویستنی نیشتمان هانی داوە بەرەو زێدەکەی، بەتایبەت کە لای وابووە: "گوندەکانی وڵاتەکەی بنکە و لانی شۆڕشگێڕین ئاوایی کانگای وەفا و خۆشەویستین و فڕوفێڵ باوی نییە".

**دێم بەرەو هۆبە و هەواری باســــــەفـــــا**
**دێم بەرەو لادێ، بەرەو کـــــانگەی وەفـــــا**
"هێمن" سالی ١٣٥٣ی هەتاوی

تەنانەت ئەو شیعرەی مامۆستای نەمر "هێمن" پاش "شار" هۆنراوەتەوە.

با ڕاستییەکی دیکەش لە بیر نەکەین، ئەویش ئەوەیە کە ئەو کات کوڕە عەشیرەت ئەگەر بە تەواوی قافلەسالاری شۆڕش نەبووبن لە ڕیزی کارواندا بوون و دەم دە سیاسەت وەردان و خەباتیان بە لاوە شانازی بووە.

خەڵکی هەژار و چەوساوە لەبەر کار و بێگار و چرووسان و سەرکوتکران بە دەستی کۆنەپەرەستان و لە ئاکامدا دواکەوتوویی فەرهەنگی زۆر بە کەمی دەیانتوانی ڕوو لە خوێندن بکەن، بەڵام کوڕە عەشیرەت بەپێچەوانە پێیان دەخوێندرا و مامۆستای تایبەتیان بۆ دەگیرا و سەرەنجام وریاتر و بە دەمودووتر بوون و تەنانەت لێرەشدا پێشبڕکێی خەڵکیان دابۆوە. جا دەکرێ کـاک سـوارە داخ و مـەغـابەت و خـەفـەتی ئەوسـای خـواردبێ و بە لای منەوە ئاوا تاوانێکی ڕەپاڵ نادرێ بەڵکو چاو نووقاندن لە ئاست حەقیقەتێکی مێژوویی تاوانە، ئەویش کە بتهەوێ کەسایەتی نەدەبی، سیاسی کەسێک هەڵسەنگێنی.

ئینجا با بێینە سەر باسی زمان و کێشی شیعرەکە.

زمانی شیعرەکە، سەمبولیکە و باشترین بەیانی مەبەست بۆ ئەوسایە.

هۆنینەوە و داڕشـتنی بە زاراوەی سـۆرانی ڕەسـەن تێکەڵاو بە وشـەی ئاومـاڵەکـانە. با بڕوانین: وەڕەز، هاڕەهاڕ، تاوویاو، بزە، زۆنگ و زەل، جـاڕەگـوڵ، تەسـک، ئەوین، کـەش، غەوارە و هتد...

دیسـانەوە سەرنج بدەین: عەلاج، نێئۆن، مەزهەر، میسال، عاتیفە، ئینتزار و هتد...

سەرەڕای ئەوانەش، کاک سوارە وێنە و تەعبیری نوێ و تایبەت بە خۆشی داڕشتووە و بە کـاری هێناون، جـێگای سـەرنجن، ئێ بـا بڕوانین، ڕۆژی چڵـکن، تاوویاوی شـەو، چاو لەبەر چرای نێئۆن شەوارە، بزێتە ناو بزەم، دژی گزەم، پەیکەری مـیسالی داوەڵ، کەمەندی دووکەڵ، شەپۆلی شین، کۆچی تاوی گەرم، دارەتەرمی کووچەی تەنگ، بناری پڕ بەهار و هتد....

زمـانی هۆنراوەکە پێوەندی ڕاسـتەوخۆی بە زەمـانی شیـعرەکەوە هەیە. ئەو دەم خوێندن و نووسین بە زمانی کوردی لە کوردستانی ئێران نەک باو نەبوو، دەکرێ بڵێین، یاساغیش بوو، ئەوە کە هێندێک لە واژەکـان کوردی نەبن شتێکی سەیر نییە. کاکە سوار لە ئێران ژیاوە و زمانی فارسی تێکەڵ بە عەرەبی خوێندووە و ناکرێ ئەو دوو زمانانە شوێنی لە سەر دانەنێن و

ئەوە مەسەلەیەکی زانستییە، کە چی ڕەخنەگر دەنووسێ:

"هەر چەندە کە لە باری زمان و ڕواڵەت و ڕەسەن بوونی وشەکانییەوە بێ کەموکووڕی نییە. بۆ نموونە ئەگەر سەیرێکی ئەم بەشەی هۆنراوەکە بە وردی بکەین. دەبینین کە دەلەنگێ و بە تەواوی مانا نابەخشێ و وشەیەک کە هەڵبژاردراوە لاواز و بێدەسەڵاتە لە گەیاندنی مانادا، وەک دەڵێ:

**بە هەر نیگایەک و پەتایەکا**

**ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت گوڵم**

وە ئێرە کە دەڵێ:

**لە شاری تۆ لە بانی عەرشە قۆندەرەی دراو**

دیار نییە کە قۆندەرەی دراو لە سەر عەرشە یا وەکو هێنی خاوەن دراو؟"

باسی وشەی ڕەسەن و ناڕەسەنمان کرد و بەڵگەشمان هێنایەوە، بەڵام ئەوەی کە فەرموویە شیعرەکە مانا نابەخشێ، ڕاستە و وەباڵی بۆ دەکێشم، چونکەشیعرەکە بە هەڵە چاپ کراوە و ڕاستییەکەی ئاوایە:

**بە هەر نیگایەک و پەتایەکە**

**دەڵێم بڕۆم لە شارەکەت گوڵم**

مانای بەیتەکە:

هەر جارێک دەڕوانم، هەر کە چاو هەڵدێنم، تووشی دەرد و پەتایەک دێم، چونکەچاوم بە تەواوی ئەو شتانە دەکەوێ کە وەبیرهێنەوەی سیستمی ناخۆشەویستی منن، هەر بۆیە دەڵێم بار کەم و بڕۆم،بەڵام ئەوە کە فەرموویە ئەو بەیتە لەنگە، وانییە، بڕوانین:

**بە هەر نیگایەک و پەتایەکە**

**مَفاعِلُنْ مَفاعِلُنْ فَعَلْ**

فەرموویانە:

**لە شاری تۆ**

**لە بانی عەرشە قۆندەرەی دراو**

مانای ڕوون نییە".

من نازانم ئەو پرسیارەی بۆ کردووە؟ خۆ ئەگەر تەنانەت بە بۆچوونی تەواو سیاسی خۆشی لێکیدابایەوە مانای هەبوو. واتە: ئەمڕۆ، لەم سەردەمەدا قۆناغ قۆناغی سەرمایەدارییە و ئەوە کەوش و پێڵاوی سیستمی سەرمایەدارییە کە لە سەر سەرانە و پێی

سەرمایەداریشی تێدایە. سەرمایەدار گەیوەتە عەرش و وەپای پەتی نەچووگە و پێڵاوەکانی وا لەپێیا. قۆندەرە بەری پێی سەرمایەدار و نەدار رادەمووسێ... کەوشی زێڕین لە پەرپەرۆچکەی ئاسمانە، نەخێر هەر لە سەر هەردە، بەڵام تۆ بڵێی ئەم قۆندەرانە هی پیاوێکی رووتی نەدار بن؟ دیارە نا، ئەوانە نی چەوسێنەری ساماندارن؟ کورد دەڵێ:

**بەخێر بێی پێڵاوەکانت سەر چاوم.**

**بەخێر بێی پێڵاوت سەر سەران، سەرچاوان.**

دەکرێ مەبەستی وێژەر لە جووتێک پێڵاوی تازەی دەپێ نەکراو بێ کە کابرا لە ژێر هەنگڵی ناوە؟!

ئەمجا با بێینە سەر کێشی شیعرەکە:

شیعرەکە لە سەر کێشی عەرووز یییە و لە بەحری"هَزَج مَقْبُوض مجبوب"دا هۆنراوەتەوە.

وەزنەکەی ئاوایە: (مَفاعِلُنْ مَفاعِلُنْ) (مفاعِلن فَعَلْ) و چونکە"شار" بە شێوەی نوێ هۆنراوەتەوە دەکرێ ژمارەی مەفاعیلی عەرووزی بە هۆی کورتی و درێژی میسراعەکان بە یەک ئەندازە نەبن، یا (مَفاعِلُنْ)، (فَعَلْ)ی لە تەکا بێ. بۆ وێنە:

**گوڵم! دڵم پڕە لە دەرد و کوڵ**

**مَفاعِلُن مَفاعِلُن فَعَل**

**دەڵێم بڕۆم لە شارەکەت**

**مَفاعِلُنْ / مَفاعِلُنْ**

ئەمما ڕاستییەکەی ئەوەیە لەم شیعرەدا ـ شار ـ جار جار وەزن شکاوە و دەگەڵ ئەو مەفاعیلەی باسی کرا هاوسەنگ نین و پارسەنگیان دەوێ. بۆ وێنە:

**دەستی گەرمی ئاشنا نییە کە ئەیگوشم**

**فاعِلُنْ / مَفاعِلنْ/ مَفاعِلُنْ / فَعَلْ**

یا:

**کێ لە شاری تۆ لە شاری قاتڵی هەژار**

**فاعِلُنْ / مَفاعِلنْ/ مَفاعِلُنْ / فَعَلْ**

یانی لە هەوەڵی هەر میسراعێکا هیجایەکی کورت کەمە، بۆ وێنە دەکرێ لە هەوەڵی هەر کام لەم میسرەعانە: "وە" زیاد بکرێ و ماناش کورت و درێژ نابێ ئەشکرێ بە ڕاوەستان لە سەر میسراعەکان یان خێرا خوێندنەوەیان هەر "شیرنشەل" بن.

جگە لەمەش بە ڕاشکاوی دەڵێم:

"شیعرەکە دەر و ژووری وەک یەکە، ڕازاوە و پتەو ـ پتەو و ڕازاوە".

"لە ئاخری ڕەخنەکەدا هاتووە:

"لە کۆتاییدا پێویستە بڵێم کە هۆنراوەکەی کاک سوارە لە جێگای خۆیدا جوانە و خاوەن هێندێک تایبەتمەندی چاکی خۆیەتی:"

کوپی هۆنراوەکە جوان بوو؟ تایبەتمەندی چاک چی لێهات؟ دەبێ بڵێم زۆر بەداخەوە ئەم ڕستەیە تەنیا بۆ دڵنەوایی و دڵدانەوەی خوێنەر نووسراوە، ئەگینا بۆچی باسی نەکراوە؟ کوا ئینسانی وردبین و بەئینساف ئەو وتەیە دەسەلمێنێ؟ بەڵام وایە "ئەو هەویرە ئاو زۆر دەبا"!

ئەوەش پەخشانێکە کە کاک سوارە لە سەر شیعری "شار"ی نووسیوە:

لاوێکی دێهاتی ڕەنگاوڕەنگی بەهارانەی هەواری چیای بەرزی دیوە و هەمیشە چاوی بە ڕوانگەی بەرین و ڕاخراوی دەشتی بە گوڵ و گیا خەملیو ڕاهاتووە دێتە شار، کۆڵانی تەنگ و درێژ وەک تابووت لەشی ئازادی ئەو لاوە ئەگوشن. هەزاران بەندی ڕەسم و یاسا لە دەوری دەست و پێی هۆگری ڕزگاری ئەو ئەبێتە کەلەبچە. ڕوانینی شار جیاوازی هەیە، لەگەڵ نیگای مێهرەبانی دێ. لە شار ژیان چەشنی پیاز هەموو تێکوڵە و کاکڵی نییە. ڕواڵەتی ژیان ڕازاوە و شکۆدار، بەڵام ڕەنگی ئەو ژیانە ڕەنگی دەسکردە هەر وەک ڕەنگێ کە لێو و گۆنای ئافرەتانی شار سوور ئەکا، بەڵام لە دێ هەموو شت سروشتییە تەنانەت سوورایی نیوەڕەنگی لێوی بزەتێزاوی کچێ کە لە ژێر گەرمای ڕوانینی لاوێکی ئەویندار شەونمی شەرم ئەکەوێتە سەر گوڵی گۆنای و خوێنی هەستی پاکی کچانە بە پێستی نەرمی دەموچاویا ئەگەڕێ، ڕەنگێکی سروشتییە، لاوی دێنشین بە هەزار هەودای ئاوریشمین بە ڕابوردووی خۆیەوە بەستراوە، فێر نەبووە کۆشکی دە نەهۆمی سەر لە ئاسمان ببینێ و بۆ ئەوەی تەماشای بکا کڵاوی سەری بەربێتەوە. لە دێ خانووبەرەی لار و کۆمی دیوە، بەڵام هەنگاوی لاری لە ڕێگا لادەری نەدیوە.

لەو حاڵەدا دڵی ئەدا بە کچێک کە وەک گوڵی لەیلووپەڕی ئاوی لە نێو زەلکاوی شارا پشکووتووە. دوو هێزی کێشەر بۆ دوو لای جیاوازی ئەکێشن. هێزی ئەوین فەرمانی مانەوەی دەداتێ لە شارێکا کە چەشنی پێڵاوی تەنگ پێی ڕێبواری ئەوین ئازار ئەدا و هێزی دەرچوون و ڕزگاربوون لە کەمەندی دووکەڵ و دراو و گەڕانەوە بۆ دێ و دیسانەوە دەستەملان بوونەوەی بیرەوەری خەیاڵ ورووژێنی هەستبزوێنی سەردەمی منداڵی و گەنجی لە لادێ و ئەم شیعرانە ئاکامی بەرەنگاری ئەو دوو هێزەن لە هەناوی لاوەکەدا و ئەبینین کە تەنانەت زنجیری زێڕینی ئەوینیش پێی ڕەوەکی لاوەکە نابەستێ و ئەچێتەوە دێ کە ڕەنگی سوور و شینی بەهاری بنار لە عاتیفەی گەشی بدا.

١ـ وێنەی تێکستی ئەم بەرنامەیەم لای حاجی عومەر ئاغا ئێلخانی، برا گەورەی خوالێخۆشبوو کاک سوارە دەست کەوت و پڕ بە دڵ سپاسی دەکەم.
٢ـ سوورە قەڵا: زیندانی قزڵ قەڵا (قزل قلعە) لە تاران، ناوی شیعرێکی کاک سوارەشە.
٣ـ ساواک: (سازمان امنیت کشور) دەزگای سیخوڕی ئێران لە زەمانی پەهلەویدا.
٤ـ شەنگەسوار: ناوی شیعرێکی کاک سوارە.
٥ـ خێڵی درۆ: ناوی شیعرێکی کاکە سوارە.

# ژیاننامەی سوارە

عومەر ئێلخانی

تامی دەچێ واتە کــــــە دەیجــــــووی بــە زار
جـوانە لە ڕێی دیـدەوە بتکێتـــــــە خـــــوار
بـــۆ وتـە و هـــەســـــــــتــی دەروون چـاوەڕێم
بـەستــەڵەکـە گـــــیـــــانە هـەرێمـی وتــار

محەممەد نووری

من ئێـســتــاش هەرکـاتێک سـوارەم دێتـەوە بیـر یا لە نـووسـراوەیەکـا یادنامـەیەکی دەخوێنمەوە یا گاهێ دۆست و ڕەفیقێکی باسێکی ئەوم بۆ دەگێڕتەوە دڵم پڕ دەبێ لە دەرد و کوڵ.

ویستم بۆ پێشەکی ئەم دیوانە بە وەزن سووک و بە قیمەت گرانە چەند فرمێسکێکی گەرم و گەش لە دیدە هەڵوەرێنم و بیکەم بە دیاری بۆ خوێنەری خۆشەویست و هەستیـار، بەلام بە قەولی مامۆستای ئەمر هێمن کە لە پێشەکی تاریک و ڕوونە جوانەکەیدا دەفەرمووێ "کێ من لە خۆم باشتر دەناسێ" لە لایەکەوە و لە لایەکی کەشەوە بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەی چەند نووسەرێکی بەڕێز کە هەرکامێکیان لە نووسراوەکانیاندا بە چەشنێک هەڵەیان لە سەر ژیانی "سوارە" هەیە، قەولم دا ئەو بێدەنگییەبشکێنم و هەرێمی سپی و بێگەردی خامۆشی بە تیـخی تیـژی وشە هەڵبڕم و بە وتارێک ژیاننامەی سـوارە بگێـڕمەوە و لە چاوانیش داوا دەکەم بۆ بەیانی ئەو هەستە دەروونییـە بە ئاهەنگی دڵۆپەی ئەسرین یارمـەتیم بدەن، ئەم نووسـراوەیە نایەوێ "سـوارە" لەباری هۆنەرییـەوە بناسێنێ، چونکە"سـوارە" ئەسـتێـرەیەکی پڕشنگداری ئاسمـانی ئەدەبی کوردی و فـارسییە و ناوە خۆش و لە سەر زمـانان سـووک و لە دڵان چەسپـەکەی "سـوارە" بە تایبەت بەناوبانگی کـاک "سـوارە" زۆر ناسراوتر و بەرزترە کە نیـازی بە ناسـاندنی من هەبێ، ناوی "سـوارە" وەک پەڕی سـەری ئەسپـی "شـەنگەسـوار"[1] ئەدرەوشێتەوە و بیـری تلووعی شێوازێکی ئەدەبیی نوێ و تایبەت ئەخاتە نێو مێشکی هەموو ئەو کەسانە کە بە جۆرێک دڵ بەستەگیان بە فەرهەنگ و ئەدەبی کورد ییەوە هەیە، هەروەها ویست و مەبەستیش ئەوە نییە کە بیروباوەڕی"سوارە" بۆ خوێنەر ڕوون بکاتەوە، کە وا بوو ئەو پێشەکییە هەوڵ ئەدا ژیاننامەیەکی کورت لە ژیانی کورتی سوارە بخاتە بەرچاوی خوێنەرە بەڕێزەکان و بەس.

جا ئێستا من وێڕای سپاسێکی گەرموگوڕ و ڕێز و ئیحترام بۆ هەموو ئەو مامۆستا و

نووسەرانەی چ لەو دیوی سنوورەوە و چ لە ژوورەوەی ولات و چ لە دەرەوە لە سەر "سوارەیان" نووسیوە و شینیان بۆ گێڕاوە و تەنانەت ئەوانەش کە ڕەخنەیان لە شیعرەکانی گرتووە و بەتایبەت ئەوانە کە جوابی ڕەخنەکانیان داوەتەوە. دەمەوێ بەو مەرجە کە لێم دڵمەند نەبن هەڵەکانیان باس بکەم.

١ـ کاک عەبدوڵلا مەردووخ کە یەکێک لە دۆست و هاوکارەکانی نزیکی "سوارە" بوو، لە گۆڤاری ژمارە ٤٨ی "قالدک" سالّی ١٣٥٤ی هەتاویدا "سالّی کۆچی دوایی سوارە" لە ژێر سەردێڕی "سرسلامتی" دەنووسێ "سوارە" لە سالّی ١٣٢٠ی هەتاوی لە شاری سەقز هاتۆتە دنیاوە و پۆلی سەرەتایی و ناوەندی لە بۆکان و سەقز خوێندووە.

٢ ـ "گروە لهجەهای اطلاعات و اخبار سازمان رادیوتلویزیون ملی ایران": کە من لام وایە هەر کاک عەبدوڵلا مەردووخ نووسیویەتی لەژێر سەردێڕی" در سوگ دوستی از دست رفتە، انسانی پاکاندیش و شاعری حساس" لە گۆڤاری "تەماشا" لە سالّی ١٣٥٤ی هەتاوی دەنووسێ "سوارە" لە سالّی ١٣٢٠ی هەتاوی لە شاری سەقز لە دایک بووە و خوێندنی سەرەتایی و چەند سالێکی لە پۆلی ناوەندیش لە سەقز بووە و دوایی بۆ تەواوکردن چۆتە تاران.

٣ـ کاک ئەحمەد شەریفی لە گۆڤاری هیوا ژمارە ٣ شوباتی ١٩٨٥ سەر وە ئەنستیتوی کورددا دەڵێ: "سوارە" لە شاری سەقز لە دایک بووە و خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە سەقز و بۆکان تەواو کردووە و کاک ئەحمەد شەریفی لە گۆڤاری ژمارە ٤/٥ی مامۆستای کورددا لە سالّی ١٣٦٦ هەتاوی لە ژێر سەردێڕی سوارە لەبەر تیشکی نووسراوەکانی دا تەنیا دەڵێ: "سوارە" لە سالّی ١٣٢٠ی هەتاوی لە دایک بووە و زیاتر لە سەر ئەم باسە ناڕوا.

٤ـ کاک عەزیز کەیخوسرەوی لە گۆڤاری ژمارە ٤ی سروە، سەر وە ئینتشاراتی سەلاحەددین لە ورمێ دەنووسێ: سوارە لە تەمەنی سێزدە و چاردە سالەییدا تووشی فەلەجی قاچی بووە و خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە بۆکان و تاران تەواو کردووە و لە لای مامۆستا مەلا حەمەدەمینی ئەشعەری خوێندوویەتی.

٥ـ کاک ح ـ بەفرین، لە گۆڤاری سروەی ژمارە ١٢ لە ژێر سەردێڕی "ئاوڕێک وە سەر سوارە"دا دەنووسێ سەبارەت بەوە کە سوارەی ئێلخانی بەجێیە یا سوارەی ئێلخانی زادە و من پێم وایە سوارەی ئێلخانی دروستە و زۆر لە نووسەر و شاعیرانی کوردی ئێران کە من دیومن "ئێلخانی" بە ڕاست دەزانن"، ئەبێ بنەماڵەی شاعیر ڕایان بەرامبەر بەو شتە چی بێ " و کاک بەفرین ئەڵێ" ڕوونبوونەوەی ئەمەش زۆر پێویستە لە مەسەلەی ئەدەبدا و هەروەها شتێکی سەرپێیی نییە".

٦ـ کاک "نیازی" له ڕانییەی عێراقەوە لە گۆڤاری کاروانی ژمارە ۲۲ی تەموزی ساڵی ۱۹۸٤ لەژێر سەردێری "با سوارە باشتر بناسرێ"دا دەڵێ: "لە گۆڤاری بەیانی ژمارە ۹۰، ئەیلوولی ۱۹۸۳ لە لاپەڕەی ٦۱ ـ ٥۷دا مامۆستا ئەسعەد نەقشبەندی وتارێکی لە ژێر سەردێری "سوارە بناسن"دا بڵاوکردۆتەوە و خوێنەر هەست بەوە دەکا کە مامۆستا ئەسعەد لەگەڵ "سوارەی" شاعیردا نزیکی هەبووە" و هەروەها کاک نیازی ئەم حەقە ئەدا بە خۆی کە پرسیار بکا ئەی بۆ لەگەڵ ئەو دۆستایەتییەشدا مامۆستا ئەسعەد نەیتوانیوە بزانێ چ ساڵێک و لە چ شوێنێک لە دایک بووە و بە چ نەخۆشییەک و ساڵی چەند کۆچی دوایی کردووە. کاک نیازی دەڵێ" بەتایبەت کە مامۆستا ئەسعەد ئارەزوویەکی فەراوانی ئەدەبی هەیە و ئەم شتانەش زانینیان بایەخێکی گرینگیان هەیە بۆ ئەمڕۆ کە ویستوویەتی ئەو بابەتانە لە فەوتان ڕزگار بکا " کاک نیازی دەڵێ: "مامۆستا نەقشبەندی لە لاپەڕەی ٥۷دا نووسیویە: نازانم چ ساڵێ هاتە دونیا، بەڵام ئەزانم کە نەخۆشی زەردوویی بووە بە زەردی و خەزانی عومری لە ساڵی (۱۳٥۳)دا"،جا ئەمجا مامۆستا نیازی باسەکەی خۆی درێژە پێدەدا و دەڵێ: "سوارە" لە ساڵی ۱۳۲۰ی هەتاوی ۱۹٤۱ زایینی لە شارە خۆڕاگرەکەی سەقز لە دایک بووە.

۷ـ کاک عەبدولقادر دەباغی لە سەر سنوورەوە لەژێر سەردێری "بەڵێ با سوارە باشتر بناسین" دەڵێ من لە گۆڤاری کارواندا نووسراوەکەی کاک نیازیم چاوپێکەوت" و تەنیا دەڵێ مامۆستا ئەسعەد بەهەڵە چووە" شیعری کاک "سوارە" قەل و هەڵۆ نییە" و "پیرە هەڵۆیە" و لە بارەی ژیانی ئەوەوە نەینووسیوە و بۆچی نەینووسیوە سەیرە و ئەگەر کاک قادر دەباغی ئاوا دوورەپەرێزی لە مەسەلەکە کردووە ئەی بۆچی دەڵێ" با سوارە باشتر بناسین"، چونکەکاک عەبدولقادر زۆر لە ماڵی بابی شاعیر بووە و دەگەڵ بنەماڵەی "سوارە" دۆستایەتی و هاتوچۆی گەرموگوڕی هەبووە و لەگەڵ ئەو شارەزاییەش بەپێچەوانەی سەردێری نووسراوەکەی نە کەم و نە زۆر و نە باشتر و نە خراپتر نەیناساندووە.

۸ ـ بەڕێزێکی تریش لە ژێر سەردێری "ناوبژی لە نێوانی برایان نیازی و نەقشبەندی دا" کە بە ناوی ـ نووسینی ئاشنا ـ لە گۆڤارێکی ترا دەنووسێ: "سوارە ئێلخانی لە بنەماڵەی ئێلخانی شاری بۆکانە. باوکی "سوارە" سەرهەنگی بازنشستە "عەقید، موتەقاعید" بوو، ناویم لەبیر نییە وا بزانم "عەبدوڵلا" بوو. "سوارە" ساڵی ۱۳۲۰ی هەتاوی لە شاری سەقزی نەبەرد لە دایک بووە" ئەو برا ئاشنایە کە لە نووسراوەکەیدا وا دەردەکەوێ زۆر ئاگای لە حاڵوباڵی "سوارە" و دۆستەکانی "سوارە" بووە و زۆر قسەیان لێ دەگێڕێتەوە و ئەو سەردێرە جوانەی هەڵبژاردووە بۆ نووسراوەکەی، بە ڕاستی ناوبژییەکی باشی کردووە و بە قەولی خۆی "کاک نیازی و کاک ئەسعەد ڕاستییە کەیان بۆ دەرکەوت.

٩. بەڕێز کاک سەلاح موهتەدی لەژێر سەردێڕی "دە ساڵ دوای کاک سوارە" لە مامۆستای کوردی ژمارە ٣دا دەڵێ: "سوارە لە گوندی قەرەگوێز لە دایک بووە". هەڵبەت خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست" مەبەستی ئێمە لەو بەشەدا تەحلیل و لێکۆڵینەوە و یا ناساندنی "سوارە" لە باری ڕێبازی ئەدەبی و فەرهەنگی و هونەرییەوە نییە کە ئەو مامۆستایانە لێی دواون "ئەو بەشە، بۆچوون و بۆنەچوونەکە بۆخۆیان".

ئەم نووسراوەیە ڕەخنە ئەگرێ و دەڵێ: ئەم مامۆستا بەڕێزانە کە بە دڵێکی پڕ لە خۆشەویستی "سوارە"وە، ویستوویانە لەسەر ژیانی سوارە تەحقیق بکەن و کاتێ خۆیان دەڵێن "شتەکە هەروا سەرپایی نییە و لە مەسەلەی ئەدەبدا گرینگە" و ناوبژی ئەکەن و شەڕ ئەکوژێننەوە و ئیراد لە یەکتر ئەگرن و بۆ نەزانینی ساڵی لەدایکبوون و کۆچی دوایی، "دەست لە بەڵەدی ئەکوتن" و ئیزهاری ئاشنایی و هاوکاربوون ئەکەن" و لایان وایە شارەزایی ئەم زانیارییانەپێویستییەکەو بایەخی بۆ ئەمڕۆ هەیە و دەڵێن بەڵێ "با سوارە باشتر بناسین"، کە چی لەو بابەتەوە مۆری بێدەنگی لە لێویان ئەدەن.

ئەبوایە لە ئەم و ئەو باشتر و ڕوونتر و بەربلاوتر پرسیاریان بکردایە جا ئەمجار دەستیان دابایە قەڵەم، دەنا هەر بە باسی بەشە ئەدەبی و لێکدانەوەی شیعرەکان ڕازی ببوایەن،بەڵام دیسانەوەش من بە بەشی خۆم لە هەموو ئەو بەڕێزانە گەلێک مەمنوونم و هیوام وایە ئەو باسانەی من گەردێک ناوێتە سەر دڵی ناسک و بێگەردیان. ئێستا دێینە سەر ژیاننامەکە بە کورتی.

ساڵی ١٣١٦ هەتاوی تازە گزنگ لە سەرانی دابوو، زاقە و دەنگی مناڵێکی ئێسک سووک لە ئەندەروونی ماڵەوە پێکەنین و خۆشیی خستە نێو تالاری دیوەخانێکی گەورە لە گوندی تورجان.

کوڕێک چاوی لە سەر دنیای ڕوون هەڵێنا و بە شیری دایکێکی بنەماڵ گەورە لە تایفەی بداغ سوڵتان ڕۆژووی کراوە،لەگەڵ ئەوەشا کە ئەو کوڕە دووهەم کوڕی ئەو ماڵەیە، بەڵام بە گۆێرەی یاسای سەردەم خەڵکی ئاواییەکە و دەوروبەر و خزم و قەوم، دەستە دەستە دەهاتنە پیرۆزبایی باوکی ئەم کوڕە. کۆڕی گوێزەبانە لە دیوەخانا هەر گەرمتر و گەورەتر دەبوو، ئەو کوڕەیان ناو نا "سوارە" و بانگیان بە گوێی دادا.

"سوارە" کوڕی ئەحمەد ئاغای ئێلخانی زادە، کوڕی حاجی بایز ئاغای حاجی ئێلخانی لە عەشیرەتی "دێبۆکر ییە" باب و باپیرانی سەرۆک حێل بوون.

ژیانی شیرەخۆری "سوارە" بە شنەبا فێنک و خۆشەکانی کوێستان یەک ڕۆژەی دوو ڕۆژە بوو و ئەتکوت بە گوێیانی هەڵدەکێشی گەورەتر ئەبوو."سوارە" ئەوەندە لە مناڵیدا قەڵەو و

گۆشتن بوو زۆر کەس لایان وابوو دەستی گۆجە و بۆ پشتەوە چۆتەوە، دایکی زۆری خەم پێوە دەخوارد "سوارە" هێشتا یەک سالانە بوو باوکی گوندی تورجانی گۆڕییەوە بە ئاوایی قەرەگوێز لەسەر چۆمی تەتەهوو (چۆمە زێوینە) و مالی چوو بۆ ئەوێ. "سوارە" لەو دێیە پێی هەلگرت و بە دابی ئەودەم بۆ بەخێوکردن درایە دەست "دایەن" و لە مالی دایەن ڕەفیقەکایەی پەیدا کرد و هەموو ڕۆژێ "لە نێو خاک و خۆل عەینی بێخەیالی[٢]" تەپوتۆزاوی دەیانبردەوە لای دایکی. "سوارە" هەر لە کاتی زۆر منالیدا فێری مەلە بوو. ڕۆژ هەتا ئێوارە لەگەل منالی نێودێ لە چۆم و کێو و سەحرا بوو، "سوارە" ڕاوەماری لە هەموو شتێکی تر لە کاتی مندالی‌و لاویدا پێ‌خۆشتر بوو، لە نێو زەمەند و کەژ و کێو لە قرچەقرچەی گەرمای هاویندا دەگەڕا و ماری "سوجە"ی سوور و شینی گایە نکێوی ئەدییەوە و بە زیندوویی دەیگرت و دەیهێناوە نێو دێ و هاویارییەکانی پێ دەترساند، "سوارە" زۆر خەسلەتی تایبەتمەندی حێلی و دێ‌نشینی وەرگرت و لەگەل خۆشی بردنییە نێو گۆڕەوە.

ئەم کوڕە خوێن شیرین و چاوشێن و سپیلکەلانەیە کە تازە هاتبوو تێبگا و خۆشەویستی دایک بزانێ، باوەشی ئاواڵە و گەرمی دایکی لێ سارد بۆوە و ئەم هەموو ئاوات و ئومێد و خۆشەویستییەڕۆهێژرا نێو گۆڕی تەنگ و تاریکەوە. ئەم "پەپوولە باڵ‌سەوز و سوورە فڕی"[٣]و زەردەی مەرگ کەوتە سەر لێوی ناسک و کوڕێکی لە "سوارە" گەورەتر و کچێکی لە "سوارە" بچووکتری دڵ بریان و چاوبەگریانی لەنێو دەریای خەیالات و خەمان بەجێ هێشت، بەلام فرشتەیەکی ڕەحمەت باوەشی گەرم و پڕ لە خۆشەویستی دایکانەی بۆ کردەوە.

ئەم ئامێزە هی باوەژنێکیان بوو کە بۆنی زڕدایکی لێ نەدەهات، ژنی مامێکی خۆیان بوو کە باوکیان پاش بەڕەحمەت چوونی ئەو مارەی کردبۆوە و "سوارە لەو باوەشە گەرمەدا پەروەردە بوو. "سوارە"یان زۆر زوو لە قەرەگوێز لە مەکتەبخانەی تایبەت لە لای مامۆستایەکی دلسۆز و زانا بە ناوی مامۆستا "شێخ ئەحمەد کەس‌نەزانی" وەبەر خوێندن نرا. "سوارە" زۆر زیرەک بوو و هەرچی مامۆستاکەی بە دەرس پێیدەکوت زۆر زوو ڕەوانی دەکرد و ئەهاتە بەری. لەگەل ئەوەشا لەبەر بزۆزی و بێعاری خۆی زۆری لێدان ئەخوارد، "سوارە" زۆری لە لای ئەم مامۆستا گەورە و پیاوچاکە نەخوێند و وەک کوڕی عەشیرەت ڕۆیشتە نێو هاوتەمەنەکانی خۆی لە ئاواییەکە، کە هەر لە منالییەوە زۆر خوو و ئولفەتی پێوەگرتبوون.

"سوارە" شاخ و داخ و هەرد و بەرد و چۆم و دەشتی "سەرسەوزی بەهاران" و "سوورەوەبووی هاوین" و "بە گێژەلۆکەی پایزان" مانگەشەوی خەمڕەوێن و تاریکەشەوی خەفەتهێن، کێوەوانانی پڕ تەجرەبە و چروساوی بەر گەرمای هاوین و سەرمای زستان، شۆڕەسوارانی تەقلەباز و ڕاوچی عەشیرەت، پیرەپیاوانی بەیتبێژ و حەکایەتخوێن، گەنج و

لاوانی "دروێنەوان و ماندوو، فەقێی حوجرە و مامۆستای ئاینی لادێ و گوندی کردە زانکۆ و مامۆستای خۆی و دەرسی پیاوەتی و جوامێری، ئازایەتی و نەبەزی، ڕاستی و پاکی و ڕق و تووڕەیی، بە ڕەحم و مـیـهـرەبانیـیـان لێ فـێـر بوو و ئامـادە کـرا بۆ سـازان لەگـەڵ هەمـوو بارودۆخێکی جوان و ناحەزی ژیان کە چاوەڕوانی لێ ئەکرا.

هەوای گیاپـەروەری کوێستانەکانی پڕ بەفر و گەردنکەشی وەستا مستەفای تورجان[٤]، خـوڕە و قـەڵپـەزەی چۆمی بەهاران و دەشـتی پڕداهاتی قـەرەگـوێز لەشی "سـوارە"ی گـەورە کـردبوو، چوونە مـەڕی شـەنگەبێرییـان، شـیـووکـوڵی کـچـان و چاوبڕکـێنەی ڕێگـای کـانی، مەڕومالاَت، خانووی لاروکۆم، بۆنی سەرسەکۆی بە کاگڵ ئاوپژاو، هەڵپەڕکێ و زەماوەند، جۆرابێن و پشکیلان، گورزی کوێری و پشکۆ بە فوو، شەڕەکەڵ و شەڕەکەڵەباب، ڕاوەتاژی و ئەسپ سواری و ڕمـبازی، زۆرانبازی و چنگەپڵـماسە، قـاڕی فـەقـێیان و شـەڕەتۆپی بەفـر و قۆچەقانی بەن، گـەڕان لە نێـو هۆز و عـەشـیـرەت، ئەوانە و زۆر شـتی تریش بوونە هەوێن و ئەوین و ڕێگا و شوێن لە تەمەنی کورتی "سوارە"دا. "سوارە" هەر بۆیە لە شاریش ئەو بیرەوەر ییـانەی گوند و ژیانی عـەشیـرەتی هەرگـیز فـەرامۆش نەکـرد و لە هەمـوو شـوێنەوارەکـانیدا بە جوانی دەردەکەوێ کە هەر لە بیری سروشت و خۆشەویستیی کاتی منالی و لاویدا نوقم بوو و هەر بۆیەش گـوڵـەکـەی لە شـاری قـاتڵی هەژار[٥] بەجێ دەهێـڵـێ و دەڕواتە بەردەواری عـەشـیـرەتەکـەی. "سـوارە" هەر لە منالـیـیـەوە تـوێشـووی شـیـعـر و نووسـینی لە دیوەخـانی ئەدەبپـەروەر و پڕ لە زانست و ئەدەبی بنەمـاڵەی خۆی وەرگـرتبـوو. زۆر کـاتی شـەو و ڕۆژانی لەگـەڵ مـامـۆسـتـاکـانی حوجـرەی فـەقـێـیـان دەکەوتە جەدەل و باسەوە لە سـەر مـانـای شـیـعـر بەتایبـەت شـیـعـرەکـانی "حافـز شـیـرازی". "سـوارە" هەر لەو دەمـەوە مـایـەی تەسـەلی دوایی وەرگرت و جارجار وەک شایەری باش شیعرێکی جەفەنگی دەگوت.

باوکی "سوارە" لە هاوینی ساڵی ١٣٣٣ی هەتاوی ماڵی لە قەرەگوێزەوە چووە "بۆکان" و "سوارە" دڵی تاسەباری لەو دێیە بەجێ هێشت.

بای پایزی تووش و بێـفـەڕ وەک لوورەی گـورگـێـکی بێـچـوو خـوراو بە گـوێ ئەگـەیی، سەروگوێلاکی دار و گیای تێک دەکردەوە، دەنگ و ڕەنگی ئەو پایزە بەڕاستی دزێو و ناخۆش ئەهاتنە بەر چاو و گوێیان.

کزەی ساردی پایزی ١٣٣٣ بۆ ژینی تاڵ و دژواری "سوارە" کات بوو بۆ "گریان"[٦] "ئەو پایزە سـەرەتای ڕۆژەڕەشی و کـڵـۆڵی لاوێکی تازە پێگەیشـتـوو، جوان چاک و خاوەنهـەست بوو.

لاوێک کە تازە ئەهات شیرنایی ژیان بچێژێ و دڵی کانگای خۆشەویستی و هیواداری بوو، لەو پایزە شوومەدا تێک هەڵگلا و کەوتە دەریای بێ بن و تاڵ و سوێری نەگبەتییە وە.

"سواره" کە نەیئەزانی چارەنووس چ خەونێکی بۆ دیوە، ڕۆژێک لەو ڕۆژە ساردانەی پاییزدا دەچێتە مەڕ شوتنی کاک سەعدی مامی لە چۆمی بۆکانێ. لەبەر شەرم و عەیبە بە جلەوە دەڕواتە نێو ئاو و دوای مەڕ شوتنیش هەر لە ڕووی هەڵنایە جلە تەڕەکانی داکەنێ و بە بەرگە تەڕەکەوە دێتەوە ماڵی مامی، شەوێ دەنیوەشەودا چریکەیەک لە ڕانی دەوەستێ و ناتوانێ قاچی ببزێوێ و نۆبەتێ دایدەگرێ.

ئەو نەخۆشییە کوتوپڕ و دەردادوییە بە قەولی دوکتورە ئاڵمانییەکە میکرۆبێکی پەراوازەی ئورووپایی بوو کە بە هەموو ئێش و ئۆفە بێ سنوور و میزانەکەیەوە بۆ "سواره"ی خۆشی نەدیو بە دیاری هات.

"سواره"ی ڕانەوەستاو، قەت دانەنیشتوو، زۆر زەرد و زەعیف و لێوبەبار لەسەر دۆشەکی هەرزن و لەسەر گازەرای پشت هەر ئەبوو چاو ببڕێتە بن میچی خانووەکە و خەفەت بۆ لەشی ساغ و لاوچاکی خۆی بخوا و بۆ ئەو هەموو ئێش و دەردە گرانەش ددان بە جەرگیدا گرێ.

"سواره" لە هەڕەتی لاوی و دڵ بەدنیاییدا چەرخی چەپگەرد لەگەڵی کەوتە دژایەتی و ژینی لێ تاڵ کرد و بەدبەختی و نەهاتی سەرەتاکەی ئاوا و بەو چەشنە ناحەزە دامەزراند. زۆر کات خۆی ئەم شیعرەی بە سۆز و بە دەنگە خۆشەکەی خۆی ئەخوێندەوە.

**"پەژارە و مەینەت و دەرد و نەهاتی**
**هەموو هاتن ئەجەل هەر تۆ نەهاتی"**

بەڕاستی شکۆی ژیان بۆ هەموو زانایەک و هونەرمەندێک هەر دەبێ ئەمە بێ، دەنا پێچەوانەی سروشت وەدی دێ، "سواره"ش وەک ئەو هەموو شاعیرە بەرز و پیاوەگەورە و بلیمەتانەی دنیای زانست دێوی دزێوی نەهاتی ڕووپەڕەی ڕەشی ژیانی بۆ لێک کردەوە و نیشانی دا. "سواره" دوای ماوەیەک لە سەر قسەی دوکتۆرە ئاڵمانییەکە بۆ دەوا و دەرمان لە نەخۆشخانەی ئەمریکاییەکان لە تەورێز خستیان و دەرمان نەکرا. "سواره" زۆربەی لەشی لە نێو گەچدا بوو، بە هیچ لایەکا جووڵانەوەی نەبوو، بێ خەوی و ئێش و ژانی بێ وچان، نە خواردنی هیچ چەشنە بژیوێک، نە گەڕان و خەم و خەفەت، وای جاڕز کردبوو تا ڕادەی بێزاری لە ژین، ئەو"سواره"ی کە ئەتکوت کاسەیەکی جوانی لە هیوالێوانە، مەرگی بە ئاوات دەخواست. "سواره" کەوتبۆوە نێو تاوێری نەهاتی و کلۆڵی و تلار ئەبۆوە. لەو کاتەدا کیسەی سەفراشی چڵکی کرد و ئەبوو هەڵبدرێ و عەمەل بکرێ: ئەو لەشە زامار و بێ‌تینە ئایا چەقۆی دوکتۆری جەڕڕاح هەڵدەگرێ؟ دوکتۆر بڕوای وا بوو ئاوا بێهێنێتەوە دەمرێ و تابشی بێهۆش کردنیشی نییە، ئەی چی بکرێ؟ وەڵامی ئەو پرسیارە حاجی ڕەحمان ئاغای موهتەدی، مامی "سواره" دایەوە و فەرمووی لەسەر خودا عەمەل بکرێ، عەمەل کرا و لەژێر

کێردی تیژی جەڕڕاح هاتە دەرێ و پاش چوار مانگ لە تەوریز مانەوە، ئەندامی بریندار و ژان تێوەستاو و بێ حەرەکە و بێ تووانی "سوارە" گەڕایەوە بۆکان، دوای سێ ساڵ لە جێدا کەوتن وەک منداڵی تازەپێگرتوو وە دارەدارە کەوت و هەستایەوە، بەڵام گۆچانێک بە دەستەوە و تەنیا ئێسک و پێست. "سوارە" سێ کەلاسی هەوەڵی ناوەندی لە ساڵی ١٣٣٦ ـ ١٣٣٧ ـ ١٣٣٨ واتە سیکلی هەر لە بۆکان وەرگرت و بۆ تەواوکردنی ناوەندی چوو بۆ تەوریز و لە ساڵی ١٣٤١ی هەتاوی دیپلۆمی لە دەبیرستانی «لوقمان»ی تەوریز وەرگرت هەر لەو ساڵەدا "سوارە" لە تاقیکردنەوەی زانستگەی تاران بەشداری کرد و وەرگیرا و لە کۆلیجی حقووق بەشی قەزایی دەستی کرد بە دەرسخوێندن.

"سوارە" ساڵی ١٣٤١ی هەتاوی بە داوی بسکی کچێکی ئازەرییەوە بوو، ئەو "سوارە"ی عاشقی بەرموور و خشڵ و مێخەکبەندی کچی کورد، وا بە تەڵەوە بوو کە ڕەسم و یاسای عەشیرەتی تێکشکاند و بەبێ ئیجازەی کەسوکار، بە دزی و بە پەلە زەماوەندی لەگەڵ کرد و بردی بۆ تاران و دڵی پڕ لە ئەوینی کچی لەباری لادێیی دا بەو کیژە نامۆ و شارستانییە.

حکومەتی شا لەو ساڵانەدا لەبەر ئەو هەموو زوڵم و ستەمەی کە لە خەڵکی ئەکرد تەنانەت سێبەری خۆشی لێ ببوو بە دوژمن و لە دار و بەرد ئەترسا. ساڵی ١٣٤٣ی هەتاوی پەلامارێکی دڕندانە بۆ گرتن و کوشتنی خەڵک کرایە سەر خەڵکی ئێران، بەتایبەت ڕووناکبیران و سوارەش کەوتە بەر ئەم هروژمە و لە بەندیخانەی "قزل قەلعە"ی تاران بۆ ماوەی شەش مانگ لەژێر بێڕەحمانەترین ئەشکەنجە و ئازاری ساواکدا خۆی ڕاگرت و شیعرە مەشهوورەکەی "سوورەقەڵا، دایکی بەڵا"ی گوت کە بەداخەوە من تا ئێستا، کە خەریکی کۆکردنەوەی ئاساری "سوارە"م وە دەستم نەکەوتووە، لە لای هەر خۆشەویستێک هەبێ و بۆم بنێرێ مەمنوونی ئەبم ."سوارە" لە هەموو بەندییەکانی ئەو بەندیخانەیە زیاتر ئەشکەنجە و زەجری لەسەر بوو، بە مشاری بەرقی داغیان دەکرد و تا سەر ئێسکی گۆشت و پێستی ئەسووتا و ئەقرچا، وای لێ هاتبوو بە هەر هۆیەکەوە بانگیان ئەکرد ئەڕشایەوە و "خودا عالمە ئەو نەخۆشییەی مەعدەی لەو دەمەوە پێوە نووسا" و ناوبانگی خۆڕاگری و ئازایەتی دەرکرد.

"سوارە" لە زیندان هاتە دەرێ و زەرد و لاواز و بێواز خوێندنی دانشگای درێژە پێدا و ساڵی ١٣٤٧ی هەتاوی خوێندنی زانستگەی تەواو کرد، بەڵام هەر وەک هەموو کارەکانی تری بۆ وەرگرتنی "دانشنامە" کە ئەبوایە شتێک بەناوی «تێز» بنووسێ کەمتەرخەمی لێ کرد و پاش چەند ساڵ وەری گرت.

"سواره" سەرەڕای ئەو هەموو نالەبارییانەی کە ڕوویان لە ژیانی ئەو کردبوو دەسکورتی و نەبوونیش لەوێ بوێستێ. باوکی سواره کە ماڵی هاتە بۆکان، بە هۆی نەمانی ماڵ و سامانەکەیەوە بوو ،لەبەر ئەوەش کە خۆی زۆر پڕخێزان بوو نەیدەتوانی یارمەتی پێویست بە "سواره" بکا. مامەکانی بەتایبەت خوداڵێخۆشبوو حاجی ڕەحمان ئاغای موهتەدی و کاک سەعدی موهتەدی یارمەتییان دەدا و ئامۆزایەکی لە خۆی گەورەتر هەبوو بە ناوی "حەسەن" کە یەکێک لە پیاوە باش و بەکەڵکەکانی بنەماڵەی شاعیر بوو، بەداخەوە ساڵی ۱۳٦۳ی هەتاوی لە شاری کەرەج کۆچی دوایی کرد، ئەو زۆرتر لە هەمووان یارمەتی ئەدا و جێگای خۆیەتی یادێکی لێ بکەین و ڕەحمەتی بۆ بنێرین. کاک حەسەن ڕووبەڕووی "سواره" ئەیگوت "سواره" هەر کات نامەم بۆ بنووسێ و بڵێ: برادر محترم کاکه حسن، ئەوە دەزانم هێشتا پووڵی ماوە، بەڵام ئەگەر بنووسێ: کاکه حەسەن بسیار عزیزم، تێئەگەم بێپووڵە و دەبێ بۆی بنێرم، "سواره"ش بە پێکەنینێ ئەم قسەیەی تەسدیق دەکرد.

سواره لە سەر ماڵی دۆست و ئاشنا و خزم زۆر بێتەعاروف و خۆماڵی بوو، ماڵی خۆشی بێموزایەقە هی ئەوان بوو.

سواره ساڵی ۱۳٤٦ی هەتاوی لە ڕادیۆ بەشی کوردی دەستی بەکار کرد و بوو بە مووچەخۆری حکوومەت.

"سواره" تەواوی ژیانی بە ناخۆشی و تاڵی بردە سەر. زۆر جار کە دەرشایەوە خوێن بوو و خۆی بە شۆخییەوە دەیگوت لە داخی ئەم ژینە تاڵە خوێن دەڕشێمەوە. تەنگوچەڵەمە لە ژیانی ئەودا ببووە ڕەفیقی گیانی و ساتێک بەجێی نەدەهێشت.

"سواره" لە پەخشانی "زوڵاڵترین پێکەنینی جیهان"دا دەڵێ": "من پەروەردەی چیا و کەژم". هەروەها لەو پەخشانەدا دەڵێ:" دڵم پارچەیەکە لە بەیانی پڕ زەردەخەنەی ئاواییە بچووکەکەمان کە لە باوەشی چیایەکی بەرزا ئارامی گرتووە". "سواره" لە یەکێکی تر لە پەخشانەکانیدا دەڵێ:" بێدەنگی باوەشی چیا بیربزوێنە، هەموو ئەو بیرەوەرییانەی کاتی منداڵی و دەورانی ژیانی لە لادێ لەگەڵ هەموو کوێرەوەرییەکانی زەمانی نەخۆشی و گاڵتەی گەردوون لە دوای نەخۆشییەکەشی، لەش بەباری و تاڵ و سوێری ژیان و گۆچان بەدەستی و شەلی، هیوا و ئاواتی خنکاوی دڵی بەکوڵی، هەموو ئەبوونە ئیلهام بۆ شیعر و شوێنەوارەکانی. "سواره" وەک پۆلووی ئاگری نێو ژیلەمۆ جاربەجارێک بە کوتنی شیعرێک نەگەشایەوە و نالەبارییەکی ژیان دایدەمرکاندەوە، نەدامەتی ئەتگوت بە بەژنی ئەو براوە. لە دەورانی کارمەندیشیدا هەر تووشی نەیاری بوو. "سواره" بۆ پلەوپایەی کارمەندی نەیدەویست نزم و نەوی بژی(۷) و "بۆ مەبەست سەر دانەوێنێ(۸)" تەنانەت بۆ "تاوێکیش".

ئەو لای وابوو ژینی بێفیز[٩] یانی نەمان، هەر بۆیەش بوو کە تەعزیم و کڕنۆشی لەبەر ئەم و ئەو نەدەکرد و لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی و بەرپرسی ڕادیۆ بەشی کوردی ملەبەملە ڕائەوەستا و قسەی نارەوای لێ قەبووڵ نەدەکرد و لەو کاتانەدا پاشەڕۆژی نەدەدی. "سوارە" دوور لە خەڵک و گۆشەگیر، ڕەنجی ئەبرد و بە هۆی کەم تاقەتی کەمتر ئەبینرا، بەڵام ڕۆح و ڕەوانی "سوارە" نەئەسرەوتن و نێو گەل و جەماوەریان دەویست، جا بۆیە "سوارە" شیعر و نووسراوەکانی بە نوێنەری خۆی نارده نێو خەڵک و بەم چەشنە هەم لەشی بیماری ڕازی کرد و هەم گیانی نەسرەوتووی ئارام کردەوە.

زستانێکی سارد و بەفراوی لە شاری بۆکان خەبەری نەخۆشی "سوارە" وەک برێشکەی سەر ساج هەڵیبەزاندمەوە، دوایی خەبەری خەماوی تر گەیشت و هەموو بەرەو تاران وەڕێکەوتین، لە تەورێز خەبەر بە هەموو قورسایی و دزێوی خۆی ئامبازم بوو و نەمانی "سوارە"ی پێ کوتین، چاوم تارمایی بە سەر کشا و لاقم یارمەتی ڕۆینی نەدەدام،ڕۆح لە جێیەکی سەختە و نایەتە دەرێ. ڕێگای تاران درێژ و درێژتر بوو لە جاران. لام وابوو چەند ڕۆژێکە بەڕێوەم، گاهێک پەلەم بوو بۆ گەیشتن چونکەدڵم مەرگی "سوارە"ی بۆ وەرنەدەگیرا، گاهێکیش پێم خۆش بوو ئەو ڕێگایە هەرگیز نەبڕێتەوە و ڕاستی ڕووداوەکە هەر ڕوون نەبێتەوە. نەخۆشخانەی "میساقییە"ی تاران کە لەبەر کوردەکانی دانیشتووی تاران مۆنجی ئەدایەوە، وەک دێوەزمە و هەیولایەکی بترسێن ئەهاتە بەرچاوم. لەبەر خۆمەوە کوتم هەیاران ڕاستە ڕووداو بڕستبڕە و سەرلێشێوانە، بەڵام مەگەر من برای "سوارە" نیم، ئەبێ لە بەرامبەر ئەو ڕووداوە تاڵ و دڵتەزێنە و ئەو هەموو جەماعەتەدا خۆڕاگری نیشان بدەم، بە شوکر و یادێکی خولقێنەری زەمین و زەمان، سکنایی و هێزم دا بە دڵی سووتاوم.

ڕۆحی بەرزەفڕی[١٠] بەرزەمۆژی سوارە جێی گرت لە توێی شیعر و لە لەشی زاماری ماڵئاوایی خواست و بەرەو شیعر و نووسراوەکانییەوە و گیانێکی تازەی پێدان. تەرمی "سوارە" کە هەڵی ئەگرت هەڵیگرن بە شانان، هاتەوە گۆڕستانی پیرۆزی بنەماڵەی خۆمان لە ئاوایی حەمامیان ناوچەی بۆکان و لەشی بێ تینی کە خۆی ئەپرسێ: تۆ بڵێی: بۆ لەشی ساردەوەبوو[١١] تینێ بێ؟ ڕۆیشتە دنیای نەمان کە تۆ بڵێی پاشی نەمان ژینێ بێ[١٢] دڵێک لە تەپین کەوت و هەزاران دڵ خورپەی کەوتێ.

ئەتگوت سروشت و خیلقەت لە ژیانی "سوارە"دا هەرگیز نەیتوانیبوو گەرمایی و تین بخولقێنێ، هەر ساردوسڕی بوو، لە سەرمایەکی پاییزیدا لەشی بوو بە ئامانجی نەخۆشییەک کە هەموو خێروخۆشی ژیانی لێ ستاندەوە و لە زستانێکی سارد و سەهۆڵبەنداندا مۆتەی مەرگ سواری بوو و هیچ بەزەیی بە گەنجی و لاوی ئەودا نەهات و گیانی لێ ساند. ڕۆژێک

له ڕۆژه ساردەکانی هەوەڵ مانگی زستانی ١٣٥٤ی هەتاوی "سواره" کاتێ بەرەوماڵ ئەگەڕێتەوە وەبەر ماشێنی یەکێک لە هاوکارەکانی خۆی دەکەوێ و ئەیبەنەوە بۆ ماڵێ، قاچی بە قەولی خۆی کە لە نامەیەکدا[١٣] بۆ "بەرپرسی زاراوەکانی ئێرانی ڕادیۆ دەنووسێ: پایم بە اندازه یک متکا ورم کرده" ئەستوور بوو و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و بە واتەی خۆی کە هەر دەو نامەیەدا نووسیویەتی" در خانەمور شبنمی طوفان است " ئەوەندە بەس بوو بۆ کولانەوەی برین و بووژانەوەی کلۆڵی ئەو.

پاش دوو ڕۆژان سواره دەبەنە نەخۆشخانەی"میساقییە"ی تاران و زەردوویی ئەگرێ. دوکتۆرەکان دەڵێن سەرەتانە و عەمەلی دەکەن و مەعلووم بوو کە ئەو سەرەتانە کەمکار و بێدەنگ بووە و بەو تەسادوفی ماشێنە وەجووڵە کەوت و مەرگی پێوەبوو. ماموستا «ڕۆژبەیانی» زانای بلیمەت و ئاگا کە یەکێک لە دۆستە باشەکانی "سواره" بوو و زۆر شۆخیو گاڵتەی ناسکی لەگەڵ ئەکرد گۆیا دەڵێ هەر ئەو ڕۆژە کە "سواره"ی لاو و خۆشەویست کۆچی کرد، من لە لای بووم. کچە پەرستارێکی جوانکلەی خشپیلانە هاتە لای، بە زمانی کوردی کە پەرستارەکە تێنەدەگەیشت، کوتم: کوڕە خۆ تۆ دەتگوت من عەشیرەتم و قەت ناترسێم، نەتزانی ئەوە عیسا مەسیح بوو، مردوو زیندوو ئەکاتەوە "سواره"ی بەشبڕاو لە ژین و دەسداشتوو لە مان، تەنیا بە بزەیەکی خەفەتهێن و مەرگاوی دەم و لێوی جوانی کە لە گۆکەوتبوون ڕازاندەوە و وڵامی دامەوە.

شاعیری پایەبەرزی کورد ماموستا حەقیقی لە شینی "سواره"دا دەفەرمووێ:

لە دڵی باب و برا غەم بارە
لە هەموو شوێنەوە جێی تۆ دیارە
چییە ئەو شین و هەراوهاوارە
کۆچی بێوادەی " کاکە سوارە"

بەڵێ "سواره"ی سەحەتسووک و دەنگخۆش بە کۆچی بێوادەی خۆی خەم و پەژارەیەکی زۆری لە سەر باب و برا و کەسوکار بار کرد.

ماموستا کە بە دوو هۆی خزمایەتی و شاعیری سوارەوە، مەرگی شاعیر، ڕۆژی ڕوونی لێ کردۆتە شەوی دەیجوور و دەڵێ:

ڕۆژی ڕوونم بە شەوی دەیجوورە
سوارە دیداری قیامەت دوورە
چیمەنی تافی جوانیت شین بوو
هەرەتی ژین بوو،چ وادەی شین بوو

زانا و مامۆستایەکی دیکەش بەڕێز "کاک یوسف کوردنژاد" بە پارچە شیعرێکی فارسی مەرگی"سوارە" ماتەم و شین ئەگێڕێ و دەڵێ:

سواره نوگل خندان باغ کردستان
بدست جور فلک پژمرید و پرپر شد
عقاب اوج شهامت بخاک درغلطید
ولی عقاب بیانش بەآسمان پر شد
ادیب و شاعر درد آشنای ملت را
دردا کەزیر خاک تیرەبستر شد
تو ای کەخاک سیەروی دل پر از گنجی
تو ای کە ظاهرت هر دم برنگ دیگر شد
کنون کەگنج هنر را گرفتەای در بر
عزیزوار بنوازش کەاین مقدر شد

ئەگەر بمەوێ داخی مەرگی سوارە لە زمان خۆم و دۆست و ئاشنا و ڕێبوارانی ڕێگای ئەوەوە بڵێم نووسینەکە لە پێشەکی دەردەچێ و دەبێتە کتێبێکی ئەستوور و منیش نە دەمەوێ و نە دەتوانم کتێبنووس بم کە وا بوو لێرەدا دەیبڕمەوە و دەڵێم ئەمە بوو ژیاننامەیەکی کورت لە ژینی بێ تینی "سوارە ئێلخانی زادە".

---

١ـ ئیشارە بە شیعری "شەنگەسواری"سوارە.
٢ـ "یادی منالّی" شیعری سوارە.
٣ـ "کچی بەیان" شیعری سوارە.
٤ـ «وەستا مستەفا» کێوێکی بەرزە کە گوندی تورجانی لە ئامێز گرتووە.
٥ـ شیعری "شار"ی سوارە .
٦ـ شیعری "هەڵۆ"ی سوارە.
٧ و ٨ ـ شیعری مامۆستا و زانای نەمری کورد هەژار ـ "هەڵۆ".
٩ـ هەژار "هەڵۆ".
١٠و ١١و ١٢ـ"هەڵۆ" سوارە.
١٣ـ ئەو نامە ئێستا لای منە.

# سواره بوت نییه!

**جەلال مەلەکشا**

ڕەخنەی ئەدەبی، لە کوردستانی ئێراندا نەک هەر ڕەگئاژۆی نەکردووە، بەڵکو بۆتە بازاڕێکی ئاڵۆز و بێسەروبن... لە ڕاستیدا، ئەوانەی خۆیان وەک ڕەخنەگر لە قەڵەم دەدەن، جگە لە جنێوفرۆشی و نان بە یەک بە قەرزدان و دارکاری یەکتر، هیچی تر لە بەر چاو ناگرن و لەم بەینەدا، ئەوەی کە مەترەح ناکرێ بابەتە ڕەخنەییەکەیە. ڕەخنەگری بەڕێز، بە جێگەی ڕەخنەی ماقوولانە و بنەڕەتی دەست دەکاتەوە، بە جێی گەلاڵەی مەبەستەکە، لە لایەنە شەخسییەکان دەکۆڵێتەوە، باروودۆخی ژیانی تایبەتی یەکتر دەخەنە ژێر تیخی قەڵەم. کەرامەت و حورمەتی قەڵەم پێشێل دەکەن و زار بە تەشەر و تانووت و جنێو ـ کە دوور لە شەرافەتی خاوەنی قەڵەمە دەکەنەوە... ئەمانەش هەمووی بەو بۆنەوەیە کە ڕەخنەگرە بەڕێزەکانمان فارس گوتەنی (کونی دوعایان ون کردووە). نازانن لە کوێیەوە لغاوی کەن. لە سەرەتاییترین بابەتە بنەڕەتییەکانی ڕەخنە بێخەبەرن. ئەرکی سەرشانی ڕەخنەگرێکی لێزان و بەئەدەب ئەوەیە بابەتەکە بخاتە ژێر موتالا و لێکۆڵینەوە، بەڵام ڕەخنەگرانی ئێمە یان تەنیا لایەنە سستەکان لەبەر چاو دەگرن یان ئامانجیان وێرانکردن و ڕووخاندنی کەسایەتی غەنیمەکەیانە!! ئەرکی ڕەخنەگر چییە؟ غەیری ئەوەیە وەک سەرپشکێکی بە ئاوەز و پسپۆڕ و داوەرێکی بێلایەن بابەتەکە هەڵلاجی بکا؟ خاڵە سستەکان نیشان بدا و لە بەرانبەردا لایەنە بەقەوەتەکانی بابەتەکەش لەبەر چاو بگرێ و ئەگەریش بتوانێ خاوەنی بەرهەم ڕێنوێنی بکا؟ من کارم بە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی تردوە نییە، ئەو بەرهەمانەی تا ئێستا وەک ڕەخنە لە گۆڤاری سرووەدا چاپ کراون، بۆ جارێکی تر چاوێکی پێدابخشێنن بزانن جگە چەند بەرهەمی قامک ژمێر، شتێک وەک ڕەخنە دەبینن. ڕەخنەگر یا مەنزووری خۆهەڵکێشان بووە، یا نان قەرزدان، یان گۆپاڵ وەشاندن و تەماکردن و تەسفیە حیسابی شەخسی...

ئێمە هێشتا تا گەیشتن بە ڕەخنەی عیلمی مەودایەکی زۆرمان ماوە، ئەوانەی کە خورجێنی ڕەخنەیان لە کۆڵ ناوە و ئیدعای ڕەخنەگری دەکەن، لەسەر یەکەم پلەی پەیجەی ڕەخنەگری ڕاوەستاون و بۆ ئاسمان دەڕوانن. قەڵەمەکانیان بەرەو ناخی مەبەست شۆڕ نابێتەوە. هێندێ جار تەنانەت بێئەوەی بزانن خاوەنی بەرهەم چی گوتووە و چی دەڵێ دەستبەجێ تیخی قەڵەم لە کالان هەڵدەکێشن و یاڵلا، کێ پیاوی شەڕە... ئەوە مەیدان و ئەوەش شیری من!!!

پەتایەکە و تووشی بووین، پەتای (بوت تاشین) چ بکەین عادەتمانە. دێین و لە یەکێک بوت دەتاشین. دەیکەینە بوت و لە بەرامبەرییەوە چۆک دادەدەین و سوجدەی بۆ دەبەین بێئەوەی هێندێ تەنانەت شیاوی ئەوە بن، ببن بە بوت!! کاتێ بوتەکەمان تاشی جا ئیتر پیاومان دەوێ بلێ لەل! پیاومان دەوێ جورعەت بە خۆی بدا و زبانم لاڵ، بلێ کورە خۆ تاڵەموویەکی سەری ئەو بوتە لارە! جا ئێرە دیاری تیر و شیر هەڵکێشان. دەبێتە گەلەکۆمە. خوێن بەرچاوان دەگرێ، بە کورتی کارێ دەکەن ئیتر کەس لەم جۆرە غەڵەتانە نەکا و خوانەخواستە، چەپ تەماشای بوتەکە نەکا! هەموو چەشنە تۆمەت و بوختان بۆ کابرای فزوول ڕیز دەکرێ. هەر دەیهاڕن. گۆڤاری سروەش چونکەڕەوشتێکی ئازاد و دێموکراتیکی هەیە و بە هەموو قەڵەمێ مەیدان دەدا، هەموو ئەو بوختان و تۆمەت و تانەوتەشەرانە چاپ دەکا. هەر چەند من بۆ خۆم وەک یەکێک لە ئەندامانی دەستەی نووسەران، بڕوای پتەوم بە ئازادی قەڵەم هەیە و پێم وایە دەبێ بە هەموو قەڵەمێک بە هەر بیر و بڕوایەکەوە مەیدان بدرێ. ئێستا بەو عەقیدە گەیشتووم دەبێ لەمەولا، قەڵەمە دەمهەراش و جنێوفرۆش و بوختانکەرەکان نەختێک بەربەست بکرێن. چونکەئەم جۆرە قەڵەمانە کەرامەتی نووسەر لەکەدار دەکەن و شەرافەتیان دەخەنە ژێر پرسیار.

عەرزم کردی. کاتێ یەکێک بوو بە بوت، ئیتر هیچ قەڵەمێ حەقی ئەوەی نییە ئەو ئاخڵە پیرۆزەی بە دەوریدا کێشراوە بشکێنێ. یان زاتی ئەوەی ببێ لایەنێکی بخاتە ژێر ڕەخنە و پرسیار، ئەم شێوە نادروستە، سونەتێکی ڕووخێنەرە. ڕاوەستان و ئیستێکی ئەدەبییە.

هێندێ کەس، سوارەی ئیلخانی زادەییان کردووە بە بوت و هێندێکیش وەک مجێوری مەزاری ئەدەبی سوارە گۆپاڵ بە دەست لە چەقی ئاستانەکەیدا ڕاوەستاون. لە پشتی کێلی قەبرەکەیەوە سەنگەریان گرتووە و بە ئەسلەحەی قەڵەمەکانیان بە کەس ئیزنی ئەوەش نادەن تەنانەت بلێ: کاکە گیان لە لای گوڵەکانی سەر مەزاری سوارەوە دڕوویەک شین بووە! نەخێر، دڕوو غەڵەت دەکا بە خۆی ئیزنی شین بوون لە سەر مەزاری سوارە بدا. چاوی ئێوە کوێرە و بە جێگەی گوڵ دڕک دەبینێ! ئاخە مەگەر دڕک دەتوانێ لە گوڵستانی سوارەدا بڕوێ؟ بە ڕاستی بڕێ جار ئەم مجێورانە دەبن بە دەستەیەکی لاتی چەقۆکێش و...

من بە گوێرەی تەمەنم، سوارەم دەناسی، لە نیزیکەوە دەمناسی. چەند جارێکیش پێکەوە دانیشتووین. لانیکەم بەرهەمەکانم خوێندۆتەوە. یان گوێم لێبووە، هەموو بەرنامەکانی تاپۆ و بوومەلێڵم بیستووە. لە زۆر لایەنی ژیانی سوارە خەبەرم هەیە کە تەنانەت مجێورەکانی ئێستا نەیانبیستووە. پێم وایە لە قووڵایی دڵمەوە دەڵێم سوارە یەکێ لە باشترین شاعیرانی کوردی کوردستانی ئێرانە. چەند پارچەیەک لە شیعرەکانی بەڕاستی شاکارن. هەرچەند

زۆربەی لە پەخشانەکانی وەرگیراو و وەرگێردراون، بەڵام شاکار و بێهاوتان. شیعری خەوەبەردینە، هەرچەند ئیلهامەکەی لە ماسییەڕەشە چکۆڵەی سەمەدی بەهرەنگی وەرگرتووە، بۆخۆی شاکارێکە. وەک شاعیرێکی بەهرەدار، شێعری نوێی کوردی لە ئێراندا ڕەواجدا، جێگایەکی تایبەتی بۆخۆی هەیە "هەرچەند پێش لە سوارە عەلی حەسەنیانی و چاوە شیعری نوێی کوردییان دەست پێکرد"، بەڵام شیعرە فارسییەکانی سوارە (جگە یەک دەوانیان) لە ڕەدیفی شیعرە دەرەجە سێهەمەکانی فارسیدان و هەر ناویان لێ نەبرێ باشترە! من هەرگیز ناتوانم سوارە وەک شاعیرێکی باشی فارسی وێژ ناو ببەم. بەڵێ دەتوانین سوارە ئیلخانی زادە وەک باشترین و گەورەترین شاعیری نوێخوازی کوردستانی ئێران بناسین و بناسێنین، بەڵام ئەوەش نابێتە دەلیل ئیتر کەس نەتوانێ ڕەخنە لە سوارە بگرێ. ئەوە نابێتە دەلیل ئیتر کەسێ بە خۆی ئیزن نەدا بڵێ فلانە واژەی لە فلانە شیعری سوارەدا سست و نارەسەنە یان فلانە شیعری زەعیفە! ئێوە هیچ شاعیرێکی گەورە نادۆزنەوە هەموو شیعرەکانی شاکار بن و ڕەخنەیان لێ نەگیرێ. نازانم هێندێ کەس بۆ دەیانەوێ سوارە بکەنە بوت؟ ئایا هۆیەکەی بەزەییە؟ چونکەسوارە ماڵئاوایی لە دنیا کردووە؟ یان ئەوەی کە سوارە لە شەوەزەنگی ڕژیمی شاهەنشاهیدا بەستەڵەکی شکاندووە و لە ڕادیۆدا تاپۆ و بوومەلێڵی بڵاو کردۆتەوە؟ هەرگیز ئەم هۆیانە مەکەن بە خاڵی موسبەتی سوارە. چونکەبێئەوەی خۆتان بزانن چ دەکەن لە باری سیاسییەوەسوارە دەخەنە ژێر پرسیاری نالەبار! خۆ سوارە ئاشیلی رووینِ تەن نەبوو بتوانێ بە زۆری شان و باهۆ ترۆوای ڕادیۆ داگیر بکا و زمانی کوردی ڕزگار بکا. ئاخە پاژنەپای ئاشیل...!!

کوتم سوارە شاعیرێکی گەورەیە. چەند شاکاری خستە سەر گەنجینەی ئەدەبیاتی کورد، بەڵام بوت نییە. زۆر لە بەرهەمەکانی چ پەخشان و چ شیعر شیاوی ڕەخنەن. لە ئەدەبیاتی فارسیدا نیما یووشیج وەک باوکی شێعری نوێ جێگایەکی بەنرخ و تایبەتی هەیە، بنەڕەت دانەری شیعری نوێی ئێرانە، شاکاری هەرمانی زۆرە، شیعری زۆر خراپیشی هەیە. ئەوەش قەبووڵ کەن هەرگیز ناتوانین سوارە لەگەڵ نیما هەڵسەنگێنین. بەم حاڵەشەوە نیمایان نەکردووە بە بوت. هەزاران ڕەخنەیان لە سەر بەرهەمەکانی نووسیوە. مجێورەکانیشی قەمە و ڕەمیان هەڵنەکێشاوە، بەرهەمەکانیان هەڵلاجی کردووە، ڕێڕەوانی شیعری نوێی تەنانەت دۆستان و یارانی خودی نیما، لە شاملووەوە بگرە تا بەراهەنی و حقووقی و دەستغەیب لایەنە سستەکانی شیعریان خستۆتە بەر چاوی خوێنەر و شاعیرانی لاو. کەسیش سەرکوتیانی نەکردوون. بەڕاستی ئەگەر شاعیرانی وەک لۆرکا نێرەودا هۆگرانی وەک سوارەیان ببا خۆ دنیا نوقمی خوێن دەبوو.

مەبەستم لەو هەموو درێژدادڕییەڕەخنەیەک بوو کەباوکی تارا لە سەر شیعری «شاری» سوارە نووسی. یاخوا ئەوەی ئێمە دیتمان ئێوە نەیبینن، لە هەموو لایەکەوە قرمژنی جنێو داباری. لە ناکاو بەرقی شمشێرەکان چاوی ئاسمانی مۆڵەق کرد. ئاخە مەگەر دەبێ؟ ئەوە کام کافری بێدینی لامەزهەبە کە ئیجازەی بەخۆی داوە بە سوارە بڵێ (بالای چشمت ابروست!) جگە لەمارف ئاغایی کە ڕەخنەیەکی ماقووڵانەی لە جوابی ڕەخنەی باوکی تارادا نووسی، دیتران هەموو بە گەلەکۆمە و جنێودان دەستیان کردە خۆپێشاندانێکی مەستانە و هەراوهوریا. من نامەوێ لە باوکی تارا دیفاع کەم. ئایا بە ڕاستی ئەم گەلەکۆمە، گەلەکۆمەیەکی ناوچەیی نەبوو؟ کاکە گیان لە زەمانی ئێمەدا «شەڕەگەڕەک» نەماوە. ئەم جۆرە شەڕانە یادگاری دەرەگایەتی و عەشیرە و عەشیرەت بازییە. زەمان، زەمانی لۆجیک و مەنتیقە. ڕەنگە باوکی تارا، لە هەمووان زۆرتر هۆگری سوارە و بەرهەمەکانی بێ.

تەنیا تاوانی جەلیل ئەوەیە کە قسەی دڵی ناشارێتەوە. ڕووک و ڕاستە. تارا، ناوی کچەکەیەتی و خۆیشی باوکی تارایە. تاوانەکانی دیکەی جەلیل ئەوەیە کە لە سەر بیروبڕوای تایبەتی خۆی ڕەخنەی لە شیعرەکەی سوارەی گرتووە. لەم دنیایە هەر کەس بەپێی بیروبڕوای خۆی لە دیاردەکان دەڕوانێ. دەرەبەگ وەک دەرەبەگ، بورژوا وەک بورژوا و مەلایەک وەک خۆی و... ئەوەش سووچ و تاوان نییە. هەروا کە ئێوەش لەسەر عەقیدەی خۆتان بە جنێو و بوختان! ئەنگۆ کە خۆتان بە ڕاژەگەرانی فەرهەنگ و ئەدەبیاتی کوردی دەزانن بەجێی ئەوەی تالانە بۆ ڕواندنی شەتڵی گوڵ خۆش بکەن، گوڵ دەپڕووکێنن، کارتان وێرانکارییە. بهێڵین با قەڵەمەکان بێسام و سڵ لایەنەکانی بەرهەمی سوارە شی بکەنەوە. سوارەش وەک هەموو شاعیرێک هەم شیعری چاکی هەیە و هەم شیعری خراپ. بە شانتاژ و هەڕەشە دەمی قەڵەمەکان مەبەستن، بهێڵین با قەڵەمە بەهرەدارەکان سەمەر بگرن. سوارە نیازی بە مجێور و ئیسکۆرت نییە. بەرهەمەکانی سوارە ناسێنەری هونەری سوارەن، بە داکۆکی نەفامانە لە سوارە بەرهەمەکانی ئاڵوودە مەکەن!

# کێ کوتوویه "سواره بوته"..؟

**حاجی عومەر ئێلخانی**

ڕۆژێک بە شەقامی شارەکەماندا دەگەڕام لە بەرامبەر کتێب فرۆشییەک چاوم کەوت بە نووسراوەیەک بە شیشەی پەنجەرەکەوە درابوو مەتڵەب و عینوانەکانی سروەی ژمارە "٧٥"ی تێدا بوو، یەکێکیان سرنجی ڕاکێشام "سوارە بوت نییە".

ئێستا گۆڤارەکەم نەخوێندبۆوە زۆر سەرم سوڕما و کوتم داخۆ دەبێ "سوارە" کێ بێ و کێ "سوارە"ی کردووە بە بوت، زۆر بە پەلە چوومە ژوورەوە و ژمارەیەکم وەرگرت و هەر لە شەقامەکەوە تا گەیشتمەوە ماڵەوە جارێکم خوێندەوە و لە ماڵەوەش جارێکی ترم خوێندەوە کە دەڕوانم نووسەرەکە یەکێکە لە مامۆستا ئەدیب و شاعیرە باشەکان "کاک جەلال مەلەکشا" ئەو مامۆستایە کە لەپلەیەکی بەرزی ئەدەبیدا جێگای هەیە، یا کۆتایی کردبوو لە باشتر نووسینی مەتڵەبەکە یا هەرچی نووسراوەکەی نەیتوانیبوو حەقی مەتڵەب ئەدا بکا.

منیش ویستم نووسراوەکەی ئەوان بکەمە دوو بەش و لە سەریان بدوێم، ئەگەر دەڵێم بۆیەیە هەروەک دەگەڵ خۆی قسە بکەم ئاوایە نەک مەقالەنووسین.

یەکەم بەش: کاک جەلال لە بارەی چەشنی "ڕەخنەگرییەوە" باس دەکا و دەڵێ "لە ڕاستییدا ئەوانە کە خۆیان وەک ڕەخنەگر لە قەڵەم دەدەن جگە لەجنێوفرۆشی و نان بە قەرزدان بەیەکتر هیچی تر لەبەر چاو ناگرن" دیارە کاک جەلال زۆر تووڕەیە لە جنێوفرۆش و کوتنی قسەی سووک بەتایبەت بە قەڵەم. ئەو لای وایە بە تەشەر و تانوت زار دەکەنەوە و حورمەتی قەڵەم پێشێل دەکەن و بە جێگەی، ماقووڵانە لە لایەنە شەخسییەکان دەکۆڵنەوە.

مامۆستا جەلال دە ڕەخنەکەی خۆیدا دەڵێ: ڕەخنەگر یا خۆهەڵکێشانی مەنزوورە یا نان بە قەرز دەدا بە ئەم و ئەو و یا دەیەوێ تەسفیەحیسابی شەخسی بکا و گۆپاڵ بوەشێنێ و تەمآ بکا. هەروەها دەفەرمووێ: ڕەخنەگرەکانی ئێمە لە یەکەم پلەی پەنجەی ڕەخنەگری ڕاوەستاون و بۆ ئاسمان دەڕوانن و قەڵەمیان بەرەو مەبەست شۆڕ ناکەنەوە بیئەوەی بزانن خاوەن مەبەست چی دەڵێ، قەڵەم وەک شمشیر لە کالان دەردەکێشن و دەڵێن یاڵڵا کێ پیاوی شەڕە ئەوە مەیدان. جا زۆر باشە من لەگەڵ کاک جەلال هاودەنگ دەبم و دەڵێم زار و قەڵەمت خۆش کە وا ڕێوشوێنی ڕەخنەگری لە کوردستانی ئێران بە ڕەخنەگرەکان نیشان دەدەی، بەڵام براکەم تۆ ئەم مەسەلە فارسییەت نەبیستووە کە دەڵێ: «رطب خورده منع رطب چون کند» تۆ خۆت زۆرت جنێو داوە. وەک عالمێکی بلاعەمەل کوتووتە و عەمەلت پێ

نەکردووە، ئەی ئەو کەسەی نووسراوەکەی تۆ دەخوێنێتەوە نالێ کاکە تۆخۆت چوویە سەر مینبەر مەوعیزە دەکەی بۆچی ئەو شیعرە بەرزە فارسییەت لەبیر چۆتەوە کە حافز دەڵێ:

**مـــشـکلی دارم ز دانشـــمند مـــجلس باز پرس**
**تو بەفـرمـاپان چرا خـود تو بە کـمـتـر می‌کنند**

تۆ خۆت بە هەموو هێز و توانات بەربوویە سەروگوێلاکی ڕەخنەگرەکان، چما کوێندەرت دیشێ خوریشۆر کوتاوتن و هەموو گیانت شەلاڵی خوێن کردوون، ئەوە نییە دەفەرمووی: بە داکۆکی نەفامانە لە سوارە، بەرهەمەکانی ئاڵوودە مەکەن. یا فەرمووتە: بڕێک جار ئەم مجێورانە دەبن بە دەستەیەکی لاتی چەقۆکێش. بەڕاستی کاکە تۆ ڕەنگە "نەفام" و "لات و چەقۆکێشت" پێ جنێو نەبێ.

کاک جەلال تۆ شەڕەگەڕەکەکەت زۆرتر بەربلاو کردۆتەوە لە گەڕەکێکی شاری "سنە"وە. کوتەکێکی بزمارڕێژت بەدەستەوە گرتووە و لەسەر گەڕەکێکی شاری "مەریوان" وەجواب هاتووی و لە بناگوێی خەڵکی گەڕەکێکی شاری "سابلاغت" ڕاکێشاوە. ئەی کاکەگیان بە بڕوای جەنابتان شەڕەگەڕەک یانی چی، دەمەوێ عەرزت بکەم ئەوە تۆی کە نانت بە قەرز داوە بە شاعیر و نووسەری گەنج کاک مارف ئاغایی و ڕەخنەکەی خۆتت لە سیحری قەڵەمی ئەو پاراستـووە، دەبێ دوو براکەی دیکە کە جوابی "باوکی تارا"یان داوەتەوە نانیان بە کێ بە قەرزدابێ. خۆ"سوارە خۆی نەماوە تا دووقات قەرزەکەی لێ وەرگرنەوە:

تۆ فەرمووتە: بە گەلەکۆمە و جنێودان دەسیان کردووە بە خۆپێشاندانێکی مەستانە و هەراوهوریا. تەنانەت تۆ ئەم شتەت بە گەلەکۆمەیەکی ناوچەیی داناوە، کاکەگیان هەر ئەوە کە تۆ باسی ناوچەت کردووە و سنوورت جیا کردۆتەوە خۆت داییە ژێر پرسیارەوە کە تەعەسوبی ناوچە هەڵیگرتووی و بەپێچەوانەی ئەوەی کە فەرمووتە: نامەوێ لە باوکی تارا دیفاع بکەم. لەسەری هەڵبەزیوبییەوە. ئەی مالی دیفاعم بە قوڕ گرت. دیفاع چۆنە؟ و هەروەها دەردەکەوێ جەنابت تۆمەتی عەربەدەکێشان و خۆپێشاندانی مەستانەت بە نووسەرێک بەلاوە تەوهین نەبێ.

فەرمووتە: یاخوا ئەوەی ئێمە دیتمان ئێوە نەیبینن. لە هەموو لایەکەوە قرمژنی جنێو داباری لەناکاو بەرقی شمشێرەکان چاوی ئاسمانی مۆڵەق کرد. کاکە بەو فەرمایشەتدا مەعلووم دەبێ کە جگە لەم سێ کەسە کە نووسراوەکانیان لە سروەدا بلاو بۆتەوە زۆر کەسی تریش لەم بارەوە نووسیویانە، بەڵام گۆڤاری سروە نەیداوەتە دەرێ. بۆئەوەی خۆت بزانی و بەپێچەوانەی تاریفێک وا لە گۆڤاری سروەت کردووە لەباری ئازادی قەڵەمەوە هێناوتە ژێر ڕەخنەوە، یا هەر خۆت پێت خۆش بووە، شتەکە گەورە کەیەوە و وەک فیرەدەرسی بە وشەی

جوان و ڕازاوه دوو لەشکرت لە بەرامبەر یەکەوە ڕاگرتووە، دەنا ئاورەکە کوژابۆوە و تۆ خۆت فووت لێ کرد و گەشاندتەوە و دەبێ چاوەڕوانی جوابی ئەم و ئەویش ببی.

لە ئامۆژگارییەکانتدا فەرمووتە: بهێڵن با قەڵەمە بەهرەدارەکان سەمەر بگرن و بە شانتاژ و هەڕەشە دەمی قەڵەمەکان مەبەستن. کاکە من وەختی خۆی سێ نووسراوەم لە ژمارەکانی ٦٣ و ٦٦ و ٦٨ی سروەدا خوێندبۆوە هەڕەشەم تێدا نەدیبوون بە ڕاستی کەوتمە شکەوە دووبارە هەر سێکم خوێندنەوە و هەڕەشەیەکم وەبەر چاو نەهات، ئەوەش خۆی بوختانێک.

جا مەگەر لە نووسراوەی بە قەولی جەنابتان عەربەدە کێشەکاندا کە گۆڤاری سروە نووسراوەکەی چاپ نەکردوون هەڕەشە کرابێ. ئێمە نەماندیتوون، بەڵام جەنابت کە دیوتن حەقی خۆتە لە بەرقی ئەم هەموو شمشێرە زومورڕەدنیگارە ترسابی.

ئێستا کاکە من عەرزت بکەم کەشیعرەکانی "سوارە"باش تێناگەی، مەگەر ئەوە شەڕەگەڕەکە یا خوانەخواستە جنێوە بە جەنابت و یا بۆخوشم نەفامی و لاتی و چەقۆ کێشییە، ئاخر براله گیان ئەوانیش هەر ئەوەندیان کوتووە کە تۆ خوێنت دە تەشتێ کردوون، جا تۆ ئەگەر نووسراوەکەی خۆت و ئەوان بە تەرازوویەکی میزان و بێغەرەز هەڵسەنگێنی دەیسەلمێنی کە قەڵەمی تۆ زۆر شەڕانی تر هاتۆتە مەیدان و گەلێ دڕتر دەمی کردۆتەوە، جا دەفەرمووی دەبوایە زمانی قەڵەمیان لەوەش پاکتر و بە عەدەبتر بێ منیش هەر پێم وایە هەروەک جەنابت دەتوانی تۆمەتی لات و چەقۆکێشی و مجێوری و نەفامی و شەڕەگەڕەک و بووژاندنەوەی عەشیرەت و دەربەگایەتی لە کەس نەدەی و مەتڵەبەکەشت بگەیەنی.

کاک جەلال گیان دە کوتێ نووسراوەی ئەم دوو برا نووسەرەدا دەبیندرێ کە گوتبێتیان "سوارە" کەس حەقی نییە باسی بکا و هەر کەس باسی بکا غەڵەت دەکا، ئەوان بە لێکدانەوەی خۆیان لایەنگرییان لە ڕاستەقینەیەک کردووە، جا ئەگەر ئەمە گوناحە، بەڵێ.

کاک جەلال دەفەرمێ: پەتایەکە تووشی بووین، پەتای بوت تاشین، چ بکەین عادەتمانە دێین و لە یەکێک بوت دەتاشین و دەیکەینە بوت و لە بەرامبەرییەوەچۆک دادەدەین و سوجدەی بۆ دەبەین بێئەوەی هێندێ شیاوی ئەوەش بن کە ببنە بوت. بە بڕوای ئێوە وا دیارە هێندێ شیاوی ئەوە هەن ببنە بوت، بەڵام "سوارە" نا. بە ڕاستی ڕاست دەفەرمووی پەتایەکی پیسە تووشی بووین کە بوت دروست دەکەین ئەوە نییە زانایەکی وەک جەنابیشت خۆت پێ نەپارێزراوە و هێندێ کەس بۆ بوت بوون بە شیاو دەزانی.

فەرمووتە: "هێندێ کەس" سوارە ئیلخانی زادەیان کردۆتە بوت و هێندێکیش وەک مجێوری مەزاری نەدەبی "سوارە" گۆپاڵ بەدەست لە چەقی ئاستانەکەی ڕاوەستاون. کاکە لە

"هێندێ کەس" و "هێندێک" مەنزوورت کێ و چی بووە؟ ئەگەر مەنزوور ئەو سێ کەسەیە کە جوابی باوکی تارایان داوەتەوە یەکیان تۆ خۆت جیات کردۆتەوە و سەهلە نان، کولێرە چەورەشت بە قەرز داوەتێ. دەمێنێتەوە دوانەکەی تر ئایا وشەی "هێندێ کەس" و "هێندێکیش" بۆ دوو کەس بەکار دەبرێ یان دەنا ئەو دووبرا نووسەرە یەک بە هەزارن.

کاکەگیان فەرمووتە: گۆڤاری سروەش چونکە ڕەوشتێکی ئازاد و دێمۆکراسی هەیە بە هەموو قەڵەمێ مەیدان دەدا ... هەر چەند من بۆخۆم وەک یەکێک لە ئەندامانی دەستەی نووسەران بڕوای پتەوم بە ئازادی قەڵەم هەیە. ... ئێستا بەو عەقیدەیە گەیشتووم دەبێ لەمەولا قەڵەمە دەمهەراش و جنێوفرۆش و بوختانکەرەکان نەختێک بەربەست بکرێن چونکەئەم جۆرە قەڵەمانە کەرامەتی نووسەر لەکەدار دەکەن و شەرافەتیان دەخەنە ژێر پرسیار. کاکەگیان لە من دەبیستی ئەو کارە مەکە، بە دوو دەلیل: یەکەمیان ئەوەیە ئازادی قەڵەم و دێمۆکراسی لە گۆڤاری سروە دەستێنییەوە و ئەوە دۆستایەتی نییە، دووهەمیان ئەوەیە کاک ئەحمەد قازی زۆر وشیار و زانایە و ددانی ماری دەردێنێ و لە هووی مووی دەکاتەوە هەر فەوری سروەی ژمارە"٧٥"ی لەبەر دەست دادەنێ و دەڵێ:" کوێخا خۆی مەشموولە"، کە وا بوو مامۆستا گیان تۆ وا باشە هەر ئامۆژگاری بکەی بۆ ئەوەی نووسەرە لاوەکانی ئێمە قەڵەم خاوێنتر بهێننە کایەوە و خۆشت بە قەڵەمی شۆراوە بە گولاوی کەرامەت ئەم جار وەرە مەیدان و لە نووکی خامەی بەهێزت گەوهەر بڕژێنە نێو خەزێنەی ئەدەبی کوردییەوە و بەو شیعرە تەڕ و پاراو و نووسراوە بەهرەدارانەت فەرهەنگی زکبرسی و زارتینووی ئێمەی کورد تێروتەسەل بکە تا ئێمەش بڵێین:

**مریزاد دستی کـه مردوستانرا**

**دوای دل و مرهم جان فرستد**

کاتی ئەوە گەیشتووە بچینەسەر بەشی دووهەمی نووسراوەکە:

دەگەڵ دۆستێکی ئەدیبم باسی نووسراوەکەی کاک جەلالم کرد. کوتی بەڵێ خوێندوومەتەوە بە قەولی مەنشوور کوتەنی کاک جەلال قسەی دڵی بۆ من بێ ئەویش بڕوای هەروەک باوکی تارایە. ئەو دۆستە دەیکوت زۆر کەس لایان وایە بە ڕەخنە لە نووسەرێک یا شاعیرێکی گەورە و بەناوبانگ پلەی خۆیان دەبەنە سەرێ و ناو و شۆرەت دەردەکەن، من گوتم خەیاڵم هەیە شتێک بۆ کاک جەلال بنووسم. ئەو دۆستە کوتی خۆ کاک جەلال هیچی نەکوتووە تا جوابێک هەڵگرێ.

کاک جەلال گیان، ئەوە قسەی دۆستەکەی من بوو و ڕەنگە خۆم هاوفکری ئەو نەبم، هەڵبەت من "باوکی تارا " ناناسم، بەڵام تۆ لە شیعر و نووسراوەکانترا دەناسم. لام وایە

تەنیا تەعەسوب و غیرەتی ناوچەیی هەڵیگرتووی و هیچی تر.

ئەمما کاکە لە بارەی "سوارە"وە کەمێک تێکەڵ و پێکەڵت کردووە و هەزارە و دوولایی ڕۆیشتووی و سەرت لە خوێنەر شێواندووە، لە لایەکەوە دەفەرمووی زۆربەی پەخشانەکانی وەرگیرا و یا وەرگێڕدراون و دەشفەرمووی: بەڵام شاکار و بێ وێنەن. هەر لە خۆت دەپرسم هیچ بیرت لێ کردووتەوە هیچ کات شتی "وەرگیراو" بێوێنە و شتی "وەرگێڕدراو" شاکار نییە؟ جەنابت دەفەرمووی: چەند پارچە شیعرێکی بەڕاستی شاکارن. تۆ بۆ "خەوەبەردینە" کە ئەسەری هەرە بەرزی"سوارە"یە دەفەرمووی ئیلهامە لە "ماسییە ڕەشە چکۆڵە"ی "سەمەدی بەهرەنگی"، ئەی شاکارییەکەی لە کوێیدایە،"وەرگیراو" کەنگێ شاکاری وەرگرەکەیە ئەگەر شاکار بێ هی هەوەڵنووسەکەیە. من عەرزت دەکەم "خەوەبەردینە" کوێی وەک "ماسییە ڕەشە" دەچێ؟ بەڕاستی ئەگەر هیچ ئینسافمان هەبێ ئەوەش دەزانین گەشەپێدان و ڕێبازدانەری شیعری نوێی کوردی لە ئێران"سوارە" بوو و جەنابت تەنانەت لەو "وەرگیراو" و "وەرگێڕدراوانە" نموونەیەکت باس نەکردووە. فەرمووتە: شیعرە فارسییەکانی "سوارە" جگە یەک دووانیی لە ڕەدیفی شیعرە دەرەجە سێیەمەکانی فارسیدان، من هەرگیز ناتوانم "سوارە" وەک شاعیرێکی باشی فارسی ناو ببەم. هەڵبەت ئەمە قبووڵە کە هیچ کەس وەک بە زمانی دایک و بابی خۆی قسە دەکا ناتوانێ بە زمانێکی تر ئاوا ڕێکوپێک و بێ گرێوگۆڵ شیعر بڵێ و بنووسێ، ڕەنگە ئەگەر فەرموبایەت "سوارە" لە ڕەدیفی شاعیرە هەرە بەرزەکانی فارسی زماندا نییە باشتر لێت وەرگیرابایە، بەڵام جەنابت چ بتوانی و چ نەتوانی "سوارە" وەک شاعیرێکی زۆر باشی فارسی ناسراوە و دەوری خۆی گێڕاوە و تەنانەت زۆر کەس شیعرە فارسییەکانی ئەویان لە کوردییەکانی لا نزمتر نین.

دەفەرمووی: نازانم هێندێ کەس بۆ دەیانەوێ سوارە بکەنە بوت، ئایا هۆیەکەی بەزەییە چونکە"سوارە" ماڵئاوایی لە دنیا کردووە؟ جا کاکە خۆ بوت دەبێ بەزەیی بە خەڵکدا بێ و ڕەحم و چاکە بکا نەک ئەوانەی سوجدە دەبەن بەزەییان بە بوتەکەدا بێ!!

فەرمووتە: یان ئەوەی کە "سوارە" لە شەوەزەنگی ڕژیمی شاهەنشاهیدا بەستەڵەکی شکاندووە و لە ڕادیۆدا" تاپۆ و بوومەلێڵ"ی بڵاو کردووتەوە. کاکی خۆم کێ ئەو باسەی کردووە و لە چ نووسراوەیەکدا دیوتە و لە کێت بیستووە پەخشانی تاپۆی "سوارە" ڕەمز و ڕازی موبارەزە و دژایەتی دەگەڵ ڕژیمی شا بووە، فەرمووتە: ئەو هۆیانە مەکەنە خاڵی موسبەت بۆ "سوارە"، چونکەبێتەوەی خۆتان بزانن چی دەکەن لە باری سیا سییەوە "سوارە" دەخەنە ژێر پرسیاری نالەبارەوە،خۆ "سوارە" ئاشیلی ڕووییننتەن نەبووە کە بتوانێ بە زۆری شان و باهۆ ترۆوای ڕادیۆ داگیر بکات و هیلنی زمانی کوردی ڕزگار بکا.

کاک جەلالی بەڕێز ئەوە تۆی خۆت دەزانی چ دەکەی و ئەو قسەیە خەریکی دێنییە گۆڕێ.
ئەوەڵەن کاکەگیان تازە ئەو خەنەیە ڕەنگی نەماوە و قارەمانی "سوورەقەڵا" کە ئەودەم ئێمەمانان کونی مشکمان پێ قەیسەری بوو لە ژێر ئەشکەنجە و ئازاری بێشەماندا هەڵیاندەقرچاند لەباری سیاسییەوە بەو قسانە ناچێتە ژێر پرسیاری نالەبار.
دووهەمەن ئێمە بۆمان ڕوون نەبۆوە تۆ یەکێک لە هۆگرەکانی "سوارە"ی یا ڕەخنەگری؟ چونکەدەو نووسراوەتدا زۆرجار لە پێکیش دراوە و لە ماپێکیش".
فەرمووتە: کوتم سوارە شاعیرێکی گەورەیە چەند شاکاری خستە سەر گەنجینەی ئەدەبیاتی کوردی، بەڵام بوت نییە. بە بڕوات پەخشانەکانی یا "وەرگێڕدراو یا وەرگیراون" و شیعرە بەرزەکەی ئیلهامە لە شاعیرێکی بێگانە. بە بڕوات شاعیرێکی گەورەیە. خوێنەر لە بەرامبەر ئەم دوو بڕوا جیاوازە چی بڵێ و لە بارەی نووسراوەی شاعیرێکی پایەبەرز و نووسەرێکی بەدەسەلاتی وەک جەنابت چلۆن داوەری بکا! من لام وایە خوێنەر دەڵێ دەو نووسراوە پێچەڵ پلووچەدا دڵ و زمان جیران نەبوون و قەڵەم سەرپێچی لە هەستی دەروون کردووە.
پاش تاریف و سەنایەکی زۆر بۆ "نیما یووشیج" کە بەڕاستی جێی خۆیەتی فەرمووتە: شاکاری هەرمانی زۆرە و شیعری خراپیشی هەیە، ئەوەش قوبووڵ بکەن کە هەرگیز ناتوانین"سوارە" لەگەڵ "نیما" هەڵسەنگێنین بەم حاڵەشەوە نەیانکردووە بە بوت. بەچی بزانین "نیما" ئەگەر ڕەخنەی لێگیرابێ دیفاعیشی لێ نەکرابێ، دەی جا ئەوە نییە جەنابت ئیراد و ڕەخنەت لە "خەوەبەرینە" هەیە و ئەرزش و قەدری کارەکەی "سوارە"ت داوە بە "سەمەدی بێهرەنگی" ئەوە نییە باوکی تاراش لە سەر یەکێک لە شیعرە باشەکانی "سوارە" "شار" ڕەخنەی هەبووە و ئاویش لە ئاو تەکانی نەخواردووە، بەڵام کاکە جەلال گیان" از ما است کە بر ماست" دەڵێن "گوێلکی خۆماڵی بە گا نابێ". لە تۆی کوردیزانی کوردناسی شاعیر و نووسەر دوور بوو هەرگیز نەتوانی سوارەی دەگەڵ "نیما" هەڵسەنگێنی و زۆر بێترس و خۆف لە وجدانی ئەدەبی خەوەبەردینە و ماسییە ڕەشەش ئیلهام لە یەک بزانی لە کاتێکا بە جارێکیشدا نەرۆیشتوون، دەگێڕنەوە مەلایەک لە کوردستانی ئێرانەوە دەچێتە شاری "بەغدا" دەگەڵ ئیمامی غەزالی دەکەوێتە مونازەرە و قسە و لەوێرا دەگەڕێتەوە دەچێتە "دینەوەر" کە یا شارێکی چکۆڵە یا گوندێکە لە ناوچەی کرماشان و دەگەڵ مەلای "دینەوەریش "وتووێژ دەکاو دوایی مەلای میوان لە مەلای خانەخوێ دەپرسێ تۆ زۆر لە "غەزالی" عالمتر و زاناتری، ئەی بۆ ناووشۆرەت هی ئەوە. مەلای "دینەوەر" دە وەڵامدا دەڵێ ئەو بەغدا گەورەی کردووە و منیش دینەوەر چکۆڵەی کردوومەوە، دێرەدا مەنزوور ئەوە نییە کە گۆیا "سوارە" بەرزترە لە

"نیما"، بەڵام بە هەڵسەنگاندنیان ئاسمان ناڕووخێ. کاکە تۆ زۆرت بۆخۆت هێناوە کە بە زمانی ناوچەی "سوارە" قسە بکەی و "جورئەتت" بە "جورعەت" نووسیوە خۆ لە موکریان و هەموو ئەو وڵاتە هەر دەڵێن "جورئەت" و نووسیوتە "بالای چشمت ابرو است" مەگەر ئێمە خۆمان لە کوردیدا نیمانە کە دەڵێ: کەس ناوێرێ پێی بڵێ پشتی چاوت برۆیە.

# لێکدانەوەی خەوەبەردینە

## (١)

مارف ئاغایی

پێشەکی:

کاک "سوارە ئیلخانی‌زادە" یەکێک لەو گەورە شاعیرانەیە کە هەڵدەگرێ زۆری قسە لە سەر بکرێ . لە نێو بەرهەمەکانی ئەو شاعیرەدا شیعری "خەوەبەردینە" جێگایەکی تایبەتی هەیە. دوای بلاو بوونەوەی ئەم شیعرە لە زۆر شوێناندا قسەی لەسەر کراوە، بەلام بەداخەوە کەس هیچی لە سەر نەنووسیوە. گوایە لە یەکێک لە ژمارەکانی نووسەری کوردستان ـ کە لە شاخ بلاو بۆتەوە کورتەباسێک لە سەر ئەم شیعرە نووسراوە کە بەداخەوە من ئەم ژمارەیەم وەدەست نەکەوت و مەمنوون دەبم ئەگەر کەسێک هەیبێ و بۆم بنێرێ.

ئەم لێکدانەوەی لەم دوو ژمارەی سروەدا لەمەودوا دەیبینن بۆچوونێکە سەبارەت بەم شیعرە بەرزە. من دلنیام زۆرن ئەو کەسانەی ئەو شیعرەی لە من باشتر دەناسن، بەلام بەداخەوە کەس تا ئێستا دەستی بۆ قەلەم نەبردووە، هەرچەند ئێستاش درەنگ نییە. دەلێن هونەرمەندی دەنگخۆش سەیید«عەلی ئەسغەری کوردستانی» لە دوو حالەتدا هونەرەکەی گولی دەکرد و تیی دەچریکاند، یەکەمیان ئەو دەمەی بوو کە کیژێکی جوانی دەدی و دووهەمیان ئەو کاتەی کە کەسێکی دەنگ ناخۆش گۆرانی ئەوی تەقلید کردبێ. هیوادارم ئەمنیش وام بە سەر بێ و ئەوانەی دەزانن من دەنگم لەوان ناخۆشترە لێم وەدەنگ بێن و نەهێلن کاک سوارەی خۆشەویست غەدری لێ بکرێ .

بەر لەوەی کە بچمە سەر باسەکە دەبێ چەند مەسەلەیەک روون بکەمەوە:

من تەنیا لە باری مانا کردنەوە لەم شیعرە دواوم هەرچەند دەزانم دەتوانێ لەگەل بارودۆخی سیاسی ئەوسای ئێران هەلبسەنگێنرێ و....، بەلام پێمخۆش نییە شیعرێکی ئاوا پرمانا بە مانایەکی تەسکی سیاسییەوە ببەستمەوە، با لەو بێرەدا خوێنەر بۆخۆی نەزەر بدا.

لە پێشدا سەنعەتی شیعری و باری فەننی شیعرەکەشی باسی لێ کرابوو، بۆ وێنە ئەگەر لە وێنەیەکدا جیناس، تەناسوب، تەزاد، شوبهاندن و... هەبوو شی کرابۆوە، بەلام لە سەر پێشنیاری برایانی دەستەی نووسەران ئەم بەشەم قرتاند هەتا باسەکە تێکەل نەبێ.

ـ ناچار بووم بۆ لێکدانەوەی شیعرەکان بەند بەند لێکیان هەلبرم و هەر وێنەیەک کە تەواو دەبێ لە وێنەکەی دیکەی جوێ کەمەوە، هەرچەند ئەم شێوە لێکدانەوەیە لە شیعری

نوێدا باو نییە چونکەشیعری نوێ لە باری ماناوە لە میحوەرێکی ئەستوونی (عەموودی)دایەو ماناکان بەیەکەوە دەبەسترێنەوە. بەڵام "چ بکەم چارم ناچارە".

ـ ئەم شیعرە لە سەر وەزنی عەرووز دارێژراوە. وەزنەکەشی "فعولن"ی عەرەبییە. بۆ وێنە:

**لە چەشنی گەرووی کەو**

**فە عوو لوون فە عوو لون**

و هەتا دوایی هەر بەم وەزنە دەچێتە پێش:

**کەوی دۆمی یەخسیری زیندانی داری،**

**فەعوولون فەعوولون فەعوولون فەعوولون**

ـ کاک سوارە لە لاپەڕەی ٢٠٨ی کتێبی «تاپۆ و بوومەلێڵ»دا کە هیوادارم بەم زووانە چاپ بکرێ، سووژەی "خەوەبەردینە" لە قاڵبی نەسردا بەم شێوەیە دووپات دەکاتەوە: جۆششی هەستی شاعیرانە لە نهادی "پترۆس دووریانی" تازەگەنجدا لە هەڵقوڵینی کانییەکی ژێر گاشەبەردێکی زل ئەچوو کە بە هیچ بارێک ڕێگای نەبوو بۆ زەریە و زێ و نەدەزاندرا کە ئەو ئاوە ڕوون و پاکە لە وشکارۆی دەشتێکی قاقڕ و لەژێر لەشی قورس و ڕەقی ئەو گاشەبەردەدا چۆن ئەجۆشێ و بناوانی ئەگاتەوە کام ڕووباری خوڕۆشان.

**لە چەشنی گەرووی کەو،**

**کەوی دۆمی یەخسیری زیندانی داری،**

**پەری سەوزەبەستەی خرۆشانی باڕی**

**تەرەی باوەشی تاسەباری بناری**

**زیندانی داری:** زیندانێک کە لە دار ساز کرابێ. مەبەست ڕکە و قەفەسە.

**بەستە:** گۆرانی سووک و لەبار کە هەوا و شیعرەکانی مایەی فۆلکلۆریان هەبێ ـ مەقام.

**سەوزەبەستە:** سەوزە، ڕەنگی ژیانە، کەویش بۆ سەوزایی دەخوێنێ. بەستەیەک کە سەوزایی و ژیانی لیدەبارێ یا بەستەیەک کە بۆ سەوزایی دەخوێنرێ. لێرەدا ئاوازێکە کە بۆ ئازادی دەخوێنرێ.

**باڕ:** باڵندەیەک کە دەوری زەرنەقووتەیی تەواو کردبێ، بەڵام هێشتا نەبووبێتە باڵندەیەکی کامل و سەر.

**باڕەکەو:** بەچکەی کەو کە هێشتا سەر نەبووبێ.

**تەرە:** لە لانە تۆراو ـ ئەو باڵندەی هێلانەکەی جێهێشتبێ.

**دۆم:** هۆزێکی کۆچەرییە کە باشترین خاسەکەویان هەیە.

پێشتر پێویستە مەسەلەیەک ڕوون بکرێتەوە. شاعیر لە سەرەتاوە دەیەوێ لە

تامەزرۆییەکی قووڵ بدوێ. بۆ دەربڕینی ڕادەی ئەو تامەزرۆییە چەند وێنەیەک دەخاتە بەر چاو. کاتێک کە بە تەواوی خوێنەر کەوتە سەر ڕەوتی شیعرەکە و توانی ئەو هەموو ئیشتیا و تامەزرۆییە بێنێتە بەرچاو، ئەوجار ئەسڵی بابەتەکە دەکوتێ. پێویستە ئەوەمان لەبیر بێ کە دوازدە دێڕی سەرەتای شیعرەکە کە لەم لێکدانەوەیەدا بە چوار بەش نووسراوە دەگەڕێتەوە سەر دێڕی سێزدە و چواردە واتە بەشی پێنجەم.

**پوختەی مانا:**

وەکو گەرووی کەو، کەوێک کە بە دەستی دۆم خرابێتە نێو قەفەس و لە کاتی باڕی و سەرەتای بلووغیدا کە هەزاران ئاهەنگی خۆش و دڵبزوێنی لە دەروونداییە و دەیەوێ لە ڕێگای گەروویەوە دەریانبڕێ، لە باوەشی زەمەند و سەرسەوزی بنار دوور خرابێتەوە.

کاک سوارە کاتێک ویستوویە "بەستەی کەو" بە نموونە بێنێتەوە بە کەوی ئاسایی ڕازی نەبووە، بەڵکو "کەوی دۆمی" هەڵبژاردووە، چونکەدۆم کەوناسترین هۆزن کە هەموو دەم باشترین خاسەکەویان هەیە. ئەم کەوە کە بە دەستی دۆم ئەسیر کراوە، خراوەتە نێو ڕکەش. ئەوسا سەردەمی باڕی بۆ کەو هەڵدەبژێرێ کە گەرووی پڕە لەو سەوزەبەستانەی کە دەبوایە بە ئازادی بۆ شینایی و سەوزایی بخوێنێ، بەڵام ئێستا کە لە نێو قەفەسدایە و لە بناریش هەڵبڕاوە تەواوی جۆشوخرۆش و تامەزرۆییەکەی دەکاتە بەستە و لە گەروویەوە دەیداتە دەر.

کاک سوارە لە شیعرە نوێیەکانیدا هەرگیز بە شوێن قافیەدا نەچووە، بەڵام هێندێک جار کە قافیە بەرەوپیری شیعرەکە هاتووە دەستی بەڕوویەوە نەناوە. لەم شیعرەدا "زیندانی داری"و "تاسەباری بناری" قافیەن. هێنانەوەی "خرۆشانی باڕی"ش بە قافیە دادەنرێ هەر چەند "ڕ"ێ "لە باڕی"دا قەڵەوەوە و لەگەڵ پیتی "ر"ێ لە وشەی "دار" و "بنار" یەکدەنگ نییە، بەڵام ئەم شێوە قافیەیە جاروبار لە حەیرانی کوردیشدا کەلکی لێ وەرگیراوە.

**شەپۆلی لە گوێن خوێنی شەرمی کچانە**
**لە سەر ڕوومەتی ماتی بووکی ڕەزاسووک**
**بەتینی بتاوێنی ڕوانینی زاوا**
**گەرمتر لە پرشنگی تاوی بەهاری**

**گوێن:** لە ڕەنگ، وەک، بە وێنەی

**بتاوێن:** سیفەتی فاعیلییە بۆ "تاوێن" ئەوەی دەتوێنێتەوە.

شەپۆلێک وەک ئەو ڕەگە خوێنەی کە لە ناکام شەرمێکی کچانەوە لە سەر کوڵمەی بووکێک دەنیشێ کە بۆ یەکەم جار گەرمای ڕوانینی زاوا لەسەر ڕوومەتی هەست پێدەکا. بە واتەیەکی تر کاتێک بووکێکی جوانی لەبەردڵان هەست دەکا کە زاوا چاوی تێ بڕیوە، بەتینی

ئەو نیگایە کە لە ڕوانگەی کیژەکەوە لە پڕشنگی تاوی بەهاریش بەتینترە، شەرم دایدەگرێ و سوور هەڵدەگەڕێ تا ئەو جێگایەی کە شەپۆل و ڕەگەیەکی خوێن لە سەر ڕوومەتی خۆ دەنوێنێ.

کاک سوارە لە لاپەڕەی ٨٢ی کتێبی «تاپۆ و بوومەلێڵ»دا ئەم وێنەیە لە پەخشانێکدا کە بۆ پێشەکی شیعری "شار"ی نووسیوە بەم شێوەیە شی دەکاتەوە:

"بەڵام لە دێ هەموو شت سروشتییە،تەنانەت سوورایی نیوەڕەنگی لێوی بزە تێزاوی کچێ کە لە ژێر گەرمای ڕوانینی لاوێکی ئەویندار شەوقی شەرم ئەکەوێتە سەر گوڵی گۆنایو خوێنی هەستی پاکی کچانە بە پێستی نەرمی دەموچاویا ئەگەڕێ، ڕەنگێکی سروشتییە."

**وەکو نەرمەهەنگاوی لاوی بەرەو ژوان**

**لە جێژوانی زیندوو بە گیانی کچی جوان**

* **نەرمەهەنگاو:** هەنگاوێک کە بە پێدزکێ و بە دزی هەڵگیرێ.

لەم دوو دێڕەدا شاعیر دەیەوێ تامەزرۆییەکە بە "هەنگاو"ی لاوێک بشوبهێنێ، بەڵام چ هەنگاوێک؟ هەنگاوێک کە بەرەو جێژوان دەچێ. جێژوانێک بە هۆی بوونی یارەوە گیانی وەبەر هاتووە. لێرەدا شوێنەکە زیندووە. یار کە گیانی بە جێژوان بەخشیوە و "شوێن"ی زیندوو کردووە دەبێ چ قیامەتێکی لە دەروونی لاودا ساز کردبێ، بەڵام سەرەڕای ئەم جۆشوخرۆشە، ڕۆیشتن بەرەو جێژوان چەشنێک ترسی لەگەڵە. دەبێ هەنگاوەکان نەرم بن. ئەڵبەت نەرم نەک بەو مانایە کە زۆر سەبر بڕوا بەڵکو بەو مانایە کە کەس دەنگی پێی نەبیسێ، لە لایەکەوە لاو دەیەوێ زوو بگاتە جێژوان و لە لایەکی ترەوە دەبێ بێهەستوخوست بڕوا کە ئەم دوو حاڵەتە گوڕوتینێکی تایبەتی دەدەن بە هەنگاو.

تەنیا یەک نوسخە لە نێو تەواوی ئەو نوسخانەی لە لای ئێمە هەیە، گەرمەهەنگاوی "لە جیاتی "نەرمەهەنگاو" نووسیبوو. "گەرمەهەنگاو" ئەوپەڕی تامەزرۆیی و گوڕی لاوی نیشان دەدا و لەگەڵ فەزای شیعرەکەش بە باشی دەخوێنێتەوە، بەڵام زۆربەی بەڕێزانێ کە شیعرەکەیان لە کاک سوارە بیستبوو ڕایان لە سەر "نەرمەهەنگاو" بوو.

**وەکو گەرمەیاوی قەشەی دستی تاراو**

**لە بژوێنی دەریای بلوورینی بەروێ**

**یاو:** تاو تەب

**گەرمەیاو:** ئەوپەڕی یاو، یاوێکی بەگوڕوتین.

**قەشە:** ماسی (چەشنێک ماسییە)

**تاراو:** تۆریاو ـ ڕۆیشتوو، زیز بوو

**بڕۆین:** زەمەند ـ ئەو شیناوەردەی تازە بێ و مەڕی وێ نەکەوتبێ. (لەم شیعرەدا بڕۆین مانایەکی مەجازی هەیە).

**بەرووێ:** بەرۆک.

**بلوور:** جۆرێ شیشەی جوان و ئەستوورە.

**بلوورین:** بلوورئاسا ـ وەک بلوور. لێرەدا مەبەست سینگی وەک بلوورە، لە کوردیدا باوە کە سینگ بە کەشەف دەشوبهێنن، پێشتر پێویستە ئاشیرە بکەین کە لەم شیعرەدا دەست بە قەشە یا ماسی بشوبهێندرێ و سینگ و بەرۆکی یاریش بە دەریا. بە کورتی یانی وەک ماسی دەستێک کە لە دەریای سینگ و بەرۆک تۆریابێ. ماسییەک کە لە دەریا تۆرابێ یا تۆراندرابێ هەتا ئەودەم کە لە پەلەقاژە دەکەوێ، هەر خۆ دەکوتێ بۆ گەیشتنەوە بۆ نێو زەریا و دەکرێ ئەوپەڕی تامەزرۆیی لەو تەبوتابەدا ببینین. ئێستا لەم شیعرەدا ماسییەکە دەستە و دەریاکەش بەرۆک.

**بەخوڕ خۆ بە دیواری کێوا ئەدا ئاو**
**لەگەڵ گاشەبەردا سەر ئەسوێ، سەر ئەسوێ.**

**بەخوڕ:** بە تەوژم ـ دەنگی خرۆشی ئاو

تا ئێستا هەر وێنەیەکی شاعیر هێنابووی هەموویان دەگەڕێنەوە سەر ئەم دوو دێڕە. تەواوی وێنەکانی پێشوو حاڵەتی ئەم ئاوەیان نیشان دەدا. کە وا بوو ئەم ئاوە وەک "گەرووی کەوەکە"، وەک "شەپۆلی خوێنەکە"، وەک "نەرمەهەنگاوی لاوەکە" و وەک "دەستە تاراوەکە" خۆ بە دیواری ئەو کێوەدا دەدا کە تێیدا یەخسیرە. لێرەدا ڕوون دەبێتەوە کە شاعیر دەیەوێ لە ئاوێک بدوێ کە یەخسیری دەستی قوولکە و ئەشکەوتێکە لە کێودا و بە تەوژم و تینەوە دەیەوێ خۆی ڕزگار بکا.

شاعیر کاتێک دەیەوێ خۆی زەربەی کۆتایی وێنەکە بوەشێنێ بەو پەڕی زانایییەوە دوو جار لە دوای یەک "سەرئەسوێ" بەکار دێنێ کە کارتێکردنێکی سەیری هەیە لە سەر خوێنەر. شاعیر لە حاڵێکدا ئەم کارەی کردووە کە لە باری وەزنیشەوە پێویستی بە دووپاتکردنەوە نەبوو، یانی بەتاڵایی وەزنی پێ پڕ نەکردۆتەوە بەڵکو مەبەستی شیعری باشتر نواندووە.

**کچی نوور قەتیسی دەستی دێوی کێوە**
**لە ئەنگوستەچاوی دڵی خێوی کێوا**
**بەرەو دەر بەرەو شاری دەریا بەڕێوە.**

**قەتیس:** گیرکردوو، پەنگ خواردوو (زۆرتر بۆ فرمێسک و ئاو و...)

ئەنگوستەچاو: زۆر تاریک ـ شەو کە زۆر تاریک بوو، تا ئەنگوست (قامک) لە چاوی یەکتر ڕۆنەکەن، کەس کەس نـابینێ، ڕەنگە "ئەنگوستەچاو" مەبەست لەو حاڵەتە بێ.

**خێوی کێو:**

لە فۆلکلۆردا زۆر شتی وەک کانی و کێو خێویان هەیە و بۆ وێنە دەڵێن مەچۆ سەر فلان کانییە چونکەخێوی هەیە و دەس دەوەشێنێ. لە ئەسڵدا خێو یانی ساحێب و خاوەند و...

زۆربەی وێنە شیعرییەکانی "خەوەبەردینە" دوو یا چەند مانا هەڵدەگرن. ئەم کۆپلەی سەرەوە یەکێکە لەو وێنانە. "کچی نوور" دەتوانێ هەم "مانگ" بێ، هەم ئەو "کانیاو"ەی کە لەبەر ڕوونی و زوڵاڵی بە کچی نوور شوبهێنرابێ. ئەگەر بە مانگی دابنێین مەبەست ئەوەیە کە مانگ ئەسیری دەستی کێوە، یانی لە پشت کێودا ماوەتەوە و ئاوەکە لە تاریکایی شەودا بەرەو شاری دەریا ڕێ دەپێوێ.

من پێم وایە "کچی نوور" مەبەست لە ئاوەکەیە و ماناکەی ئاوایە:

ئەو کانیاوەی کە لە ڕوونیدا وەک کیژی نوور وایە، بە دەستی دێوی کێو ئەسیر کراوە و خراوەتە نێو ئەشکەوتێک، لەو تاریکایی و ئەنگوستەچاوییەی کە لە نێو دڵی کێودا بە سەریدا سەپاوە خۆی ڕزگار دەکا و دێتە دەر هەتا بەرەو شاری دەریا بڕوا. هێنانەوەی شاری دەریاش بەڵگەیەکی دیکەیە بۆ سەلماندنی ئەم مەسەلەیە، کانی کە هەمان "کچی نوورە" بەرەو دەریا دەچێ شاعیر بۆ نیشاندانی بچووکیی ئەو لە بەرانبەر گەورەیی دەریادا "شاری دەریا"ی هێناوە. یانی کانی یا کچی نوور بەشێکە لە شاری دەریا.

جگە لەوێنەش بەڵگەی دیکەی ئەوەیە کە شاعیر لە چەند دێڕی دواییدا دیسان ئاوەکە بە نوور دەشوبهێنێ و دەڵێ:

**شەتی نوور بەڕووی مانگی عەرزا کشاوە**

دیارە ئەوە هەمان نوورە یەخسیرەکەیە کە ئێستا ڕزگار بووە.

بەڵگەی تریش ئەوەیە کە شاعیر دەڵێ کچی نوور بەرەو دەر، بەرەو شاری دەریا بەڕێوە. ئەم ڕستەیە دوو مانا دەگەیەنێ: یەکەم ئەوەی کە بەرەو دەر بەڕێوەیە، یانی هێشتا وەدەر نەکەوتووە، وەڕێکەوتووە، بەڵام نەگەیشتۆتە "دەرێ" کە ئەو دەم ناتوانێ ئەو "کچی نوورە" مانگ بێ، چونکەلە چەند دێڕی دواییدا هاتووە:

**لەبەر پێی حەریری کەوەی سێوەڕە**

**بە پۆی مانگەشەو چندراوە**

لە حاڵێکدا هیچ بوارێک بۆ ئازاد بوونی مانگ ساز نەکراوە و لە شێعرەکەدا زەمینەی ئەم وێنەیە وجوودی نییە.

ئەگەر نا، مەبەست "لە بەرێوە" ئەوە بێ کە وەدەرکەوتووە، ئەودەم شاعیر نالێ "لە ئەنگوستەچاوی..." چونکە"مانگەشەو" و "ئەنگوستەچاو"یەک ناگرنەوە.

هەروەها قەتیس بۆ فرمێسک و شتی ئاوەکی دەکار دەکرێ بۆ وێنە فرمێسک لە چاودا قەتیس دەمێنێ کە لێرەشدا ئەم ئاوە فرمێسکێکە کە لە چاوی کێودا قەتیس ماوە و دەیەوێ ڕزگار بێ.

**گەرووی وشک و چاوی سپی چاوەکانی**

**دەرووی ڕوونی ئاوە**

**دەروو:** دەروون

هەرچەند کە ئەم سەرچاوەیە ئاوێکی کەمی تێدایە و ڕەنگی مردوو لە سەر چاوەکانی نیشتووە (چاو سپی هەڵگەڕان، حاڵەتی مردنە)، بەڵام هیوا و هومێدی دەروونی کە پڕەلە ئاو، ڕوون و بەکەیف و زیندووی ڕاگرتووە. لێرەدا شاعیر دەچێتە ناخی قارەمانی شێعرەکە (ئاو)، بە خوێنەر دەڵێ کە ئەم چاوە بە ڕواڵەت کەمئاوە لە دەرووندا هیوایەکی گەورە و ڕوونی هەیە کە ئەوی هان دەدا بۆ ڕۆیشتن.

**بە فانووسی ئەستێرەبەرچاوی ڕوونە**

**لەبەر پێی حەریری کەوەی سێوەڕە**

**بە پۆی مانگەشەو چەندراوە**

**حەریر:** پارچەی ئاوریشم

**کەوە:** کەوگ ـ شینی ئاچخ.

**سێوەڕە:** سێپەڕە ـ سێپەڵگە ـ گیایەکی سێ بەرگە و تا ڕادەیەک وەک وێنجە دەچێ، لە قەراخ ئاو و ڕووباریش دەڕوێ.

**پۆ:** تێوەردانی تەون (لەگەڵ ڕایەڵ دێ، ڕایەڵوپۆ)

لێرەدا شاعیر دەیەوێ لە پێشوازی سروشت لە لایەک و کارتێکردنی ئەم ئاوە لە سەر سروشت لە لایەکی ترەوە بدوێ.

**دەڵێ:** بەرچاوی ئەم ئاوە بەو ئەستێرانە ڕووناک کراوەتەوە کە وەک فانووس داگیرساون. هەروەها گیای شینی سێوەڕەبە جوانییەک لە ژێر پێی کانیاوەکە ڕاکشاوە کە دەڵێی قوماشێکی شینی ئاوریشمە و بە پۆی مانگەشەو چندراوە هەتا ئەم پێی نازی بخاتە سەر.

**ئەڵێی بورجی خاپووری مێژووی لەمێژین**

**لە درزی هەزار خشتی ڕۆژ و شەوانی**

**دڵۆپەی چپەی پۆلی پەریانی دادا**

**خاپوور:** وێران

**درز:** شکاف ـ قەڵشت

**چپە:** سرتە

لەم وێنەیەدا شاعیر لە چۆنییەتی دەنگەکە دەدوێ:

دەنگێک دێ بەڵام ئەو دەنگە وەک چی دەچێ:

دەبێ پێشتر ئەوەمان لەبیر بێ کە ئەگەر مێژوو بە "بورج" دابنێین دەبێ لە جیاتی "خشت"یش لە "ڕۆژ" و "شەو" کەڵک وەرگرین. چونکەبۆ سازکردنی بورج و قەڵا دەبێ خشت لە سەر یەک بچندرێ و بۆ سازبوونی مێژووش دەبێ "شەو" و "ڕۆژ" تێپەڕ بێن. شەو و ڕۆژ هەمان پێوانەی زەمانن، زەمانیش دایکی مێژووە.

کاک سوارە کە دەیەوێ ئەو دەنگە لەو پەڕی خۆشیدا بنوێنێ ئەنگوست دادەنێتە سەر مێژوو. بۆ گەلێک کە بورجی مێژوویەکەی تا ڕادەیەک ڕووخێنراوە و ئاگادارییەکی زۆری لە سەر مێژووی کۆنی خۆی نییە خۆشترین دەنگ ئەو دەنگەیە کە لە زمان ئەم دیاردەیەوە بێ. شاعیر دەڵێ ئەم دەنگە وەک چپە و سرتەی خۆش و ڕوح سووکی دەستەیەک پەر یيە، کە لە نێو درز و قەڵشتی نێوان خشتە ڕووخاوەکانی (کە مەبەست شەو و ڕۆژە) قەڵای مێژووەوە بە گوێ دەگا.

کە وا بوو تا ئێرە ئەوە ڕوون بۆوە کە لە مانگەشەوێکی خۆشی بەهار یا هاویندا (کە ولات سەرسەوزە) ئاوێک لە دەستی کێو ڕزگار بووە و وەڕێکەوتووە، ئەم ئاوە، وەک چپەی پەریان دەچێ (لە دەنگدا):

هەروەها کاک سوارە لە لاپەڕی ٢٤٩ی کتێبی تاپۆ و بوومەلێڵدا کاتێک دەنگێکی بە گوێ دەگا دەڵێ (چپەی پۆلی پەریانە، لە کۆڕی جێگا کۆنەکانا.)

**ئەڵێی پێکەنینی کچی سەرگوزشتەی قەدیمی**

**لە ئەندامی تاپۆی وەکو بوومەلێڵی**

**سنووری شەوی دوێنێ، ئەوڕۆی بەیانی**

**پەچەی قورسی نهیمانی ئینسانی لادا**

**سەرگوورشتە:** چیرۆکی ڕابردوو، هەمان سەرگوزەشتە.

**تاپۆ:** تارمایی ـ ئەو ڕەشاییەی لە دوورەوە لە چاو دەدا و وەک شەبەح دەبینرێ.

**بوومەلێڵ:** بوومەلێڵە ـ شەوەکی ـ سەرەتای بەربەیانی کە دنیا تاریک و ڕوونە.

**سنوور:** حدوود ـ هێڵی نێوان دوو زەوی.

**پەچە:** ڕووبەندی ژنان.

**نیسیان:** فەرامۆشی.

ئەم دەنگە وەک پێکەنینی کیژی سەرگوزەشتە دەچێ (لێرەدا ڕابردوو گیانی وەبەرهاتووەو بووە بە کیژ و کیژەکە پێدەکەنێ) کە لە تاریک و ڕوونی نێوان شەو و ڕۆژی ئەمڕۆدا، ڕووبەندی قورس و گرانی، فەرامۆشی ئینسانی وەلاداوە. مەبەست ئەوەیە کە ئەم دەنگە مرۆڤی وشیار کردۆتەوە و لە فەرامۆشی دەری هێناوە. وەک چۆن ئینسان بە دەنگێکی لە پڕ وەخۆ دێتەوە ئەم دەنگەش بەم شێوەیە مرۆڤی وەخۆ هێناوەتەوە.

کاک سوارە لە لاپەڕەی ١٨٦ی «تاپۆ و بوومەلێڵ»دا دەڵێ:

**ئادەمیزاد بریتییە لە دوێنێ و ئەمڕۆ و بەیانی**

بە سرنجدان بەم بۆچوونە دەکرێ دێڕی سێهەمی شیعری سەرەوە. ئاوا لێک بدەینەوە:

سنووری شەوی دوێنێ، سنووری شەوی ئەوڕۆ و سنووری شەوی بەیانی. بە واتەیەکی تر ئەم تاپۆیە لە ڕابردوو و ئێستا و داهاتوودا وەبەر چاو دەکەوێ. ئەڵبەتە ئەودەم لە جیاتی "ئەوڕۆی بەیانی" "ئەوڕۆ، بەیانی" جوانترە.

١. ئەڵێی دەنگی شمشاڵە ڕەشماڵی دۆڵی دڕیوە

٢. شەماڵی دەرەی دووره شاری

**پشووی پڕ لە عەتری بەهاری کچی کورد**

**بە بلوێری شووشی گەرووی زەرد و زۆڵی**

**لە زەنوێری زێوئاژنی سای زرینگانەوەی شەو**

**بە خوڕ زەمزەمەی هەڵبڕیوە.**

**ڕەشماڵ:** چادر

**دەرە:** دۆڵ و دەرە - دۆڵ

**زەردوزۆڵ:** وشەدوانەیە بە مانای زۆر زەرد و ناسک. (لەم وشە دوانەیەدا "زۆڵ" بە تەنیایی مانای نییە و ئەگەر لەگەڵ زەرد بێ ئەم مانایە دەبەخشێ).

**زەنوێر:** بە شوێنی بڵیند و بەرز دەڵێن کە هەوایەکی خۆش و سازگاری هەبێ.

**زێوئاژن:** "دەرزیئاژن" هەیە، کە بە مانای زۆر دەرزی تێراکردنە، زێوئاژن بۆچوونێکی شاعیرانەیە بە مانای ئەوەی کە ڕەنگی زێوئاسا هەموو لایەکی داگرت - زێوکاری کراو - بە زێو کێڵدراو.

**سا:** کات، دەم، زەمان.

**زرینگانەوەی شەو:** ئەودەم کە شەو زۆر درەنگ بێ دەڵێن شەو زرینگاوەتەوە.

**خوڕ:** هوروژم - تاووتین.

**هەڵبڕین:** بڵند کردن (لێرەدا)

١ـ لێرەدا دەنگی ناو بە دەنگی شمشاڵ شوبهێنراوە و دۆڵ و دەرەش بە چادر و ڕەشماڵ، کە وا بوو ئەم دەنگە وەک دەنگی شمشاڵە کە بە چادری دۆڵ و دەرەدا تێپەڕێ.

٢ـ یا دەڵێی بای شەماڵە کە لە دۆڵ و دەرەی دوور لە شارەوە هەناسەی پڕ کردووە لە بۆنوبەرامەی بەهاری کیژی کورد کە لە گەردنی زەرد و ناسکی بلوێرئاسایەوە، لە کاتێکدا کە ئەستێرەوەک زێو بە سینگی ئاسمانەوەدەزریوێنەوە و شەو زرینگاوەتەوە (مەبەست ئەوەیە کە دنیا بێدەنگە و هیچ دەنگێک بە گوێ ناگا) بە تەوژم و هەیبەتەوە ئاهەنگ و زەمزەمەی هەڵبڕیوە.

شاعیر لە سەرەتای ئەم وێنەیەدا باسی "ڕەشماڵ" و "دۆڵ" دەکا و پاشان باسی "عەتری بەهاری کچی کورد" دەکا.

ئەم کیژەکوردەی کە سوارە هێناویەتە دنیای شیعرەکەی، کیژی عەشیرەتە و هەموو دەم لە نێو سروشتدا ژیاوە و بە بۆنی بەهاری ژیاوەتەوە. بۆیە ئەم کیژە بۆنی بەهاری لێوە دێ. هەروەها گەرووی زەرد و باریک و ناسکی کیژ بە بلوێر شوبهێندراوە. ئاسمانیش لە نیوەشەوێکی پڕ ئەستێرەدا بە "زەنوێری زێوئاژن" ناو براوە.

ئەڵبەتە زەنوێری زێوئاژن دەتوانێ مەبەست لەو شیناوەردەش بێ کە بە نووری وەک زێوی مانگ ڕازاوەتەوە، بەڵام پێم وایە مەبەستی ئەسڵی شاعیر ئاسمانە کە بە ئەستێرەزێوئاژن کراوە چونکەلە وێنەی پێشوودا کوتبووی کە کەوەی سێوەڕەبە پۆی مانگەشەو چندراوە و دووپاتی ئەم وێنەیە لێرەدا جوان نییە.

کاک سوارە لە لاپەڕەی ٢٤٩ی کتێبی «تاپۆ و بوومەلێڵ»دا بەم شێوەیە لە دەنگی شمشاڵ دەدوێ: "سکاڵای ئەوینی لاوێک، سکاڵایەک کە چەشنی زایەڵەی دوورەدەستی دەنگی شمشاڵێکە لە بەرەبەیانییە کی زرنگاودا".

**١ـ بە ئیعجازی ئەنگوستی پاکی محەممەد**
**شەتی نوور بەڕووی مانگی عەرزا کشاوە**
**٢ـ تروسکەی بروسکەی شەوی دەمبەهاری بەهەورە**
**لە سەر عاسمانی زەوی ڕاخوشاوە**

**ئیعجاز:** موعجزە کردن

**ئەنگوست:** قامک ـ تپل.

**شەت:** زێ، چەمی گەورە

**تروسکە:** بریقە.

١ـ ئیشارەیە بە موعجزەی حەزرەتی محەممەد (د.خ) کە ئیشارەتی بە مانگ کرد و شەقی کرد.

لەم وێنەیەدا زەوی بە مانگ شوبهێنراوە و ئەم موعجزەیە لە سەر زەوییەک ڕوو دەدا کە حوکمی مانگی پێدراوە. واتە ئەم ئاوەی کە وەک ڕووباری نوور بەسەر زەویدا دەکشێ و زەوی کردۆتە دوو بەش (بەشێکیان کەوتۆتە ئەوبەری ئاوەکە و بەشێکی دیکەی کەوتۆتە ئەمبەری ئاوەکە) وەک موعجزەی حەزرەتی محەممەدە کە ئەو مانگی کردە دوو بەش. بە واتەیەکی دیکە ئەم ئاوە کە لەبەر ڕوونی وەک ڕووباری نوور دەچێ وەک موعجزەیەکی تازەیە کە لە سەر زەوی ڕووی دابێ.

٢ـ یا زەوی وەکو ئاسمانێک دەچێ کە لە شەوێکی پڕ لە هەوری بەهاریدا بە بریقە و ترووسکانەوەی برووسکێک برازێتەوە. واتە ئەم ئاوە ڕوونە لە سەر زەوی بە چەشنێک دەبریقێتەوە کە دەڵێی زەوی برووسکی لێداوە و ترووسکەی دێ.

دیارە کە شاعیر بە ئانقەست لە برووسکی شەوی بەهاری پڕ هەوری ناو بردووە چونکەبرووسکی بەهاری بەتایبەت لە شەوێکی پڕ هەوردا لە هەموو کاتێک پڕنوورتر و توندترە و ئەمە وردبینی شاعیر دەگەیەنێ. کاک سوارە لە سەنعەتی ئیغراقی کەڵک وەرگرتووە بۆ ئەوەی ئەم ئاوە بە برووسک یا نوور بشوبهێنێ و هەروەها موعجزەی پێکردووە هەتا حاڵەتێکی تەقەددوسی پێ بدا.

**لە هەر گاز و ڕێبازێ وا گازی ئاوی ئەگاتێ**
**نیازی هەزاران گەزیزەی بەنازی وەدی دێ**
**ئەبووژێتەوە داری چاکی بە ودمی هەناسەی**
**شنەی نەرمەلاوێنی دەم بای ئەخاتێ**

**گاز:** ئەم وشەیە مانای زۆرە کە لێرەدا "گاز"ی یەکەم دەتوانێ ئەم مانایانەی هەبێ: ١ـ شیو و دۆڵی تەنگ و باریک ٢ـ لا، ئالی.

هەروەها "گاز"ی دووهەمیش بە مانای "بانگ" و "دەنگ"ە.

**گەزیزە:** بلازیز ـ بەلازیز ـ گوڵێکی کورتەبالای خەت خەتی ڕەنگاوڕەنگە کە هەوەڵی نەورۆزێ دەپشکوێ و پاش ماوەیەکی کورت دەژاکێ. بە کوردی شیمال "جانەمەرگی"شی پێدەڵێن، کە هەمان "جوانەمەرگ"ە و بە هۆی زوو ژاکان و مردنی گوڵەکەوە وای پێدەڵێن.

**ودم:** نەفەسی مبارەک

**داری چاکی:** ئەم دارە ویشکەیە کە لە سەر مەزاری پیاوچاکان دە عەرزی ڕۆدەکەن و شاڵی پێوەیە و خەڵک بۆ مبارەکیی شاڵەکەی لێدەکەنەوە.

هەر شوێن و ڕێبازێک کە دەنگ و خرۆشی ئەم ئاوەی پێدەگا دەبێتە هۆی گەشانەوە و بە ئاوات گەیشتنی هەزاران گوڵەگەزیزەی بەناز.

تەنانەت ئەم ئاوە ودمی بەدەســتــە و بە ودمی هەناســەی داری ویشکی ســەرچاکی دەبووژێنێتەوە و سەوزی دەکاتەوە و سۆزە و شنەبای بۆ ڕەوانە دەکا هەتا بیلاوێنێتەوە و بە نێو لک و گەڵاکانیدا رابرێ.

کە هیچ ئاسەوارێکی لە ژیان دەبەردا نەماوە، بەڵام دەنگ و خرۆش ودمی هەناسەی ئەم ئاوە دەیبووژێنێتەوە.

پێشتر وتمان "بەهار" یا "هاوین"، بەڵام لێرەدا ڕوون دەبێتەوە کە ئەو وەرزەی ئاوەکەی پێدا دەڕوا بەهارە. چونکەشاعیر دەڵێ "نیازی گەزیزە وەدی دێ" و گەزیزەش گوڵێکە کە تەنیا لە سەرەتای بەهاردا دەڕوێ و بە قسەی شاعیر بە ئاوات دەگا.

**دریژەی هەیە**

# لێکدانەوەی خەوەبەردینە

## (٢)

**مارف ئاغایی**

پێشەکی:

لە ژمارەی پێشووی سروەدا، شەرحی بەشێک لە شیعری بەرزی "خەوەبەردینە"تان چاو پێکەوت. لەم ژمارەیەدا دووهەمین و دواهەمین بەشی ئەم شەرحە دەخوێنینەوە.

"سروە"

**١ـ ئەڵێن تاجی زمرووتی دورگەی لە سەر ناوە دەریا**
**هەتا چاو هەتەر کا شەپۆلە، شەپۆلە،**
**لە بروونا، لە چوونا**
**بە ئاهەنگە سەربەندی بزوێنی خۆشی**
**٢ـ لەبەر خۆرەتاوا ئەڵێی سنگی ژینە ئەهاژێ**
**ئەڵێی: هانی هەستانە دەنگی خرۆشی**

**زمرووت:** گەوهەرێکی بەنرخی زۆر کەسکە

**دورگە:** جەزیرە

**هەتەر:** مەودای حوکمی چاو

**سەربەند:** لە گۆرانیدا بەو بەندە دەکوترێ کە پاش چەند شیعرێک دەگەڕێنەوە سەری ـ چەند وشەیەک کە سەردتای گۆرانییە.

**بزوێن:** ئەو شتەی کە ئینسان دەبزوێنێ و وەجۆشی دێنێ.

**هان:** دنە

شاعیر لە زمان ئاوەکە قسە دەکا. ئەم ئاوەی کە بەرەو دەریا دەڕوا، ئاوا لە دەریا دەدوێ: دەڵێن دەریا تاجێکی کەسکی لە سەر ناوە کە ناوی دورگەیە. واتە دورگە کە لەنێو دەریادا دەبێ بووە بە تاجێک بۆ پادشای دەریا. لە دێڕی دووهەمەوە هەتا دێڕی ئاخری ئەم وێنەیە، باس باسی "نەوەستان" و "هاژین" و "خرۆشین"ە، واتە ئەم ئاوە لە خەیاڵیدا دەریا وەک سەمبولی بزووتنەوە و شەپۆل و... دەناسێ و دەڵێ: تا چاو بڕ دەکا لە دەریادا شەپۆل دەبینرێ

کە هێندێک تازە ساز دەبن و هێندێک لە حاڵی چووندان و ئەو ئاهەنگەی کە لە ئەنجامی خرۆشانی ئەم شەپۆلانەوە ساز دەبن سەربەندێکی خۆش و بزوێنەر ساز دەکەن.

٢ـ ئەم دەریایە لە بەرانبەر نووری هەتاودا، وەک سینگی ژیان دەچێ. مرۆڤ کە زیندوو بێ و گیانی دەبەردا بێ سینگی دەهاژێ، بۆ؟ چونکەقەلبی لێدەدا و ئێستاش لە ڕوانگەی شاعیرەوە دەریا زیندووە و خرۆشانی شەپۆلەکانیشی بە لێدانی دڵی دەریا شوبهاندووە. لە دێڕی ئاخریدا دەڵێ ئەو دەنگەی کە لە ئەنجام خرۆشی دەریاوە ساز دەبێ وەک ئەوەیە کە هانت بدا بۆ ڕاپەڕین و هەستان.

**١ـ سروودی خوناوەی بەهارە لە گوێما**

**لە هەر شیوە جۆبارێ هەر دەشتە چۆمێ**

**٢ـ لە دڵمایە بڕوای بەڕینی بە دەریا گەیشتن**

**لە تاریکە تاراوگەکەم وا بەسەر چوو**

**زەمانی تەریکیم**

**ئیتر خێر و خۆشی لە ڕێما**

**خوناو:** شەونم ـ خوناف ـ پڕیشکە بارانی زۆر ورد و لەسەرەخۆ ـ ئەو دڵۆپە ئاوەی بەیانان لە سەر گوڵ دەنیشێ.

**شیو:** دۆڵودەرەی تەنگ

**تاراوگە:** ئەو شوێنەی کە تاراوی لێیە.

**تەریکی:** تەنیایی ـ بێلایەنی.

١ـ بەهار وەرزی زیندوو بوونەوەیە. ئاوەکەش کە لە تاراوگەکەی ڕەهابووە دەڵێ گوێم لە دەنگی پڕیشکەبارانی وردی بەهاری (خوناوە) دەبێ. لە هەر دۆڵ و شیوێک جۆبارێک بەڕێوەیە و هەر دەشتێک چۆمێکی پێدا دەڕوا.

٢ـ لە دڵی مندا، بۆ گەیشتن بە دەریا بڕوا و ئیمانێکی گەورە هەیە، سەردەمی تەنیایی و دوورکەوتەیی من بە سەر چوو، ئەو سەردەمەی کە لە شوێنێکی تاریک و دوورکەوتەدا زیندانی بووم. ئیتر لەمەودوا خێر و خۆشی چاوەڕوانمە.

**١ـ وەهایە:**

**کە کاتی بە هیوا**

**بەهارانە لووزەو ئەبەستن بەرەو شاری دەریا**

**٢ـ بەڵام داخی جەرگم لەگەڵ هەر بەهارێ**

**کە ڕاتەچڵەکن سەوزەڵانی**

**لە خاکینەخەونی گرانا**
**لە دڵما خەم و داخی ئەم دەردە سەوزە:**
**کە دەردی گرانی هەموو ڕێبوارێ وەنەوزە.**

**لووزەو:** شۆڕبوونەوەی ئاو بە تاو.

**خاکینەخەون:** لەو تەرکیبانەیە کە کاک سوارە بە شارەزاییەکی زۆرەوە سازی کردوون. چونکەلە سەوزەڵانی قسەی کردووە و گیا و سەوزەش لە نێو خاکدان، ئەو قۆناخەی کە ئەوان لە ژێر خاکن بە "خاکینەخەون"ی ناو ناوە. واتە خەونی خاکی.

**وەنەوز:** چۆرت ـ خەو بردنەوە ـ خەونووچکە.

١ـ لێرە بەدواوە دیسان شاعیر قسە دەکا، نەک ئاوەکە. شاعیر دوای ئەوەی کە لە دەروونی ئاوەکەوە ڕوانییە دەریا ئەوجار دەڵێ: بەم شێوەیە کە کانی بە هیوا و ئاواتەوە لە وەرزی بەهاردا، بە تەوژم و تینێکی زۆرەوە بەرەو شاری دەریا ڕێگە دەبڕێ.

٢ـ بەڵام سەد حەیف و مەخابن هەر کە بەهار هات و شینایی و سەوزەڵانی لەو خاکینەخەونەی (کە لە پایز و زستاندا هەیانبوو) ڕاچڵەکین (وەخەبەر هاتن)، لە دڵی منیشدا خەم و حەسرەتی دەردێک سەوز دەبێ، دەردەکەشی ئەوەیە کە: دەردی گرانی هەموو ڕێبوارێکی، وەنەوز و خەونووچکەیە. بە واتەیەکی تر، شاعیر ئەو ئاوە بە ڕێبواری ڕێگای دەریا دەزانێ، بەڵام لە خەمی ئەوەیدایە کە لە نیوەی ڕێگادا لە ڕۆیشتن و لووزەو بەستن بکەوێ و نەتوانێ ڕێگاکەی درێژە پێبدا. شاعیر ئەم ڕاوەستانەی بە وەنەوز ناو بردووە.

**١ـ لەبەر نووری خۆرا**
**گەڵێ کوێرەکانی شەوارەن**
**٢ـ زنەی دەم بەهاواری هاری درۆزن هەزارن**
**کە تەلیسمی سیحر و تەلیسمی بنارن**
**بەبێ هەوڵی هەڵدان و چارانی چارن**

**کوێرەکانی:** ئەو کانییە ی کە تەنیا بەهاران ئاوی هەبێ و پاشان کوێر بێتەوە.

**شەوارە:** ئەم وشەیە لە ئەسڵدا بە مانای ڕاوی باڵندەیە لە شەودا بە چرا. کاتێک نووری چرا دە چاوی باڵندە دەگرن، باڵندە چاوی نابینێ و دەڵێن چاوی بە شەوارە گیراوە. لێرەدا کاک سوارە کوێرەکانی بە باڵندە داناوە و چراکەش بە خۆر.

**تەلیسم:** شوێنی جادووکراو

**چار:** چارە ـ عیلاج ـ دەرەتان

**چارانی چار:** دۆزینەوەی عیلاج.

١ـ گەلێک لە کوێرەکانییەکان کە نووری خۆریان وێکەوتووە، چاویان بە شەوارە کەوتووە (هەر چەند دەبوایە لەبەر نووری خۆر جوانتر ڕێگا بدۆزنەوە)
٢ـ زۆرن زنەی فریوکار و درۆزن کە وا دەنوێنن دەیانەوێ هاوار بکەن (ڕێ بکەون)، بەلام لە حەقیقەتدا لە بناری کێودا دەستەوەستان مانەوە و تەسلیمی جادووی بنار بوونە کە تەنانەت بۆ ڕزگاری و دۆزینەوەی ڕێگای ڕەهایی هەوڵیش نادەن.

**١ـ بە هیوان بگرمێنێ هەوری بەهاری**

**ڕەهابن**

**لە زینداني بەردینی غارا.**

**٢ـ کەچی وا کەوی و دەستەمۆی دەستەلاتی ڕکەی دۆڵ و شیون**

**لەبەر سامی ڕێ وا بەزیو و تەزیون**

**لەگەڵ کۆچی کردن گزنگێ،**

**چەواشەن لە پێچی نزارا**

**دەستەمۆ:** ڕام

**کۆچ کردن:** فرچک دان.

**چەواشە:** سەرگەردان. سەرلێشێواو

**نزار:** جێگایەک لە بەرزی شاخ و کێودا کە بەر سێبەرە و کەمتر تاوی لێدەدا.

ئەوەش هەر درێژەی وێنەکەی پێشووە. دەڵێ:

١ـ کوێرەکانییەخسیرەکان، بەو هیوایەن کە هەوری بەهاری گرمەی بێ (گرمەی هەوری بەهاری بارینی بارانی پێوەیە و کوێرەکانی بە تەمان دوای گرمەی هەور، باران ببارێ و ئەوان ڕەگەڵ باران بکەون) و لە زینداني بەردینی ئەشکەوت ڕەها بن. (دیارە کە ئەشکەوت لە بەردە و کە بە زیندانیش دانرا دەبێتە زینداني بەردین).
٢ـ ئەگەرچی ئەم ئاوانە بە شێوەیەک کەوتوونەتە ژێر دەست قەفەسی دۆڵ و دەرە و تەسلیم بوونە و لە ترسی دژواری ڕێگا ئەوەندە خۆیان شکاندووە و بەزیون، هەر کە تیشکی ڕۆژیان لە سەر نیشت نووری هومێدیان لێ پەیدا بوو، (لە جیات ئەوەی بە باشی کەلکی لێ وەرگرن) لە پێچی نزاردا سەریان لێ دەشێوێ. (وەک باڵندەیەکیان لێ دێ کە چاوی بە شەوارە کەوتووە).

**١ـ هەتا بیری تاڵی گراوێ**

**بە دڵما گەڕاوە**

**هەتا یاد ئەکەم ئاوە بەو ورمەبەردینە کاری گراوە**

ئەڵێم سەد مەغابن
وەجاخێ کە ڕووگەی هەزاران نزای شینەباهۆی بەتاسەن
٢. وەبووژێنەوەی هەست و هان و هەناسەن
چلۆنە کە بیژووی گراوان ئەبینن
لە نێوچاوی ئەو خانەدانە
لە هی چۆنە پیتی براوە؟

**گراو:** ئاوێکی مەعدەنییە کە گازی هەیە و گەرمە و بۆ دەرد بەکار دێ، ئاوی گراو زۆرتر وەک ئاوێکی گەنیو دەچێ کە لە شوێنێکدا پەنگ بخواتەوە.

**ورم:** خەو (لە زاراوەی هەورامیدا) - ڕووخان - ڕمان - لەم شیعرەدا مەبەست خەوە.

**مەغابن:** مەخابن - حەسرەت - حەیف - مخابن -(وشەیەکە لە زاراوەی کرمانجی ژووروودا)

**وەجاخ:** وجاخ - خانەدانی بەمیوان - مرۆڤی ڕەسەن و نەجیم.

**ڕووگە:** قوبلە - ئەو شوێنەی کە زۆر کەس ڕووی تێ دەکەن.

**نزا:** دوعا - داوا لە خوا

**باهۆ:** شان و پیل.

**شینەباهۆ:** مەبەست لەو شیناوەردەیە کە لە سەر زەوی ڕواوە و وەک ئەوەیە کە باهۆیەکی شین بێ.

**لەهی:** لافاو - سێلاو - (وشەیەکی زاراوەی کرمانجی ژووررووە).

**پیت:** بەرەکەت - خێر - لێرەدا بایەخ و ئەرزش مانا دەدا.

١. هەر کاتێک بیرم لە چارەنووسی تاڵی گراو کردووەتەوە و یادی ئەو بە دڵما تێپەڕیوە، هەر کاتێک کە وەبیرم دێتەوە. ئاوە تەسلیمی خەوێکی بەردین (لە نێو ئەشکەوت واتا بەرددا بووە، دەڵێم سەد حەیف بۆ خانەدانی ئاو کە وەک قوبڵەیەک بوون بۆ هەزاران پاڕانەوەی بازووی شینی بە تاسەی شیناوەرد. مرۆڤ کە دەپاڕێتەوە دەستی بەرز دەکاتەوە، ئێستاش کە باس لە پاڕانەوەی شیناوەردە، "شینەباهۆ" بەکار هێنراوە و چون گیا بێ ئاو ناژی بۆیە لەبەر خانەدانی ئاو دەپاڕێتەوە کە ئاودێری بکا و گیانی پێ ببەخشێ.

٢. ئەو خانەدانەی کە هەست و ئەنگیزە و هەناسەیان دەبووژاندەوە (خانەدانی ئاو) ئێستا چلۆنە چاویان بەرەدایە دەدا هەتا گراوی بیژوو ببینن (گراو کە وتمان زۆرتر وەک ئاوێکی گەنیو دەچێ، لەگەڵ ئاو بەو واتەیەی کە شاعیر بە سەمبولی جووڵانەوە و بەرەوپێش چوونی داناوە یەک ناگرنەوە، بۆیە شاعیر گراو بە بیژوو ناو دەبا). لە نێو چاوی ئەو

خانەدانەدا چلۆنە کە سێلاو لە بیر کراوە. واتە بۆ سێلاو هەڵناستێ تا ئەو گڕاوانە ڕامالێ و لەو حاڵەتەیان وەدەرخا.

**نە سۆزەی بلاوێنی میری، خوناوەی بەهاری**
**نە تووکی برای ڕێبواری**
**لە کاسی خەوا، فێری ڕاسانی ناکەن**
**لە مانا، بە ئامان و بریا**
**پەشیمانی هەرمانی ناکەن**

**سۆزە:** سروەبا ـ شنەبا ـ گۆرانی بەدەنگی نزم ـ سۆز
**تووک:** نزای خەراپ ـ نەفرین.
**کاس:** گێژ ـ وڕ ـ سەرتاساو
**هەرمان:** جاودانە ـ هەرگیز نەفەوتان.

نە شنەی خۆش و دڵبزوێنی میری بەهار، نە دوعالێکردنی هاوڕێی، ئەم گڕاوە لەو حاڵەتە کاس و گێژ ییەی کە بە سەریدا هاتووە، وەدەرناخەن و دەرسی هەستانی فێر ناکەن. هەروەها هیچکام لەوانە، بە هیچ شێوەیەک ناتوانن کە ئەو گڕاوانە لە ژیاندا، بۆ هەرمان و جاودانە بوون پەشیمان بکەنەوە (یانی ناتوانن بە هیچ کلۆجێ، تێیان بگەیەنن کە لە جێگایەکدا مانەوە و گەنین مانای ژیان نییە، بەڵکو دەبێ وەڕێ بکەون و هەرمان و نەفەوتانی خۆتان لە بەرەوپێش چووندا ببیننەوە)

**١ـ وەها گەی لەشی بەو گەبەردینە گاوی دراوە**
**کەحێلێکە، کۆرژن و حیلەی نەماوە**
**٢ـ وەهایە کە هەر گیایە لەو دەشتە شینێ**
**لە سەر ماتەمی ئاوەبەردینە، سەر شین و سەرگەرمی شینێ**

**گە:** (مەفسەلی ئێسک).
**گاودان:** پێکەوە لکاندن.
**کەحێل:** کەحلان ـ ئەسپی نەجیب
**کۆرژن:** حیلەی توورەی ئەسپ

درێژەی بەندی پێشووە، دەڵێ: ئەم گڕاوە (ئەڵبەتە مەبەست تەنیا یەک گڕاو بە تەنیا نییە بەڵکو هەموو گڕاوێک دەگرێتەوە) بە شێوەیەک گە و مەفسلی لەشی بەو مەفسەلە بەردینانە جۆش دراوە و بە شێوەیەک دەپاڵ یەک چوونە کە وەک ئەسپێکی لێهاتوو کە نەتوانێ بحیلێنێ و کۆرژنی نەمابێ. (شاعیر لەو وێنەیەدا ئەوەی گەیاندووە کە ئاو بە

حەرەکەتەوە جوانە و ئەسپ بە کورژنەوە، وە ئاوێک کە لە جێگایەکیدا قەتیس بێ، دەنگی نییە و وەک ئەسپێکە کە حیلەی نەمابێ).

٢ـ لەبەر ئەو مەبەستانەی سەرەوەیە کە هەر گیایەکی کە لەو دەشتەدا شین بووە، لە خەم و ماتەمی ئەو ئاوەی کە لە نێو دیواری بەردیندا زیندانییە، سەری بە نیشانەی تازیەباری شینە و خەریکی شینگێڕییە.

**١ـ گەلێ گوڵە لەو چۆڵە یەخسیری خاکن**
**بە ڕوویا گەڵا وەک چەمۆڵەی کلۆڵی وەریون**
**٢ـ گەمارۆی زەلی نێزە، وا تەنگی پێ هەڵچنیون**
**کە بێ دەرفەتی پێکەنین بە سەد بەرزگی زەردەماسی**
**٣ـ لقوپوپ و هەشگەڵ**
**وەها دەور و پشتی تەنیون**
**کە بێ فرسەتی چاوەبرکێ**
**لەگەڵ عەرشی پاکن**

**چەمۆڵە:** چەمبۆڵە ـ پووکاولە ـ پەنجە بە بڵاوی ـ کاتێک دوعا لە کەسێک دەکەن چەمۆڵەی لێدەنێن کە چەشنێک بە سووک گرتنە.

**کلۆڵی:** چارەڕەشی

**زەل:** قامیش ـ چیت ـ چیتک ٢ ـ باتلاغ ـ هەردی تەڕی شل

**تەنگ پێ هەڵچنین:** خستنە ژێر فشار

**هەشگەڵ:** چاوبرکە ـ بە چاو یەکتر حاڵی کردن ـ تێگەیشتن بە تماشا ـ چاوچاوێن.

١ـ زۆرن ئەو گوڵاوانەی کە لەو چۆڵاییەیدا (ئەو شوێنەیە کە ئاوەکە پێیدا دەڕوا)، ئەسیری خاکن، ناتوانن، ڕێگە ببڕن. گەڵا بە سەریاندا وەریوە و ئەو گەڵایانە بە شێوەیەک لە سەر ئاوەکە نیشتوون کە وەک ئەوەیە چەمۆڵەی چارەڕەشی لە ئاوەکە بنێن.

٢ـ بە شێوەیەک لە لایەن قامیشی نێزەئاساوە دەورە دراون ـ (دەوروبەری گوڵەکان قامیشی لێ ڕواوە) کە دەرفەتی پێکەنینیان نییە، ئەڵبەتە چ پێکەنینێک:

ماسی کاتێک دێتە سەر ڕووی ئاو وەردەگەڕێتە سەر پشت و بەرزگی ـ کە ڕەنگی سپییە ـ وەدیار دەکەوێ. کاک سوارە ئەم حاڵەتەی بە پێکەنینی گوڵ داناوە کە لە حەقیقەتدا ئەو بەرزگە سپییانە کە وەدەر دەکەون وەک ددانی گوڵ دەچن کە لە کاتی پێکەنیندا خۆ دەنوێنن. ئێستا لەو وێنەیەدا دەڵێ کە ئەو گوڵانە بە شێوەیەک دەورە دراون کە ماسییەکان لە ترسان دەرفەتی ئەو کارەیان نییە، یا ڕەنگە مەبەست ئەوە بێ کە هەر ماسی تێدا نییە کە ئەو دیمەنە بخوڵقێنن.

۳ـ گەڵا و ورکەداری ویشکبوو و پووشوپەڵاش بە شێوەیەک دەورویشتی ئەو گۆمانەیان گرتووە کە گۆمەکان فرسەتی ئەوەیان نییە کە تەنانەت لەگەڵ ئاسمانی پاکیش چاوچاوێنێ بکەن. واتە ئەم ئاوانە یەخسیری خاکن، بە نێزەی قامیش دەوریان دراوە و بە لق و هەشگەڵ سەریان داپۆشراوە.

**هەتا جۆگە ئاوێ بە وشکی دەبینم**
**ئەڵێی مێرگی ڕوخساری کیژێکی کاڵ و مناڵە**
**بە کووزی تەمەن جاڕەجوانێکی پڕ خەوشوخاڵە،**
**تەشەنداره جەرگی برینم.**

**مێرگ:** چیمەن ـ گیاجاڕ ـ بەڵام لێرەدا وەک کینایە کەلکی لێ وەرگیراوە.
**کووز:** تەختەی باریک لە شێوکردنی زەوی.
**کووزی تەمەن:** مەبەست سەرەتای تەمەنە، ئەودەم کە تازە زەوی تەمەن دەکێڵدرێ و کووزی لێ دەدرێ.
**جاڕ:** شوێنی گیایەکی تایبەتی: نەرگزجاڕ ـ لەوەڕگە ـ زەوی نەکێڵدراو ـ پەرێز.
**خەوش:** عەیب ـ کەمایەسی.

هەتا جۆگە ئاوێکی بە ویشکی دەبینم هەر پێم وایە کە مێرگی ڕوخساری (ڕوخسارێک کە گیانی تێدابێ و...) کچێکی منداڵکارە کە لە سەرەتای تەمەندا جاڕێکە جوان، بەڵام پڕ لە خاڵ و لەککە. بە دیتنی ئەو دیمەنە جەرگی برینم تەشەندار دەبێ و زووخاو دێنێتەوە.

*

**بەڵێ : دوورە گەرمێنی دەریا**
**بەڵێ : وایە کانی هەژارن**
**ئەزانم**
**ئەوانەی کە پاراوی ئاون بژارن.**
**ئەزانم لە ڕێگا،**
**مەترسی گەلێ ژەنگ و ژارن.**

**پاراو:** تێراو

بەڵێ ڕاستە کە گەرمێنی دەریا دوورە و ئەوەش ڕاستە کە کانی هەژارن (واتە کەمئاون و بە زەحمەت دەتوانن بگەن بە دەریا) هەروەها دەشزانم کە لە ڕێگای دەریادا زۆر مەترسی وەک مانەوە (ژەنگ هێنان) و لەنێوچوون، چاوەڕوانی ئاوەکانە.

**بەڵام کاکە ئەو گشتە عەقڵی خەسارن**
**لە ناو ئەو هەموو ئاوە هەر چاوەیەک**
**باوی هەنگاوی خۆشە**
**بە تەنیا ئەوە شارەزای کۆسپ و کەندالی ڕێیە**
**هەوەڵ مەنزڵی زێیە، ئاواتی بەرزی زرێیە**
**باوی هەنگاو خۆش بوون:** باش ڕۆیشتن ـ لە سەر ڕەوت بوون.
**زێ:** چۆمی گەورە ـ ڕووبار.
**زرێ:** دەریا.
بەڵام کاکە تەواوی ئەو ئاوانە بە فیڕۆ دەچن و عەقڵی خەسارن (عەقڵێک کە لە ڕێگای ڕاست کەلکی لێ وەرناگیرێ) لە نێو ئەو هەموو ئاوانەدا تەنیا یەک چاوە ئاو، بە تەوژم و تینە و تەنیا ئەویشە کە هەموو هەوراز و نشێوی ڕێگا بە باشی دەناسێ و ڕێگا دەپێوێ. هەوەڵ مەنزڵێک کە ئەم ئاوە دەیەوێ پێی بگا، ڕووبارە و ئاواتی هەرە گەورەشی (کە دەبێتە دووهەم مەنزڵی) گەیشتن بە دەریایە.
**ئەزانێ لە هەڵدێرە هانی بەهێزی**
**لە ئەسکوند و چاڵایە هەڵدان و گێژی**
**پەڕۆی شینی سەرشانی دەریایە ژینی کەرێزی**
**ئەسکوند:** ئەسقوند ـ حاڵەتێک لە جگ کاتێک کە لە سەر نووکەکەی دەچەقێ ـ لێرەدا مەبەستی شاعیر بڵیندایی واتە ئەسکوند و چاڵ کەوتوونەتە بەرابەر یەک.
**هەڵدان:** بەرە و بەرزی فڕێدان یا ڕوشدکردن.
**هەڵدێر:** لێرەدا مەبەست تاچگەیە.
**گێژ خواردن:** سووڕانی با و ئاو بە دەوری خۆیاندا.
**پەڕۆی شینی سەرشانی بوون:** مایەی ماتەم و خەم بوون. قەدیم لە کاتی تازیە و ناڕەحەتیدا پەڕۆیەکی شینیان لە سەر شان دەبەست.
**کەرێز:** ڕێگەئاوی بە ژێر زەویدا کێشراو ـ قەنات.
تەنیا ئەو یەک ئاوەیە کە دەزانێ بۆ ئەوەی بەوپەڕی هێزی خۆی بگا دەبێ کەندولەند ببڕێ و هەروەها دەشزانێ کە ئەگەر ئاوێک بە شێوەی کەرێز بژی، لە حەقیقەتدا وەک پەڕۆی شینی سەر شانی دەریای لێدێ، واتە دەبێتە مایەی ناڕەحەتی و پەژارە و نەنگی دەریا.
**ئەزانێ لە پێ ناکەوێ پێیە پێڵاوی تاسەی پیاسەی لە پێ بێ**
**ئەوستان ئەوەستێ بە دەستێ**
**کە خاراوی ئێش و سواوی سوێ بێ**

**پێڵاو:** کەوش. پیتاو.
**پیاسە:** گەشت و گەڕانی بە پێیان.
**خاراو:** ڕاهاتوو لە کار
**سواو:** ساویاگ.
**سوێ:** ئازار و ژان ـ داخ و عەزرەت ـ تاسە.

ئەزانێ ئەو پێیەی کە تامەزرۆی گەڕان و ڕۆیشتن بێ و کەوشی حەزی ڕۆیشتنی دەپێ کردبێ هەرگیز ناوەستێ. نەوەستان (ڕۆیشتنێکی هەمیشەیی) بە دەستێک پێکدێ کە لە کارکردندا خارابێ و بە ئازار و ژان سوابێ.

**لە هەر شوێنێ ڕاماوە، داماوە، کاری تەواوە**
**ئەزانێ ئەبێ هەر بڕێ و بازوێ، تا بڕێ تا بمێنێ**
**هەناوی بە هەنگاوە، نەسرەوتنە کوولەکەی رووحی ئاوە**

**ڕامان:** دەبیرەوە چوون ـ مات بوون و بیرکردنەوە.
**دامان:** تامان ـ ماتی و سەرگەردانی.
**ئازۆتن:** لێخورین.
**بازوێ:** لێخورێ ـ تاو بدا.

لەهەر جێگایەک کە نیستێک بمێنێتەوە یا بۆ شتێک تێبمێنێ ئیتر کاری تەواو دەبێ و دەبێتە ئاوێکی ڕاوەستاوی گەنیو. ئەم ئاوە ئەزانێ کە بۆ ئەوەی بمێنێ دەبێ هەر لە حاڵی ڕۆیشتندا بێ و بەرەوپێش بازوێ چونکەنەفەسی ئاو لەگەڵ هەنگاوەکانییەتی و کوولەکە[1]ی رووحی ئاو، ئارام نەگرتن و بەرەوپێش چوونە.

---

١ـ ئەو قسەیە دەگەڕێتەوە سەر ئەفسانەی کوردی کە لە هێندێک لە چیرۆکەکاندا ئاوای باس لێ دەکرێ: رووحی دێو لە نێو کوولەکەیەکدایە، ئەو دێوە دەسەلاتی بە سەر هەموو شتێک دەشکێ، قارەمانی چیرۆک تا ڕادەیەکی زۆر جەزرەبە دەدا، تەنیا ڕێگای بەزاندنی ئەو دێوە ئەوەیە کە کوولەکەی رووحی بشکێنی یا بیدڕێ چونکەهەر کاتێک کوولەکە بشکێ رووحی دێوەکەش دەفڕێ و ئیتر دێوەکە دەمرێ. لەم شیعرەدا کاک سوارە دەڵێ "نەسرەوتن" کوولەکەی رووحی ئاوە، واتە هەر کات نەسرەوتن لە نێو بچێ وەک ئەوەیە رووحی ئاوەکە فڕیوە و خۆشی مردووە.

**تێبینی:**
مانای زۆربەی وشەکانم ڕاستەوخۆ لە "هەنبانە بۆرینە"ی مامۆستای خۆشەویستم "هەژار" وەرگرتووە.

# سواره

**محەممەد حەمەباقی**

**"تێبینی":**

ئەم وتارەی کە لە ژێرەوە دەیخوێننەوە لە ژمارەی دووهەمی گۆواری "نووسەری کوردستان" لە ساڵی ١٩٨١ی زایینی و بە قەڵەمی کاک "محەممەد حەمەباقی" بڵاو کراوەوە. کاتێک چاومان بەم وتارە کەوت خۆشحاڵ بووین کە بینیمان سێزدە ساڵ لەمەوبەر، کاکە حەمەباقی ئاوڕی وە سوارە ئیلخانی زادە داوەتەوە. ئێستا کە لە ژمارەکانی تازەی سروەدا باسی کاک سوارە هاتۆتە گۆڕێ، بە پێویستمان زانی کە ئەم وتارەش بخەینە بەرچاوی خوێنەران.

**دەستەی نووسەران**

ئەگەرچی ڕووناکبیرانی کوردستان بە گشتی، هێشتا تەواوی ئەو چەند شیعرە کەمەی سوارە ئیلخانی زادەیان نەدیوە، بەڵام لە ڕوانگەی ئەو مشتەوە، کە نموونەی خەرواریکە، «سوارە» سەرەتای سەرهەڵدانی ڕێبازێکی تازە بوو لە شیعری کوردیدا. ئەو شیعرەی لە کوردستانی ئێراندا باو بووە و ئێستاش لە دنیای شێعری «هێمن» و «هەژار»ەوە ئەبینرێ، لەسەر دەستی «سوارە»دا، لە سالانی پەنجاکانەوە بەدواوە، سەروبن هەموو بناغەکانی هەڵوەشایەوە و لەهەموو ڕووەکانی تەکنیک و کێش و سەروا و مەودای وشەوە، شەقلی تازەی بە سەردا هێنا...

ئەم شاعیرە، بۆ یەکەم جار لە کوردستانی ئێراندا، ڕچەی لاسایی و چاولێکەری شکاند و ئالای دەست پێکردنی تازەبوونەوەی شیعری هەڵکرد... تازە کردنەوەی شیعری کوردی لە کوردستانی ئێراندا، ئەگەرچی لەچاو تازە کردنەوەی شیعری کوردی لە کوردستانی عێراقدا، بەدواترە، بەڵام بۆ کوردستانی ئێران، کە شیعری فارسی، زۆر دەمێک بوو، شاعیرانی فارس، شۆڕشی شیعریبیان تیاکردبوو، ئەبوایە شیعری کوردیش، لەو پارچەیەدا، شتێک بکات. «سوارە»ش بەو هۆیەوە کە لە کۆلێژی «حقوق»ی تاران ئەیخوێند و ڕووناکبیرێکی هۆشیار بووە، ئاگاداری شۆڕشە ئەدەبییەکانی گەلانی دوور و نزیک بووە و زۆر زیرەکانە لە شیعر ئەگەیشت.

ئەو سالانەی سوارە، ئەم ئەرکەی تیا گرتە ئەستۆ، دڕندەیەتی ڕژێمی دیکتاتۆری شای ئێران، لە لووتکەدا بوو... بۆیە شیعرەکانی سوارە، پڕن لە وێنە و ڕەمزی شاراوە... ئەم جۆرە

شیعرەش کە لە یەک کاتدا، دوو نیشان ئەپێکێ: یەکەمیان شکاندنی ڕچەی شیعری پێش خۆی و دووهەمیان لە ئامێز گرتنی ئەو هەموو مەبەستانەی لە چوارچێوەی ڕەمز و هێما و ئیشاراتی شاراوەدا، شیعرێکی قووڵ داڕێژراو و پڕنهێنی ئەبن... شیعرێک کە بە ڕاگوزاریانە و بە سەر پێیی و خێرا نەخوێندرێتەوە و لایەنە جوانەکانی، بە پەلە، خۆیان نەدەن بە دەستەوە... شیعرێک کە بە پێوانەی دڕندەیەتی سەردەمەکە ئەبێ بە شیعرەکەشدا شۆڕ بێتەوە... شۆڕبوونەوە بۆ نێو بێشە چڕ و تەنگ و ئاخنراوەکانی ئەو ڕەمز و نیشانانە...

لەبەر ئەوە لە خوێندنەوەی هەموو شیعری «سوارە»دا، وا هەست ئەکەی کە وشەکان زۆر توندوتۆڵ خراونەتە پاڵ یەک و ڕستەکانیش توندتر بە یەکەوە نووسێنراون کە بەم کارە، تێکڕای هەموو شیعرەکە، شێوەی پتەوی و توندوتۆڵی پێوە ئەبینرێ... شێوەیەک «ئەدۆنیس» واتەنی: تەکنیکی شێعرەکە ئەوەندە توندوتۆڵ بێ، وەک پایەی خانوویەک، کە ئەگەر خشتێک یان بەردێکی لێ دەربهێنرێ، سەرتاپای خانووەکە ئەڕووخێ...

بە کورتی شیعری سوارە، دیاردەیەکی تازە و تایبەتییە و مۆرکی «سوارە»یەتی پێوە دیارە...

من لام وایە، ئەگەر ئەم شاعیرە، لەو تەمەنەدا (٣٨) ساڵ، جوانەمەرگ نەبوایە، تازە بوونەوەی شیعری کوردی کوردستانی ئێرانیش، وا زوو جوانەمەرگ نەدەبوو... چونکەئەوەی ئەم جوانەمەرگ بوونە، ئەسەلمێنێ، کپ بوونەوەی تازەبوونەوەکەی سوارەیە...

ئێستا ئەگەر لە کوردستانی ئێراندا چەند دەنگێکی تری جیاواز لە دەنگی «هێمن» و «هەژار» هەبن، هەر هەمان ڕێچکەی سواردن و هیچیان نوقلانەی درێژەپێدانی تازە کردنەوەکەی سوارە، بە گوێی شیعری کوردیدا ناچرپێنن... بەپێچەوانەی ئەو دیاردە و شوێن پەنجەیەی کە شیعری «گۆران»، لە سەر شیعری سەردەمی خۆی و دوای خۆی لە سەر شیعری تا ئێستای شاعیرانی کورد، بەجێی هێشت...

لێرەدا ئەگەر لەنگەرێک بگرین و بڵێین: بۆچی شیعری «گۆران»، لە سەردەمی «گۆران» خۆیدا و تا ئێستاش، شوێن پەنجە و تارمایی بە سەر شیعر و تاقیکردنەوەی «سوارە»، بە سەر شیعری کوردی و شاعیرانی دوای خۆیەوە، دیار نییە!؟

لە وەڵامدا ئەڵێین:

١ـ تاقیکردنەوەی تازەگەرییەکەی «گۆران»، تاقیکردنەوەیەکی ئاوەکی و نامۆ نەبوو، لە ئەدەبی کوردییا. چونکە«گۆران» ئەگەر هەندێ چاولێکەری و تاقیکردنەوەی شاعیرانی ئەو سەردەمەی «تورک»ی پەیڕەو کردبێ...، بەڵام لە بنەڕەتدا «گۆران»، ئاوڕی لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی و کێش ـ ە خۆماڵییەکانمان دایەوە... کە بیرهێنانەوەی ئەم جۆرە

تاقیکردنەوانە، گەڕانەوە بوو بۆ سەرچاوە ڕوونەکانی دێرینەمان و جەماوەری خوێنەرانیش پێیان خۆش و چاک بوو.

٢ـ تاقیکردنەوەی «گۆران»، تاقیکردنەوەیەکی تاکە کەسی و تاقانە و تایبەت بە «گۆران»ەوە نەبوو، چونکەئەگەر ئاکامی سەروەری تاقیکردنەوە شیعرییەکانی ئەو ساڵانەی «گۆران»ی تیا درەوشایەوە و «گۆران» لە چاو دەستە شاعیرە هاوڕێکانیا، زیاتر دەرکەوت...، بەڵام لە ڕاستیدا تاقیکردنەوەکە، تەقەڵلایەکی هەرەوەزی و بەکۆمەڵ بوو... لە بەر ئەوەی لەهەمان سەردەمدا و، بگرە پێش «گۆران»یش، شاعیرانی تری وەک: پیرەمێرد، شێخ نووری شێخ ساڵح، ئەوڕەحمان بەگی بابان (کاتب نفوس)، ڕەمزی مەلا مارف... کە جگە لەمی دواییان، ئەوانی تریان، تەمەن و تاقیکردنەوەی شیعریان، پێش «گۆران»یش بوو... لەمەش تایبەتی تر، ئاوڕدانەوە و دەسپێشکەریی دێرینە و زیرەکانەی «پیرەمێرد» لە کێش ـە خۆماڵییەکانمان و گەنجینەی شیعری دەوڵەمەند و تەمەندرێژی شیعری شێوەی «گۆران»ی، کە ئەم شێوە زمانە، لە چاو شێوەکانی تری زمانی کوردیدا، بەتەمەنتر و ڕدگ داکوتاوتر بوو...

٣ـ لە ئاکامی تاقیکردنەوەی وا گەورە و بەکۆمەڵدا، خەرمانی تاقیکردنەوەکەش، گەورە نەبێ... بۆیە جێ‌پەنجەی چەند شاعیرێکی ئاوا گەورە و بەتوانا و پڕتاقیکردنەوە، کە هەموویان پێش تەقەڵلای تازەگەری، شیعری «کلاسیک»یشیان پەیڕەو کردووە، لە سەر سەردەمەکە و دوای خۆیشیان و ڕەنگە تا درەنگانێکی تریش هەر بمێنێ...

بەڵام تاقیکردنەوە شیعرییەکەی «سوارە»، ئاکامی بەم جۆرە نەشکایەوە، چونکە:

١ـ ئەو گەنجینە شیعرییەی کە «سوارە» تیایدا تەقەڵلای دۆزینەوەی کێشوەرێکی تری ئەدا، هەر بە تەنیا گەنجینەی شیعری کوردی نەبوو... بەڵکو چەند پەنجەرەیەکی تیا بوو، کە هەر یەکیان، بە سەر تاقیکردنەوەی تردا ئەیانڕوانی، ودک تاقیکردنەوەی دەوڵەمەند و دێرینەی شعر و ئەدەبی فارسی و هەر لە ڕێگەی ئەدەبی فارسیشەوە، پەنجەرەی تر بۆ سەر تاقیکردنەوەی ئەدەبی هەمە جۆرەی گەلانی دنیا...

٢ـ تاقیکردنەوەی «سوارە»، تاقیکردنەوەیەکی تاکە کەسی و تاقانە بوو، کە لە تەمەنێکی ئاوا کورتدا خەرمانی گەورە و دەوڵەمەندی وەک سەردەمەکەی «گۆران» لەدوای خۆی بەجێ ناهێڵێ. کە نموونەکانی ئەم بەڵگەیەمان، تاقیکردنەوەی «هەردی»یە، لای خۆمانو تاقیکردنەوەی «ڕامبۆ»یە، لە فەرەنسا.

٣ـ ئەو ڕۆژگار و سەردەمەی «سوارە»، ئەم تاقیکردنەوە شیعرییەی«گۆران» تیا ئەنجامدا، بە بەراورد لەگەڵ ڕۆژگار و سەردەمی «گۆران» و دەستە هاوڕێکانی، دوو ڕۆژگار و

سەردەمی جیاواز بوون، چونکەرۆژگاری گۆران و پیرەمێرد و هاوڕێکانیان، ڕۆژگاری ڕاپەڕین و هەڵسانەوەی بیری نەتەوایەتی و زمان و ئەدەبی کوردی و هاتنە دنیای چەندان و بە یەکەوەی ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی بووە و بەرهەمی تازەگەرییەکەیان هەر خێرا و بە ئەندازەیەکی بەرین و بەربلاو، بە چاپکراوی، بە سەر خوێنەراندا بلاو بۆتەوە...، بەلام ڕۆژگار و سەردەمی تازەگەرییەکەی «سوارە»، ڕۆژگاری گەمارۆدانی بیری نەتەوایەتی و قاتوقڕی ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی بووە و لە هەمان کاتیشدا، ژمارەی خوێنەرانی ئەدەب و فەرهەنگی کوردی، لە هەر دوو سەردەمەکەدا، جیاوازی نێوان ئاسمان و ڕیسمانە... لە بەر ئەوەی ڕۆژگاری تاقیکردنەوەی پیرەمێرد و گۆران لە ژێر سێبەری یەکەمین دەسەلاتدارییەتی کوردیدا، بە ڕابەرایەتی «شێخ مەحموود» بووە، کە خوێندنی کوردی، کرایە زمانی ڕەسمی دەوڵەت و دواتریش و دوای تێکچوونی دەسەلاتە کوردییەکەش، نەتوانرا زمانی کوردی قەدەغە بکرێ ... بۆیە ژمارەی خوێنەرانی تازەگەرییەکەی گۆران و هاوڕێکانی تا هاتووە بەربلاوتر بووە، بەلام بەپێچەوانە، ژمارەی خوێنەرانی زمان و ئەدەبی کوردی و لە هەمان کاتیشدا، شیعری «سوارە»، تا ئێستاش ڕەنگدانەوەی دژواری، لە نیشتمانی «سوارە»دا، لە سەر پەرەپێدانی زمان و فەرهەنگی کوردی هەیە...

لەبەر ئەوە، لەم هەمموو گەمارۆدانەی «سوارە»دا، گەورەیەتی «سوارە»، لەوەدا دەرئەکەوێ، کە لە شەوەزەنگێکی تاریک و ساماناکدا، بە تەنیا و تاکە کەسی، ڕچە و ڕێبازێکی تایبەتی شکاند... کە بە دڵنیاییەوە، ئەتوانین بڵێین: تازەگەری «سوارە» یان بە واتەیەکی تر، ئەتوانین بڵێین: چەند مەزنە «سوارە»، ئەو شاعیرەی لە یەکەمین تەقەڵلای تاقیکردنەوەی داهێنانێکی تردا، بازنەی شیعری چاولێکەری و یەکتر جوونەوە و باوی بەجێ هێشت و لە دەرەوەی ئەو بازنەیەدا بانگەوازی دۆزینەوەی نیشتمانێکی جیاواز و تایبەتمەندی ڕاهێشت و نەخشەیەکی تازەی خستە سەر جۆگرافیای شیعری هاوچەرخی کوردی... و بە تەنیا و لە دەرفەتێکی کورتدا، چەپکەگوڵی شیعری خۆی، لە گوڵدانی شیعری کوردییا داناوە، بۆنوبەرامە و تایبەتمەندیی خۆی پێشکەش سەردەمەکەی کرد... کە دڵنیاین سەردەمەکانی داهاتووش، دەستاودەست و پشتاوپشت، بۆ یەکتری ئەگوێزنەوە...

ئەم شیعرەی سوارە «خەوەبەردینە»، وەک کاک سەلاحەددین پێشەکی بۆ نووسیوە[1]:

(سەرگوزوشتەی ئەو ئاو و سەرچاوانەیە، کە بە هیوای یەکترگرتنەوە، بوون بە چۆم و ڕێ دەکەوتن و بە تەمان بگەن بە دەریا...، بەلام لە ڕێگا، هەر کام بە دەردێک دەچن و هەر یەک بە لایەکا، لادەدەن... تەنانەت ئاوی وا هەیە، ڕاستەوخۆ دەبێتە دژی خۆی، دەبێتە بەرد... خەونی بەردین دەبینێ . تەنیا سەرچاوەیەک تەواو شارەزایە، هەم ڕێگای

دۆزیوەتەوەو هەم ورە و باوەڕی بەتینە، ئەزانێ لە پێشا لەگەڵ جۆگە و جۆباری لە یەک نزیک نەبێ یەک بگرێتەوە و ببێ بە چۆم - زێیەکی گەورە - کە گەلەکەی خۆیەتی... پاشان هەموو چۆمەکان پێکەوە بچنەوە، تا دەریای بەشەریەت...

ئەگەر ئەو پێشەکییە ی کاک سەلاح، کلیلی کردنەوەی دەرگای ڕەمز و هیماکان بێ بۆ تێگەیشتن و شەرحی شیعرەکە. من هەندێ لایەنی تری شیعرەکەم مەبەستە:

شیعرەکە بە پێشەکییەکی درێژ دەست پێ ئەکا. پێشەکییەکی پڕ وێنە و دیمەنی شاعیرانە. ئەم دەست پێکردنانە، بەو جۆرە پێشەکییا نە لە شیعری داستان و بەیتە فۆلکلۆرییە کوردییەکاندا بەکار هێنراون. گەلێ شاعیری تریشمان وەک: مەولەوی و پیرەمێرد و کامەران، بۆ شیعری کورت و ئێستاش زۆر و کەم و جاروبار، شاعیرانمان، ئەم کارە ئەکەن... لە ڕاستیدا پەیڕەوکردنی ئەم پێشەکی نووسینانە، ئەگەر بۆ هێندێ بابەتی شیعری پێویست بکا، لە شیعری تازەی جیهاندا، بەکارهێنانی زۆر کەم بۆتەوە، بە شێوەیەک کە شیعرەکە ڕاستەوخۆ و برووسکە ئاسایی، دەست پێئەکا، بە کەمترین وشە و ڕستە، مەبەستەکان ئەوترێن.

٢ـ ئەوەی جێی سەرنجە، ئەم شیعرە، سەرومڕ سیمای ڕۆمانسیانەی پێوە دیارە. کە ئەم سیمایە، بۆ شیعری ڕەمزی زۆر ناتەبان... شاعیرە ڕۆمانسییەکان کەمتر توخنی بابەتی ڕەمزی ئەکەون و بەپێچەوانەشەوە شاعیرە ڕەمزییەکان، لە ڕۆمانسییەت دوور ئەکەونەوە... «سوارە» لە گەلێ شیعری تریدا، ئەم توێژاڵی ڕۆمانسییە بە سەر شیعرەکانیا زاڵە و هەندێ جار تارمایی و جێ‌پەنجەی شیعرە ڕۆمانسییەکانی مەولەوی تاوەگۆزی و هەندێ جاری تریش بۆنوبەرامەی (دوو هاوینە گەشتەکەی - گۆران) لە شیعری سوارە - دا هەست پێ ئەکرێ:

**وەکوو نەرمەنگاوی لاوی بەرەو ژووان**
**لەجێ ژووانی زیندوو بە گیانی کچی جوان**
**وەکوو گەرمەباوی قەشەی دەستی تاراو**
**لە بزوێنی دەریای بلووڕینی بەروێ**
**بەخوڕ خۆ بە دیواری کێوا ئەدا ئاو**
**لەگەڵ گاشەبەردا، سەر ئەسوێ، سەر ئەسوێ...**

یان

**ئەڵێی تاجی زمڕوتی دوورگەی لە سەر ناوە دەریا**
**هەتا چاو هەتەر کا شەپۆلە، شەپۆلە،**
**لە بوونا لە چوونا**

**بە ئاهەنگە سەربەندی بزوێنی خۆشی**
**لەبەر خۆرەتاوا ئەڵێی سینگی ژینە ئەهاژێ**
**ئەڵێی هانی هەستانە دەنگی خرۆشی...**

٣ـ بەڵام لە تەکنیکدا، لە مەولەوی و گۆران جیاوازترە مەودای وشە، ڕەت و بڵاوە. لە پشتی وشەکانییەوە، چەند دنیا و مانای تر هەن... ئەمە ڕەگەزێکی شیعری تازەیە، وشە لەو جێگایە گەورەترە، کە تیایدا دائەنرێ... لەم بارەیاندا قایل نابێ ئەوەندەی خۆی بێ... حەز ئەکا لەو جێگایە گەورەتر بێ کە تیایدا دانراوە. حەز ئەکا لە یەک مانا و زاراوە گەورەتر بێ... بەڵکو چەند مانا یان چەند مەودایەک لە خۆیدا کۆ بکاتەوە... بە جۆرێک ئەگەر تێکڕای شیعرێک لەم بابەتە بخوێنیتەوە، هەست ئەکەی تێکڕای شیعرەکە چەند مانایەکی هەیە و هەمووشیان جوان و شیاون، بەپێچەوانەی شیعری مەولەوی و گۆران ـ ەوە، کە «وشە» هەر مانا فەرهەنگییەکەی هەیە... با سەیری ئەم دوو وێنەیەی مەولەوی و گۆران بکەین:

مەولەوی:

**بـــۆی بـــاڵات هـــەرزان وە دەشـــت و هـــەردان**
**غـەمز ڕای لای تـۆم وەکـــــام گـــــوزەردان؟**

گۆران:

**قـــژکـــاڵی لێـــوئاڵی پرشنگی نیگا کـــاڵ**
**ئەی کـچـە جـوانەکـەی سـەرگـۆنا نەختێ ئاڵ**

لای هەر دووکـیـان «وشـە» کوتومت، هەر ئەو مانایە بە دەستەوە ئەدا کە لە دێڕەکاندا نووسراون. مانایەکی تر لە پشتیانەوە نییە کەچی لای «سوارە»، بەم جۆرەیە:

**بەڵێ، دوورە گەرمێنی دەریا**
**بەڵێ، وایە کانی هەژارن**
**ئەزانم، ئەوانەی کە پاراوی ئاون، بژارن**
**ئەزانم، لە ڕێگا مەترسی گەلێ زەنگ و ژارن**

٤ـ سەرەڕای ئەو توێژاڵە ڕۆمانسییەش کە بە سەر شیعرەکەدا زاڵە، ئەبوایە نێوەڕۆکی شیعرەکە لەوە ڕوونتر بـوایە کـە چاوەڕوان ئەکرێ. کەچی لە هەمان کاتدا جۆرە تەمێک بە

سەر مانای شیعرەکەوەیە... واتا هەر چەندە شیعرەکە ڕۆمانسییە، بەڵام ئەبێ زۆر لە سەر دێڕەکان ڕابوەستی و ورد ببیتەوە، ئەوسا دوای شیکردنەوەی دێڕەکان، لە مانای شیعرەکە ئەگەی. ئەم جۆرە شیعرانە، لەو بابەتانەن کە زوو دەستەمۆ نابن، سرکن... ئەبێ ماندووت بکەن. ڕەنگە ئەم سرکی و دەستەمۆ نەبوونە، هۆی مانا فەلسەفییەکەی بێ کە تێکڕای شیعرەکەی لە ئامێز گرتووە.

جیا لەم سەرنجانەش، ئەوەی جێی دڵخۆشییە، لەم شیعرە و ئەو چەند شیعرەی «سوارە»، کە من دیومن، ئاسۆی بیری نەتەواوەتی و نیشتمانیی سوارە، بەرینترە لە ئاسۆی تەسکی نەتەوایەتی ئەو شیعرە کوردییەی لە کوردستانی ئێراندا باو بووە. بەتایبەتی لە شیعرەکانی «هێمن» و «هەژار»دا... ئەم شیعرە بەڵگەیەکی گەورەی ئەو دڵخۆشییەیە، چونکەئەو «چۆم»ەی سوارە لەم شیعرەدا مەبەستێتی، نەتەوەی کوردە، بەڵام ئەم چۆمە، چۆمی تری وەک خۆی ناسیوە و لەگەڵی تێکەڵ بووە و بە تێکەڵ بوونیان ڕووبارێکی گەورە دروست ئەکەن و بەرەو دەریا هەنگاو ئەنێن کە قۆناغی دوایی «دەریا»کە، مەبەست لە هەموو مرۆڤایەتییە، ئەم بازدانە، بە سەر سنووری تەسک و داخراوی نەتەوایەتیدا و پەڕینەوە بۆ تێکەڵبوون لەگەڵ نەتەوە و گەلانی تردا، نەک هەر مرۆڤایەتی کورد دەرئەخا، بەڵکو حەقیقەتی مەسەلەی کورد ئەسەلمێنێ. بۆیە ئەمەی سوارە لەم شیعرەدا کردوویەتی، جگە لەو سنوور شکاندنەش، ڕاچەنینی شیعری نەتەوایەتی کوردییە، بۆ خۆناساندنی بە شیعری جیهانی و شانازی کردن بەوەوە کە نەتەوەی کوردیش چۆمێکی ئەسرەوتە و ئەڕژێتە دەریای گەورەی مرۆڤایەتییەوە.

---

(١) کاتی نووسینی ئەم وتارە، شیعری خەوەبەردینەش لە ژمارەی پێشتر یانی ژمارەی یەکەمی نووسەری کوردستاندا بڵاوکرابۆوە.

# هێندێک تێبینی له سەر لێکدانەوەی خەوەبەردینە

**ئەحمەد قازی**

**نالی بە داوە شەعری دەقیقی خەیالی شیعر**
**بۆ ئەو کەسەی کە شاعیرە سەد داوی نایەوە**

نالی

دەق و دۆغری دەڵێم شیعری خەوەبەردینەش کە لە سەرجەمی دیوانی شاعیردا وەک دوندێکی بەرزی سەرسەوزی زەنوێر دێتە بەرچاو لە باری ئاقار و ئاو و هەواوە هەمان حاڵ و هەوای مەڵبەندی شیعرەکانی دیکەی شاعیری هەیە و دەکەوێتە جەغزی جوغرافیایی بیروباوەڕی باقی شیعرەکانی سوارەوە، بەڵام لە باری زمان و کەرەسەوە شاعیر تێکۆشاوە خۆی لە "شیعری موتلەق" نزیک کاتەوە و لەم مەبەستەدا سەرکەوتووە. هەر لەبەر ئەوەشە کە هەر کەسێک دەتوانێ بە قازانجی بیروبۆچوونی خۆی شیعرەکە لێکداتەوە. وا تێدەگەم سوارە لێرەدا ڕەوشتی نالی دەکار هێناوە و لە زۆر جێگا داوی بۆ خوێنەران ناوەتەوە کە لە باری مانای ڕواڵەتی و نێوەڕۆکەوە سەرپشک بن لە هەڵبژاردنی مانادا.

خەوەبەردینە لەم ڕوانگەوە لە نێو ئاسەواری شاعیردا مومتازە. کمونیستەکان دەیانگوت سوارە لەو شیعرەدا باسی گەیشتنی کۆمەڵگای دواکەوتوو، بەڵام تێکۆشەر، بە سۆسیالیزم دەکا. عاریفەکان لێکدانەوەیەکی دیکەیان لە شیعرەکە بەدەستەوە دەدا و پێیان وابوو باسی گەیشتن بە خودا و "فنا في الله"ی تێدا کراوە. بێلایەنەکان دەیانگوت شاعیر تەنیا ویستوویەتی بڵێ "ليس للانسان الا ما سعى،" ئادەمیزاد تەنیا بە تێکۆشان و ڕانەوەستان پێدەگا و سەردەکەوێ. هەمووی ئەوانەش حەقیان بووچونکە شیعرەکە وەها "موتلەق" بوو کە دەکرا ئەو مانایەنەی لێ هەڵبکرێنی.

کاک مارف لە مانا کردنەوەی یەکەم کۆپلەدا لە ژێر سەردێڕی "پوختەی مانادا" بە کورتی و لە سەریەک مانای کۆپلەکەی بە دەستەوە داوە کە لە کۆپلەکانی داوییدا تا ئەندازەیەک ئەو ئوسلووبەی لە دەست دەردەچێ و دەست دەکا بە لێکدانەوەی دوور و درێژتر وچی دیکە ڕێکەوەندی "پوختەی مانا" دەکار ناهێنێ و ئازادییەکی زۆرتر بەخۆی دەدا و لە "پوختەی مانا" دەست هەڵدەگرێ. ئەوەش بە لای منەوە لە هێزی شیعرەکەوە سەرچاوە دەگرێ کە نووسەری وتار ناچار دەکا بۆ بەدەستەوەدانی مانایەکی تێروتەسەل، زیاتر پەلەقاژە بکا و باڵ بکوتێ.

با ئێستا شیعر به شیعر و کۆپله به کۆپله به شیعرەکەدا بچینەوه و کەموکوورییەکان باس بکەین.

١ـ له کۆپلەی یەکەمدا مانای "سەوزەبەستە" ئەوه نییه که ئاغایی گوتوویەتی کەو بۆ سەوزایی ناخوێنێ. مەبەست له "سەوزەبەستە"، بەستەی شاد و دڵبزوێنه و هیچی دیکه. ئەوەش له "پوختەی مانا"دا ئیشارەی پێکراوه.

٢ـ له دێڕی "تەرەی باوەشی تاسەباری بناری"دا "تەره" بێجگه لەو مانایه که نووسراوه مانایەکی دیکەشی هەیه. "تەره" بەو قوولکەیه دەگوترێ کە گەلاتووتن یا میوەی نەگەیشتووی تێدا له تەره دەدەن تا زەرد بێ و ڕەنگ هەڵبێنێ. له سەر یەک بەو جێگاکه و ئەو شتەی تێی دایه دەڵێن "تەره" هەروەک گوتمان کاک سواره له باری واژه و ڕێکخستنەوەش وەک نالی کارێکی وای کردووه شیعرەکان مانای جیاواز بدەن. ئەگەر تەره بەو مانایه بگرین مانای ئەو دێڕه دەبێته:

" له باوەشی یا سینگی کەوەکەدا تاسەباری و مەیلیچوونەوه بۆ بناری کێوی تەره بووه و کۆبۆتەوه "ئەوەش له باری تەرکیبی واژەی دێڕه شێعرەکەوه مانایەکی دروستتره.

٣ـ لێکدانەوەی کاک مارف که دەڵێ "ئەو کەوه له ڕاستیدا دوو جار ئەسیره چونکه به دەستی دۆم گیراوه و خراوەته نێو ڕکەش!" لێکدانەوەیەکی نادروستە. دیاره هەر کەس کەو بگرێ ئەگەر سەری نەبڕێ به هەر حاڵ دەیخاته نێو ڕکە. جاچ دۆم بێ وچ بابایەکی دیکه! ئەسیری و له ڕکەدا بوون هەر دووک یەکن و ئەم زێده مانایه لازم نەبوو.

٤ـ لەم کۆپلەدا تەنیا باسی ئەو تاسەبارییه کراوه که ده گەرووی کەوی دۆمدا قەتیس ماوه و باسی ئەوەی ناکا که کاک مارف گوتەنی "بەڵام ئێستا له نێو قەفەسدایه و له بناریش هەڵبڕاوه تەواوی جۆشوخرۆش و تامەزرۆییەکەی دەکاته بەسته و له گەروویەوه دەیداته دەر".

٥ـ له کۆپلەی دووهەمدا که کولمەی کیژ له ژێر نیگای گەرمی زاوادا سوور هەڵدەگەڕێ، کاک مارف دەڵێ "شەپۆلێک وەک ئەو ڕەگەخوێنەی که لەسەر کولمەی بووکێک دەنیشێ." ڕەگەخوێن له سەر کولمه نانیشێ و وەک جۆگەلەیەک به بن پێستدا تێدەپەڕێ و ئەگەر هەر ئەو ڕەگەخوێنه سوور هەڵگەڕێ بووک دەبێته پیرێژنی چرچوچۆل که ڕەگی هەڵدەستێ و تووره دەبێ. مەبەستی شاعیر سوورهەڵگەڕانی سەر کولمەی بووکی ڕەزاسووکه و بەس که شێوەی سوورەگوڵ دەدا.

٦ـ له کۆپلەی سێهەمدا بۆ "گەرمەیاو" نووسراوه "یاوی به گوڕوتین" سیفەتی یاوی بەگوڕوتین هەرگیز بۆ "یاو" یا هیچ نەخۆشییەک دەکار ناکرێ و زۆرتر مانای چالاک و ئازایەتی دەدا.

کە وا بوو ئەگەر لە ماناکردنەوەی "گەرمەیاو"دا گوترابا "تەبی زۆر" یا حاڵەتێک کە نەخۆش لەبەر یاو "وەک ئاور دایسێ" باشتر بوو:

٧ـ بە بڕوای من ئەگەر لەم دێڕە شیعرەدا "لەگەڵ گاشەبەردا سەر ئەسوێ، سەر ئەسوێ" "سەر ئەسوێ" دووپات نەکرێتەوە وەزنی شیعرەکە تێکدەچێ و لەنەکاو دەبڕێتەوە و لەنگی و سەکتە پێک دێنێ.

**٨ـ گەرووی وشک و چاوی سپی چاوەکانی**

**دەرووی ڕوونی ئاوە.**

کاک مارف دە لێکدانەوەی ئەم دوو دێڕەدا مانای نەپێکاوە و تەفرەمان دەدا و بە لێکدانەوەیەکی گشتی و دوورە زەین بە سەر شیعرەکەدا تێپەڕیوە. شاعیر دەڵێ: دەرووی ڕوونی ئاو، یانی کەلێن و دەرفەتی ڕزگار بوون بریتییە لە گەرووی وشک وچاوی سپی چاوەکانییەک کە بەوێدا دێتە دەرەوە. لێرەدا شیکردنەوەیەک لازمە. "دەرووی ڕوون." یانی هیوا یا دەرفەتی ڕزگار بوون. یەک بە یەکێ دەڵێ هیچ دەرووی ڕوونم نییە، کە بە هەڵە لە هێندێک شوێندا بۆتە "هیچ دەراوی ڕوونم" یانی هیچ ڕێگەی ڕزگار بوون یا دەرباز بوونم نییە کە وا بوو مانای ئەم دوو دێڕە شیعرە ئەوەیە: "گەرووی وشک وچاوی سپی بووی (مردووی) چاوەکانی ڕێگەی دەرباز بوونی ئاوە. بەپێچەوانەی بۆچوونی کاک مارف لە هیچ جێگای شیعرەکەدا باسێک لە کەمی ئاوەکە دەگۆڕێدا نییە.

**٩ـ ئەڵێی بورجی خاپووری مێژووی لەمێژین.**

ئەم دێڕەشیعرە وێنەی ئەم چیا و ئەشکەوت و ڕەوەزە بەدەستەوە دەدا کە ئاوەکەی پێدا دێتە دەر و هەڵدەڕژێتە خوار، لە دێڕی دووهەمدا ئەوجار باسی زەمان دەکا و لە مەکان و زەماندا دەنگی ئاو وەک "دڵۆپەی چپەی پۆلی پەریان" بە گوێ دەگا.

١٠ـ سیفەتی "ڕوح سووک" بۆچپە و سرتە دروست نییە.

١١ـ لە کۆتایی ئەم کۆیلەیەدا نووسیویەتی: "کە وا بوو ئاوێک کە لە مانگەشەوێکی خۆشی بەهار یا هاویندا (کە ولات سەرسەوزە) ئاوێک لە دەستی کێو ڕزگار بووە." هیچ ئاوێک بە هاوین (کە ولات زەرد و سووتاوە) لە ئەشکەوت و چاوەکانی نایەتە دەرەوە.چونکە هاوین وەرزی هەڵچۆڕانی کانیاو و چۆماو و ئاوەکانە. ئەوجار ئەگەر سەرتاسەری شیعرەکەچاو لێبکەین هەمووی هەر باسی بەهارە: (ترووسکەی برووسکەی شەوی دەم بەهاری بەهەورە... یا "دەگەڵ هەر بەهارێک کە ڕادەچڵەکن سەوزەڵانی... لە هەر گاز و ڕێبازێ وا گازی ئاوی دەگاتێ... نیازی هەزاران گەزیزەی بەنازی وەدی دێ) وەک بزانین گەزیزە یەکەم گوڵی سەرەبەهارە و... کە وا بوو باسی هاوین کردن دژایەتی دەگەڵ

گیانی سەوز و زەنوێر و بەهارانەی شیعرەکە هەیە.

١٢ـ ئەم دێڕە شیعرە "سنووری شەوی دوێنێ ئەوڕۆی بەیانی" دەبێ بخرێتە نێو دوو کورتە هێڵەوە و ئاوا بنووسرێ:

ـ سنووری شەوی دوێنێ، ئەمڕۆ بەیانی ـ

لام وانییە (ئەوڕۆی ـ) دروست بێ. پیتی (ی) زیادییە و بە هەڵەی دەستنووسی دەزانم. لێرەدا باسێک لە داهاتوو نییە سوارە دەڵێ لە مەرزی دوێنێ شەو (کە لەبەر وەزنی شیعر کردوویەتە "شەوی دوێنێ") و ئەمڕۆ بەیانیدا. یانی لە نێوان شەو و ڕۆژدا یا لە تاریکو ڕوونی بەیانیدا.

١٣ـ ڕێکەوەندی "زێو ئاژن" دەسکردی سوارە نییە و لە زبانی کوردیدا زۆر دەکار دەکرێ. قەدیم مۆدنەسیغاری زێو ئاژن زۆر هەبوو.

١٤ـ دە لێکدانەوەی ئەم دێڕەدا "بە خوڕ زەمزەمەی هەڵبڕیوە" نووسراوە "بە تەوژم و هەیبەتەوە ئاهەنگ و زەمزەمەی هەڵبڕیوە". لێرەدا بە بڕوای من ڕێکەوەندی "بە تەوژم و هەیبەتەوە" لێکدانەوەیەکی جوان نییە. واژەی "هەیبەت" بۆ دەنگ کەمتر دەکار دەکرێ. زۆرتر بۆ دیمەن و دیتنە. باشتر بوو لە واژەگەلێک وەک "گشت، گوڕ، گەرموگوڕ" کەلک وەربگیرێ.

١٥ـ لەم دوو دێڕە شیعرەدا کە دەڵێ:

**ئەبووژێتەوە داری چاکی بە ودمی هەناسەی**
**شنەی نەرمەلاوێنی دەمبای ئەخاتێ**

کاک مارف، داری چاکی بەو "دارە ویشکە کە لە سەر مەزاری پیاوچاکان دەعەرزی ڕۆدەکەن و شاڵی پێوەیە..." مانا کردۆتەوە. من ئەوە ڕەد ناکەمەوە، بەڵام ئەوە دەڵێم لە کوردستانی ئێمەدا داری چاکی، بریتییە لە داربووز یا داربەڕوو یا داربنێشتێک،دارەبەنێک کە لەبن سەری پیاوچاک دەچەقێندرێ. ئەم دارانە ئەغڵەب کەم گەڵا و بێ گەشە و نەشەن چونکە جێگەکەیان وشک و بێ ئاوە، بەڵام زیندوون. سوارە دەڵێ ئەم دارە تینووە کەم گەڵایانە بە ودمی هەناسەی ئاو دەبووژێنەوە و لقوپۆپی نەرم و شلکی تازە دەردەکەن.

کاک مارف لەم لێکدانەوەیەدا بەسەر ڕێکەوەندی "نەرمەلاوێن"دا تێپەڕیوە. لە قەراغ چۆمەکانی موکریانداچەشنێک "بی" هەیە کە پێی دەڵێن "لاوێن". ئەم چەشنە "بی"یە زۆر ئەستوور نابێ و دەیکەنە سەلە و سەوەتە. دارێکی ناسک و نەرمە و لە قەراغ چۆمان بە دەم ئاوەوە شین دەبێ و وڵات دادەگرێ و بە شنەی با دەشنێتەوە و کەروێشکە دەکا. ئەم چەشنە "بی"یە لە قەراغ تەتەهوو و جەغتووی نیزیک بۆکان زۆرە و سوارەی سروشت پەرست ئەم تەرکیبەی لێرەوە دەست کەوتووە. کە وا بوو لە ماناکردنەوەی ئەم دوو دێڕە شیعرەدا دەڵێین:

**"داریچاکی بە ودمی هەناسەی ئاوەکە دەبووژێتەوەو**
**لقوپۆی وەک نەرمەلاوێنی دەم شنەبا ئەشنێتەوە."**
کاک مارف "لاوێن" بە لاواندنەوە مانا دەکاتەوە.
١٦ـ لە مەڕ ئەم دێرە شیعرەوە: "لەبەر خۆرەتاوا ئەڵێی سینگی ژینە ئەهاژێ." نووسەر کە دەگاتە لێکدانەوەی "ئەهاژێ" دەڵێ "مرۆڤ کە زیندوو بێ و گیانی دەبەردا بێ سینگی دەهاژێ، بۆ؟ چونکە قەلبی لێدەدا و ئێستاش لە ڕوانگەی شاعیرەوە دەریا زیندووە و خرۆشانی شەپۆلەکانیشی بە لێدانی دڵی دەریا شوبهاندووە".
بەپێچەوانەی ئەم بۆچوونە "هاژان یا هاژین" بۆ لێدانی قەلب و دڵەکوتە دەکار ناکرێ و بەتایبەتی بۆ نەفەس کێشانی بە پەلە و کورت دەکار دەکرێ. دیارە کاتێک پیاو ماندوو دەبێ‌و توند، توند، نەفەس دەکێشێ دڵەکوتەشی وێدەکەوێ، بەڵام هاژان کاری بەدڵ نییە و تەنیا بۆ هەناسەکێشان دەکار دەکرێ.
کە وا بوو بۆ لێکدانەوەی شیعرەکە دەبێ بێژین:
دەریا وەک سینەی ژیان دەهاژێ، هەڵدەستێ و دەنیشێتەوە.چونکە شەپۆلان دەدا.
١٧ـ "کوێرەکانی" یانی کانی کەم ئاو.
١٨ـ بۆ "شەوارە" لێرەدا مانای "سەرلێشێواو" پڕ بە پێستە.
١٩ـ "بە هیوان بگرمێنێ هەوری بەهاری " دەگەڕێتەوە سەر "زنە دەم بە هاوارە درۆزنەکان" نەک کوێرەکانییەکان.
٢٠ـ ڕێکەوەندی "کەچی" مانای "ئەگەرچی" نادا. زۆرتر هاومانای "در حالیکە"ی فارسییە، لێرەدا باشتر بوو، "بەڵام" مانا بکرێتەوە.
**٢١ـ هەتا بیری تاڵی گراوێ**
**بە دڵما گەڕاوە،**
**هەتا یاد ئەکەم ئاوە بەو ورمە بەردینە کاری کراوە.**
**ئەڵێم سەت مەخابن**
**وەجاغێ کە ڕووگەی هەزاران نزای شینە باهۆی بەتاسەن**
**وەبووژێنەوەی هەست و هان و هەناسەن.**
**چلۆنە کە بیژووی گراوان ئەبینن.**
**لەنێوچاوی ئەو خانەدانە**
**لەهی بۆچی پیتی براوە؟**

دە لێکدانەوەی ئەم شیعرەدا ئەگەرچی نووسەر زۆری هەوڵی داوە مانایەکی تێروتەسەل بە دەستەوە بدا و چی تێدا نەهێڵێتەوە، بەڵام بە تەواوی سەرنەکەوتووە و هێندێکیش لە ماناکانی دروست نین.

گڕاو بەو ئاوە مەعدەنییە دەڵێن کە تامێکی تاڵ و سوێری هەیە و ئاوەکە پڕە لە خوێی جۆراوجۆر (املاح) و پاش ئەوەی وەڕێکەوت ئەم خوێگەلە دەبنە بەرد وچین چین دەکەونە سەریەک و نایەڵن ئاوەکە کوێبێتەوە سەریەک و جاری بێ. مەبەست لە "ورمەبەردینە" دە شیعرەکەدا هەر ئەم خوێگەلەن کە دەبنە بەرد و ئاوەکە بلاو دەکەنەوە و کاری دەکەن یانی لە نێوی دەبەن. شاعیر شکایەت لەم ورمەبەردینەیە دەکا کە ئاوی لە تایبەتمەندییەکانی خۆی، کە وەڕێکەوتنە و تێراوکردنی مەزرا و شیناوەرد، بێبەش کردووە. کاک مارف ورمەبەردینەی بە "ئەشکەوتی بەردین" مانا کردۆتەوە کە هیچ پێوەندی بە گڕاوەوە نییە.

واژەی "وەجاغ" بێجگە لەو مانایانە کە ئاغایی بەدەستییەوە داوە زۆرتر مانای خانەدانی شێخ و سەید و پیاوچاکان دەدا. دەڵێن فلانکەس وەجاغە جنێوی پێ مەدە، یانی لە بنەماڵەیەکی سەیدە، یا نەوە شێخ و شتی وایە. کە وا بوو باری مەزهەبیش لە "وەجاغ"دا هەیە. بەتایبەتی کە باسی دوعا و نزا و ڕووگەش لە شیعرەکەدا ئەو زەمینەیە بەدەستەوە دەدا.

لێکدانەوەی "بیژووی گڕاوان دەبینن" ئەوە نییە کە ئاغایی گوتوویەتی. لێرەدا مەبەست لە "بینین" خستنەوە و زانە. دەڵێن فلانە ژن دوو منداڵی دیوە یانی دوو زگ زاوە. لە فۆلکلۆردا دەڵێ: (بانە و مەریوان ئەو دیوە و دیوە ـ ڕەحمەت لەو دایکەی تۆی بۆ من دیوە). یانی ڕەحمەت لەو دایکەی تۆی بۆ من هاوردە سەر دنیا. دیارە لازمە ئەوەش بێژم کە زۆرتر بۆ مالات ئەوە دەڵێن لە شیعرەکەدا شاعیر دەڵێ سەد مەخابن چ قەوماوە کە بنەماڵەی ڕەسەنو پیرۆزی ئاو لە جیات ڕۆڵەی ڕەسەن بیژوویان دەبێ؟! بیژووی گڕاو.

٢٢ـ لەو شیعرەدا:

**وەهایە کە هەر گیایە لەو دەشتە شینن**

**لە سەر ماتەمی ئاوەبەردینە، سەر شێن و سەرگەرمی شینن**

لێرەشدا ئەم هەڵەیە دووپات بۆتەوە کە "ئاوەبەردینە" بە ئاوی نێو دیواری بەردین یا ئەشکەوت مانا کراوەتەوە. کەچی مەبەست ئاوی گڕاوە کە لەبەر ئەملاحی زۆر ناتوانێ بڕوا و لە جێگاوە دەبێتە بەرد و ئەلحەق ڕێکەوەندی "ئاوەبەردینە" داهێنانێکی هونەرمەندانەیە.

٢٣ـ لەم دێڕە شیعرەدا:

**کە بێ دەرفەتی پێکەنین بە سەد بەرزگی زەردە ماسی:**

کاک مارف دەڵێ "ماسی کاتێک دێتە سەر ڕووی ئاو وەردەگەڕێتە سەر پشت و بەرزگی کە ڕەنگی سپییە وەدەردەکەوێ". پێویستە بگوترێ کە زەردەماسی هەرگیز نایەتە سەر ئاو. زۆرتر بە بنیچۆمەوە دەنووسێ و دێت و دەچێ و لە تەنکاوان دەلەوەڕێ. ئەم خۆ وەرگێڕانەش هەر لە بن ئاودا دەکا و پێی دەڵێن سپیاو کردن (ماسی سپیاو دەکا). ڕەنگە هۆی ئەم کارە خۆ ڕزگار کردن لەچەنگ ملۆزم (ئەنگەل) بێ،چونکە ماسی خۆی ڕەبەرد و خیزی بن ئاو دەخشێنێ، یا گەرادانان بێ کە ماسی دەیەوێ گەراکان وەبن خیز بدا.

٢٤ـ لە کۆپلەی ژێرەوەدا:

**بەڵێ : دوورە گەرمێنی دەریا**

**ئەزانم،**

**ئەوانەی کە پاراوی ئاون بژارن.**

**ئەزانم لە ڕێگا،**

**مەترسی گەلێ ژەنگ و ژارن.**

لەم کۆپلەیەدا شاعیر سەرجەمی باسەکە وێک دێنێتەوە بۆ مەبەستی ئاخر (نتیجەگیری)و دەیەوێ پەیامی خۆی بدا بە خوێنەر و پێی دەڵێ:

بەڵێ ڕاستە دەریا دوورە و ئەوەش ڕاستە کە کانی هەژار و بە قەولی کاک مارف ئاویان زۆر نییە و بژارەکان لەو ئاوە بەناحەق پاراو دەبن (ئەم دێڕە دە لێکدانەوەکەدا لە قەڵەم کەوتووە) دیسان ئەوەش ڕاستە کە لە ڕێگای گەیشتن بە ئاواتدا «دەریا» مەترسی تاڵ و تیژو ڕزا و تۆقێن زۆرە، بەڵام:

**کاکە ئەو گشتە عەقڵی خەسارن**

"عەقڵی خەسار" ئەوە نییە کە کاک مارف گوتوویەتی، مەبەست عەقڵ و تەجرەبەیەکە کە پاش زەرەر کردن وەدەست دەکەوێ. یانی ئەزموون و تەجرەبەیەکە کە پاش خەسارەت و زیان دێتن. یانی دەبێ لەچارەنووسی گراو یا گۆلە قەتیس ماوەکان و درۆزنە دەم بە هاوارە چەواشەکان تەجرەبە وەربگیرێ کە ئەو کانییەی وا باوی هەنگاوی خۆشە، چارەنووسی ئەوان دەزانێ و تەجرەبە وەردەگرێ و بەرەو دەریا خۆ دەکوتێ.

٢٥ - **ئەزانێ لەپێ ناکەوێ پایە پێڵاوی تاسەی پیاسەی لەپێ بێ**

**ئەوەستان ئەوەستێ بە دەستێ**

**کە خاراوی ئێش و سواوی سوێ بێ.**

من پێم وایە ئەم کۆپلەیە شیعری سوارەی نەمر نییە، باشم لەبیرە کاک سوارە کە ئەو شیعرەی بڵاو کردەوە و نوسخەیەکیشی بە من گەیشت ئەو کۆپلەیەی تێدا نەبوو. ڕەنگە

دوایی خۆی لێی زیاد کردبێ. یا کەسێک ئەو کارەی کردبێ.

سەبک و شێوەی ئەم کۆیلەیە لە باری وەزن و هۆنینەوە و هەڵبژاردنی واژە زۆر وەشیعرەکانی دیکە دەچن، بەڵام لە دێڕی دووهەمدا واژەی "نەوەستان" ئەگەر بە مانای کۆڵنەدان و ماندوو نەبوون بێ، شیعرەکە مانای دروستی نابێ، بەداخەوە هەموو ئەو نوسخانەی بەدەستمان گەیشتوون "نەوەستان"یان نووسیوە. ئەگەر "نەوەستان" بکەینە "کە، وەستان" شیعرەکە مانای دروست بەدەستەوە دەدا. یانی دەبێتە ئەوە کە کانییە بە هیوا کە ئەزانێ:

لە پێ ناکەوێ...

کە وەستان ئەوەستێ بە دەستێ کە خاراو بێ

لە کۆتایی ئەم وتارەدا، تکام لە دۆستان و شیعرناسانی خۆشەویست ئەوەیە ئەگەر بیروڕاو بۆچوونی تایبەتییان هەیە، یا پێیان وایە هەڵەیەک لەبارەی لێکدانەوە و ماناکردنەوە لەم وتارەدا ڕووی داوە. پێمان ڕابگەیەنن. مەبەست لەم نووسین و لێکدانەوە تەنیا ناسینی باشتر و زانینی هەراوتری شاکاری "خەوەبەردینە"ی سوارەی نەمرە و بەس.

# وڵامی ڕەخنە

مارف ئاغایی

**تێبینی:**
لە ژمارە ٨٤ و ٨٥ی گۆڤاری سروەدا، وتارێک بە ناوی "لێکدانەوەی خەوەبەردینە" (مارف ئاغایی) بڵاو کرایەوە. لە سروەی ژمارە ٩٤دا بیروڕای کاک "ئەحمەد قازی"مان سەبارەت بەم وتارە خوێندەوە. لەم ژمارەیەشدا وەڵامی کاک مارف دەخوێنینەوە.
(دەستەی نووسەران)

کاتێک کاک ئەحمەد قازی وەک نووسەری گۆواری سروە، "لێکدانەوەی خەوەبەردینە"ی خوێندەوە بانگی کردم و فەرمووی: لێکدانەوەکەم زۆر پێ جوانە، بەڵام لەچەند شوێندا پێم وایە بە هەڵەچووی، پێت خۆشە وتارەکەت ئیسلاح بکەم یا وتارێکی سەربەخۆی، وەکو ڕەخنە، لە سەر بنووسم. منیش داوام لێ کرد کە بە شێوەی ڕەخنە بینووسێ و ئەویش وتی بە یەک شەرت کە ئەگەر ئەتۆش وڵامێکت هەبێ بینووسییەوە، بۆ ئەوەی نەهێڵێن باسی "سوارە" لە سروەدا جێگای بەتاڵ بێ.

کاک ئەحمەد وڵامەکانی خۆی ژمارە لێدابوو کە منیش بەپێی ئەو ئەژمارانە زۆر بە کورتی بیروڕای خۆم دەنووسمەوە.

١ـ من بە سرنجدان بە فەزای شیعرەکە هێندێک لە وشەکانم مانا کردۆتەوە. لە پێشدا وتوومە بەستە یانی گۆرانی سووک و لەبار کە... پاشانیش وتوومە سەوزەبەستە یانی ئەو بەستەیەی کە سەوزایی و ژیانی لێ دەبارێ. سەوزایی بۆ دەخوێنرێ؟ چونکە کەو لە بەهاردا کە لە سەوزایی دوور کەوتۆتەوە ئەو بەستەیە دەخوێنێ. کاک ئەحمەد بۆخۆشی بەم شێوەیە هەر لەم وتارەدا "شەوارە"ی مانا کردۆتەوە. نووسیویە لێرەدا "شەوارە" یانی "سەرلێ شێواو". کە من پێم وایە دروستە، هەرچەند ئەوە مانای مەجازی شەوارەیە و مانای فەرهەنگییەکەی شتێکی دیکەیە.

٢ـ کاک ئەحمەد مانایەکی دیکەشی پێ زیاد کردووە کە جوانە.

٣ـ کاک سوارە دەڵێ "کەوی دۆمی یەخسیری زیندانی داری". دەیتوانی باسی دۆم نەکا، چونکە وەک کاک ئەحمەد وتوویە کەوی یەخسیر هەر یەخسیرە. بەدەست هەر کەسێک بێ، بەڵام کاک سوارە تەئکید لە سەر ئەو قسەیە دەکا... کە من پێم وایە بە عەمد ئەو کارەی کردبێ.

٤ـ له بەندی چواردا کاک ئەحمەد دەڵێ کاک سوارە تەنیا باسی ئەو تاسەبارییەی کردووە کە لە گەرووی کەوی دۆمدا قەتیس ماوە و باسی ئەوەی ناکا کە مارف گوتەنی: "بەڵام ئێستا لە نێو قەفەسدایە و لە بناریش هەڵبڕاوە و تەواوی جۆشوخرۆش و تامەزرۆییەکەی دەکاتە بەستە و لە گەرووییەوە دەیداتە دەر."

من دەڵێم تەواوی ئەو شتانەی نووسیومە لە زمان شیعرەکەوەیە و هیچم لە خۆمەوە نەنووسیوە. دەلیلیشم ئەوەیە کە کاک سوارە لە (نێو قەفەسدایە)، پاشان دەڵێ: "پڕی سەوزەبەستەی خرۆشانی باڕی" کە وا بوو جۆش‌وخرۆش و تامەزرۆیی هەیە تا بیکا بە سەوزەبەستە، پاشان دەڵێ "تەرەی باوەشی تاسەباری بناری" دیارە کە لە بناریش هەڵبڕاوە.

٥ـ کاک ئەحمەد دەنووسێ: "ڕەگەخوێن لە سەر کوڵمە نانیشێ و وەک جۆگەیەک بە بن پێستدا تێدەپەڕێ و ئەگەر هەر ئەو ڕەگەخوێنە سوور هەڵگەڕێ بووک دەبێتە پیرێژنی چرچ و چۆل کە ڕەگی هەڵدەستێ و توورە دەبێ."

من دەڵێم: مەبەست لە ڕەگەخوێن ئەو ڕایەڵە باریک و سووردیە کە بە سەر کوڵمدا دەگەڕێ، ئەم شتانە مەجازین. من پرسیارێک لە کاک ئەحمەد دەکەم: ئەگەر ڕەگەخوێن بووک بکا بە پیرێژن، ئەدی جۆگەخوێن (کە کاک ئەحمەد وتوویە) و شەپۆلی خوێن کە کاک سوارە وتوویەچ لە گۆنای بووک دەکەن؟!

٦ـ ئێمە دەڵێین فلانی یاویکی توندی هەیە. بۆ ناتوانین بڵێین یاوێکی بەگوڕوتین فلان کەسی داگرتووە؟

٧ـ کاک ئەحمەد دەفەرمووێ ئەگەر لەم دێڕەدا:

لەگەڵ گاشەبەردا سەر ئەسوێ، سەر ئەسوێ "سەر ئەسوێ"یەک لابەرین وەزنی شیعرەکە تێکدەچێ. بەڵام من دەڵێم وەزنی ئەم شیعرە "فەعوولون"ە و"سەرئەسوێ" بە تەنیایی یەک "فەعوولون" و لە شیعری نوێ لە سەر وەزنی عەرووزدا هیچ قەراردادێک نییە بۆ ئەوەی کە لە دێڕێکدا بۆ وێنە دەبێ چەند "فەعوولون" هەبێ، کە وا بوو بە لابردنی ئەم "فەعوولون"ە وەزنەکە تێک ناچێ.

٨ـ بۆچوونەکەی کاک ئەحمەد دروستە.

٩ـ بەم شێوەیە شەرحەکە کاملتر دەبێ.

١٠ـ سیفەتی "ڕۆح سووک" بۆچپە و سرتە دروستە. تەعبیری بەم شێوەیە لە شیعری کوردیدا زۆرە.چپە و سرتە دەتوانێ ڕۆحی هەبێ.چونکە زۆر جار دەڵێین لە ڕۆحی ئەو بابەتە یا ئەو قسەیە نەگەیشتم. هەر شتێکیش کە موجازەن ڕۆحی پێ بدرێ دەکرێ بڵێی ڕۆح سووکە یا نا...

١١ـ لەم کۆپلەیەدا کاک ئەحمەد پەلەی کردووە. سابیتی کردووە کە وەرزەکە هاوین نەبووە بەڵکو بەهار بووە. ئەوە هەمان شتە کە هەر لەو وتاریدا، بەڵام چەند ستوون دواتر من بەم شێوەیە باسم کردووە: "پێشتر وتمان بەهار یا هاوین، بەڵام لێرەدا ڕوون دەبێتەوە کە ئەو وەرزەی ئاوەکەی پێدا دەڕوا بەهارە.چونکە شاعیر دەڵێ نیازی گەزیزەی وەدی دێ و گەزیزەش گوڵێکە کە تەنیا لە سەرەتای بەهاردا دەڕوێ".

١٢ـ ئەم بەندە دەگەڕێتەوە سەر جیاوازی نوسخەکان کە بیروڕای کاک ئەحمەد دروستە.

١٣ـ کاک ئەحمەد فەرموویە" ڕێکەوەندی زێوئاژن دەسکردی سوارەی نییە". منیش نەموتووە دەسکردی سوارەیە وتوومە: "دەرزی ئاژن»مان هەیە کە بە مانای زۆر دەرزی تێڕاکردنە، زێوئاژن بۆچوونێکی شاعیرانەیە بە مانای ئەوەی کە ڕەنگی زێوئاسا هەموو لایەکی داگرت، زێوکاری کراو.

١٤ـ لەم بەندەدا بۆ سێهەمین جار، یەک مەسەلە دێتە گۆڕێ و ئەویش ئەوەی کە من وتوومە بە تەوژم و هەیبەتەوە ئاهەنگ و زەمزەمەی هەڵبڕیوە، "کاک ئەحمەد وتوویە تەوژم و هەیبەت بۆ دەنگ، لێکدانەوەیەکی جوان نییە." کە وەک وتم من پێم وایە دروستە.

١٥ـ ئەو شەرحە دووهەمەی کاک ئەحمەدیش پێویستە.

١٦ـ بۆچوونەکەی من هەڵە بوو.

١٧ـ لەم بەندەدا قسەی من و کاک ئەحمەد هەر یەکە.

١٨ـ لە پێشداش وتم کە "سەر لێشێواو" لێرەدا مانای مەجازی شەوارەیە.

١٩ـ پێم وایە دەگەڕێتەوە سەر هەردووکیان (هەم زنەی ... و هەم کوێرەکانی)

٢٠ـ بۆ مانای "کەچی" بۆچوونەکەی کاک ئەحمەد دروستە.

٢١ـ کاک ئەحمەد دەڵێ: "مەبەست لە ورمەبەردینە دە شیعرەکەدا هەر ئەم خوێگەلەن کە دەبنە بەرد و ئاوەکە بڵاو دەکەنەوە و کاری دەکەن یانی لە نێوی دەبەن."

من دیسان دەڵێمەوە کە ورم یانی خەو (بە زاراوەی هەورامی) ورمەبەردینە یانی خەوەبەردینە و ئەویش یانی خەوێکی وەک بەرد بێ (بەردین). من ورمەبەردینەم بە ئەشکەوتی بەردین مانا نەکردۆتەوە.

بۆ بیژووی گراوان پێم وایە هەر دوو مانا دروستن.

٢٢ـ پێم وایە ئاوەبەردینە، زۆرتر مەبەستی ئەو ئاوە بێ کە لە نێو ئەشکەوتدایە. فەزای شیعرەکە لە خەو دەدوێ. ئاوێک کە بوویێتە بەرد نەخەوتووە، بەڵکو مردووە، بەڵام ئاوێک کە لە ئەشکەوتدا یەخسیر بووبێ، خەوتووە،چونکە جارێ ماهییەتی خۆی لە دەست نەداوە.

# درەوشانەوەی سوارە

**سەلاحەددین ئاشتی (شەماڵ)**

هەرکات دەمهەوێ بڵێم خزمینە بۆ پێشەوە!؟ خێرا بیری خلیسکان، لارێ بوون، تلاسکە بەستن و هەڵنەستانەوە وەکو تەزووییەک لە بەری پێمرا دەست پێدەکا و لە تۆقی سەرم دەچێتە دەر!

دەڵێی هەنگاو دەنێم ڕووەوچرێک، بەرەو ڕەهۆڵ و بوودرێک، بۆ دۆزینەوەی سەرێک و سوورێک! دەترسم پوختەی مەبەستم، بینە پۆلوو لە سەر دەستم، بمخەنە گەرداوی پەلە و داغم کەن و نەساغم کەن...!؟

ئەو کەسانەی بەرەو ئاسۆی بە هەودای ترووسکەچندراو بەرێوەن وچاویان بڕیوەتە دیمەنی بیربزوێنی بەیانی کە داوێنی پاک و ساکاری کردۆتە پایەندازی ڕۆژێکی نوێ و ژیانێکی تازە، هەقیانە ترسیان ڕێنیشێ و تۆزی پەژارەیان لێ نیشێ! ئاخر ڕۆژ داهاتن تەنیا ڕواڵەتی هەڵسووڕانی دەفە بێدەنگەکەی خۆر نییە!؟ وا هەیە ڕۆژیش داهاتووە، بەڵام ژیان پێڕاهاتووەو برستی بە تیخی جەللادی زەمان داهاتووە!

جا بۆیە تاقمی خەنیم و جەردە، فریودەر و هەڵخەڵەتێن و گێرەشێوێن هەردەم بۆسەیان ناوەتەوە و مەترسییان لە کوێستانی ڕووحا دەنگی داوەتەوە!

نامهەوێ پێشەنگی کاروانی پێشکەوتن هەڵە و سڵ کەم و لە کار و کردەوەی دوودڵ کەم، بەڵام دەڵێم بۆ بڕینی ئەو ڕێیە نوێیە ئاوڕدانەوە بۆ دەسکەوتی مێژوو پێویستە! ملپێودنان ناشیرن و نادروستە!

ڕابردوو ئەزموونە، ئەزموونی تاڵ، ئەزموونی شیرن! وەلانانی شەرم و شوورەییە و ڕێز لێگرتنی مەزنییە. کاکڵی بە کەلکی مێژوو خەزێنەیەکی هەرگیز نەبڕاوەیە و مەحەکێکی پەسند و جێی متمانەیە!

ئەگەر بخوازین لە بەستێنی ئەدەبی ئەمڕۆی دنیادا کە وا تێکەڵاوی سیاسەت بووە، خەریکە نەیناسینەوە و ڕێی تێبەرین، دەبێ ئاگادار بین لە بارودۆخ، قۆناخی ژین، ژینی گەلان! ئەوسا لە خۆمان ڕامێنین، ئاستی بووغمان هەڵسەنگێنین، دوایە حوکمی بەرەو پێش و بەرەو دوا، لە بان کلاوڕۆژنەی تەنگەبەری زەمانیمان ڕا داتەکێنین!؟

لە ئەدەبیاتی ولاتانی ئورووپایدا، لە نێو گەلانی لە خۆبایدا، هەر ڕۆژەی شێوە و شێوازێک هەیە، سەیر و سەمەرە،چاک و جێی سرنج، بێسەرەوبەرە، بەڵام قەت نەبووە

ئەدەبیاتی کۆن، شرتوگوم کرێ و "دیزە بە دەرخۆنە" بکرێ! هەر داهێنانێک بە ئامیانی پاکی ڕابردوو هەوێن نەکرابێ، سست و بێپێزە و بۆیان چا نابێ، با هەزار مت و موور و سلسلە و خشلی پێ هەڵواسرابێ!

بۆیە باسی هەندەران دەکەم هەتا خۆمانم وەبیر بێتەوە و بە ناوی ڕووناکبیریی، دەسکردی جوان و نەخشینی خۆن لە بیر نەچێتەوە!

هەبوو نەبوو، شاعیرێ بوو، نووسەرێ بوو، خاوەن هەست و شعوور و بیر، پیاوێ ئازا و بەوەج و ژیر، لە هەرێمی هونەروەری و ئەدەبیاتا جێی ڕا و تەگبیرا!

ئەو توانی کەولی "گۆران"ی لێرە بخاتە سەرشانی، بیباتە نێو توێی شیعرەوە و بیکاتە کری پەخشانی و تەنانەت پتریش پێهەڵاچێ، ببێتە نوور، باڵ بگرێ و لە دەواری شەوگاری پشووبڕ ڕاچێ!

یەکێ هەبوو، یەکێ نەبوو، شاسوارێ بوو، کاسوارێ بوو، سەحەت سووک و لەبەردڵان، کەلامی لە پەلکی گوڵان، کەچی بێناز و پەڕیوەی مەڵبەندی قەتیسی بێدەنگی!

نازانم بۆ هەرکات دەمهەوێ باسی شیعر یا کورتەچیرۆک و پەخشانی کاک سوارە ئێلخانیزادە بکەم، باڵ دەگرم و دەڵێی بە مەڵبەندی ئەفسانەدا ڕادەبوورم. لە ڕێوە خواوەندی شیعری یۆنانییەکانم دێنەوە یاد و هەرا و گرمەی وروژانی عالەمم لا زیندوو دەبێتەوە!؟

بڵێی چ ڕازێک بێ، چ تەلیسمێک بێ و تا ئێستا نەشکابێ؟! بۆچی سوارەچەند دەیە پاش ماڵاوایی ئێستاش هەر تاقەسواری مەیدانی شیعری نوێیە؟! خۆ ئەو لە ڕاستەڕێیانی لانەداوە، کەچی چۆکی بە وشە داداوە و بە ویستی خۆی تەقڵە و جلیتێنی پێ کردوون و بەرەو قۆناخێکی تری بردوون.

تۆ بڵێی سوارە هەڵکەوتەی دەور و زەمان نەبێ؟چما ئەگەر وا نییە، بۆ کەس زات ناکا بە ئاشکرا خۆ لە قەرەی بدا!؟چماچ شتێک غەیری زمان و بیری تیژ دەستاوێژی وێژەوانە؟! زمانی پاراو، بۆچوون و لێکدانەوەی نوێ و دڵگر و بیرکردنەوەی فەیلەسووفانە، دیاردەی هەرە بەرز و بەرچاوی قەڵەمی سوارەن.

ئەوی ڕاستی بێ ئەو باشوەستای زەمانە بوو کە توانی وشە بە وردی تیفتیفە بدا و لە شوێنی خۆی دەکاری کا، کەسایەتی و دەمار بدا بە هێندێکان و ڕووحیان وەبەر بێنێ و لە خەمیان بڕەخسێنێ!

کەلامی سەربەخۆ، وێنەی ئاشنا بۆ زەین، وێنواندنی تایبەت و خەیاڵی ناسک بوونە ڕایەڵوپۆی شوێنەوارەکانی، کە دەتوانین بڵێین زۆربەیان خۆماڵی و خۆشەویستن.

گەرچی لە نێو ئەدەبی کوردیدا پتر بە شاعیرێکی بەرز و خاوەن شێوازی سەربەخۆ

ناسراوە، بەڵام ئەوەی جێگەی شانازی و ڕەزامەندییە و بۆ سرنج دەبێ، پەخشان و داستانی کەم وێنەیەتی!

ئەو شوێنەوارانەی کە لە پەنجەرەی نیوەتاکی "تاپۆ و بوومەلێڵ"ی بەیانا پێشکەشی کردوون، گەرچی بەرنامەیەک بوون بۆ ڕادیۆ نووسراون و هەر لە وێوە بڵاو کراونەوە، بەڵان زۆربەیان نووسراوەیەکی سووک و بازاڕی نین و نەبوون!؟

گەر بمهەوێ بۆ هەر یەک لە بەرنامەکانی شتێک بنووسم، دەبێ چەند هێندی نووسراوەکەی کۆبە و پەراوێز لێ بنێم و هێشتاش ناتەواوە؟!

خوێنەری چاوەڕوان و تامەزرۆ!

بۆ ئەوەی لەگەڵم هاودەنگ و هاوهەنگاو بی ئومێدم وایە بە یارمەتی یەزدان و خزمان و دۆستانی کاکە سوارە هەر وا لەبەرەوە، بۆ دەوڵەمەندتر کردنی ئەدەبەکەمان و ڕێنوێنی نووسەران، چەند نموونە کورتەچیرۆک و پەخشان و لێکدانەوەی ئەدەبی لێ بڵاو کەینەوە.

لام وایە ئیتر حەشاردانیان گوناهێکی زۆر گەورەیە و قەڵەمی شاعیران و نووسەرانی دەروەست هی گەلە و ملکی تایبەتی کەسێ نییە و دەبێ بێتەوە نێو گەلێ!

سبەی چۆن دەبێ وچ دەقەومێ، نازانین!؟

هەتا دەرفەت لە کیس نەچووە و مەبەستەکانیش ڕەنگیان نەگۆڕاوە، دەی با دەست بەکار بین و تەیار بین!

# دو صمیمی

صلاح الدین عربی (آشتی)

میتوان هرگونه کشتی راند بر دریا.
میتوان مستانه با یاری بلَم در خلوت آرام دریا راند.
میتوان زیر نگاه ماه با آواز قایقران سه تاری زد، لبی بوسید.

شاملو

بدون تردید «فروغ فرخزاد» (۱۳۱۳ ـ ۱۳٤٥) را می‌توان یکی از سرایندگان برجسته شعر معاصر ایران قلمداد کرد و در مورد تعابیر، تصاویر، پیامها و دیدگاههای وی پس از یک انقلاب فکری و درونی ـ از سال ۱۳۳۹ به بعد ـ به عنوان یک پدیده خاص به بحث و تبادل نظر پرداخت.

به نظر آقای محمّد حقوقی، ـ «فروغ یک چهره دارد با دو نیمرخ. نیمرخی که آینه شاعر «اسیر»، «دیوار» و «عصیان» است و نیمرخی که آینه چهره شاعر «تولدی دیگر» و «ایمان بیاوریم»!»

«آینه نیمرخ اول، آینه‌ای کوچک در خانه‌ای محدود، نماینده زنی تنها و معترض، با تموج و تلاطم احساسات زنانه و مادرانه در قیام در برابر آداب و سنن معمول و معهود خانوادگی...!»

«و آینه نیمرخ دوم، آینه‌ای است در جهانی نامحدود، نماینده زنی همچنان با سریان و جریان تخیل و تفکری جهانی، در شعرهایی آزاد و با خط محتوایی که در عمق حرکت دارد...!»

من در اینجا قصد روانکاوی واژه ها و یا بررسی عناصر بسامدی اشعار فروغ را ندارم و تنها و تنها برآنم که در حد توان به مقایسه یکی از سروده های آن شاعر «لُر» بنام عروسک «کوکی» و شعر «یک صمیمی» از سروده های فارسی «سواره

ایلخانی زاده» (۱۳۱٦ـ ۱۳۵٤) شـاعر توانمنـد کُـرد، باعتبـار تفکـرات عمیـق فلـسفی، سیاسی و جامعه شناسی وی بپردازم.

شاعری که به سبب ذوق و سلیقه و استعداد فطری و خاستگاه اجتماعی، با سپری شدن بیش از دو دهه از کوچ نابهنگامش، باید هنوز وی را در کردستان یکی از چهره های درخشان شعر امروز کُردی پنداشت.

گرچه آفتاب شعر نو کُردی نه چندان دیرتر از شعر فارسی طلوع کرده بـود، امـا این روند تنها زمانی تعالی یافت که سواره و همقطارانش بـا بهـره گیـری از انقـلاب شعر فارسـی و تلفیق آن با ادبیات کُردی در راستای تجددگرایی پا به عرصـه وجـود نهادند و بر آن بودند که جریانی اصیل، پویا و بالنده پدید آورند، ولی با کمال تأسف این روند دیری نپایید و می‌توان گفت با مرگ سواره در کردستان ایران سیر نزولـی پیمود و هنوز هم بدان جایگاه رفیع دوران طلایـی گذشـته خـویش صـعود نکـرده و اکنون به واسطه یک رشته از مسائل مهـم در حیطـه ادبیـات و نـوع نگـرش سـطحی مدّعیان شعر، همچو شعر فارسی در حال گذر از یک بحران است!

خواننده عزیز!

این پیش‌درآمد تنها زمینه آشنایی مختصری بود جهت برخورد منطقی یا دیـدگاه های فردی و غیرکلاسیک در این برآورد.

شکی نیست که سواره نیز همانند «فروغ» دارای دو نیمرخ کاملاً متفاوت و متمایز است. او در نیمرخ اول جوانی است پرشور، حساس و دنباله رو و تحت تأثیر اشعار کلاسیک کُردی با دیدی محدود...!

در نیمرخ دوم، او انسانی است با بینشی عمیق، آزاد اندیش و متأثر از جریانات و تحولات خاص سیاسی جهان، ایران و کردستان. این انقلاب درونی در بافت کارهای این دوره یعنی اشعاری که از سال ۱۳٤۱ به بعد سروده، به خوبی نمایان است.

آشنایی سواره با دیدگاهها و اشعار نغز پدر شعر نو کُردی «گـوران» و تحـولات شعر کلاسیک فارسی که توسط «نیما» پایه ریـزی و از سـوی «شـاملو»، «اخـوان»، «فروغ» و دیگران دنبال شده بود، او را در دنیایی تازه و پر از اعجاب و اعجاز قـرار داد.

«گوران» با گام نهادن در راه یک نوع نوگرایی ویژه که می‌توان آنرا اساساً گونه ای «بازگشت به خویشتن» دانست، با درآویختن به دامن شعر هجایی و به کنار گذاردن اوزان عروضی و همچنین ایجاد فضایی کاملاً ملموس در اشعار شاملو از تصاویر و تعابیر تازه می‌توانست برای سواره «کُرد» یگانه سرمشق و راهنما باشد...، اما از سوی دیگر «نیما» و پیروانش نیز در تأثیرگذاری بر ساختار، تعابیر و تصاویر اشعار سواره نقش بسزایی داشتند، خصوصاً که دانش آموختن وی به زبان فارسی بود! سواره با اینکه نسبت به تحول شعر در کردستان عراق کاملاً آگاه بود و نیک می‌دانست که وزن هجایی یکی از بارزترین خصیصه های داستانهای منظوم فولکلوری کُردی است و حتی در چندین مقاله تحلیلی در خصوص ادبیات کُردی وقوف خویش را بر لزوم رهایی از وزن عروضی اظهار می‌دارد و ضرورت بازگشت به آن وزن اصیل را امری طبیعی، منطقی و اجتناب‌ناپذیر می‌داند، اما باز در این راه گام برنداشت و سرودن شعر در قالب «عروض نیمایی» را نتوانست رها کند.

***

چنانکه قبلاً اشاره شد «فروغ» با انتشار مجموعه «تولدی دیگر» که شامل سروده های سالهای ۱۳۳۹ تا ۱۳۴۲ می‌باشد و شعر «عروسک‌کوکی» نیز در آن به چاپ رسیده است، دریچه ای به سوی جهانی دیگر گشود و به جانب جاودانگی گام برداشت.

«عروسک کوکی» که با کلامی آمیخته به طنز سروده شده و یکی از شاخص ترین اشعار مجموعه مزبور است، با تعابیر ملموس و شاعرانه، بیانگر دیدگاه انسانی ملتهب، ناراضی و عاصی است. فروغ در این شعر با تکرار فعل «می‌توان» که ذهن خواننده را هرچه بیشتر به جانب خویش معطوف می‌دارد، با بیانی شیوا، انسان را به وادی «توانستن» دعوت می‌نماید. «توانستنی که بیشتر نمایانگر حرکت غریزی خواسته‌های آدمی و در جهت نمایاندن مظاهر مادی و حسی زندگی پیش می‌رود و در انتها به سوی بازگشایی دریچه های معنوی در حرکت است...

او زندگی را با غم خاموشی می آغازد و با نگاههای خیره و بدون هدف مشخص گام برمی‌دارد و در کنار پنجره ای باز می ایستد، اما بسان کوران و کران.

دوباره در این طریق، پرخاشگر و خشمگین و آزرده فریاد کاذب بودن «دوست داشتن»های آنی را سر می‌دهد و آلودن دامن عفیف عشق را در یک هم‌آغوشی گذرا، یک نوع حرکت چندش آور می‌پندارد. نفسهای هوس انگیز و تنهای پژمرده در این گونه فضاهای ممکن و متعفن برای او کاملاً آشنا هستند. گوش فرا دادن به این نوع اکاذیب حیله گرانه در نظرش نوعی پستی بشمار می‌آیند...

و آیا این طنین همان صدای کاذبی نیست که فروغ را با اینهمه درک و فهم به زندان تاریک تنهایی و پوسیدن در پیله بیهودگی سوق می دهد و او را به نوشتن غمنامه اعمال و افعال خویش و بیگانگان وا می‌دارد؟

فروغ می‌داند که رخنه ها و شکافهای موجود در زندگی محصور را می‌توان با صورتکها و نقشهای رنگین پوچ پوشانید و خود را بیخبر از درزهای واقعی نشان داد، اما آیا این «خودفریبی» می‌تواند رضایت خاطر وی را جلب نماید؟!

او آگاه است که می‌تواند همانند یک عروسک کوکی بدون درک و فهم و احساس سر از هر ناکجاآبادی درآورد، اما آیا این «بودن» این «فریاد خوشبختی» زهرخندی نیست بر تار و پود این بازیهای تکراری و چندش آور؟! چرا، به نظر من این همان «بودنی» است که تعدادی از هنرمندان ما را بارها و بارها و بارها دچار تزلزلات فکری کرده و به جانب تردید و سردرگمی سوق داده است...!

شعر «عروسک کوکی» عصیان است علیه جبری تصنعی که روح و روان جامعه را درنوردیده و همین امر است که «سواره» را بر آن داشته که به «استقبال»، «تکمیل» و یا «تفسیر» آن ببردازد.

گرچه جای هیچگونه بحث و گمانی نیست که فکر اولیه توسط فروغ ابراز و انتشار یافته و حتی انعکاس برخی از تصاویر وی در شعر «یک صمیمی» کاملاً مشهود است، اما به جرأت می‌توان گفت که چگونگی پرداخت و تعابیر و نتیجه‌گیری «سواره» چنان رساست که یک قدم پا فراتر نهاده، یعنی می‌توان گفت «سواره» در

برخی از تصاویر به تفسیر و تکمیل تفکرات فروغ پرداخته و دیوار بلند این زندان ملال آور را درهم ریخته و مخاطب را آسوده تر با مسئله «بودن» آشنا ساخته است.

«فروغ» برای القاء پیام خویش چندان سر در پی کلام کاملاً ادبی ننهاده و بسیار ساده و بی پیرایه سخن می‌راند، گو اینکه در محفلی قصه می‌گوید، در حالی که سواره به دنبال تصاویر کاملاً بدیع و شاعرانه مرکب می‌راند و چابک سواری است آشنا در سرزمین «بودن».

# کوا شەنگەسوار؟

سەلاحەددین عەرەبی (ئاشتی)

**کوا شەنگەسوار؟**
**کە درەوشانەوەی پەڕی سەری ئەسپی**
**چاوێک بخاتە بیری تلووعێ!**

بەرەبەیانێک، مرۆڤێکی ڕووناکبیر، لە پەنا پەسارێک بە تەنیایی دانیشتووە و بیر دەکاتەوە. خەیاڵی زەمانێک هەڵیدەگرێ کە ئادەمیزادێ شاباڵی باڵندان شەلاڵی کانیاوی هەتاو دەکا و مزگێنی ئەنگووتنی بەیانی پێیە!

بە بۆچوونی شاعیر، ئەو ئینسانە، ڕەمزی بزووتنەوەیەکە کە دەتوانێ لە زەمانێکی ئەنگوستەچاودا، تیشک و سۆمایی بێ بۆ نیگای باوەڕێکی پیرۆز.

ئەندێشەیەکی ڕوون و ئەسرەوتوو، بۆ دەربڕینی هەستی پاک و بەسۆز، دەسەوداوێنی مێژوو دەبێ و بە کووچە و کۆلان و شەقامی هەزار بە هەزاریدا دێتە خوار و شوێنی سەمبولی جوولانەوە و پێشکەوت ـ کە شۆڕەسوارێکی بە دەمارە ـ هەڵدەگرێ!

لێرەدا باس باسی ئاسۆ و دەروویەکی ڕوونە لە تاریکستانی ژیانی گەلێکی کۆن و چەوساوە و دواکەوتوودا. وا دیارە نەبوون یا دیار نەبوونی ئالاهەڵگری کاروان، کۆست و قۆرتێکی گەورەیە، بۆیە شاعیر وا گەرم و پەژار دەلالێتەوە و لە قوولایی بیریدا بە شوێنیا دەگەڕێ: دەگەڕێ بەڵکو داشدار وەدۆزێتەوە! بەلام هەزار مخابن، لە مەیدانی ژیاندا سۆراغی ناکا!

شەپۆل و لەرەی دەنگی دوورە متمانە و هەور و هەلای ڕووحی دانەسەکنیوی شاعیر، لە دەماری کەلامی گەڕاوە و زەین لە ڕێوە وەری دەگرێ و تویژێک تۆڕی نیگەرانی بە سەر دەکشێ! بەلام با دیسانیش هەست ڕاگرین و بزانین ئەو شیعرە بۆ ڕسکاوە!؟ تۆزێک بەرەو دوا دەبینەوە!

**ـ کوا "شەنگەسوار"؟**

کامە سوار؟ شەنگەسوار کێیە؟ داخوا هەر خەیاڵ و زیندەخەوێکە باسی دەکرێ، یا نا، مەبەست تەواو خۆیایە و ڕاستەوخۆ باسی قارەمانێکی ناسیاوە و هاتووە و تیژ تێپەڕیوە و داخی لە سەر دڵی شاعیر داناوە! وا دەردەکەوێ قەدەرحەیامێک بە سەر کۆچی سووری سوارا

گوزەراوە و ئێستا هونەروەر کونەبرینی کولاونەوە و تاسەی دەکا!
باسی پەیامی تاقانەکەی - کە ترووسکە و رووناکییە - بۆ کۆمەڵ دەکا. کۆمەڵێکی کە خۆی رێگای تێداچوون لەوی تەخت کرد! بۆیە ئەوین و دڵەڕاوکەیەکی نەهێنی کە سەرەتای شیعرەکەی پێداگیرساوە، دەگۆڕێ و دەتەقێتەوە و دەبێتە ڕق و تووڕەیی:

**- ئەی سەرزەوی پڕپووچ**
**ئەی هەر هەناسەیەک نەفەسی دواییت!**
**تەرمێ ئەچێ!**
**ژنێ ژانی منالی پێیا دێ!**
**ئاخۆ هەموو ئەمە بوو ئەمبیست؟!**
**دامێنی ژینی ئادەمیزاد**
**هەڵناتەکێ لە منال**
**لە ژیانی کرچوکاڵ!**

وڵات یەکسەر مژوتەمە، ژیان هەڵدێر و ئەستەمە! مرۆڤ هەتا ملان بە زەلکاوی نەزانیو نەفامیدا رۆچووە و خەریکە تێدا دەچێ و سووری ون دەبێ! کۆمەڵ بە دەستی خۆی هەڵکەوتەیەک دە ناخی رۆدەکا و مچوڕکیشی پێدا نایە!!
رۆشنبیرێک لەنێو ئەو جەغزەدا دەسوورێتەوە، دڵتەنگ و ئاگادارە و ناتوانێ بێدەنگ بێ.
چاوسووری چوو. چ بکا؟ روو دە چی کا غەیری فەلسەفەی بوون و نەبوون؟! بۆ ئەوەی دیق نەکا دەبێ بە جۆرێک دڵنەوایی بکا. ددان بە جەرگی دادەگرێ و ئارامییەک بە سەری دەکشێ. پشوویەک نوێ دەکاتەوە و ئەهوەن دەبێتەوە و دەڵێ: - کاتێک مەرگ هەیە و بەرچاومانەوە تەرمی خۆشەویستێک دەبەن، بزانن ژیانیش هەیە و وەجاخ هەروا بە هاسانی کوێر نابێتەوە. ئەوەتا، "ژنێ ژانی منالی پێیا دێ"! ژان ژانی گەلە و ژیان لە شوێنێکی دیکەوە دەست پێدەکاتەوە و نابڕێتەوە: بەلام ژیانێکی "کرچوکاڵ"، هەبوونێکی نوێ و ساوا، کە پێویستی بە زەمان و کامڵبوون هەیە.
شەنگەسوار لە تەنگەژەی قۆناخی تاریک و نووتەکدا بووژەڵە بووە و لە کڵ هاتۆتە دەر! لە خۆوە سەری هەڵنەداوە و هەروا "لە پڕێ، نەبووە بە کوڕێ"!
شاعیر راز و نیاز دەکا و برەتینێک لە دەروونی گەڕاوە. بە خەیاڵی روانی داری هیواوە کەیفخۆشە، ئەمما هێندە ناپا و لە پڕ دەنگێک وەخۆی دێنێتەوە.

**- دیتم کە پرمە دێ!**
**من گەرمی بیر و هەوا بووم!**
**پرمەی کەحێلی سواری مەریوانە؟!**
**بێچارە خۆم!**
**پرمەی گرینی کەلجی عەشیرەت بوو!**

هەر بە خـەیاڵی ئارەزووی زێڕینـەوە ڕادەپەڕێ، ئـۆخـژنـێک بـە نـاخـیـدا ڕادەبرێ و ئوسـتوورەی ئازایەتی و پیـاوچاکی - کـە دوانزە سوارەی "مـەریوان"ن - دێنە یادی! های لەو خـۆشـیـیـە، وەی لەم بەخـتـەوەرییـە! وا دیارە هەلی دەرباز بوون لە زیندانی مـحـالاتـیش هەڵدەکەوێ!

تۆزێک ڕادەمێنێ، باشتر هەست ڕادەگرێ، هەمـوو ئەندامی دەبن بە گوێ! کـەچی هەی داد، هەی بێداد، خۆ ئەو دەنگە، پرمەی شین و شەپۆڕی جەماوەر بوو! ئەو کەسانەی قەراری ئەوتۆیان نەکردبوو...!؟ گریان بۆچی و بۆ کێ؟؟

وا دیارە ئەم چەرخ و خـولە دژ بە ویـست و داخـوازی شـاعـیـر هەڵدەسووڕێ بۆیە هاوار دەکا:

**- ئەی سەردەمی هەموو بەر ئاوەژوو!**
**داخێ، مەغابنێ، خەفەتێ**
**بۆ چاوی شینی تازەبەهار**
**کوا شەنگەسوار؟**
**وا کەوتە بەر تەڵەزمی سماتەی غار**
**ئاسمان ئەوەندە خۆڵەمێ**
**قاز و قورینگ تەپوتۆزاوین!**
**چەخماخەدانی هەوری ئەزۆک**
**ئەستێ و بەرد و پووشوون**
**بە دەستی پیری لەرزۆک!**

هۆنەر دەسـتـی بەرداونەوە: لەو شین و ڕۆیەدا وا دەردەکـەوێ ئەدیو بوو و ئەمـانی شەنگەسوار ڕاستەقینەیەکی ژەهراوییە!

سواری چاوئاسمانی لە ئەشکەوتێدا کەوتۆتە بەر فرکەفرکی پریشکەی شاڵاوی غەیان و ڕووحی بەرزی سپاردووە و هەڕەتی لاوی نەبواردووە! بە دیتنی ئەو کارەساتە ناکاوە، ئاسمان لێڵ و داگیراوە و پۆل پۆلی باڵندەی سەربەخۆ و کۆچەریش، تۆزی خەفەتیان لە سەر نیشتووە!

لەم قۆناخەدا شەڕی چاکە و خراپە ململانێی نوور و تاریکی دوایی پێهاتووە و بە لای ناخۆشدا شکاوەتەوە.

بەداخەوە سوار ئەو سەفەرە گەورە و گرانەی پێوە نەهات. بریسکەیەک بوو ڕابرد و هەلومەرجی چەسپیوی پێ ئەو بارەوبار نەکرا! گەردوونی چەپگەرد بە ویستی نەگەڕا و تلی پێدا. هەولێدا، بەڵام ئاگری بۆ هەڵنەگیرسا، هەروەک پیرەپیاوێکی کەنەفت و کڵۆڵ کە بیهەوێ لەوپەڕی بێدەسەڵاتیدا شان وەبەر کارێکی قورس و ئەستەم بدا و بۆی نەکرێ! ئەو نوکتەیە ناڵەی هەناسەساردییە لە گەمارۆی چارەنووسێکی شەم و بەسەرهاتێکی تاڵ و توندا. قسە لە تێکچوون و خاپووربوونی پەنامەکی کۆشکی ئاواتە!

**- رووخان بەداخەوە بێفرمە**

**رووخان کۆشکی لە پۆڵا**

**دیواری چین و پەیکەرەی بولهەول!**

ئەو ڕووداوە تووش و دزێوە، کە بێ دەنگدانەوە و ڕەنگدانەوەیەکی ئەوتۆیە، بۆ شاعیر ئەوەندە دڵتەزێنە، لە گوێن جمین و ڕووخانی دیواری گەورەی چین و پەیکەرەی هەزاران ساڵەی ئەبوولهەول وایە. ئەو شوێنەوارانەی کە مەزهەری هێز و ژیاری و پاراستن و لێرەدا سفەتەکانیان دەچێتەوە سەر شەنگەسوار، ئەو سفەتانەی نیشانەی نرخ و بایەخی بەرزی چووکەڵەسوارێکی جوانەمەرگن و هەڵدەگرێ کۆتەڵی بۆ برازێتەوە و جۆگەلەی فرمێسکی لەدوا هەڵبەسترێ!

**- ئاخۆ فرمێسکی ڕوونی دواباوەڕ**

**بۆ مەرگی زرێ برێژم**

**یا ڕووباری چووکی بەفیڕۆچوو!؟**

وەکو ڕوونە شەنگەسوار دەبێ تازەترین فکری دەوران بووبێ کە هەنگاوی بەرەو شاری دەریا نابێ، بەڵام هەنگاوێکی کەموکورت و خەماوی. بیری شاعیر بۆ پچڕانەوە و ماڵاوایی یەکجارەکی ئامادەیە و ئاڵەدۆزەی پاشەکشەیەتی و باوەڕیشی تەواو کز دەنوێنێ! ئەو کەسەی بە بیستنی پرمەی شیوەنی کورە کوڕانی هۆز بە خۆیدا دەشکاوە، هاتۆتە سەر گریان! باشە بۆ کامیان بگری؟ بۆ زرێ یا ڕووبار؟ تەمێک بە سەر چاوی دەکشێ و ئاسۆی لێ تاریک دەبێ.

تۆ بڵێی ئەگەر ڕووبار نەبێ، زرێ نەبنە دەشتێکی ویشک و قاقڕ و شەپۆل نەچنەوە ڕیزی ئەفسانان؟!

هاوارە! هاوارە لە من و لە دەریا و ڕووبار! هاوارە لە چۆماوێکی کە نەیتوانی شوێنێکی بەرچاو لە خۆی جێ بێڵێ و هەڵچۆڕا!

ئەو وتەیە پتر لە دڕدۆنگی دەکا، هەتا شین گێڕی! تامی زاری شاعیر گۆڕاوە و بە نووسینی واتەی "بەفیڕۆچوو"ن، جووڵانەوەکەی دەباتە ژێر پرسیار و دوودڵی پێوە دیارە!

وە پێوشوێنی شەنگەسوار کەوتن و نەوەستان زۆری پێ دەوێ. شاعیر ترسی وەبەر نیشتووە و قەڵای ئومێدی ڕووخاوە: بەتایبەت کە چاویشی بە "خێڵی درۆ" دەکەوێ کە وا خەریکی پاساو هێنانەوەن لە سەر درێژە نەدانی ڕێگای پڕ ڕەمز و ڕاز! سەرکۆنە دەکا! بەڵام ئەو هەڵوێستە دەپێش هەموو کەسدا، پێی خۆی دەگرێتەوە، با بڕوانین،

**ـ ئەمڕۆ هەر شەویلکە لە کارایە**

**دەس پیرەڵۆکی ئارەقی بەرێشتێن**

**دڵ هەمانەی کولوانە**

**سەر گرکەتاڵە**

**دەمار بێ خوێن.**

لە ڕوانگەی هۆنەرەوە قسەی زل و فەلسەفە تەنینی بێ هۆ، بێ هوودەیە. بە بیستنی وتەی بێکردەوە قێزی دەبێتەوە!؟

دڵی ئادەمیزادی ورەبەرداو بە هەمبانەی حیزی دەشوبهێنێ، کە هەتا تێی بکەی هەر دەبیا و سنووری بۆ نییە. خوێریگەری بە سووک دەژمێرێ و لە دوو چوونی بە نەفامی دادەنێ!

لای وایە ئەو کەسانەی ئاوا کەوتوونە گێژاوی قەیرانەوە، مێشکیان کاڵە و تۆوی تاڵ و پووچی تێدایە. ڕەگی غیرەتیان نابزوێ و دەمار نەماوە و "خوێن بووە بە ئاو".

# پاش پێشەکی

سەلاحەددین عەرەبی (ئاشتی)

من ئەڵێم
هەتا هەتایە دەوری جوانییە.
ئەمڕۆ گەر هەتاو کەسیرەیە. نەماوە ئاگر و گڕی.
مێرگی ئاسمان بە سووتمانی هەوری لۆکەیی نەزۆک.
پڕ لە خاڵ و قۆپەنە!
جەنگەڵێ کە جێژوانی پۆلە پۆری بارییە.
جێگەمۆڵی کەمتیار و گورگ و ڕێوییە!
شۆڕەبی کە بۆتە داری چاکی بێ نەشە و شنە،
زەلکە گەر تەیاری تیر و قۆشەنە،
خۆشەویستەکەم!
لە پەنجەرەی نیوەتاکی بوومەلێڵەوە
چاوی من لە دیمەنی کچی بەیانییە!
لە حەنجەرەی زەمانەوە
گوێم لە زەمزەمەی زوڵاڵی خیزە وردەکانی کانییە!

هیوایەک پەری ئاسا باڵ دەنگێوێ و لە مەڵبەندی ویشک و قاقڕی ناهومێدییا دەنیشێ و بە خوناوکەی نارەناری بەهاری ئاوپڕشکێنی گوڵی ژاکاوی ژیان دەکا.

گوێ بە بیستنی ئەو زمزمە زوڵاڵ و نوێیە دەلاوێتەوە و ڕووح بە لێکدانەوە و تەعبیری شەپۆلی ئەو مووسیقایە بەرەو سەما دەچێ و درەوشانەوەی لە ئەستێران تێدەپەڕێ...

ئەوە تەوەری سەرەکی بیری باریکی شاعیر و نووسەری هەڵکەوتەی سەردەم، کاک سوارەیە.

وتەی کاکەسوار بۆ من هەمیشە چەشنی ڕەهۆڵێک وایە کە لە زیندانی بێ ڕۆچنی خەمی هەبوون و دەردی نەبووندا بەرەو سنووری نوور و بوون دەکشێ. هەر بەڕاستی ئەوەندەم شەو و ڕۆژ پێ تێکخستوونەوە، لێم بوونە بیرەوەری ئەمری ژیانم و سەربەندی گشتی وتەکانم.

دڵ کامە هاواری پێخۆشە کاک سوارە لەوێ ڕەشماڵی خۆی هەڵدەدا و بە زمانی شیرن و پاراو میوانداری دەکا و نەقڵ و نەزیلەی دنیای کۆنە و نوێ دەگێڕێتەوە. لێرەدا بەرامەی

سەرخۆبوونی مرۆڤ تۆمار بە تۆمار وڵات دەتەنێتەوە و ترووسکەی بیری ئازاد خۆ دەردەخا و بەرگێڕەوەی بۆ نییە.

ئەسری کوردی خەریکە کەسایەتی پەیدا دەکا و کەوتۆتە سەر ڕاستەڕێیان. ئەم کتێبە، درێژەی ئەو قۆناخە شکۆدارەیە و بە دەستی هەڵکەوتەیەک لە بەرەی مامۆستایان: هەژار، هێمن، قزڵجی، زەبیحی و شوکور مستەفا بەهێزتر دەکرێ. بە لای منەوە بڕینی ئەو ڕێگایە لە لایەن کاک سوارەوە کارێکی یەگجار گرینگ و بەرچاوە، بۆ؟ چونکە چاپ و بلاوکرانەوەی چاپەمەنی بە زمانی کوردی لە ئێراندا بە دەگمەن بوو: تەوەی بە وردی و بە پارێزەوە کاری لە سەر دەکرا و تینوگوڕێکی وەبەر هەناوی ئەدەب دەنا ، زیاتر دەسنووس و تاق تاقە کتێبی دەستاودەست گەڕاوی سنوور پەڕاندووی گەرمێن بوون و هیچی دیکە، بەڵام تێکەڵاوی نزیکی کاک سوارە لەگەڵ کۆڕ و کۆمەڵی ڕۆشنبیری کورد و پلەی بنەماڵەیی لەو بارودۆخەدا توانیویانە باڵی بە سەر بکێشن و هەلی بۆ بڕەخسێنن. جا بۆ درێژەی مەنتیقی باسەکە پێویستە لێرەدا ئیشارە بۆ ڕووداوێکی زۆر گرینگ لە مێژووی ئێرانا بکرێ کە بە "شۆڕشی سپی" ناودێر کراوە. ئەم پێشهاتە کە دەگەڕێتەوە سەر گەلاڵە و زەختی لاوەکی، ڕیفۆرمێک بوو لە کۆمەڵی داخراو و نیمچە دەرەبەگی وڵاتا و بە بڕوای زۆربەی پسپۆڕان لە پێشکەوتی کۆمەڵا دەورێکی مەزنی بینیوە.

هەڵبەت هەر لەوەی ئەو ئاڵوگۆڕە بە شێوەی ئاشکرا بێتە ئاراوە، لە ژێرەوە جێگا و ڕێگای بۆ خۆش دەکرا. بۆ وێنە لە ساڵی "١٣٣٨"ی هەتاویدا مانگنامەی "کوردستان" بە زمانی کوردی لە تاران هاتە چاپ کران و سوارەش یەکێک بوو لە هاوکارانی، کە بەداخەوە تەنیا چەند ساڵی تەمەن کرد.

هەر لەو سەروبەندەدا بەشی کوردی ڕادیۆ کرمانشان کرایەوە و بوو بە درێژەی بە ڕەسمی نووسین و خوێندنەوەی کوردی: هەڵبەت تەنیا لەم چوارچێوەیەدا. زۆربەی نووسەران و هاوکارانی مانگنامەی "کوردستان" بوونە کارگێڕ و هاوکاری ڕادیۆ کرماشان.

بە کورتی مەودای ساڵانی چلی هەتاوی کە سوارە تووشی زیندان و بگرتن هات و دوای ماوەیەک ئازاد کرا، هەر دەسبەرداری کاری ئەدەبی نەبوو: تا ئەو جێیەی کە توانی شوێنەواری بەنرخی «تاپۆ و بوومەلێڵ» بخولقێنێ و لە ڕادیۆوە بلاوی کاتەوە...

حەقیقەت ئەوەیە چونکە تاپۆ و بوومەلێڵ تەنیا باسێک و دوو باس نییە و پتر لە شێست بەرنامەی سەربەخۆیە و لە چەند ساڵاندا نووسراوە، ڕادەربڕین و لێکدانەوەی ورد گەلێک ئەستەم دەکا و لکی زۆر لێ دەبنەوە و بێتوو بکەوینە ئەو لێڕەوارە چڕە، دەرکەوتنمان ئەوەندە ئەخایەنێ کە وەڕەزی لە دوو دەبێ و لە پێشا باسی تەودەرەی سەرەکی هەڵوێستی

نووسەر کرا و بە هەڵەی دەزانم شەقڵی بیرم بخەمە سەر دەقی بۆچوون و ڕوانگەی سوارە و ئۆگران.

ئادەمیزاد بوونەوەرێکی ڕەمزاوییە، جاری وایە دڵی خۆشە، خۆشی بۆ دێ و ڕوون دەبینێ، لە بازنەی شادیدا هەڵدەسووڕێ، هەستی دەبزوێ و بە ژیانەوە دەخافڵێ: هەلی وایە خەمناکە، هەموو شتێک لەبەر چاوی تەمگرتوویە و قاپۆڕی ژیان بە زیندان دەشوبهێنێ: ئینجەل لە مابەینی هەرکیاندایە، لە تەنەکەبیران لا دەدا و قووڵ دەبێتەوە، بۆیە لە چیرۆکی "شەڕگە"دا بە لێکدانەوەیەکی عالمانە، شەڕ وەلا دەنێ و دەسکەگوڵی ئاشتی و پێکهاتن دەکاتە دیاری: پێکهاتنێک لە سەر بناغەی مرۆڤایەتی و خۆشەویستیی ئادەمیزاد.

وەک ڕوونە گێڕانەوەی نێوەرۆکی زۆربەی چیرۆکەکان لە زمان یەکەم کەسی تاکەوەیە و دەتوانم بڵێم خوێنەر زۆر چاک بەدوای خۆیدا دەکێشێ. فۆڕمی چیرۆک، تەنز، پەخشان، لێکدانەوە و ناساندنی کەسایەتییەکان برێ لە قەڵافەتی ئەدەبی فارسی نیزیکن، بەڵام جیاوازییان زۆرە. بەرچاوترین جیاوازیی سوارە لەگەڵ ئەدیبانی سەردەمی خۆی ئەوەیە کە سەرەڕای زاڵبوون بە سەر فەرهەنگی ڕەسەن و زمانی فۆلکلۆر و زگماکیدا، بە بوونی چێشکەیەکی (زەق) سەربەخۆ و هەڵکەوتە، نووسراوەکانیشی وەکو شیعرەکانی پڕن لە وێنەی جوان و خەیاڵ ورووژێن و وردەکاری زیرەکانە و کەمتر وایە نێوەرۆکی نووسراوەکانی گرێ نەدرابن بە مەبەستێکی گرینگی بەرزی گەلی بێدەرەتان. کاکە سوار ئەوینداڕێکی لەجۆشە و هەموو شتێک لە جوانی و خۆشەویستییا دەبینێ . یانی مەلی جوانیی پەرەستی ڕووحی لەوپەڕی ناڕەحەتی و کڵۆڵیشدا، سەرەڕای بڕوا بە ئەوینی ئاسمانی، هێشتا نەیتوانیوە خۆی لە دوای ئەوینی زەوینی تیژتێپەڕ ڕزگار کا و هەتا جێیەک چۆتە پێش کە لۆمەی کراوە!؟

بە ڕای من سەرجەمی بابەتەکانی ئەو کتێبە دەتوانێ گەلێک قوژبنی تاریک و ونی ڕووحی ئەوسای کۆمەڵی کوردەواری، بەتایبەت توێژی ڕووناکبیر و خوێندەوار و چۆنییەتی هەڵوێست و ویستی بەرەنگاری و ملکەچی وەدەر بخا. واتە مەودایەک کە لە نێوان نووسەرانی ئاوارەی کوردستانی ڕۆژهەڵات و هەڵسوکەوت و هەڵوێستی خەڵکا بەدی دەکرا، بە بڵاوبوونەوەی ئەو کتێبە چاکتر دەردەکەوێ و مەیدانی بۆ لێدوان و شیکردنەوە فرەوانتر دەبێتەوە.

# سواره و دوو جار مەرگ

**عومەر ئیلخانی**

هەیاران ئەی دڵی غافڵ کەس نییە لە من بپرسێ ئەرێ بۆ دەبێ سوارە دووجار شەربەتی مەرگ بچێژێ؟ تاوەکو وەڵامی بدەمەوە بۆ کڵۆڵی و سەرلێشێواوی من. ئەرێ ئەو دوو کۆچە بێ وادەیە بۆ هەر لە زستانێکی سارد و بەفراویدا بوون؟ بۆ ئەوەی ملۆزمی چارەڕەشی بلێت بزانە من چەند بە توانا و بێ بەزەییم لەم سەرما وسۆڵەدا جەرگت هەڵدەقرچێنم و داغی پێوە دەنێم.

"هاوار بۆ خەڵکی بێ هاوار". منم کە هاوار و دەنگ لە گەروومدا قەتیس ماوە.

سوارە لە تەمەنی ژێری چڵ ساڵەوە لە زستانی ڕەشی ساڵی هەزار و سێسەدو پەنجاو چوار زۆر بە پەلە و بێ ماڵئاوایی بەجێی هێشتین تەرمی پیرۆزیان لە گوندی "حەمامیان" ئەسپەردەی خاک کرد. سوارە جارێکی تر هەر لە ژێر تەمەنی چڵ ساڵەوە هەر لە زستانی تووش و بێ فەڕدا لە سابلاغ بوو بە میوانی دوو خانەخوێی دڵوا و بە خولق. دوو گەورە پیاوی بلیمەتی کورد و لە لایەن هێمن و هەژار بەخێرهاتن کرا.

"وەرن وەرن شەوە گرتوومی بمگەنێ هاوار" کێ بە هاوارمەوە دێ کێ بێ و بڵێ ئەرێ ئەوە تۆ شێت بووی، دەلی بووی؟ چۆن کەسێک دوو جار ئەمرێ؟ تا جوابی بدەمەوە کاکە گیان تازە هاتبوو کەمە کەمە هەوەڵ کەڕەتی مەرگی سوارە لە بیر بەرمەوە، کەڕەتی دووهەم دڵتەزێنتر، گورچووبڕتر هەر نەیگوت خواحافیز و ڕۆیی و نەگەڕاوە. ئەرێ بۆم نییە سەودایی بم "خەساری بێ گەڕانەوە" کە شاعیر باسی دەکا ئەمەیە "ئەوانەی کە چوون کوا گەڕانەوە" بەڕاستی وایە.

ئەم جارە "مانی"شی لەتەک خۆیا برد و نەیهێشت بگەڕێتەوە ئەو "مانی"یەی کە لەو زستانەدا تەرحی سوارەی وەک تابلۆیەکی ڕەنگاوڕەنگ کێشاو هاورێ دەگەڵ شیعرێکی بەرز ناردییە نێو بازاڕی ئەدیب و شاعیران.

بۆ کێ بگریم بۆ سوارەی ساڵی ٥٤؟ بۆ سوارەی ساڵی ٧٦؟ بۆ دەست و پەنجە ڕەنگینەکەی "مانی"؟ نا بۆ کۆریەی لێوبەهاری شیعر دەگریم. بۆ پەخشانی ساوای بێ ناز دەگریم کە وا لارەمل چاویان بڕیوەتە لاوانی وڵات.

بۆ دایکی زگ سووتاو و تاسەبار دەگریم کە بەو پەڕی لە خۆبوردوویی ماوەی دا لەشی ساردەوەبووی کوڕە جوانەکەی لە باوەشی گەرمی دەربێنن و لە شارێکی تر بینێژن. بۆ ئەو دایکە کڵۆڵە کە لەو شەنگە بالایە هەر ماچێک و ئۆخەیەکی بۆ مایەوە.

خۆم بەوە دڵداری دەدەمەوە و جوانەمەرگەکانیش دەلاوێنمەوە کە ڕۆژێک جێگاتان پڕ دەبێتەوە، بەلام دیسانەوەش دڵ هەر لە کوڵە و چاو هەر کەیلی سروشکە.

**بە بۆنەی بیست و حەوتەمین ساڵوەگەڕی**
**مەرگی شاسواری شیعری نوێی کوردی**

# کوا شەنگەسوار؟

**کــــە درەوشـــــانەوەی پەڕی ســــــەر ئەمســــــپی**
**چـاوێک بــخـــــــاتە بیــــــــری تـلووعێ!**

## شەنگەسوار

**مەنسوور حامیدی**

جـاروبـارە منیش وەک زۆرانی تر خـۆم فـریو دەدەم و نـایشـارمـەوە و دەڵێم سـوارە باش دەناسم! مـەگێن هەر ئەو سـواریە ناڵێن کە شیـعری "خـەوەبەردینە"ی گـوتووە. جـا نازانن چ شیعرێکە و ناشزانم چ شیعرێکە! ئاخر سەیر ترساندوویانـم، هەقمە وا بڵێم. گۆیا هەر تەنیا چەند کـەس ئیـزنیـان هەیە و دەتوانن و توانیـویانە مـانای لێدەنەوە. ئەوانیش ئەو خـزم و دۆستو برادەرانەی سوارەن کە ئەوان سەردەمان خۆی میوانی ماناکەی کردوون و "شاکلیل"ی خستۆتە گیرفانیان و دەڵێن بێتوو لەوان بترازێ، قسە لێکردنی هەڵەیە و ئامان! وەک ئەوەی سوارە هەر نەیزانیبێ تەئویل بە چ مانایەکە و پێی وا بووبێ تەفسیر و لێکدانەوە و نیشانە و ڕەمز و مەجاز تەنیا بە کەلکی نەقڵ و نەزیلەکانی مەلا نەسرەدین دێن... .

خودا هەڵناگرێ ئەو کەسانەی وا بە پارێز باسی کاک سوار دەکەن، زۆریش ناهەق نین، بە تایبـەت کـاتێ دەزانن سـوارە کـوڕی کـێیـە و کـەی لە دایک بووە و چلۆن ناچار بوو هەمـوو قـورسـایی لەشی بخـاتە سـەر لایەکی یا بە منداڵی چەندی مـەلە پێـخـۆش بووە و کـەی زەماوەندی کردووە و چەند کـەی تر ... دیارە خـۆ دەیناسن. چما ئێـمـە کەسـانی دەورووبەری خۆمـان چۆن دەناسین. دەی لە مـاڵەوە دەست پێدەکەین، براکەت دەناسم، وەکی ئەوەیە خۆتـم ناسیبێ! هەرچی نووسیوتە با نووسیبێتت، تۆ هەر ئەو کەسەی کە خاڵت دراوسێمانە. جا بەم چەشنەیە کە تا ئیمڕۆ سوارە ئەو جۆرەی شیـاوەتی نەناسراوە. ئێسـتـاش نەمـانتـوانیـوە ژیانی هونەری و ژیانی ئاسـایی هونەرمـەندێک لێک جیا کـەینەوە و لە دوو گۆشـەنیگای جیـاوازەوە بۆی بڕوانین. وێدەچێ لە ڕووبەڕوو بوون لەگـەڵ سـوارەدا زۆرتر مـەبەست خـۆ دەرخـستن و

خۆهەڵدانەوە بێ تا ناسینی سوارەی شاعیر و نووسەر و بەرهەمەکانی. لێرە هەڵدەگرێ گلەییەکی دۆستانە بێنینە ئاراوە. بەڕاستی ئێمە بۆچ کەمتر و بە دەگمەن پەی بە ڕادەی گەورەیی گەورەکانمان دەبەین؟ لە چی دەترسین؟ بۆچ پێمان خۆشە هەمیشە تەم ومژ بالایان بشارێتەوە؟ بڵێی لەبەر ئەوە نەبێ تا هەست بە بچووک بوونی خۆمان نەکەین؟ ئەی ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان هات و بای بەتەوژمی کوێستان، لابەرێ پەردە لەسەر بالامان و دەرکەوێ هەر دەکوژین دووراودوور،سەر لە کامە بەفر ڕۆ دەکەین تا کەس نەبینین؟! بەلام سەرەڕای ئەمە بە دڵنیایی دەڵێم سوارەش دەناسرێ، ئەمما نەک وەک کاک حوسێن، تووفرۆشەکەی جیرانمان کە دایم و دەرهەم هەر کاک حوسێنە و هەمیشەی خوداش هەر تووفرۆشە. بەڵێ سوارە دەناسرێ، بەلام کەسێک دەیناسێ کە مل بە بەرمووری وشەی ڕەنگاوڕەنگ نەبێ و دەست و پەنجەی کوشتەی هەوای بەریشتێن. کەسێک کە ئالبۆمی عەکسی یادگاری نەبێتو نەیەوێ لەگەڵ سوارەش وێنەیەک هەڵگرێ و ئالبۆمەکەی لیپاولیپ کا لە ناسنامەی هونەری. دیارە سوارە لەگەڵ هەرکەسێک وێنە هەڵناگرێ، بە تایبەتی ئەگەر ئەو کەسە لە تایفە و خێڵی درۆ بێ، هەر سەیر دەیانڕەتێنێ. چونکو زۆر بە باشی دەیناسێ و دەیانناسێنێ. لە بوون و هەناسەکێشانیشیان بەگومانە:

**ئێوە کێن؟**
**خێڵی درۆ**
**گەلی دەم پڕ لە هەرا**
**نیشتەجێی شاری بە گرمە و دووکەڵ**
**پێم بڵێن:**
**ئێوە چ کارەن؟**
**چ کەسن؟**

خۆزگە ئەوەندە ڕەپ و ڕاست مابایینەوە کە وێرابامان بڵێین: از بد حادثه اين جا به پناه آمده ايم. چونکو ئەم تۆزقاڵە ڕاستییەش دەیتوانی هەوەڵ هەنگاوی ئاگابوونەوە و وەخۆهاتنەوە با کە بەداخەوە نییە. ڕەنگە هەشبن بڵێن سوارە ڕووی شیعرەکەی لە ئێمە نەکردووە، ئەوەتا دەڵێ: ئێوە ئەی کرمی کتێب / یاری غاری هۆدە. کەس نەزانێ خوا عالمە لە ساڵدا تاقە کتێبێکیش لێک ناکەمەوە چونکو لەگەڵ میزاجم نایەتەوە. دە خەوم دەکا و دیسانیش هەروا پێ دادەگرێ لەسەر ناسینی سوارە. سوێند لەسەر سوێند و سێ تەلاقیش بە دوایدا کە کەس وەکی ئەو نەیتوانیوە سوارە بناسێ. لەوانەشە بۆ بەڵگە چەند پەڕ کاغەزی "پەناباد"ی کە بە جەوهەری سەوز چەند شیعرێکی بەستەزمانی سوارەی لێ نووسیبێ،

ئەوەیش پڕ هەڵەوپەڵە، بە سینگماندا بدا کە بابەڵێ ئێوە ئیتر لە کوێوە هاتوون؟ بەڵێ! چەند دوور ڕاوەستابێ، سوارە لە سەردەمێکدا هاتە گۆ کە گەلی کوردیش وەک زۆربەی گەلانی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست لە حاڵی توێژ هاویشتندا بوو. دنیا ئاڵوگۆڕێکی سەیری بەسەرا هاتبوو. شەپۆلێک هەستابوو کە هەرچی کۆن و کۆنەویست بوو ڕایدەماڵی. بیروباوەڕ و هونەرو سیاسەت و تەنانەت ڕووکاری ژیانیش گومانی لێ دەکرا. ئەم خەونە خۆشانەی کە لە کاتی خەویشدا بواری سەرهەڵدانیان نەبوو لە دڵندا دەگووران و چەکەرەیان دەکرد و سوارە و چەند دۆستی شاعیری تری دەبا دڵدارییان کردبا، هەڵبەت نە بە زمانێکی پواو و سواو، بەڵکو بە زمانێکی دیکە و ڕیزی پێشەوەی ئەم "پێشکەوت"ەیان بۆ ڕووناکبیران چۆڵ کردبوو و ڕووناکبیر هەر ئەو کەسە بوو کە دەبوو خاوەنی ئەو شتە بێ کە ناوی زمانێکی دیکە بوو کە بەداخەوە نەبوو، کە ئەگەر وا نەبوایە "چاوە" نەیدەگوت:

**کێ هەیە بێتە یارمەتیم؟**
**خۆ هەواڵەکەم وەنەوزی خستۆتە خەو**
**هەواڵەکەم، هەواڵەکەم**
**قوڕ بە ماڵەکەم**
**پرخە پرخی خەویەتی**
**ڕاتەکاندنێکی لازمە**

هەر ئەودەم ئێمە کەمتر شیعری سوارە دەبینین کە ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ، ئەو بە ڕواڵەت ڕووناکبیرانەی نەخستبێتە ژێر پلاری تەوس و توانج. دەبێ چەندیان وەڕەز کردبێ و چەندیشمان وەڕەز کردبێ کەوا دڕدۆنگ و بێ باوەڕە سەبارەت بە ئێمە:

**من دەڵێم:**
**پەپوولەیەک فڕی بە باڵی سەوز و سوورەوە**
**من دەڵێم:**
**گوڵێ بە دەم شنەی شەماڵەوە بزەی بزووت**
**تۆ دەڵێی:**
**چ بوو پەپوولەیەک فڕی؟**
**یانە سوورەگوڵ، زەردە کەوتە لێوی ناسکی؟**

با لێرەش نەڵێین کە مەبەستی سوارە لە پەپوولە و گوڵ چ بوو؟ خۆ لەمە پێشتریش نەیانزانی، ئەوانەی کە دەبوو بزانن چ بووا؟ بلێی زانیبێتمان چ قەوماوە و ئاگاداری ئەو جووڵانەوە و سەرهەڵدانانە بووبێن؟ ئەدی بۆ نەمانسەلماند و ئینکارمان کرد و گوتمان «چ

بوو پەپوولەیەک فڕی؟!» لە جیاتی چی باسی چیمان کرد؟ خەو و خەو و خەو و« ئاڵی زاڵی شەو»:

**باسی شەو مەکە، نە شایەری شەوم**

**باسی خەو مەکە لە لای هومێدی فێرە سەرڕەوم**

**پێم مەڵێ کە ئاڵی زاڵی شەو، چاوی بێخەوی چرە**

**پێم مەڵێ نەهاتنەوە ئەوەی کە چوون**

لەو سەردەمە ئەستەم و دژوارەدا یەکێکی وەک سوارە ئەرکێکی گەورە و گرانی لەسەر شان بوو، چونکە دەیزانی:

**لایەکی بیرم لای ئەو گەنجەیە**

**بە دەمی برین پێکەنی!**

**بە شوورەی وەک پۆڵای لەشی**

**ڕێگای چەکمەی سووری خوێن و**

**دەستی ڕەشی "بەعسی" تەنی!**

**لایەکی بیریشم لای تۆ**

**نا، ئەی هەنیەت وەک مانگەشەو**

**نا، دەریای مەندی چاوبەخەو!**

بە ڕاشکاوی دەتوانین بڵێین، شیعری سوارە، شیعری خۆڕاگری و ڕاوەستانە دژ بە ڕووخانو هەرەسهێنان. شیعری سوارە، شیعری هومێد و ئیمان و باوەڕە بە هەتاو و ڕووناکی و سەرکەوتن.

برووسکەئاسا دێ و لە شەوەزەنگی ترس و سام و شەکەتیدا ڕووناکی دەخاتە دڵ و خەو لە چاوان دەتارێنێ. هۆنراوەی سوارە ڕکەبەری ئەو کەسانەیە چاو دەقووچێنن بۆ ئەوەی هیچ نەبینن و ناچار نەبن بەرەو پێش بازوێن، بۆیە ئاوا دەنگ هەڵدەبڕێ:

**ئێستە وا گرمە لە کێوان بەرزە**

**مێش ئەخاتە لەشی گا، بوولەرزە**

**ئێوەن و ئێوەن و لۆکەی گوێتان**

**بەسیەتی، بەسیەتی**

**وا هات، وا چوو**

یان:

**ئەمڕۆ هەر شەویلکە لە کارایە**

**دەس پیرەڵۆکی ئارەقی بەرپشتێن**
**دڵ هەمانەی کولوانە**
**سەر گرگەتاڵە**
**دەمار بێ خوێن!**

یان:

**ئێوە کەی شێری جیهان**
**بەردەماوخۆری تولە و گورگی گەڕن**
**قاقرە گیانە هەوای بەرپشتێن**
**شۆرەکاتێکە کوژەی خەڵفی دەست**
**زەلکەیە کۆرەکەتان، ئێوە زەلن**
**هەر بە بایەک ئەگەرێن بێ دەربەست!**

شیعر بۆ یەکی وەک سوارە گەپ لێدان و پۆز و ئیفادەیەکی ڕووناکبیرانە نەبوو. شیعر شعوور و حزوورێکی حەستەمی کوردانە بوو لە زەمانێکی گەلێ تاڵ و تووندا. شێعر پەنجەرەیەک بوو کە لەوێ ڕا دەیتوانی بڕوانێتە هەموو جیهانی ژیانی گەلەکەی و لە جیاتی هەموو خەوبردووانی دەوروبەری هاوار بەرز کاتەوە. هاواری وەڕەزی لە دەست شارێکی کە تەنیایی سوارانی لە کارگاکانی خوێن و خەفەت و خۆڵەمێشدا دەکردە مەبەستێکی مێژوویی و خەفەتی هەراو و ئەوینی تەسکی دەکردە چارەنووسی شاعیرێک کە «لەشی بە دارەتەرمی کووچە تەنگەکانی شار ڕانەهاتووە» و فێر نەبووە «بەزین و دابەزین». بۆ ناسینی شیعری سوارە، دۆزینەوەی کلیلی دەرگای دنیای بیری تیژی، کە بە ڕەمز و ڕاز کلۆن کراوە، وەک پێویستییەک خۆ دەنوێنێ. سەردەمی ڕەش و تاریکی پاشایەتی، سوارە بەرەو ڕەمز و سەمبول پاڵ پێوە دەنێ و ئەویش وەک خاوەن کەلامێکی کارا دادەمێنێ و ڕوح وە بەر قەڵەمی دێنێ. بۆ وێنە "پەنجەرە" یەکێ لەم نەهێنی و نیشانە و ڕەمزانەیە کە سوارە دەیهەوێ لەوێ ڕا ڕووناکی پێشانی کۆمەڵگا بدا:

**لە پەنجەرەی نیوەتاکی بوومەلێڵەوە**
**چاوی من لە دیمەنی کچی بەیانییە**

***

**دەمێکی وا دادێ**
**بە هەرچی وا لە وزەی سەوزی پەنجەرەدا**

دڵی بە تاسەی من
خەریکە پێ ئەکەنێ.
* * *
ئەوژم و تین ئەگەڕا نوتفەدانی پەنجەرەکان
وە ماڵی بێ زگ وزا
پڕ ئەبوو لە تۆوی بەهارا
شنە هەمیشە وەکوو
ویردی زاری پەنجەرە بوو
ئەبوو بە سەربەندێ
لە قاپی سەوزی زەمەندا!

هەروەها کچ لە شیعرەکانی سوارەدا ڕەمزێکی جێی ڕامان و سەرنجە و کوولەکەی ڕۆحی ژیان و مانەوەیە:

شەپۆلی لەگوێن خوێنی شەرمی کچانە
لەسەر ڕوومەتی ماتی بووکی ڕەزاسووک
* * *
وەکوو نەرمە هەنگاوی لاوی بەرەو ژوان
لە جێ ژوانی زیندوو بە گیانی کچی جوان
* * *
ئەڵێی پێکەنینی کچی سەرگورشتەی قەدیمی
لە ئەندامی تاپۆی وەکوو بوومەلێڵی
ـ سنووری شەوی دوێنێ، ئەورۆ بەیانی ـ
پەچەی قورسی نیسانی ئینسانی لادا.
* * *
شەماڵی دەرەی دوورە شاری
پشووی پڕ لە عەتری بەهاری کچی کورد
* * *
وە عەتری زاری کچی پێوە
خاکی ماچوومی
* * *

**لە پەنجەرەی نیوەتاکی بوومەلێڵەوە**
**چاوی من لە دیمەنی کچی بەیانییە!**

* * *

**تۆ شۆڕەبی نێو شۆڕەکاتێکی گەرمی**
**لەبەر نیگای تاسەباری ئەویندارا**
**خۆداپۆشیو بە لک وپۆی**
**کەزیەی نەرمی**
**بەڵام ئەی کیژ**
**ئەی چاونەرم**
**ئەی خەنجەری تۆڵەی رق تیژ**

* * *

**بەڵام ئەمڕۆ من بەشێکی کوردستانم**
**کیژی سەد برا کوژراوی نیشتمانم**

لە ڕاستیدا سوارە هەر جۆرێک ڕێگای بڕیبێ، شوێنپێیەکی وای جێ هێشتووە کە ڕێبواری ڕاستەقینە هەتڵە نەبێ. هەرچەند شیعری سوارە لەو پەڕی ئیجازی خۆیدایە و هەوڵی داوە زمانی هۆنراوەی کوردی لە بەندی دووپاتبوونەوە و سوان و پوان ڕزگار کا و شیعرێتی زاتی ئەم زمانە دەربڕێ و بە ساز کردنی مووسیقی ژوورەوە و تەعبیری نوێ و ئاوردانەوەی بەجێ لە فۆلکلۆر، شیعرێکی چەند نوێ و چەند مانا بڵێ، لە هەمان کاتا بە دانانی ڕەمزشکێنێک کە جاروبارە وشەیەکە و چەلی واشە دێڕێک یا چەند دێڕە و هاویشتوویەتە نێو جەرگەی، لەوێ ڕا وردە وردە دەوری هەڵکشانی تۆش دەست پێدەکا تا بەڕاستی دەگەیە خۆت، وەک لە شیعری "خەوەبەردینە"دا دەبینین کە کلیلی کردنەوەی شیعرەکە لە لووزەوی قاسپەی کەوی بەندکراوا خۆ نیشان دەدا:

**لە چەشنی گەرووی کەو**
**کەوی دۆمی یەخسیری زیندانی داری**
**پڕی سەوزەبەستەی خرۆشانی باری**
**تەرەی باوەشی تاسەباری بناری**

بێ گومان هەرچی لەم شیعرەدا هەیە و نییە دەگەڕێتەوە سەر بزووتن و جووڵان و بەرەو پێش کوتان کە لە شەپۆلی گەرووی کەودایە. واتە شاعیر دەڵێ دەبێ بە گەرووی کەودا ڕۆبینە خوار و لەگەڵ قاسپەی کەوی دۆمی گەڕۆکی قەفەزچندا سەرهەڵدەینەوە. دیارە کە

باسی گەروو دەکا مەبەستی مۆنجی دەنگە، چونکە ئەمە چەشنێک مەجازە بە عەلاقەی حاڵ و مەحەل، یانی باسی مەحەل دەکا و مەبەستی حاڵە و هەر لە دەنگی کەوڕایە کە دەگەینە ڕەنگی. ئەم خاڵ و میلەی زیندانێکی بە شووڵ تەندراوی لە دەوری لەشی کەو گرتۆتەوە و کردوویەتی بە زیندانییەکی مێژوویی و ئەم دەنگ و قاسپە بێ برانەوەیە ڕەنگە هاوارێکی ئەزەلی بێ لە دەست ئەم چارەنووسە شووم و بێفەڕە. ئەم هاوارە هەمان سەوزەبەستەی خرۆشانی بارییە کە بە هۆی دوور بوون لە «باوەشی تاسەباری بنار» بە درێژایی زەمان دەبێتە «شەپۆلێک لەگوێن شەرمی خوێنی کچانە»، کە پاک و بێگەرد و پیرۆزە و «بە خوڕ خۆ لە سینگی دیواری غار دەدا و لەگەڵ گاشەبەردا سەر ئەسوێ، سەر ئەسوێ».

لام وایە مانای شیعری سوارە، قەشەی دەستی تاراوە و بە هەموو تۆڕ و داوێ ناگیرێ. نووسین لەسەر شیعر و نووسراوەکانی سوارە یەکجار کەمن و هەتا دۆستایەتی گەرمیان لەگەڵ نەگیرێ و تێکەڵاوییان لە تەک نەکرێ، کەوی نابن و خۆ بە دەستەوە نادەن. خۆشەویستی سوارە دنیایەکی پان وبەرینە و ئەوینداری هەردەم ئەویندارتری دەوێ . ئەگەرچی بە خۆشییەوە هەبوون و هەن کەسانێک کە خۆشیان ویستووە و ڕێزیان لێناوە، وەک ئەم خزم و دۆست و برادەرانەی زانیویانە سوارە کێ بووە و خۆیان پێوە ماندوو کردووە. لێرەدا ئەگەر باسی میرات پارێزەرانی شاعیر، کاک سەلاحەددین ئاشتی و خوالێخۆش بوو مارف ئاغایی و بەڕێز حاجی عومەر ئاغا ئێلخانی و بەرەی ئامۆزایانی نەکەم، ناجوامێریم کردووە. چونکە بە حەقیقەت هەرکام بە بارێکدا شوێنی تەواویان دانا لەسەر ناسینی سوارە. کەچی دیسانیش یەکی وەک من جاروبارە پەیدا دەبێ و خۆ فریو دەدا و دەڵێ سوارە باش دەناسم. مەگین هەر ئەم سوارەیە نالێن کە شیعری "خەوەبەردینە"ی گوتووە. جا نازانن چ شیعرێکە ... کە سەر هەڵدەبڕین دەبینین کە سوارە هەر وا سوار و چاوەڕوانە ...

# سواره و سێ سەرنج

عەبدولخالق یەعقووبی

**ئەم یادداشتە پێشکەشە بە بیرەوەری ٦٦ ساڵەی لەدایکبوونی سوارە**

**١. "سوارە و ئەخلاقی پێشڕەوایەتی"**

سوارە ئیلخانیزادە لەو شاعیرە بەدەگمەن هەڵکەوتووانەی شیعری ڕۆژهەڵاتی جیهانە کە لە هەمبەر ئەرکی شاعیرانەی خۆی هەڵوێستی ڕەخنەگرانە و تێڕوانینی فەلسەفی و خوێندنەوەی فیکری بووە. لە بەرامبەر هەر هەنگاوێک کە بۆ پەرەپێدانی سنووری شیعر هەڵی هێناوەتەوە لاپەڕەیەکیشی لە سەر بۆچوونی جوانی ناسانەی خۆی لە مەڕ شیعر ڕەش کردۆتەوە. بە وتەیەکی تر، سوارە بۆ هەر هەڵوێستێکی مۆدێرنی خۆی لە بابەت تازەکردنەوەی چ شیعر و چ پەخشانی سوردێ لێکدانەوەیەکی مۆدێرنیشی ڕەگەڵ خستووە و تەنیا بە هەڵوێستگرتنی ڕووت ڕازی نەبووە. بۆ نموونە سوارە وەک هەڵوێستی تاکە کەسی خۆی زۆری باوەڕ بە تێکەڵی شاعیر و کۆمەڵگاکەی بووە و تەنانەت ئەرکی ڕێپێشاندەری جەماوەر دەخاتە ئەستۆی شاعیر یان هونەرمەند. من لێرەدا نامەوێ لە سەر باری ئەرزیشی ئەم هەڵوێستە داوەری بکەم، چونکی مەبەستی ئەم یادداشتە بەدەر لەم باسەیە، ئەوەی لێرەدا لام گرینگە ئەوەیە کە سوارە لە پای ئەم هەڵوێستەی ڕادەوەستێ و بە شیکردنەوەیەکی فیکری - فەلسەفی، گریمان زۆریش بە بەهێز یان بێ هێز، پشتی ئەم بۆچوونەی دەگرێ و ڕێگا نادا خوێنەرەکەی ئەم قسەیە وەک قسەیەک کە هەر بە قسەیی دەمێنێتەوە وەربگرێ بەڵکو بە چەندین شێوە پاساوی ڕەخنەگرانەی خۆی بۆ دێنێتەوە، بۆ نموونە دەڵێ: "شاعیر نابێتە شاعیر تا لە پێش هەموو شتێکدا نەبێتە کۆمەڵناس، نەبێتە نوێنگەی ئاواتی سبەینێی کۆمەڵ و مەکۆی زانیاری دوێنێی کۆمەڵ"[١]، "هونەرمەند ئەندازیاری کۆشکی ئاواتی بەیانی کۆمەڵە، ڕچەشکێن و هاندەر و ڕێ پێشاندەرە"[٢]، "شاعیر نییە ئەو کەسە وا وشە لیزگە ئەکا. ئەو کەسە هەڵبەستەچییە نەک شاعیر، شاعیر تا دەردێکی نەبێ، تا بڕوایەک لە دەروونیا نەبێ... شیعر نالێ"[٣] تەنانەت سوارە بۆ پاڵپشتی ئەم هەڵوێستەی خۆی هێرشێکی ڕەخنەگرانە دەکاتە سەر شیعری عەرووز و دەڵێ: "لە ڕاستییا داوخواز و نیازی کۆمەڵ نەبوو کە ئەو ویژەیەی (واتە ویژەی پەیوەندیدار بە شیعری عەرووز) کرد بە باو، بەڵکو پێویستی کەمایەتییەکی ئەشراف و ئاریستۆکرات وەک دەرەبەگی زل و چینەکانی تری حەساوە و

تێـروتەسـەل بوو کـە نیـازی بە وێژەیەکی دوور لە تێگەیشـتنی چەوسـاوەکـان بوو بۆ خەڵـەتاندنیان و گێژ کردنیان"[٤] لەم لێکدانەوەشیدا ئەوەندە زێدەڕەوی دەکا و توند دەڕوا کە بەم جۆرە دەدوێ: "بە لای منەوە شاعیری عـەرووزی شـاعـیـر نیـیـە، چونکە جگە لەوە کە کەوتۆتە شوێن شێوەی شاعیرێکی تر، شاعیرەکەی پێشووش کورد نەبووە."[٥] (دیسان لێرەدا دووپاتی دەکـەمـەوە کـە لەم یادداشـتـەدا مـەبەسـتی داوەریکردن و بەهادانانم بۆ ئەم دید و تێبینییانەی سوارە نییە، هەرچەند جیاوازییەکی زۆر ئەبینم لە نێوان دیدی سوارە و دیدی خۆم بۆ ئەم باسە.) بە کورتی و لە سەر دەستی ئەم نموونانەوە دەمەوێ بڵـێم سوارە لەو ماوە کورتەی کە تەمەنی نووسینی ڕێگای پێدا، وەک شاعیر و نووسەرێکی پێشڕەو، هیچ کات هەوڵی ئەوەی نەدا هەڵوێسـتـە ئەدەبی و فـیـکرییـیـەکـانی بە بێ پاڵپـشـتی تەحلیلێکی ڕەخنەگـرانە، بمێننەوە. سـوارە سـەرەڕای ئەوەی دەیزانی لە مـەیدانێکدا گـۆی فـیکر و قـەڵەم دەخـاتە کـایەوە کـە ڕێژەی تماشـاکـەران چەندین قـاتی گـەمـەچیـانن و بۆی هەبوو بێ ئەو لێکدانەوانەش قسـەکانی بڕ بکەن و جێ بگرن، بەڵام ئەو وشیـارتر لەو بۆچوونە ڕەمەکییانە بوو، دەیزانی چاو و گوێی کراوە، کەمیش بێ تیژن و پیاوی وریا هەمیشـە هەن. جیا لەمە سـوارە وانەبوو هەر بۆ ئەوەی خـۆی بدوێ، ئەو دەیزانی ئـەوەی نوێ بەڕێوەن و بە گـوڕتر دێنە مەیدان، ئەو ئەودیەی کە لە شیعری هەرمانی خەوەبەردینە دا ئاوا باسیان دەکا:

**لە ناو ئەو هەموو ئاوە هەر چاوەیەک**
**باوی هەنگاوی خۆشە**
**بە تەنیا ئەوە شارەزای کۆسپ و کەنداڵی ڕێیە**
**هەوەڵ مەنزڵی زێیە، ئاواتی بەرزی زرێیە**

سوارە لە مـەیدانی ئەدەبی کـوردیدا بە گشـتی و لە پانتـایی شیـعـری نوێی کـوردسـتـانی ئێراندا بەتایبەتی یەکێک بوو لە پێشڕەوانی خاوەن دەسەڵاتی فیکری و مەعریفی، جگە لەم ڕاستییە حاشا هەڵنەگرە سوارە پێشڕەوێک بووە کە نەک هەر ئەخلاقی پێشڕەوایەتی ناسیوە، بـەڵکو بـەکـردەوەش لـە هەڵوێست و ڕاچە و ڕەفـتـاری خۆیدا ڕەچاوی کـردووە و ڕێزی بۆ داناوە. لە «تاپۆ و بوومـەلێڵ»دا سوارە شـەش وتاری، ڕاستـەوخۆ و ناڕاستـەوخۆ، لە سـەر گۆران نووسیوە، کەچی تەنانەت دێڕێک باسی شیعری خۆی ناکات، هەر چەند گومانی تێدا نییـە کە دەیتـوانی و مـافی خـۆیشی بوو - باسی شیـعـر و بەخشـانەکانی خـۆی بکات، بەڵام وێدەچێ سوارە هێند سـەرسـەختانە پابەندی ئەخلاقی پێشڕەوایەتی بووە کە ڕێگای ئەم کارەی بە خۆی نەداوە. سوارە نەک هەر حەزی نەکردووە تەنیا باسی خۆی بکات، بەڵکو هەوڵی داوە لەو دەرفـەتەی بۆی هەڵکەوتووە - واتە بەرنامـەی ڕادیۆیی تاپۆ و بوومـەلێڵ - باسی شـانۆ و

شیعری کلاسیکی کوردی و بەیت و باویش بکا، تەنانەت کۆمەڵێک باسی تێیۆری ئەدەبی هێناوەتە گۆڕێ، وەک ئەو وتارانەی کە لە سەر پێناسە و کارکردی شیعرنووسینی یان ئەو باسانەی کە تێیدا لە بەهرەی شاعیری دەدوێ، یان باسێک کە لە سەر "حەقیقەتی شاعیرانەو حەقیقەتی عیلمی" وەری گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

پێشڕەوایەتی بۆ سوارە شیرنایی گەمەی خۆنواندنێکی ڕۆشنبیرئاسایانە نەبوو، بەڵکو قورسایی ئەرکی خۆبەختکردنێکی ئازایانە بوو، خۆبەختکردن لە پێناوی فیکر و جوانی و نیشتماندا.

**٢- سوارە و خۆزیای "خەوەبەردینە"**

"خەوەبەردینە" نەک هەر باشترین شیعری سوارە ئێلخانی زادەیە، بەڵکو سەرچڵترین شیعری کوردستانی ئێرانیشە تا ساتەوەختی نووسینی ئەم دێڕانە. بە ڕای من شیعری "قوربانی تۆزی ڕێگەتم"ی نالی چەندە پێشاندەری کاکڵی هزر و ئەندیشەی نالییە لە مەڕ نیشتمان، شیعری "خەوەبەردینە"ش ئەوەندە نوێنەری ڕاستەقینەی بیر و بۆچوونی سوارەیە لە هەمبەر کێشەی نەتەوەیی کورد. سوارە لە "خەوەبەردینە"دا باوەڕی بەو ڕاستییەیە کە کورد "ئاوێکە و لەگەڵ گاشە بەردا سەر ئەسوێ" پێشگرییانەی سوارە ئەوە نییە کە میللەتەکەی هێشتا نەگەیشتوونەتە قۆناغی "ئاو بوون"، سوارە پێی وایە گەلەکەی نەک هەر ئاون بەڵکو ئاوێکن "لە چەشنی گەرووی کەو پڕی سەوزەبەستەی خرۆشانی باڕی". سوارە دۆگماتیک و دەمارگرژانە و ڕەشبینانە بیر ناکاتەوە، بە جۆرێک پێی وا بێ نیشتمانەکەی شیاوی گەیشتن بە دەریا نەبێ، هەرچەند دەزانێ کەوی ئەم خاکە: "کەوی دۆمی یەخسیری زیندانی داری"یە، بەڵام دەشێ کەوی نێو ڕکە بێ و گەرووشت سەرڕێژی بەستە.

سوارە تەنانەت لەو ئاوەدا ڕواڵەت و سیمای "کچی نوور" دەبینێت و دیارە بزووتنی نوور تەنیا بزووتن نییە لە ژێر دەسەڵاتی گاشەبەردەوە بەرەو شاری دەریا بەڵکو جێهێشتنی تاریکایی ژێر گاشە بەرد و لە ئامێز گرتنی ڕووناکایی شاری دەریاشە.

سوارە لە هێنانی دەستە واژەکانی "خەوەبەردینە"دا ئەوپەڕی زانایی و زیرەکی شاعیریتی خۆی بەکار هێناوە، بۆ نموونە "کچی نوور" چونکی بەرەو شاری دەریا بەڕێوەیە دەکرێ بڵێین هەمان ئاوە، بەڵام ئەو ئاوە لە سەرێکەوە چونکە کچە، دیارە دەبێ دواڕۆژ ببێتە کانگای پیتو پیتزیی مرۆڤ، هەم مرۆڤی لەگەڵ دەژی وەک شوو، هەمیش مرۆڤی لێ بەرهەم دێ وەکو ڕۆڵە، هەم مایەی ئارامی ژیانە، هەمیش هەوێنی دەوامی ژیان، هەم ڕاگری ئینسانە، هەمیش هەڵگری ئینسان لە سەرێکی دیکەوە چونکی نوورە، مانەوەی ڕووناکاییە و نەمانی

تاریکایی، بوونی گەرمای جیهانە و نەبوونی سەهۆڵبەندان. نوور بە حوکمی ئەوەی گەوهەری ڕۆشناییـیە ڕێ نشـاندەرە و لە سۆنگەی ئەوەی سەرچاوەی ڕۆشناییـیە خـودی ڕێیە. کە وایە کچی نوور ڕاستـە "قەتیسـی دەسی دێوی کێوە"، بەڵام هەر دەشێ ڕێگای شاری دەریا بگرێتە بەر چونکی "ئەسرەوتنە کوولەکەی ڕۆحی ئاوە."

سوارە لە "خەوەبەردینە"دا چارەنووسی مرۆڤی کورد بە چارەنووسی ئەو ئاوەوە گرێ دەدات کـە ڕێگای شـاری دەریای لەبەرە و بۆی هەیە لە نیـوە ڕێدا هەرەسی شـەکـەتی بەسـەریدا برووخێ و ببێتە گۆل و گڕاو و بۆن بگرێ و چەمۆڵەی کلۆڵی بە ڕوویا بوەرێ:

**گەڵی گۆلە لەو چۆڵە پەخسیری خاکن**

**بە ڕوویا گەڵا وەک چەمۆڵەی کلۆڵی وەرێون**

لە لایەکی دیکەوە بۆیشی هەیە ببێتە ئەو چاوەیەی کە باوی هەنگاوی خۆشە و:

**ئەزانێ لە هەڵدێرە هانی بەهێزی**

**لە ئەسکوند و چاڵایە هەڵدان و گێژی**

**پەرژی شینی سەرشانی دەریایە ژینی گەرێزی**

ئەو چاوەیەی کە ناچارە لە بە دەریا گەیشتن و دیتنی ئەو دیەنەی کە:

**لە بەر خۆرەتاوا ئەڵێی سینگی ژینە ئەهاژێ**

لە "خەوەبەردینە"دا وێدەچێ شاعیر بیهەوێ حەرەکەتی ئاو لە ژێر دەسەڵاتی "ڕکەی دۆڵ و شیـو" بەرەو "مـەنزڵی زێ" یاخـود بەرەو "ئاواتی بەرزی زرێ" بگێـڕێتـەوە، واتـە ڕەوایەتی کۆچ و کـۆچباری ئاو لە بەستێنی بەرتەسکی گۆلیـتی و گڕاوێتی بەرەو پانتـایی بەرفـراوانی شـاری دەریا لە کـۆپلەی یەکـەمی شیـعـرەکـەش دا سـەرەتای ئەم "هەوڵی هەڵدان"ە یاخـود "چارانی چارە وەسف دەکرێ، لەو شوێنەی کە شیوەکە دەڵێ:

**بە خورِ خۆ بە دیواری کێوا ئەدا ئاو**

**لەگەڵ گاشە بەردا سەر ئەسوێ، سەر ئەسوێ**

بەڵام دوا جار و لە نیوەی شیعرەکەدا خوێنـەر هەست بەوە دەکا کە شـاعیر چیتر شوێنپێی ئەم کۆچ و کۆچبارە هەڵناگرێ و تەنیـا بە وێنا کـردنی ئەو حاڵەتانە قەناعەت دەکا کە ئەگەر بگاتێ چۆن دەبێ. واتە سوارە لێرەدا بە قـەولی خـۆی حەقیـقـەت لە واقـیع جیـا دەکـاتەوە و ئەوەی لێرە بەدوا باسی دەکات حەقیقەتێکە کە لە وانەیە خۆی ببێ بە واقیع و لەوانەشە نەبێ بە وتەیەکی تر "خەوەبەردینە" لە واقیـعـێکەوە دەست پێدەکـا و لە قـەوارەی حەقـیـقـەتێکدا

دەوامی دەبێ. سوارە ئەم گێڕانەوە سەمبولیکە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەکاتە زمانحاڵی بەسەرهاتی میللەت و مرۆڤی کورد.

لە خوێنەریشی ناشارێتەوە کە ئەم بەسەرهاتەی بە لاوە زۆر تاڵە:

**هەتا بیری تاڵی گراوێ**
**بە دڵما گەڕاوە**
**هەتا یاد ئەکەم ئاوە بەو ورمەبەردینە کاری کراوە**
**ئەڵێم سەد مەخابن**
**ومجاخێ کە ڕووگەی هەزاران نزای شینەباهۆی بەتاسەن**
**وە بووژێنەوەی هەست و هان و هەناسەن**
**چلۆنە کە بیژووی گراوان ئەبیێن**
**لە نێو چاوی ئەو خانەدانە**
**لەهی چۆنە پیتی بڕاوە؟**

خۆزیای "خەوەبەردینە" خۆزیای گەیشتن بە شاری دەریایە، چونکی کانی لە ژێر گاشە بەرداندا دەبنە گۆلی دواڕۆژ و گراوی داهاتوو، بەلام بە گەیشتنە دەریا ناوی ڕاوەستاوی کانی دەبێتە "سینگی ژین" و ئەهاژێ:

**ئەڵێن تاجی زمرووتی دورگەی لە سەر ناوە دەریا**
**هەتا چاو هەتەر کا، شەپۆلە، شەپۆلە**
**لە بوونا، لە چوونا**

**٣ـ سوارە و دەنگی تاپۆ و بوومەلێڵ**

زۆر کەس پێی وایە «تاپۆ و بوومەلێڵ» کۆمەڵێک پەخشانی ئەدەبی سوارە ئێلخانی زادەن کە لە ڕێگای بەرنامەی ڕادیۆ پێشکەشی کردوون. ڕاستە ئەم زنجیرە بەرنامەیە پەخشانی تێدا بووە، بەلام لە «تاپۆ و بوومەلێڵ»دا وتاری ڕەخنەیی و وتاری لێکۆڵینەوەیی و وەرگێڕانی بابەتی تیۆری ئەدەبی و تەنانەت تەنزیشی تێدا بەدی دەکرێ، ئەویش نەک هەر لە بەستێنی شیعردا، بەڵکو لە بواری فەلسەفی و فیکری و لە بابەت ژانری لە گوێن شانۆیشەوە و تەنانەت هەندێ جار کورتە چیرۆکیشی، باوەکو زۆریش بە مانای وردی وشە، هونەری نەبن، نووسیوە. کە وایە «تاپۆ و بوومەلێڵ» تەنیا پەخشانی ڕووت نییە و کۆمەڵێکی هەمە ڕەنگ و هەمە چەشنە لە بوار و بەستێنەکانی جیاجیای ئەدەب و تەنانەت

فەلسەفەدا. ئێستا پرسیاری من ئەوەیە سوارە بۆچی تاپۆ و بوومەلێڵی نووسی؟ هەموومان دەزانین ئەو بارودۆخ و فەزا کۆمەلایەتی و سیاسییەی «تاپۆ و بوومەلێڵ»ی تێدا نووسراوە تەواو دژ بە چالاکی فیکری و ئەدەبی بە زمانی کوردی بووە و تەنانەت لەو سەروبەندەدا گۆڤارێکی کوردی لە ئارادا نەبووە تا بەرهەمی قەلەمی شاعیران و نووسەرانی لە جۆری سوارە بلاو بکاتەوە. ئەی چی و کێ دنەی سوارەیان دا دەس بداتە خولقاندنی کۆمەلێک وتاری ڕۆشنبیرانەی بە زمان پاراو و بە نێوەرۆک بە پێز و هاوچەرخانە؟ مەبەستی سوارە لە هێنانە بەر باسی بابەتی وەکو "شیعر زیاتر لە فەلسەفە نیزیکە، هەتا مێژوو" چی بوو لە کاتێکدا بەردەنگی ئەو سەردەمی وێژە و نووسراوەی کوردی بە ژمارە کەم و لە عەقلی ئەدەبیدا پلە نزم بوون؟ ئایا سوارە تەنیا ویستوویەتی ئەرکی ئیداری خۆی جێبەجێ بکا، یان نا، مەبەستێکی گەورەتر و ئاواتێکی بەرزتری لە مێشک و دلدا بووە؟

خوێندنەوەی وردی «تاپۆ و بوومەلێڵ» ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەخا کە سوارە ئامانجی لە نووسینی «تاپۆ و بوومەلێڵ» ئەگەر نەلێین شۆڕش، بزووتنەوەیەکی ئەدەبی و زمانی بووە لە خانەی عەقل و فیکری کوردیدا. سوارە هەلی بەرنامەی ڕادیۆی قۆزتۆتەوە و لەم ڕێگایەوە زنجیرە باسێکی هەمەلایەنەی بە زمانێکی پاراوی کوردی کە لە هەمان کات هەلگری کۆمەلێک باسی تازە بابەتی ئەدەبی و فیکری بن هێناوەتە ئاراوە کە هەم زمانی کوردی لە مەرگەساتی نەنووسین خەلەساندبێ، هەمیش ئەدەبی کوردی لە باس وخواسی هاوچەرخانە و هاوسەردەمانەی جیهان بێبەش نەکردبێ. سوارە «تاپۆ و بوومەلێڵ»ی کردۆتە مەکۆی ئەو ئەدەبەی کە مافی ڕەوای خۆی بووە لە دەیان گۆڤار و کتێبدا بوونی دەنگ بداتەوە، بەلام کە ئەو بوونە ڕێگای لێ بگیرێ، سوارە ناچارە لە تەختی شاعیریتی دابەزێ و بپەڕژێتە سەر ئەرکی ڕەخنەگرتن و وەرگێران و پەخشان و وتار نووسین. بە ڕای من بەرنامەی «تاپۆ و بوومەلێڵ»ی سوارە دەوری ئەو گۆڤارانە دەگێڕێ کە دەبوایە ئەو سەردەم بلاو ببوونایە و ڕێگا نەدەدرا بلاو ببنەوە. سوارە «تاپۆ و بوومەلێڵ»ی بۆیە کردە بەرنامەی ئیداری خۆی چونکە هەستی بەو غیابە بڕست بڕەی نووسینی کوردی و عەقلی کوردی کردبوو.

«تاپۆ و بوومەلێڵ» بۆ من بەلگەی بەلگەنەویستی ڕووناکبیرێکە کە کۆلنەدانی تەنیا لە سۆنگەی سووربوونێتی لەسەر نووسین. سوارە «تاپۆ و بوومەلێڵ»ی بۆیە نووسی کە بەر لەوەی بە کوردی بمرێ بە کوردی ژیابێ، لە سەردەمێکدا کە بە کوردی مردن کاری هەموو "پاراوی ئاو"ێک و "خێلی درۆ"یەک بوو، بەلام بە کوردی ژیان تەنیا لە دەسەلاتی ئەو کەسانەدا بوو کە دەیانزانی:

ئەوەستان ئەوەستێ بە دەستێ
کە خاراوی ئێش و سواوی سوێ بێ
لە هەر شوێنێ ڕاماوە، داماوە، کاری تەواوە
ئەزانێ ئەبێ هەر بژێ و باژوێ، تا بژی تا بمێنێ
هەناوی بە هەنگاوە، ئەسرەوتنە کوولەکەی ڕووحی ئاوە

---

١ ـ تاپۆ و بوومەلێڵ، سوارە ئیلخانی زادە، ١٣٧٩، نشر پانیز، ل ٨٣.
٢ ـ هـ.س، ل ٨٤.
٣ ـ هـ.س، ل ٨٤.
٤ ـ هـ.س، ل ٢٤٤.
٥ ـ هـ.س، ل ٢٥١.

# کتێبێک لە گفتوگۆدا

**سەلاحەددین موهتەدی**

یەکێک لەو کتێبانەی کە دەتوانم بڵێم بەداخەوە تا ئێستا زۆر بە کەمی ئاوڕی لێ دراوەتەوە، چ لە بواری ڕەخنە و چ لە بواری لێدوان، دیوانی شیعری "خەوەبەردینە"، یەکێک لە شاکارەکانی ئەدەبی کوردی، دیوانی شاعیری گەورەی کورد، "سوارە ئیلخانی زادە" سوارەی شاعیرە.

بۆ قسەکردن لە سەر ئەم کتێبەش، میوانداری بەڕێز مامۆستا "سەلاحەددین موهتەدی"مان کردووە کە بەڕێز یەکێکە لە ڕۆشنبیرەکان، جگە لەوەی کە لە بواری سیاسەتدا کاری کردووە، تەمەنێکی زۆر لەگەڵ کاک "سوارە ی ئیلخانی زادە" دۆست و هاوڕێی نزیکی بووە. جگە لەوە، هەر لەگەڵ کاک "سوارە" ماوەیەکی زۆر سەرقاڵی ڕەخنەی ئەدەبی و نەقدی ئەدەبی بووە. بە ناوی بەرنامەکەمانەوە کاک "سەلاحەددین موهتەدی" زۆر زۆر بەخێرهاتنتان دەکەم.

و: سپاستان دەکەم.

**پ: ڕاستی بۆ من فرسەتێکی زێڕینە کە جەنابت لە بەرنامەیەکا ئەبینم و دەتوانم لەگەڵ جەنابت باس لە کاک "سوارە" بکەم.**

و: سپاست دەکەم. باس لە کاک "سوارە"، یەکیان ئەوەیە کۆن نابێ، تا باسی بکەی هەڵدەگرێ زیاتریشی لە سەر بدوێی. دوو، بۆ من تەنیا لێکدانەوە و ڕەخنەگرییەکی ئەدەبیش نییە و بەس. بۆ من زیندووکردنەوەی هەموو بیرەودرییەکانمە. بیرەوەری هەر لە منداڵیمەوە کە ئێمە هەم ڕەفیق بووین، هەم ئامۆزا بووین، هاوماڵ بووین، پێکەوە گەورە بووین، پێکەوە گەنج بووین، پێکەوە دڵداریمان کرد، پێکەوە سیاسەتمان کرد، پێکەوە کوردایەتی و هەڵات هەڵات و گیران و زیندانمان کرد، پێکەوە کاری ئەدەبی و نووسین و شیعر و ڕەخنەگریمان کرد.

من لە شۆێنێکدا دەڵێم لە باسێکی "سوارە"دا ئەو شیعرە دەبێ دووپات کەمەوە:

**من و مەجنوون لە مەکتەبخانەیی عیشقا دەرس خوێن بووین،**
**ئەمن خەتمی کەلامم کرد لە وە للەیلا بەجێ ما ئەو**

ڕاستی ئەو لە جێگایەکدا بەجێ ما کە بەداخەوە ئیتر وەختی ئەوە بوو خەڵک چاوەڕوانی بەرهەم و بەهرەی زیاتر بوو.

**پ. کاک "سەلا ح" تاکو ئێستا زۆر کەم ڕەخنەگران و نووسەران زۆر بە کەمی بە داخەوە**

باسی کاک "سواره"یان کردووه. ئەگەر چی من دەبێ لە میانەی ئەم بەرنامەیە ئاماژە بکەم بە وەی کە لەم دوایانەدا گۆڤاری "ڕۆژڤار" کە سەردەم دەری ئەکات ژمارەیەکیان تەرخان کرد بۆ قسەکردن لە سەر سەرجەم بەرهەمەکانی کاک "سوارە"، بەڵام بە دەگمەن ئەبینی لەم لا و لەو لا نووسینێکی ڕەخنەگرانەمان هەبێ لە سەر کاک "سوارە".

**پێت وایە ئەمە بەشێکی ئەگەڕێتەوە بۆوە کە مەسەلەن نووسینی کاک "سوارە"، نووسینێکی سەختە، ئەو سەبک و شێوازەی کاک "سوارە" شێوازێکی سەختە یانی ڕەخنەگران دەرەقەتی نایەن یان شتی تر لە ئارادایە.**

و: وەڵڵا من پێم وایە بەشە زۆرەکەی خۆت باست کرد. شیعری کاک "سوارە" تێگەیشتنیشی دژوارە و لێکدانەوەشی دژوار و سەختە، ئەمە لایەک. خۆی زمانێکی وای هەڵبژاردووە. وەخۆی شێوە بەیانێکی وای هەڵبژاردووە، ئێمە دواتر باسی دەکەین بۆ، بەڵام جگە لەوە بڕێک لە لێکدانەوەکانیشی ڕەنگە بچێتەوە سەر جیهانی سیاسەت و زۆر کەسیش خۆی ئامادە نەبێ لەم جیهانەدا، بێتە نێو مەیدانەوە. سێهەمی بڕێکیان ئیشاراتی تێدا هەیە بۆ ڕووداوی تایبەت، ئەوی ئەو سەردەمە نەژیابێ و لە نێو ڕووداوەکاندا بەشداری نەبووبێ ئیشارەکانیش تێناگا، ڕەنگە دواتر ئێمە باسی بڕێک لە شیعرەکانی بکەین کە ئیشارە بۆ کوێن. هەموو ئەوانە بۆتە هۆی ئەوە کە زۆر کەس خۆی لە قەرەی لێکدانەوەی شیعرەکانی نەدا، بەڵام جگە لەوە، خۆشەویستی "سوارە" و بەرزی شیعرەکانی زۆر جار وای لێ کردووە کەس پێویستی بە وەی نەدیوە کە ڕەخنە بگرێ، بەس ستایش و پێداهەڵکوتن بووە، ڕەنگ بێ ئەگەر بڕێک شاعیر لە ڕابردوودا ویستبێتیان ئەمە بشکێنن، هێرشێکی بکەنە سەر، جا ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ لایەنگرانی هێندە بە توندی بە گژیدا چوونەوە و بە کۆمەڵ و دەستە جەمعی جوابیان داوەتەوە ئیتر کەس نەیوێراوە قسەی لێ بکا، یا ڕەخنەی لێ بگرێ. هەموو ئەوانە بوونە هۆی ئەوە کە بۆچی کەم باسی "سوارە" کراوە.

**پ: کاک "سەلاح" ئەگەر باسی کاک "سوارە" بکەین، دەبێ بێ گومان باسی بزووتنەوەی شیعری نوێی کوردی کوردستانی ئێران بکەین. بزووتنەوەی شیعری کوردستانی ئێران. جەنابت دەزانی لە سەردەمی ئەخیرەوە لە سەردەمی دوای کۆماری مەهاباد ئەگەر باس بکەین، لە "هێمن" و مامۆستا "هەژار" و لە "سەید کامیل ئیمامی" و مامۆستا "حەقیقی" و ئەمانەدا خۆی دەبینێتەوە. بەس ئەم پۆلە شاعیرە کە دەکرێ بڵێین قوتابخانەی موکریان پێک دەهێنن، دواجار "سوارە" لە هەناوی ئەمانەوە دێتە دەرەوە. ئەو جێ هێشتنەوە ئەو دابڕانە کە کاک "سوارە" لە وان دەیکا چۆن ئەبنێیتەوە؟**

و: ئێمە دەبێ ئەم دوو مەکتەبی شیعر گوتنە، یا وەکو ئێوە دەڵێن ئەو دوو مەدرەسەی

شیعرییه به تەواوی لێک جیا کەینەوە. "هەژار"، "هێمن"، "خاڵەمین"، "حەقیقی"، "سەیدکامیل" و "محەممەد نووری" و هەموو ئەوانە ئەو قوتابخانەن کە دەکرێ پێی بڵێی قوتابخانەیەک کە "سەیفی قازی" ڕچەشکێن و مامۆستا و بەرەوپێدەری بوو.

کلاسیزمی نوێی دەتوانین پێ بڵێین لە ئەدەبی کوردی لە کوردستانی ئێراندا، بۆیە پێی دەڵێین کلا سیسم چونکە ئەمە لە باری گوتنەوە، لە باری وەزن و قافیەوە شێوەی کلا سیکی بە خۆی گرت. وەزنی تێک نەداىوو، قافیەکانی لەبەرچاو دەگرت، وەک عەرووزەکانی لەبەرچاو دەگرت، بەڵام لە نێوەرۆکدا گۆڕانی هێنا.

لەباتی تەنیا شیعری غەزەلی و دڵداری و پێداهەڵگوتنی مەعشووقە بێ، مەعنا و نێوەرۆکی کۆمەڵایەتی هێنا گۆڕێ، نێوەرۆکی سیاسی و میللیشی هێنا گۆڕێ. لە هەڵبژاردنی وشەشدا لەباتی ئەو وشە عەرەبی و فارسییە ڕەق و تەقەکانی کۆن، کەڵکی وەرگرت لە وشەی کوردی پەتی کە مەوجوود بوون لە نێو کۆمەڵگادا. ئەوە جیاوازییەک دەخاتە بەینی ئەم گۆڕانکار ییەی کە لە کوردستانی عێراق کرا تا کوردستانی ئێران، لە کوردستانی عێراق زیاتر خەڵکی کە ئالاهەڵگری نوێکردنەوەی بەیانی شیعری کوردی بوون خەڵکی شارە کان بوون. ئەوانە زیاتر کەلکیان وەردەگرت لە دانان و داهێنانی وشەی تازە لە بەرامبەر وشە کۆنەکاندا، بەڵام خەڵکەکەی کە لە سەردەمی "سەیفی قازی" بە خۆی و بە شاگردەکانیشییەوە، زیاتر خەڵکی دێ بوون، ئەمانە زیاتر کەلکیان وەردەگرت لەو وشانەی لە نێو کشتوکاڵ، لە نێو مەرداری لە نێو گەرمێن و کوێستان کردنی خێڵ و عێلە کاندا بە کار دەبرا و ئەوانەیان بە ئەمانەت وەرگرت و مەعنای تازە یان پێ بەخشی. مەعنای تازە لە جیهانی سیاسەت، مەعنای تازە لە جیهانی تەغەززولدا.

ئەم مەکتەبە کلاسیزمە نوێیەی کە "سەیفولقوزات" یا وەکو پاشان پێی دەگوترێ "سەیفی قازی" دەستی پێکرد، هەموو ئەو شاعیرانەی سەردەمی جمهووری کوردستان و کۆمەڵەی "ژ.ک" لەو قوتابخانە دا بوون.

ئەم قوتابخانە یە تا دوای رووخانی جمهووری کوردستانیش بۆ ماوەیەک دەوامی کرد. ئەوەی دواتر هاتە گۆڕێ، لە وێنەی "سوارە" و باقی ڕەفیقە کانی کە بڵێین لە ئاخری دەیەی پەنجاکان ـ من لێرە هەتا دەڵێم پەنجاکان و شەستەکان و ئەوە بە تاریخی میلادی دەیڵێم بۆ وەی هەموو لایەک باشی تێبگەن و موشکیلە دروست نەبێ ـ لە کۆتایی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکانە وە قوتابخانەیەکی تازە هات، ڕچەیەکی تازە هات کە ئەمە ڕچەی شیعری نوێی کوردییە. ئەم شیعرە نوێیە هەموو قەرارادادە کۆنە کانی شکاند.

**پ: ئەو قوتابخانە نوێیە، کە باسی "سوارە" ئەکەی، واتە قوتابخانە ی "سوارە"، لە**

**هەناوی شیعری کلاسیکی نوێی کورد بیەوە، واتە لە هەناوی "هێمن" و "هەژار" ئەو قوتابخانە ی کە باست کرد، هاتە دەرەوە یان موتەئەسیر بوو بەو گۆڕانکارییەی کە لە ئێران لە نێو شاعیرە فارسە کانا دروست بووە، یان موتەئەسیر بوو بەو گۆڕانە شیعرییەی کە لە لای "گۆران"ی خۆمان لای "شێخ نوری شێخ سالح" هاتە ئاراوە؟**

و: ئەگەر زۆر کورتت جواب دەمەوە، بەڵێم وەڵڵا هەموویان تەئسیریان هەبوو. شیعری کۆنی کوردی، شیعری کلاسیکی کوردی، بە کلاسیزمی کۆن و کلاسیزمی نوێ شێوە گەنجینەیەکی فەرهەنگی بوون بۆ ئەوانیش و بۆ هەر کە سی دیکە و ئێستاش هەر بەردەوام وان، تەبعەن هەموو کەس کەلکی لێ وەرگرتووە و کردوویەتی بە سەرمایەیەک لە زانستی فەرهەنگی و ئەدەبی خۆیدا، بەڵام سەردەمێک هات کە هەست بە ئەوە دەکرا گۆڕانکاری پێویستە، ئەم هەستە بۆدە کرا؟

شیعری نوێی کوردیش وەکو هەموو دیاردەیەکی کە لە ناو کۆمەڵدا سەر هەڵدەدا کوتوپڕ و لە ناکاو سەری هەڵنەدا، یا بەرهەمی زۆرزانی، زیرەکی یا بلیمەتی کەسێک یا چەند کەسێک نەبوو بەتەنێ، بە لکو ڕەنگدانەوەی گۆڕانکارییەک بوو کە لە نێو کۆمەڵدا ڕووی دابوو. جا ڕەنگدانەوەکەی وا هاتە نێو ئەدەبیاتیشەوە.

کۆمەڵگای ئێران ڕووی کردە گۆڕان. لە ئاخری پەنجاکان و سەرەتای شەستەکانی میلادییە وە. کۆمەڵگای ئێران لە کۆمەڵگایەکی عەشایری، ئەرباب و ڕەعییەتی زیاتر پشت ئەستوور بە بەرهەمی کشتوکاڵییەوە گۆڕا بە کۆمەڵگایەکی شارستانی، کۆمەڵگایەکی زیاد بوونی ژمارەی خوێندەوار و خوێندکار.

**پ: لە بارەی شیعری "هەڵۆ"وە پرسیار کرا داخوا کاک "سوارە"، چ کاتێک ئەو شیعرەی نووسیوە، بە سەر کێیدا یان سەر چیدا وتوویەتی؟!**

و: ئەو شیعرە کاتی خۆی "پووشکین"ی شاعیری ڕووس کوتوویەتی. دوایە دوکتور "فەرەیدوون [پەرویز] ناتەلی خانلەری" کە یەکێک لە ئەدیب و شاعیرە گەورەکانی ئێرانە، کردی بە فارسی، چەند ساڵێک دواتر کە من بە پێشمەرگایەتی لە کوردستانی ئێرانەوە ڕووم کردە کوردستانی عێراق و مامۆستا "هەژار"م دی و بووین بە هاوماڵ و ڕەفیقی ساڵهای لێرەبوونم لە کوردستانی عێراق. توانیم ئەم شیعرەی بۆ بگێڕمەوە.

بە شێکی زۆریشم لەبەر بوو، هەر شیعرە کانیشم بۆ نووسیوە، ئەوەی لە بەرم نەبوو بە پەخشان جێگا بەتاڵە کانم بۆ پڕ کردە وە. ئەویش لە ڕووی ئەوەوە شیعرێکی کوردی کوت هەر بە ناوی "هەڵۆ" ـ دیارە شیعرێکی بەرزە و بەناوبانگەوە ـ هەر لە سەر وەزنی شیعرە کەی "خانلەر"یشە.

کاتێک من لە کوردستانی عێراق گەڕامە وە بۆ کوردستانی ئێران نوسخەیەکی ئەم شیعرە دەسنووسەی "هەژار"م لە لا بوو. "سوارە" ویستی خۆی تاقی بکاتەوە لە و مەیدانە و چۆن "هەژار" کردبووی بە کوردی، ئەویش جارێکی دیکە شیعرەکەی "هەژار"ی سەرلەنوێ رێک خستەوە و کردییەوە بە کوردی. بۆیە میسرە عی ئەوەڵی بۆ ئەوەی کە نیشانی بدا شیعرەکەی لە "هەژار" وەرگرتووە، و نەڵەن دزی کردووە، عەینی میسرە عەکەی "هەژار" دووپات دەکاتەوە.

ئەو دەڵێ: "پایزە دار و دەوەن ڕەنگ زەردە" ئەم دەڵێ: "پایزە دار و دەوەن بێ بەرگە" بەم تەرتیبە ویستی بڵێ کە ئەوە شیعرێکە وەدووی "هەژار" کەوتووە.

ئەو شیعرە زۆری دەنگ دایەوە. هومێدەوارم ئەوانەی کە مۆسیقا دەزانن و دەنگیان خۆشە بتوانن ئەو شیعرەی "هەڵۆی سوارە" بکەن بە سروود، چونکە یەکێک لە باشترینی ئەو شیعرانەیە کە هەڵدەگرێ بکرێ بە سروود.

**پ: ئەوکات کە باسی گۆڕانکاری، یا فەرهەنگی و ڕۆشنبیریتان ئەکرد لە ئێران، هێندێک گۆڕانکاری سیاسیش هەبوو، بەشداریکردنی کاک "سوارە" ئەوکات لە بزووتنەوەی خوێندکارانی چەپی ئێرانی ئەمانە چ تەئسیر و گۆڕانکاریێکیان هەبوو. هەر لە و کاتەدا جەنابت دەبینی بزووتنەوەی "سیاهکەل" تەئسیرێکی زۆری هەبوو لە سەر زۆربەی ڕۆشنبیران و گۆڕانکارییەکی زۆری دروست کرد؟**

و: جا با پێت بڵێم حەرەکەتەکەی خوێندکارانی کورد لە کوردستانی ئێران، پێش ئی "سیاهکەل"یشە وەختێک کۆمەڵگای ئێران گۆڕا، لە ناخەوە گۆڕا، پەیوەندی ئابووری گۆڕا، ڕێگا نەبوو، ئەم گۆڕا نکارییە دەبوو تەئسیری خۆی بکاتە سەر ئەدەب و "فەرهەنگ"یش. قسەی تازە هاتە گۆڕێ مەعنای تازە هاتە گۆڕێ. بۆ مەعنای تازە تۆ دەبوو شێوازی تازەی بەیانیی دروست کەی. ئەم قالبە کۆنانەی شیعریی نەیاندەتوانی مەعنا تازەکان لە نێو خۆیاندا بگونجێنن، لەبەر ئەوە پێویستی هەبوو بە شکاندنی قالبە کۆنەکان و هێنانی قالبی تازە و ئەمە لە کۆتایی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکانی میلادییەوە دەستی پێکرد. ئەو کاتە یەکێتی خوێند کارانی کورد لە زانستگاکانی ئێران دروست بوو ـ دیارە بە نهێنی ـ کە هەمووی ئێمە "سوارە"ش و منیش ئەندامی ئەم یەکێتییە بووین. چالاک بوو، وە ئەم یەکێتییە لە لایەکەوە سیاسەت بوو، بەڵام لە لایەکی دیکەشەوە فەرهەنگ و نووسین و شیعر و ئەدەب بوو، ئەمانە تێکەڵ دەبوو دەگەڵ فکری چەپ کە لە دنیای دەرەوەش دەهات بۆ نێو ئێران. خوێندکارانی ئێرانی دەگرتەوە، خوێندکارانی کوردیشی دەگرتەوە.

ئەمە قۆناغی یەکەمی یەکێتی خوێندکارانی کوردە، بەڵام قۆناغی دووەمی دەگەڕێتەوە بۆ

نێوەڕاستی شەستەکان. کاتێک من ڕۆیشتم بۆ پێشمەرگایەتی لە ئێرانەوە بۆ کوردستانی عێراق و سێ ساڵم پێچوو. "سوارە" و ڕەفیقە کانیشی کە مابوونەوە ئەوانیش گیران، چوونە زیندان ئەوانیش ماوەیەکیان پێچوو، جارێکی دیکە هەر دووکمان هاتینەوە و لە کولێژی حقووق یەکترمان گرتەوە. ئەمە لە نێوە ڕاستی شەستەکانەوە بوو. ئەوجار بیری سیاسی چەپ بە سەر هەموو ئێران و بە سەر گەنجەکان و خوێندەوارانی ئێراندا زاڵ ببوو. دیارە بە سەر ئێمەشدا.

هەر ئەو کاتەش بوو کە "سمایل شەریف زادە"، "سولەیمان موعینی"، "مەلا ئاوارە" و ڕەفیقەکانیان لەو چوارچێوە کۆنە تەقلیدییەی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران هاتبوونە دەرێ. هەر وەکو چۆن سازمانی ئینقلابی حیزبی توودە لە حیزبی توودەی ئێران جیا بۆوە و ناوی خۆی نا سازمانی ئینقلابیی، ئەمانیش ناوی خۆیان نا کومیتەی ئینقلابیی حیزبی دێموکرات. لە واقیعدا کومیتەیەکی ئینقلابیی بوو کە لە دژ سوننەت و ترادیسیۆنە کۆنەکانی حیزبی دیمۆکرات ڕاست ببۆوە. ئەوانیش هاتنەوە بۆ نێو کوردستانی ئێران، بە شێوەیەکی چەکدارانە.

بەینی ئێمە وەک خوێندکارانی کورد و بەینی ئەوان وەکو هێزی چەکدار پەیوەندی پەیدا بوو. وەکو ئەوان بوونە باڵی چەکداری حەرەکەتەکە و ئێمەش بووینە باڵی تەنزیمی و سیاسی و فەرهەنگی بزووتنەوەکە. ئەمە جارەکی دیکە تەئسیری کردە سەر شیعری "سوارە". ئەم جار شیعرەکانی "سوارە"، ڕوونتر و ئاشکراتر خەباتگێڕانەتر و شۆڕشگێڕانە تر بوو.

حادیسەی "سیاه کەل" لە واقیعدا دوای حەرەکەتەکەی "سمایل شەریف زادە" و وان دەستی پێکرد. بۆیە یەکێک لە بەناوبانگترین شاعیرانی ئەو سەردەمەی ئێران بە زمانی فارسی شیعرێکی خۆشی هەیە کە دەڵێی:

**راهی باید زین کوهستان سرسخت زجنگل سرسبز**

دەیهەوێ بڵێ لە کوێستانە سەختەکانی کوردستانەوە، پێویستە ئێمە ڕێگایەک بکەینەوە بۆ لێرە وارە سەرسەوزەکانی مازەندەران کە حادیسەی "سیاهکەل" لە وێ ڕووی دابوو. ئەو دووانە تێکەڵ بوون.

**پ: تۆ بڵێی ئەمە ڕاست بێ کە "سوارە" لە سەرەمەرگیدا لە نەخۆشخانە گوتوویەتی تەنیا ئارەزووم ئەمەیە کچێکی جوان لەگەڵما بخەوێ؟**

و: ئەوە کە "سوارە" لە خەستەخانە بووبێ و پێش سەرەمەرگ ئارەزووی ئەوەی کردبێ کە کچێکی جوانی لە گەڵ بخەوێ: لە ڕاستیدا ئەوە زیاتر ئەفسانەیە، بەڵام ئەفسانەیەک لە حەقیقەتێکەوە سەرچاوە دەگرێ. ئەو حەقیقەتەش ئەوەیە "سوارە" بنیادەمێکی زۆر دڵ تەڕ

بوو. زۆر ئەهلی دڵداری و عاشقێنی و حەزلێکردوویی بوو. ڕەنگە من لە چەند سمینارردا کە گرتوومە و لە چەندین مەقالە دا کە لە سەر "سوارە" م نووسیبێ قەت نەبووە باسی ئەوە نەکەم.

"سوارە" شاعیرێکی عاشقی، ئەویندار، دڵتەڕی هەمیشە گەش بوو و ئەو کەسەش کە ئەو قسەی بۆ "سوارە" ساز کردووە لە تەبیعەتی "سوارە" زۆر دوور نییە.

**پ: تکایە ڕوونکردنەوە یەکمان بۆ بکەن لە سەر بەرنامەی "تاپۆ و بوومەلێڵ".**

و: "تاپۆ" یانی "شەبەح، تارمایی"، "بوومەلێڵیش" دیارە "بەری بەیانە کە هێشتا بەینی تاریکایی و ڕۆشنایی وڵات تەواو دەرنەکەوتووە".

"سوارە" لەو دوو مەفهوومە کە یەکیان تارماییە و یەکیان بوومەلێڵی بەیانییە، دەیەویست ڕەمزێک یا ڕازێک دابنێ، بەینی حەقیقەت و بەینی ئەو شتانە کە ئەو مەجبوور بوو لە پەردە دا بیڵێ.

**پ: کاک "سەلاح" حەز دەکەم کات بە فیڕۆ نەدەم بێمە سەر تەفسیرکردنی شیعرەکان، تۆ دەزانی دوای ئەوە کە ناوەندی ئینتیشاراتی "سەلاحەددین" کە دیوانە کەی کاک "سوارە"یان کۆ کردەوە، ناوی "خەوەبەردینە"یان لێنا. جەنابت دەزانی "خەوەبەردینە" یەکێکە لە جوانترین و قورسترین شیعرەکانی کاک "سوارە"، بۆ ئەم ناوە لەم کتێبە ئایا هەیەنەی ئەم شیعرە بە سەر هەموو شیعرەکانی کاک "سوارە"وەیە، پێت وایە ئەم شیعرە لووتکەی نوێخوازی و ئیبداعی کاک "سوارە" یە لە شیعرییا؟**

و: وەڵڵا ئەگەر ورد بمهەوێ قسە بکەم، نەک لووتکەی ئیبداع و داهێنانی "سوارە"یە لە شیعری کوردیدا، بەڵکو لووتکەی ئیبداع و داهێنانی شیعری کوردییە لە کوردستانی ئێران.

هەر لە سەرەتای دەستپێکرانی شیعری نوێی ڕا تا ئێستا، ئەمە دەلیلێک. دەلیلی دووەم ئەمەیە، درێژترینی شیعرەکانیێتی لە باری قەوارەوە، سێهەمی گرانترینی، وە هەروەها پڕ ڕەمزو ڕازترین و نادیارترینی شیعرەکانیشێتی. هەموو ئەوانە وای لێ کردووە کە بە لای منەوە حەقی خۆیان بووە ئەگەر ناوی دیوانە کەیان ناوە "خەوەبەردینە".

**پ: ئەم شیعرە زۆر قورسە و ڕەنگە بەشێکی زۆر لە خوێنەرانی کاک "سوارە" لە ڕاستییا تێنەگەن کە مەبەستی کاک "سوارە" چییە ؟ لەبەر ئەوەی تۆ دەزانی زمانی شیعرەکە زمانێکی ڕەمزییە، ئەگەرچی ئەم شیعرە تارمایی ڕۆمانتیکی بە سەرە وەیە یان تەنسیری ڕۆمانتیکی بە سەرەوەیە، بەڵام ئەم شیعرە، شیعرێکە، وا دیارە شیعرێکی ڕەمزییە.**

**دەمهەوێ داوا لە جەنابت بکەم، بڵێم بە دیدێکی ڕەخنەگرانەوە چۆن ئەو شیعرە ئەخوێنیتەوە؟ چۆن ئەو شیعرە باس دەکەی. ئەم شیعرە دەیهەوێ لە چی بدوێ؟**

و: کەسێک باسی شیعری نوێی کوردستانی ئێران دەکا، دەبێ ئەوە بزانێ کە هەلومەرجێک کە شیعری کوردستانی ئێرانی تێدا داندرا، ئەو هەلومەرجە نییە کە لە کوردستانی عێراق لە ساڵەکانی پێشوو، هەر لە دەورەی دەسەڵاتی ئینگلیزەکانەوە مەوجوود بووە، ئەم هەلومەرجە شیعر گوتن ئازاد بووە، باسی کورد و کوردستان کران ئازاد بووە. ناچار بووە لە ئێران هەر کەس شیعر بڵێ بەتایبەت شیعری نوێ کە نێوەرۆکێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و شۆڕشگێڕانەی هەبوو، ناچار بوو دەبوو پەنا بەرێتە بەر ئەم ڕەمز و ڕازە.

ئێستە کەسێک شیعری "شەوە"ی "فاتیح" دەخوێنێتەوە، یا بەشێکی زۆر لە شیعرەکانی کاک "عەلی حەسەنیانی" دەخوێنێتەوە سەیر دەکا هەموو ناچار بوون بەو زمانە قسە بکەن.

بەڵام "سوارە" جگە لەوە، لە ڕاستی خۆشی پێی خۆش بوو، "سوارە" خۆی یەکێک لەو کەسانە بوو کە زەوقی ئەوە بوو بە زمانێکی پڕ لە ڕاز و نهێنی، بە زمانێکی نیوە شاردراوە، نیوە نهێنی، نیوە ئاشکرا قسە بکا و بە زمانێک قسە بکا کە خوێنەر مەعنای جۆراوجۆری بتوانێ لێ وەربگرێ و هەر کەسە بە زەوقی خۆی بتوانێ لێکی بداتەوە.

**پ: ڕەنگە ئەوە زۆر ترین داهێنانی کاک "سوارە" بێ لە شیعرا!**

و: بەڵێ ڕەنگە ئەمە زۆرترین داهێنانی هەموو شاعیرە کوردەکانی دنیا بێ.

**پ: لە یەک مەرحەلەیا یەک داهران دروست دەکا لە زمانا، کە ئەیهەوێ یەک بونیادی تر، یەک خانووی تر بۆ زمانی کوردی دروست بکات، کە ئەو خانووە، خانووی زمانی "هێمن"، یا زمانی تەنانەت "گۆران"یش نییە!**

و: نا. کە شیعری کوردی ڕچەی خۆی دۆزییەوە لە کوردستانی ئێران، لە ڕاستیدا سەردەمێک بوو، دوای ئەو گۆڕانە کۆمەڵایەتییەی لە کۆمەڵگای ئێراندا ڕووی دابوو و پێویستی بەوە هەبوو قالبی نوێ بدۆزێتەوە بۆ بەیانی شیعری کوردی. ئێمە لە مێژ بوو قسەمان لەوەی دەکرد و دادەنیشتین و لە نێو چوارچێوەی ئەو ڕێکخراوە خوێند کارییە یدا کە خەباتی سیاسی دەکرد، بەڵام بەشی زۆری خەباتەکە، خەباتی فەرهەنگی، کولتووری ئەدەبی کوردی بوو. قسە لەوە دەکا، شیعری کوردی دەبێ کام ڕچە بگرێتە بەر؟

**پ: حەز دەکەم کاک "سەلاحەددین"، باسێک لەسەر شیعرە فارسییەکانی کاک "سوارە" بکا کە هەر وەکو دەزانین شیعرە فارسییەکانی کاک "سوارە"ش کاریگەرێکی زۆریان هەبووە لەو حەرەکەتانەی کە کاک "سەلاحەددین" بۆ خۆی ئاماژە یان پێدەکا. بەتایبەت هەر وەک دەزانین کە زۆریش لە گۆڤاری "خوشە"دا کە شاعیری گەورەی فارس "ئەحمەد شاملوو" بڵاوی دەکردەوە، بڵاو دەبۆوە. جا حەز دە کەم لە ڕوانگەی کاک "سەلاحەددین"ەوە کاریگەری ئەم شیعرە فارسییانە بزانم چۆنە؟**

**پرسیاری دووەم ئەوەیە کاک "سەلاحەددین" پێم خۆشە شی بکاتەوە کە میزانی تەئسیرپەزیری تەئسیر وەرگرتنی کاک "سوارە" تا چ رادەیەک لە شیعری نوێی کوردی لە کوردستانی عێراق بوو؟ وە تا چ رادەیەک لە شیعری نوێی فارسی بوو لە ئێراندا؟**

و: ئەمن لە پرسیارە دووهەمە کەیەوە دەست پێدەکەم. چونکە خۆشم هەر لە سەر ئەوە خەریک بووم بڕۆم. لەو لێکۆڵینەوەد کە ڕێبازی شیعری کوردی دەبێ چۆن بێ ئێمە چیمان لە بەردەست دابوو؟ دیارە کە دەڵێم ئێمە، ئەمن شاعیر نەبووم، بەڵام من ڕەخنەگری ئەدەبی بووم، کارم لەگەڵ ئەدەبیات بوو، کەسانی وەکو "سوارە"، وەکو "فاتیح"، وەکو "عەلی حەسەنیانی" زەوقی شیعریيان هەبوو، هەموو قسە لەوە دەکرا ڕێبازی شیعری نوێی کوردی چ بێ، تەنانەت کەوتبووینە سەر ئەوە زیندوو کردنەوەی بەیتە کۆنەکان، کەڵک وەرگرتن لە حەیران. ئایا ئەوانەن کە ئێمە دەخەنە سەر ڕچەیەکی نوێوە، نەجاتمان دەدەن لە دەست وەزنە عەرووزییە کۆنەکە.

شیعری فارسی ئێران لەبەر چاومانە، شیعری فارسی نوێی ئێران لە "نیما یوشیج"وە لە "نیما"وە تا "شاملوو"، هەروەها تەرجەمەی شێعری ئورووپایشمان لەبەر دەستدا بوو کە بە زمانی فارسی بڵاو دەبوونەوە. ئێمە لە و بەزمەدا بووین کە دوو دیوانی شیعری کوردی هی "گۆران"، یەکیان "فرمێسک و هونەر"، یەکیان "بەهەشت و یادگار" کەوتە بەردەستمان. ئەمە دنیایەکی دیکەی تازەی بە ئێمە نیشان دا و دەرگایەکی تازە و هەراو و بەرینیشی بۆ کردینەوە. لە ڕاستیدا ئێمە زانیمان ئەو شتەی کە لێی دەگەڕێین ئەمەیە. چونکە زانیمان پێش ئێمە خەڵکێکی زۆر کاریان کردووە بۆ دۆزینەوەی ڕێباز و ڕچەی شیعری نوێی کوردی و کاری گەورەیان کردووە. "گۆران" بوو بە بو تێک لە بەر چاوی ئێمە. لە بیرمە ئەو کاتە "سوارە" لە تەورێز بوو، من لە تاران بووم، وە هەریەک دیوانیشمان هەبوو، لای من بوو، من هەر بە پازدە ڕۆژ ، بیست ڕۆژ جارێک شیعرێک لە شیعرەکانی "گۆران"م هەڵدەبژارد، بۆم دەنارد و بۆچوونی خۆمم لە سەر دە نووسی. شێوەی شیعرەکەی، چۆن ئێمە دەتوانین چاوی لێ بکەین، چۆن دەتوانین کەلکی لێ وەربگرین، جارێ، دە بیست لاپەڕەم لە سەر شیعرێک دەنووسی و بە هەمان قەوارە و بە هەمان شێوە "سوارە" جوابی دەداوە. یانی ئێمە کەوتینە سەر لێکۆڵینەوەی شیعری "گۆران".

لەبەر ئەوە کاتێک لە تاران جارێکی دیکە هەموو کۆ بووینەوە، بەو حیسابە گەیشتین کە شیعری نوێی کوردی، "گۆران" ڕچەکەی شکاندووە، پێویست ناکا ئێمە بیگۆڕین یان گۆڕانکاریی گەورەی لێ بکەین، مەگەر هەر ئەوەندە کە ئیقتیزای موحیتە نوێیەکەی خۆی بێ. ئیقتیزای کوردستانی ئێران بێ. جگە لەوە شیعری نوێی فارسیشمان لەبەر چاو بوو.

گومانی تێدا نییە، "سوارە" تەئسیری زۆری وەرگرتووە لە شاعیرە نوێیە فارسییەکان، کە وەکو دواتر پیاو دەتوانێ باسی شیعرە فارسییەکەی بکا، کە کاک "وریا" داوا دەکا باسێکی ئەوە بکەین، بەڵام من داوا دەکەم ئەوە وەختێک بچین کە پرسیارەکە بێتە سەر باسی شیعری فارسی "سوارە". هەر بە بەراوەردێکی کەم بڵێم،"سوارە" ئەوەندە بە توانا بوو لە زمانی فارسیدا. یەک ئەوەیە هیچ مومکین نییە کەسێک شیعری فارسی "سوارە" بخوێنێتە وە و بزانێ ئەوە زمانی فارسی نەبووە.

**پ: بەراوەرد ئەگەر بکەی لە نێوان شیعرە فارسییەکانی و شیعرە کوردییەکانی خۆیا، حەز ناکا بە دیوێک لە دیوەکان ئەیهەوێ هەمان پەیام کە بە زمانی کوردی هەیەتی، بە زمانی فارسیش بیگەیەنێ. ئەوە شیعری "خێڵی درۆ"مان هەیە، لە لای کاک "سوارە" یانی ئەو پەیامەی کە دەیهەوێ بیگەیەنێ حەز ناکا لە شیعرێکی تری فارسی یا دەیهەوێ؟**

و: ڕاستە، بەڵێ ڕاستە، ئەوە زۆریش تەبیعییە. شیعری کوردییەکەش و شیعری فارسییەکەش هەر یەک کەسن و لە یەک هەست و لە یەک داخوازی و لە یەک ئومێد و ئامانجەوە سەرچاوە دەگرن.

شیعری "خێڵی درۆ" تۆ دەبێ بزانی هی چ سەردەمێکە. ساڵی ١٩٦٧ و ٦٨ ئەو حەرەکەتە چەکدارییەی کە من بۆم باس کردی لە پێشدا. هێزە چەکدارییەکەی "شەریف زادە"و "مەلا ئاوارە" و "سولەیمان موعینی" و باقی تێکۆشەرانی سیاسی کوردستانی ئێران دەستی پێکردبوو. ئێمە وەکو هێزێکی خوێندکاریی لەگەڵیان لە پەیوەند دا بووین. لە سەردەمێکدا ئەوان داوایان لە ئێمە کرد کە بە هۆی ئەوە برێک لە سە رکردەکانیان شەهید کراون و توانای ئیدامەدانی شۆڕشەکەیان نییە، ئێمە بچینە نێویانەوە و خوێنێکی تازە بخە ینە بەر ئەم حەرەکەتە چەکدارییە. ئەوە بزووتنەوە خوێندکاری و سیاسییە چەپە کەی ئێمە ی ـ کە دیارە ئێمە بزووتنەوەیەکی سیاسی، خوێندکاری چەپی کوردی بووین ـ ئەم حەرەکەتەی لە وانەیە بڵێم دوو لەتی کرد.

ئێمە بووینە دوو دەستە: دەستەیەک دەمانگوت با بچین. ئێمە خۆشمان کە ئەم بزووتنەوەمان دامەزراندووە، بەرنامەمان ئەوە بوو کاتێک گەیشتینە ئەوەندە خەڵکی چەکدارو ئەوەندە خەڵکی کادر، دەبێ دەست بکەین بە بەرپاکردنی شۆڕش لە کوردستانی ئێران. ئێستا خۆ ئەوانە هاتوونەوە، چەکدارە کانیان هەیە. ئێمە ش خۆمان کادرەکان بە ئەندازەی کافی هەین، دەبێ دەست پێ بکەین.

جەماعەتێک بەرامبەر بە ئێمە ڕاوەستان و دەیانگوت نابێ بچین، چونکە ئەوانە بە ئەندازەی پێویست چەپ نین، بە ئەندازەی پێویست مارکسیست نین و خۆمان تەربیەتمان

نەکردوون، خۆمان ئامادەمان نەکردوون، لەبەر ئەوە نابێ بچین. یانی لە واقیعدا بۆ نەچوونی خۆیان، بۆ ناشۆرشگێڕیتی خۆیان دەلیلی چەپیان دەهێناوە. بە ئایات و ئەحکام و پرەنسیپەکانی چەپەوە چەسپابوون، "سوارە" لەوە دایە کە حەملەیان پێدەکا:

**ئێوە کێن؟ خێڵی درۆ**
**ئەی گەلی دەم پڕ لە هەرا**

ڕەنگە ئەمن میسالێکت لێرە بۆ بێنمەوە لە خێڵی درۆکەی، کە ئیشارە دەکا: ئێوە لە وشەی چەپ و لە ئیستیلاحاتی چەپ کەلک وەردەگرن بۆ خۆدزینەوە لە شۆڕش. لە حاڵێکدا چەپ پێویستە، وەسیلەی بەرپاکردنی شۆڕش بێ نەک خۆدزینەوە لە شۆڕش. بۆیە دەڵێ:

**ئێوە ئەی کرمی کتێب**
**یاری غاری هۆدە**
**بە گەرووی قاسپەی کەوی کەوتارێن**
**جارێ کام گوم بوو ئەدەن وا بەهەڵپە و بەدەمۆ؟**
**ئێوە،**
**میراتگری کام جێ لە وەڕن؟**
**ئێوە،**
**حاشاگری ڕووبەندی وشە**
**بووکی بێ تارای سوور**

دەیهەوێ بڵێ خەڵک ڕەنگی سوور دەکا بە ئاڵا و هەڵی دەکا، ئێوە کردووتانە بە تارا و بە سەری خۆتان داداوە بۆ خۆدزینەوە.

پاشان لە جێگایەک دەڵێ:

**مل بە بە رمووری وشەی ڕەنگاوڕەنگ!**

خەڵک وشە دەکاتە گوللە و لە سینگی دوژمنی هەڵدەکا، ئێوە وشەتان کردۆتە بەرمووریێک و بۆ خۆ جوانکردن و خۆ ڕازاندنەوە و خۆ دەرخستن ئەم وشانە بەکار دێنن. ئینجا لە شۆ نێنیکدا دەڵێ:

**خوانەکا بای بە تەوژمی کوێستان**
**لابەرێ پەردە لە سەر بالآتان**
**دەردەکەوێ، هەر دەکوژن دوورا و دوور**

بۆیە دەڵێ: **"دوور کوژی، نیزیک خەسار"**

**ئێستە وا گرمە لە کێوان بەرزە**
**مێش ئەخاتە لەشی گا بوولەرزە**

تاقە مێشێک دە توانی ئەگەر لە سەر پێستی گایە کی گەورەش نیشت، لانی کەم بوولەرزەیەکی لە لەشی گایە کەدا دروست کا، دەتوانێ لەرزە بخاتە ئەندامی گایەکی گەورە.
بەلام ئێوە ناتوانن لەرزە بخەنە نێو ولاتەکەی خۆتان:

**ئێوەن و ئێوەن و لۆکەی گوێتان**
**بەسیەتی ... بەسیەی**
**وا هات ... وا چوو**

جا ئەمە "سوارە"، جارێکی دیکە لە شیعرێکی دیکەی فارسیدا دە یلێتە وە، بەلام دیارە لە شیعرە کوردییەکە دا زیاتر تەعبیرەکان کوردستانین و مەوزووعی بە حسەکەش کوردستانییە، بەلام لە شیعرەکەی دیکەدا، "زرد، سیاە، رنگی" زیاتر جیهانییە، زیاتر ئەنترناسیۆنالە. لە ژێر تەوژمی ئەم حەرەکەتە چەپە شۆڕشگێڕییەی کە لە دەیەی شەستەکان و کۆتایی شەستەکان هەموو دنیای گرتبۆوە خیلافی بەینی دوو ئۆردوگای گەورەی جیهانی کۆمونیزم، خیلافی بەینی شووڕەوی و چین و سەرهەلدانی چین وەکو پالەوپشتێکی گەورە بۆ حەرەکەتی شۆڕ شگێڕانە لە موقابیل ئارامی و مەندی سیاسەتی سۆڤییەتیدا ئەوکاتە و هەروەها ئەو حەرەکەتە گەورانەی کە دەزانی لە هەموو ئورووپا بەتایبەت بەوەی پێی دەلێن مانگی مەی، شۆڕشی خوێندکاران لە پاریس لە مانگی مەی ۱۹٦۸، هەر لە حەرەکەتی "لۆمۆمباوە" لە ئەفریقا و تا "گیڤارا" لە ئەمریکای لاتین هەموو ئەوانە تەئسیری کردۆتە سەر سوارە و تەئسیری کردبووە سەر هەموومان. ئەوە عومقی ئاگاهێکەیەتی، جگە لەوە ئەمە ئیقتیزای شیعرە فارسییەکەیەتی کە زیاتر جیهانییە، شیعرە کوردییەکەی زیاتر شۆڕشێکی کوردستانی لەبەر چاوە، بەلام لێرەدا هەموو دنیا موخاتەب قەرار دەدا و دەلێ:

**زرد ـ سیاە ـ رنگی**
**من و تو**
**هر دو بە طفلی می‌اندیشیم**
**کە بر سینەی ما بیدار است**
**با تنی از تب آتش گرم**
**شیر خون می‌طلبد**
**و مادر فرهنگش را می‌خواند**
**من و تو هر دو**

با یک خون می‌اندیشیم
من و تو هر دو به صبحی می‌اندیشیم
که طلوعش را مژده از رایت انگشت دهیم
من و تو هر دو نیک آگاهیم
که شب سنگدل پنبه به گوش
به جز از بانگ مؤذن
روی گلدسته صبح
با سرود آتش و اذانی از تیر
بیدار نمی‌گردد
من و تو هر دو نیک آگاهیم
که دهان‌های انباشته از باد جدل را
باید بست
و فصاحت را
در رواق کوهستان
از خطیبی که کلامش سربی است
باید آموخت
تو ظریف زرد، من رنگی، برادرمان زنگی
همه نیک آگاهیم
صورت عیسی را
که بر آن نقش هزاران سیلی است
در کوثر نفرت باید شست
و دروغین سحر صلح
بین گرگ و بره را
بر فراز دار فلق خونی
باید آویخت

ئەمە هەمان شۆڕشگێڕییە کە لە "خێڵی درۆ"دا هەیە، بەڵام لە "خێڵی درۆ"دا سەحنە و ساحەیەکی کوردستانی لەبەر چاوە. لە "زەرد و سیاه و ڕەنگی"دا و بە پانایی هەموو جیهان و هەموو شۆڕشگێڕان و هەموو نەتەوە زۆرلێکراوانی جیهان موخاتەب دەکا.

لەگەڵ مامۆستای بەڕێز، مامۆستا "سەلاحەددین موهتەدی" لە سەر یەکێک لە ناوازەترین

دیوانه شیعرییەکانی یەکێک لە باشترین شاعیرەکانی کوردستانی ئێران، یەکێک لە شاعیره نوێخوازەکانی کوردستانی ئێران، کاک "سواره ئیلخانی زاده" کەمێ قسەمان کرد.

بە داخەوە ماوە زۆر کورت بوو و نەمانتوانی مافی تەواو بدەین بە شیعرەکانی کاک "سواره". بۆیە من هەر ئەو کات ئەو بەڵێنەم لە کاک "سەلاحەددین موهتەدی" وەرگرت کە جارێکی دیکە لە خزمەتیا دانیشینەوە و بتوانین تاوتوێی بەشێکی زۆر لە شیعرەکانی بکەین. بۆیە بە خۆشییەوە ئەم شەو بە خۆشحاڵییەوە ئەو بەڵێنییەمان هێنا جێ وله خزمەت کاک "سەلاحەددین موهتەدی" داین بۆ ئەوەی بتوانین بەشێک لە شیعرەکانی بخەینە ژێر گفتوگۆ و ڕاڤەکردنەوە.

**پ: سەرەتا بە ناوی بەرنامە کەوە بەخێرهاتنی جەنابت دەکەمەوە، کاک "سەلاحەددین موهتەدی"**

و: سپاست دەکەم.

**پ: زۆر پەلەمە لەوەی کە بچینە سەر بابەتەکە. حەز دەکەم سەرەتا بە وە دەست پێ بکەین بە خوێندنەوەی "خەوەبەردینە"، شاکارەکەی کاک "سواره ئیلخانی زاده"، خوێندنەوەیەکی شیکارییانەی جەنابت.**

و: بە سەرچاو، لە ڕاستیدا، ئەوە ئاواتێکی دێرینی من بوو کە دەرفەتێکم بۆ هەڵبکەوێ و جا چ بە خوێندنەوە بۆ تەلویزیۆن، چ بە نووسین بۆ ڕۆژنامە و گۆڤار و لە نێو کتێبدا، لە سەر "خەوەبەردینە" قسە بکەم.

قسە لە سەر "خەوە بەرینە" ماوە و مۆڵەتی زۆر و دوور و درێژی دەوێ. ماوەیەک لەمەوپێش گفتوگۆم لەگەڵ کرا، بەڵام ڕەنگە لە سێ چوار سەعات من لەو بارە وە قسەم کردبێ، بەڵام ئەوەی ئەوڕۆ هەڵدەگرێ لە بەرنامەیەکی تەلویزیۆنیدا بیلێی، من هەر وەکو داوام لێ دەکەی بە سەرچاو وا دەکەم. هەم "خەوەبەردینە" دەخوێنمەوە و هەم حەول دەدەم لەگەڵ هەر برگەیەکیش شیکردنەوەیەکی کورتی پێ ئیزافە بکەم. "سواره" یادی بەخێر دەڵێ:

**لە چەشنی گەرووی کەو،**
**کەوی دۆمی یەخسیری زیندانی داری:**
**پڕی سەوزە بەستەی خرۆشانی باری**
**تەرەی باوەشی تاسە باری بناری**
**شەپۆلی لە گوێن خوێنی شەرمی کچانە**
**لە سەر رووومەتی ماتی بووکی ڕەزاسووک**
**بە تینی بتاوێنی ڕوانینی زاوا**

**گەرمتر لە پرشنگی تاوی بەهاری**
**وەکوو نەرمە هەنگاوی لاوی بەرەو ژوان**
**لە جێ ژوانی زیندوو بە گیانی کچی جوان**
**وەکوو گەرمە پاوی قەشەی دەستی تاراو،**
**لە بڕۆینی دەریای بلوورینی بەروێ**
**بە خوڕ خۆ بە دیواری کێوا ئە دا ئاو**
**لەگەڵ گاشەبەردا سەر ئەسوێ، سەر ئەسوێ.**

**پ: بەهەووره ئیقاعی ئەو شیعرە، ریتمی ئەم شیعرە، پێم وایە کەمێک کاریگەرە بە ریتمی شیعرێکی "گۆران"، کە باسی پەردەی شانۆ دەکا.**

و: دەگونجێ، چونکە من لە جاری پێشوودا لە باسی سەرهەڵدانی شیعری نوێی کوردی لە کوردستانی ئێراندا ئەوەم بۆ باس کردی، کە دوای گەڕانێکی زۆری هەمووومان بە دووی ڕیبازێکی نوێ بۆ شیعری کوردی و بە دووی سەرمەشقێک کە لە ڕووی ئەوەڕا بتوانین ئەم ڕچەیە پەیدا کەین، سەرەنجام گەیشتینە "گۆران" و "گۆران" بوو بەو کەسە کە زۆرترین کاریگەریی لە سەر شیعری نوێ لە کوردستانی ئێراندا هە بوو. لەبەر ئەوە دەگونجێ لەگەڵ جلوەی شانۆی "گۆران"یش دا ئیقاعیان لێک نیزیک بێ.

**پ: "سوارە"، دەیهەوێ لە "خەوەبەردینە" دا چی بڵێ؟**

و: "سوارە" دەیهەوێ لە "خەوەبەردینە"دا باسی ئاوێک بکا کە جارێ لە نێو دڵی کێودا قەتیس ماوە. ئەم ئاوە تەبیعەتی ئەوەیە دەیهەوێ بێتە دەرێ، تەبیعەتی ئەوەیە ببزوێ و بڕوا. لەبەر ئەوە لە نێو خۆیدا حەرەکەت دەکا و دەبزوێ و دەهاڕێ و وەکو خۆی دەڵێ: "سەر بە گاشەبەرد دەدا بۆ ئەوەی بێتە دەرێ." جا لە ئەم چەند بڕگەی کە من خوێندمەوە بە چەند تەسویری جوان و جۆراوجۆر ئەم تەلاش و تێکۆشانی ئاو بۆ هاتنە دەرێ لە زیندانەکەی خۆی نیشان دەدا. وەک بۆ خۆی دەڵێ: "لە زیندانی بەردینی غارا" دەیهەوێ بێتە دەرێ لەم زیندانە. لە پێشدا تەشبیهی دەکا، دەنگەکەی تەشبیە دەکا بە دەنگی کەوێک، کەوی دۆمێک کە گیراوە، لە قەفەسدایە، باڵەفڕێ دەکا، دەیهەوێ بێتە دەرێ. کە ناتوانێ بێتە دەرێ. دەخوێنێ، دەقاسپێنێ، کەی وەکو ئەو کەوەی لە بناری کێوێکدایە و وەکو ئەو کەوەی خۆی گەنجە و لە سەردەمی باڕیە تێدایە. ئەم دەنگە خۆشەی ئەو کەوە باڕە تەتشبیە دەکا بە دەنگی ئاوەکە. ئەنجا لە بەشی دووەمدا، باسی شەپۆلی ئاوەکە دەکا. شەپۆلی ئاوەکە دەشوبهێنێ بە خوێنێک کە دێتە سەر ڕوومەتی ماتی بووکێکی ڕەزاسووک کاتێک زاوا سەیری ئەکا. کە گەرمترە لە پرشنگی تاوی بەهاریی. چۆن ئەم خوێنە لە سەر ڕوومەتی ئەو

بووکە دێ و دەچێ و شەپۆل دەدا، ئاویش لە ناو کێوەکە دا هەر ئاوا شەپۆل دەدا.

لە جێگایەک تەشبیهی دەکا بە لاوێک، کوڕێکی گەنج، کە هەنگاو هەڵدێنێتەوە بۆ ئەوەی بچێ بۆ جێ ژوان، جێ ژوانێک کە زیندووە بە گیانی دۆست و یارێکی خۆی.

جارێکی دیکە بەراوردی دەکا و دەیشوبهێنێ بە دەستێک، دەستەکەش تەشبیە دەکا بە ماسیەک، یا وەک خۆی دەڵێ قەشە ـ قەشە جۆرێک ماسیە ـ وەک چۆن ماسی لە ئاو، لە دەریا دوور بکەوێتەوە، هەڵدەبەزێتەوە و بزووتنەوە و جووڵانەوەی هەیە. دەستی ئەو کوڕەش وەکو ئەو ماسییە وایە، بەڵام دوور کەوتۆتەوە لە چی؟ ئەم دەستە لە دەریای "بلووریی بەرۆ" یانی لە دەریای سینگ و بەرۆکی یارەکەی دوور کەوتۆتەوە. جا ئەم دەستە کە تەشبیهی کردووە بەو ماسییە ئەوە خۆی لە تەشبیهی سووەمدا دەبێتە ئاوەکە کە لە نێو کێوەکەدایە.

لە واقیعدا تۆ دەبینی، سێ تەشبیهی کردووە. هەر لەو بڕگە چکۆڵەدا ئاوەکە تەشبیە دەکا بە دەستێک کە لە سینگ و بەرۆکی یار دوور کەوتۆتەوە و ئەو دەستە ش کە لە سینگ و بەرۆکی یار دوور کەوتۆتەوە، جارێکی دیکە تەشبیهی دەکا بە ماسییەک کە لە دەریا دوور کەوتۆتەوە. ئەمە هەر سێکیان جارێ تەشبیهی ئاوەکەیە، کاتێک لە نێو کێوەکە دا خەریکە بە خوڕ خۆ بە دیواری کێوا دەدا.

**پ: ئەگەر وایە کە خودی ئاوەکەش خۆی ڕەمزە، هیمایە بۆ شتێکی تر؟**

و: بێ گومان ئێستا ئەمە دە چینە سەر ئەوە کە مەبەستی لەو ئاوە چییە؟

**کچی نوور قەتیسی دەسی دێوی کێوە**
**لە ئەنگوستەچاوی دڵی خێوی کێوا**
**بەرەو دەر، بەرەو شاری دەریا بەڕێوە.**

ئینجا خەریکە بێتە دەرێ. ئاوەکە تەشبیە کراوە بە کچی نوور، دیارە ئاوەکە تەشبیە کراوە بە نوور و نووریش تەشبیە کراوە بە کچ. ئەمەش دووبارە سێ تەشبیە لە سەریەک لە یەک دێڕی شێعریدا. ئینجا خەریکە بێتە دەر، بۆ کوێ؟ بەرەو شاری دەریا. چونکە مەبەستی هەموو ئاوێک ئەوەیە بگاتە شار ـ شار لە بیرت بێ لە شێعری "سوارە" دا ـ لە ئەکسەر جێگادا دوو مەعنا دەبەخشێ: شار، ئەو مەعنا ئاشکرا و دیارەکەی شارە یانی وڵاتێک کە خەڵکێکی زۆر تێیدا نیشتەجێن،بەڵام شار، لە یاریکردنی منداڵان و گەنجانی کوردەواریشدا، بەو مەقسەدە، یا بە ئاخری کایەکە دەڵێن کە پیاو لە ڕاکردندا، یا لە کۆتایی یاریدا دەبێ بیگاتێ، دەڵێ دەبێ بگاتە شار.

لەبەر ئەوەی، ئەو دەریایە وەکو شار وایە کە ئاو دەیهەوێ بیگاتێ. بۆ ئەوە کە بیگاتێ

بە کوێدا تێدەپەڕێ؟

**گەرووی ویشک و چاوی سپی چاوەکانی**

**دەرووی ڕوونی ئاوە**

دیارە گەرووی ویشکە، چونکە هێشتا ئاوی پێدا نەهاتووە. چاویشی سپییە، چونکە چاو لە ئینتزار و چاوەڕوانیدا سپی دەبێ و ئەو کانییەش کە هێشتا ئاوی پێدا نە هاتووە عادەتەن خیزەکانی سپین. ئەوە گەرووی ڕوونی ئاوە، ئاو بە وێدا هومێد دەکا کە بێتە دەرێ:

**بە فانۆسی ئەستێرە بەر چاوی ڕوونە**

**لەبەر پێی حەریری کەوەی سێوەرە**

**بە پوی مانگە شەو چنراوە.**

جا لێرەدایە کە دەڵێ بۆ ئەم کچی نوورە پێشوازی دەکرێ. ئەم پێشوازییەی چۆن لێ دەکرێ. ئەستێرە دەبێتە فانۆسێک و ڕووناکایی بۆ ڕادەدێرێ.

**پ: ئەم تەشبیهە زۆر سەیرە، یانی لە شوێنێکا کچی نوور دێتە دەرەوە و لە شوێنێکا ئەستێرە کە ئەویش هەر نوورە، پێشوازی لێ دەکا ئەمە پێت وا نییە تا ئێرە ئەم تایبەتییە تایبەتە بە شیعری کاک "سوارە". سەیر کە کاک سەلاح مەسەلەن مومکین نییە لە شیعری شاعیرێکی دیکەدا تۆ شتێکی بە جوان تەشبیە کەی و جوانە کەش بە جوانێکی کە تەشبیە کەی.**

و: تۆ جوانی بۆچووی کاک "ڕاسان"، هەر هەموو "خەوەبەردینە" یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەم خەسڵەتەیە. "سوارە" بە یەک تەشبیهەوە ناوەستێ، جاری وایە دوو و سێ و چوار تەشبیە دێنێتەوە. لە بەینی هەر چواریاندا موناسەبە ساز دەکا و جا ئەم جارەکە مەرامەکەی خۆی، کە ئاوەکەیە یا تەسویرێکە، کە دەیهەوێ ئەو تەسویرە بە گوێی خوێنەر بگەیەنێ بەیان دەکا.

**پ: لە پشتی فانۆسیشەوە یەک پرسیاری تر دروست دەبێ، فانۆس تیشکێکی کەم ئەدا، ڕووناکاییەکی کەم ئەدات، بۆ ئەوەندە بە شتی وردەوە ئەچەسپێ کاکە "سوارە"؟ بۆ بە کانییەکی پچووکەوە ئەچەسپێ، لە جیاتی ڕووناکاییەکی زیاتر، دێ بە فانووسێکی بچووکەوە دەچەسپێ.**

و: لە بیرت بێ "گۆران"یش دەڵێ:

**کانییەکی ڕوونی بەر تریفەی مانگە شەو:**

**لە بنیا بلەرزێ مرواری زیخ و چەو،**

**جوانترە لە لای من لە دەریای بێ سنوور،**
**شەپۆلی بێتە بەر تیشکی ڕۆژ شلپ و هوور.**

شاعیران هەمیشە لایە نگری عەزەمەت و گەورەیی نین، جاری وایە زیاتر ئاشقی جوانیو جەمال و ئارامین. جگە لەوە لە بیرت بێ ئەستێرە نوورەکەی نوورێکی ئارامە. بە پێچەوانەی ڕۆژ لە بەر ئەوە تەشبیهی ئەستێرە بە فانۆس تەشبیهێکی زۆر جوان و پڕ بە پێستە لە جێگای خۆیدا.

ئەستێرە بۆی دەبێتە فانۆسێک و بەر چاوی ڕوون دەکا، لە خواریشەوە سێوەرە دەڵێی حەریرێکی کەوەی شینە ڕاخراوە و تیشکی مانگە شەویش بە پۆی زێوین چنیوێتی.

ئەوەیش یەکێک لە هەرە جوانییەکانە، لە زۆر جێگا تایبەتە بە "سوارە".

ئینجا دەگاتە ئەو دەنگە نەرمەی کە لە ئاوە وە دێ. شلپە نییە، شەپۆل نییە، بەڵکو دەنگێکی نەرمی ئاوێکە کە جارییە، هێشتا نەگەیوەتە دەرێ. تەشبیهی دەکا بە چی؟

**ئەڵێی بورجی خاپووری مێژووی لەمێژین،**
**لە درزی هەزار خشتی ڕۆژ و شەوانی**
**دلۆپەی چپەی پۆلی پەریانی دادا**
**ئەڵێی پێکەنینی کچی سەرگورشتەی قەدیمی**
**لە ئەندامی تاپۆی وەکوو بوومەلێڵی**
**- سنووری شەوی دوێنێ ئەوڕۆی بەیانی -**
**پەچەی قورسی نسیانی ئینسانی لادا.**

مێژوو تەشبیه دەکا بە چی؟ تەشبیهی دەکا بە بورجێکی خاپوور، بورجێکی کۆنی کاولکراوی لە مێژینە. ئەم بورجە بە چی دروست کراوە؟ بە هەزاران خشتی ڕۆژ و شەو کە لە سەر یەک داندراون. زەمانە لە هەزاران خشتی ڕۆژ و شەو پێکدێ، ئەگەر تەشبیهی کەین بە بورجێک.

لە درزی ئەم خشتانەدا کە خشتی ڕۆژ و شەون، دەڵێی پۆلێک پەری لەو دیوی زەمانەوە، لەو دیوی مێژوو چپە دەکەن و چپەی ئەوان وەک دلۆپەیەک لە درزی ئەو خشتانەوە دەگاتە گوێی ئینسان. ئەم دەنگە خۆشەی پۆلێک پەری کە لەوپەڕی سنووری زەمانەوە دێتە گوێ، وەک دەنگی ئەو ئاوە دەچێ کە لە نێو کێوەکەدایە. جارێکی دیکە تەشبیهی دەکاتە وە، هەر عەینی شت، جارێکی دیکە ئەم سەرگوزەشتە قەدیمانەی کە بۆ ئێمەی دەگێڕنەوە، ئەم ئەفسانە، ئەفسانەی کۆن تەشبیه دەکا بە کچێک و گێڕانەوە کەی تەشبیه دەکا بە پێکە نینی ئەم کچە، "پێکەنینی کچی سەرگوزە شتەی قەدیمی". ئەم پێکەنینە، ئەو نسیانی ئینسانە کە

ئینسان هەیەتی بەرامبەر بە ڕابردوو، وەکو پەچەیەک وایە بە سەر بیرەوەری نسیانی دادراوە تەوە، بەم پێکەنینە ئەم پەچەیە لادەدا لە کـاتێکی دیار و نادیاردا. بەینی سنووری شەوی دوێنێ، کە ڕابردووە و ئەوڕۆی بەیانی کە هێشتا نەهاتووە. ئەمە ئەم بوومەلێڵەیە کە مێژوو لە بەینی پێش مێـژوو و دوای مـێـژوو لە سنووری بەینی دیار و نادیاری مـێـژوودا دیاری دەکرێ. لەو سنوورەوە کچێک، کە کچی سەرگوزەشتە کۆنەکان بێ، کچی ئەفسانەکان بێ، پێدەکەنن و ئەم پەچە لە سەر ئینسانی ئێمە لادەدەن و ڕابردوو وەبیر ئێمە دێننەوە. ئەم دەنگە خۆشەش وەک دەنگی ئاوەکە دەچێ لە نێو کێوەکەدا.

**پ: مەبەست، کاک سەلاح لێرە بە شێکی تر ئەوە نییە کە مرۆڤایەتی لە فەرامۆشێکی تەواو دا ئەژی. ئەم دەنگی ئاوە دەنگێکە، کـچی نوور، کـچـێکە کـە دێ و ئێـمـە لەو فەرامۆشییە و لەو بێ ئاگاهییە نەجات دەدا؟**

و: بەرێوەڵلا. بۆ؟ تۆ لەوەدا دەبینی کە "سوارە" لەگەڵ ئەفسانە زۆر دەراوێنێ و دەیهەوێ ئەفسانە ببەستێتەوە بە ژیانی ئەمڕۆمانەوە. ئەفسانە یا ئوستوورە یەکێک لەو شتانەیە کە "سوارە"، خۆی زۆر پێوە خەریک دەکا و لە شێعرەکانیدا هەر جارەی بە جۆرێک ئیشارەی پێدەکا، بۆ چی؟ چونکە ژیانی ئینسان درێژەی ڕابردوویەتی.

ئەگەر ئینسـان وەکو واحـیدێکی یەکگرتووی بەشەری چاو لێ بکەی، ئینسان تەنیا لە لەحزەدا ناژی، لە کاتی ئێستادا ناژی، ئینسان درێژەپێدراوی مێژوویەکی لە مێژینەی چەندین هەزار ساڵەیە کـە برێکی لە بیرە و برێکیش لە بیر نەمـاوە. "سوارە" دەیهەوێ بە هۆی ئەم سەرگوزشتە کـۆنانەوە، بە هۆی ئەم مێـژوو لە مێـژینەوە لە خـیلالی هەزاران خشـتی ڕۆژ و شەودا، ئەفسانە کۆنەکان و ئوستوورەکانمان وەبیر بێنێتەوە، بۆیە تۆ دەبینی "سوارە"، لەگەڵ "خەوەبەردینە"، دەیان مەبەستی دیکەش دێنێتە گۆڕێ، جگە لە مەبەستی ئەوەی کـە بڵێ ئاوەکە چۆن هاتە دەرێ و چی کرد، بەڵام هەر یەک لە وانە مەبەستێکی تایبەتن. دیارە ناکرێ لە سەر هەموویان زۆر بڕۆم، چونکە کات زۆر دەبێ.

**ئەڵێی دەنگی شمشاڵە ڕەشماڵی دۆڵی دڕیوە**
**شمماڵی دەرەی doورە شاری**
**پشووی پڕ لە عەتری بە هاری کچی کورد**
**بە بلوێری شووشی گەرووی زەرد و زۆڵی**
**لە زەنوێری زێوئاژنی سای زرینگانەوەی شەو**
**بە خوڕ زەمزەمەی هەڵدڕیوە**

لیرەشدا ئەم تەشبیهانە دووبارە تێکەڵ دەبنەوە، دەنگی شمشاڵ، یا خود دەنگی شمشاڵ کە دیارە خۆشە، بەڵام جارێ خودی شمشاڵەکەیە، شمشاڵەکە تەشبیە دەکا بە گەرووی زەردوزۆڵی کچێکی کورد. لە کەی؟ کە بە پشووی پڕ لە عەتری بە هاریبە وە، لە کاتی زرینگانەوەی شەو کە دنیا سپی و زێوئاژنە و دنیا زرینگاوتەوە. لەم دەشتە زێوئاژنە بە خوڕ زەمزەمە هەڵدەبڕێ کچی کورد و لەو کاتەشدا وەکو دەنگی شمشاڵ دەچێ.

ئاوە کە تەشبیە دەکا بە گەرووی زەردوزۆڵی کچی کورد و ئەم گەرووی زەردوزۆڵەش تەشبیهی دەکا بە شمشاڵێک و شمشاڵێکیش کە لە نیوەشەودا ڕەشماڵی دۆڵی دادڕیوە، دۆڵ تەشبیهی دەکا بە ڕەشماڵێک کە وڵاتی داگرتووە.

**بە ئیعجازی ئەنگوستی پاکی محەممەد**

**شەتی نوور بە ڕووی مانگی عەرزا کشاوە.**

ئەوە ئیشارە بەو ئەفسانەیەی "شەقوولقەمەر" دەکا. ئەمە شەتێکی نوورە، بەڵام لە سەر ئەوە بە سەر مانگا ڕاکشا بێ، بە سەر مانگی عەرزا ڕاکشاوە، عەرز تەشبیە دەکا بە مانگێک، شەتی نوورەکە بە سەر مانگی عەرزا ڕاکشاوە، نەک بە سەر مانگی عاسمانا.

**trووسکەی برووسکەی شەوی دەم بەهاری بە هەورە**

**لە سەر عاسمانی زەوی ڕاخوشاوە.**

جارێکی دیکەش، زەوی لەگەڵ عاسمان موقارە زە دەکا. دەڵێی تروسکەی برووسکەی شەوێکی بەهاریبە، بەڵام ئاخر ئەم برووسکەیە بە ئاسماندا ڕادەکشێ!! بەڵام لێرە نەک لە سەر ئاسمانی سەرەوە، لە سەر ئاسمانی خوارەوە، لە سەر زەوی ڕاکشاوە، چونکە ئاوەکە بە سەر زەویدا دێ تێدەپەڕێ.

**پ: ئەم تەشبیهە مەعکووسانە، ئەم تە شبیهە پێچەوانانە، لە شیعری کاک "سوارە"یا زۆر سەیرە؟**

و: لە زۆر جێگادا نازانی چ تەشبیە دەکا بە چی. ئەوەی عەرەب پێی دەڵێن "موشەبەهون موشەبەهونبێ" لە زۆر جێگادا جێگاکانی خۆیان دەگۆڕن و خۆی سوننەتێک یا ڕەسمێک یا نەریتێکی تازە دادە نێ بۆ شیعری کوردی، کە شەرت نییە لەگەڵ هەموو ڕێنوێنی و ئامۆژگاری ئەدیبە کۆنەکانی زمانی فارسی و عەرەبی و تەنانەت شاعیرە کلاسیکەکانی زمانی کورد یش بگونجێ. تەشبیهەکانی وا تێکەڵ دەکا، لە زۆر جێگادا زۆر لێ وردبوونەوەی دەوێ تا بزانی لەم دووانە کامەیان تەشبیە کراوە بە وی تر.

جا ئەمجارە باسی ئەوە دەکا، ئەگەر ئاو گەیشتێ، ئەگەر هات و ئاو بگا چ دەبێ؟

**لە هەر گاز و ڕێبازێ وا گازی ئاوی ئەگاتێ**
**نیازی هەزاران گەزیزەی بەنازی وەدی دێ**
**ئەبووژێتەوە داری چاکی بە ودمی هەناسەی**
**شنەی نەرمە لاوێنی دەم بای ئەخاتێ.**

خۆ ئەگەر هەر گاز و ڕێبازێک، هەر شوێنێک کە دەنگی ئاوی گەیشتێ. گازی دووەم مەعنای دەنگە. کە دەنگی ئاو گەیشتە هەر شوێنێک، نیازی هەزاران گەزیزەی بەناز کە ئاواتی ئەوەیانە ئاو بیانگاتێ، نیازیان وەدی دێ. داری چاکی کە زۆر پیرە، وشک بووە بە ودمی هەناسەی ئاو بە بەرەکەتی هەناسەی ئاو، داری چاکیش دەبووژێتەوە. ئەم داری چاکییە وشک و ڕەق و پیر بووە، شنەی لاوێنێکی نەرمی کە بە دەم باوە شنەی دێ دەکەوێتە داری چاکییە وە. لاوێن ئەو دارە «بی» یەیە کە فەرقی لەگەڵ داری «بی» گەورە ئەوەیە، دارە بییەکان بن دە کەن و گەورە دەبن، بەڵام ئەوانە هەر شوولی تەڕن و دەمێننەوە و عادەتە لەو نەرمە لاوێنەشە کە قەرتاڵە و سەوەتە و شتی دیکەی دارین دەهۆندرێتەوە، ئەوانە دەبێ نەرم بن و نەشکێن.

جا دەیهەوێ بڵێ ئەو نەرمە لاوێنی کە بە دەم بای شنەی شەماڵەوە، شنەی دێ چەند نەرمە داری چاکی وەختێک ئاو دەیانگاتێ ئاوا نەرم دەبێتەوە و جارێکی دیکە گەنج دەبێتەوە بە هۆی ئاوەکەوە.

جا ئەلێرەدا ئاو لەبەر خۆیەوە قسە دەکا. خەڵک چاوەڕوانی ئاوە. ئەی ئاوەکە چاوەڕوانی چییە؟ لێرەوار، زەوی، درەخت، کێو، هەموو چاوەڕوانی ئاون. ئەستێرە، مانگەشەو، بەڵام ئەی خۆی ئاوەکە نیازی چییە؟ ئاوەکە چ تەمایەکی هەیە؟

ئاو بیر دەکاتەوە و ئاوا بیر دەکاتەوە:

**ئەڵێن تاجی زمرووتی دورگەی لە سەر ئاوە دەریا**
**هەتا چاو هەتەر کا، شەپۆلە، شەپۆلە**
**لە بوونا لە چوونا**
**بە ئاهەنگە سەربەندی بزوێنی خۆشی**
**لەبەر خۆرەتاوا ئەڵێی سینگی ژینە ئەهاژێ**
**ئەڵێی: هانی هەستانە دەنگی خرۆشی**
**سروودی خوناوەی بەهارە لە گوێما**
**لە هەر شێوە جۆباری هەر دەشتە چۆمێ**
**لە دڵمایە بروای بەرینی بە دەریا گەیشتێ**

**لە تاریکە تاراوگەکەم وا بەسەر چوو**
**زەمانی تەریکیم**
**ئیتر خێروخۆشی لە ڕێما**

ئاو بە هیوایە بگاتە دەریا، ئەوە ئامانجی ئاوە، کە لە دڵی کێو دێتە دەرێ، بەو نیازە دێتە دەرێ سەرەنجام بگاتە دەریا. جا دەریا چۆنە؟ ئاو هێشتا نەیدیوە، هێشتا نەیگەیشتۆتێ. خۆی دەریا تەسویر دەکا لە مێشکی خۆیدا. ئاوا بیر دەکاتەوە:

**هەتا چاو هەتەر کا، شەپۆلە، شەپۆلە**
**لە بوونا لە چوونا**

حەرەکەت و بزووتن و ژیان، ئەم تەسویرەیە کە هاتۆتە مێشکی ئەم ئاوە سەبارەت بە دەریای کە هێشتا نەیگرتووە. جا ئەم ئاوە، سەربەندێکی هەیە. ئەم ئاهەنگی دەریایە، سەربەندێکی خۆشی هەیە. وەکو سینگی ژین وایە. تەشبیهی شەپۆلەکانی ئاوە کە هەڵدەستێ و دەکەوێتە وە خوارێ. تەشبیهی دەکا دەڵێی سینگی ژیانە لەبەر خۆیەوە دە هاژێ و هەڵدەستێ و دێتەوە خوار. ئینجا دەڵێ من سروودی خوناوەی بەهارم لە گوێدایە. من دەزانم بارانی بەهار دەبارێ و دەزانم کە بارانی بەهار گەیشت من پێی بەهێز دەبم، من پێی بە توانا دەبم و پێی دەگەم بە دەریا. دڵیشم ئیمانێک و بڕوایەکی بەرینی ئەوەی هەیە کە دەگەم بە دەریا.

سوارە لێرە دا دەیهەوێ ئەم مەنتیقە ئەم دیالیکتیکە وردە بگەیەنێ کە هەم زەمینەی ماددی هەیە بۆ گەیشتنم، چونکە بەهار هەمیشە دەبارێ، باران هەرگیز تەواو نابێ لە جیهاندا، بەهار سەرچاوەی ئاوە، سەرچاوەی بوون و ژیانی ئاوە.

دوو، بڕوای منە بۆ ئەو ئامانجەم. بڕوایەکی بەرینی بە دەریا گەیشتنیش لە سینگمدایە و لە دڵمدایە. بەینی ئەم زەمینە ماددی و ئەم زەمینە مەعنەوییە، نەتیجەیەک دێتە بەرهەم کە گەیشتنی منە بە دەریا.

بەم تەرتیبە ئەو تەسەوری دەریا دەکا و ئیتر دەڵێ خێروخۆشی لە ڕێما. جا ئەم جار شاعیر خۆی دەڵێ:

وەهایە:

**کە کانی بە هیوا**
**بەهارانە لووزەو ئەبەستێ بەرەو شاری دەریا**
**بەڵام داخی جەرگم لەگەڵ هەر بەهارێ**
**کە ڕائەچڵەکن سەوزەڵانی**

**لە خاکینە خەونی گرانا**
**لە دڵما خەم و داخی ئەم دەردە سەوزە:**
**کە دەردی گرانی هەموو ڕێبوارێ وەنەوزە.**

کانی ئەو هیوایەیان هەیە، بۆیە ئاوا لووزەو دەبەستن و بە خوڕ هێرش دەبەن و ڕوو دەکەنە شاری دەریا، بەڵام من خەمی چیمە؟

خەمی ئەوەمە هەموو بەهارێک کە سەوزەڵانی وەخەبەر دێن و لەم خەود خاکینەی کە تا ئێستا بوویانە لە نێو گڵ و خاک وا وەخەبەر دێن و بەرز دەبنەوە، لەو کاتەدا خەمێکی دیکە لە دڵی مندا سەوزە کە هەموو ڕێبوارێک مەترسێکی لە ڕێگا دایە، ئەویش ئەوەیە لە نیوە ی ڕێگا خەوی لێ بکەوێ، وەنەوز بدا.

**پ: ئەم فەرامۆشییە هەمان ئەو شتە نەبوو کە لە کۆپلەیەکا:**
**- سنووری شەوی دوێنێ ئەوڕۆ بەیانی -**
**پەچەی قورسی نسیانی ئینسانی لادا**
**دەمانگێڕێتەوە بۆ ئەو خەمە گەورەی کە ئینسان فەرامۆشی دەکا؟**

و: کە ئینسان لە نیوەی ڕێگا پێ ناگا. کە لا دەدا، کە واز دێنێ، ماندوو دەبێ، دەترسێ و سەرەنجام سەری لێ دەشێوێ. ئەمە چارەنووسی ئینسانە.

سوارە خەیاڵی هەیە بڵێت جا لە نێو هەموو ئەوانەدا بە تەنیا یەکێکیان پێدەگا. من دوایە دەگەمە ئەوە، بەڵام مەترسی ئەوەی هەیە کە هەموو ڕێبوارێک، ئەو خەتەرەی لە سەر ڕێگایە کە لە نیوەی ڕێگادا خەوی لێ بکەوێ.

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی شیعری سوارە، کە سەبەبی خۆشییەکەیەتی و سەبەبی بەرزیکەیەتی جاری پێشووش ئیشارەم پێکرد، یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی شیعری شاعیرانی گەورەی هەموو جیهان یەکێکیان ئەوەیە کە هەر کەس بۆی هەیە بە دڵی خۆی مەعنای لێبداتەوە و دەشکونجێ، مەعنای زۆر هەڵدەگرێ. خۆ دیارە ئەوەی گوێگرە خۆشەویستەکەی ئێمە دەیڵێ دوور نییە لە هەموو ئەو قسانەی کە لە شیعرەکە دا هەیە.

ئینجا باسمان کرد کە ئاوەکە دێتە دەرێ. هیوای هەیە، بڕوایەکی بەرینی لە دڵدا هەیە و سەرچاوەیەکی ماددیشی بۆ مسۆگەر بووە لە عالەمدا کە ئەویش خوناوەی بەهاری بەردەوامە. بۆیە هیوای هەیە پێ بگا، بەڵام مەترسی ئەوە هەیە وەکو هەموو ڕێبوارێک لە تاریخدا، لابدا، لاڕێ بێ، نەزانێ، سەری لێ بشێوێ، بترسێ، واز بێنێ و هەموو ئەو شتانەی کە باسمان کرد.

ئینجا سوارە، دەکەوێتە سەر لێک جیاکردنەوەی ئەم جۆرە ئاوانە، ئەم ئاوانە هەموویان لە

شیعری "خەوەبەردینە"دا میسالێکن و ڕەمزێکن بۆ حەرەکەتی ئینسان لە کۆمەڵگادا. هەموو ئەو ئاوانە، جۆراوجۆریی حەرەکەتەکانی ئینسان نیشان دەدەن. یەکێکیان توند و تیژە، یەکیان ئارامە، یەکیان ڕادەوەستێ تا سەرەنجام دەگاتە یەکێکیان کە لە هەمووان خراپترە. ئەویش ئەو ئاوەیە کە گراوە. کە سەرەنجام دەبێ بە بەرد. ئەوە ئاوە مەعدەنییەکانن، کە دوای ماوەیەک لە سەرچاوە هاتە دەرێ، چەند هەنگاوێک ناڕوا و ویشک دەبێ و دەبێ بە بەرد.

ئاخر ئاو ڕەمزی ڕانەوەستانە، ڕەمزی بزووتنە، کە چی بەرد، ڕەمزی وەستان و بێ حەرەکەتییە، تەواو ئەو ئاوە تەبدیل دەبێ بە دژی خۆی. ئەمە ئیتر ئەم کارەساتەیە یا ئەم فاجیعەیە کە جاری وایە ڕوو دەکاتە ئینسان کە تەبدیلی دەکا بە دژی خۆی. ئایشارمەوە کاتێک ئەم شیعرە دەگوترا، ئێمە دەستەبەندی زۆر کەسمان کردبوو کە هەر یەک لەو ئاوانە کێ یا چ جەرەیان و یا چ حەرەکەتێک دەگرێتەوە. ئەم ئاوەی ئاخر کە دەبێ بە بەرد و هەر بۆیەش ناوی ناوە "خەوەبەردینە" ئاوێکە کە خەو ئەبینێ بە بوون بە بەرد، خەو بە بەرد بوونەوە ئەبینێ، کە تەشبیهمان دەکرد، دەمانگوت ئەوە ئەو کەسەیە کە لە دژی گەلەکەی خۆی شەڕ دەکا. ئەوەی ناتوانێ، ئەوەی دەوەستێ، ئەوەی واز دێنێ، هەر چۆنێک بێ چارێکی بۆ دەکرێ، بەڵام ئەی ئەوە ی دەبێ بە دژی خۆی؟

جا سوارە لە "خەوەبەردینە" دا نیهایەتی خراپییەکەی لەو ئاوەدا دەبینێ کە گراوە و کە دەبێ بە بەرد. نیهایەتی چاکییەکەش لەو ئاوەدا دەبینێ کە ناوەستێ، کە ئیتر ئاخری شیعرەکە بەوە دێنێ کە " هە ناوی بە هەنگاوە" ئەسرەوتنە کوولەکەی ڕووحی ئاوە. ئەمە هەرە ئاوە چاکەکەیە، دوایە دەگەینە سەر ئەو، بەڵام ئێستا بێ بزانین ئاوەکان چۆن یەکە یەکە دابەش دەکا و هەر یەکە سیفەتێکی تایبەتی بۆ دەبینێتەوە.

**لە بەر نووری خۆرا**
**گەلێ کوێرە کانی شەوارن**
**زنەی دەم بەهاواری هاری درۆزن هەزارن**
**کە تەسلیمی سیحر و تە لیسمی بنارن**
**بە بێ هەوڵی هەڵدان و چارانی چارن**
**بە هیوان بگرمێنێ هەوری بەهاری**
**ڕەها بن**
**لە زیندانی بەردینی غارا**
**کە چی، وا کەوی و دەستە مۆی دەسەڵاتی ڕکەی دۆڵ و شیون**
**لەبەر سامی ڕێ وا بەزیو و تەزیون**

**لەگەڵ گۆچی کردن گزنگێ،**
**چەواشەن لە پێچی نزارا.**

ئەمە باسی ئەوە دەکا گەلێک کوێرەکانی، خۆیان لە سەر پێی خۆیان ڕاناوەستن، بە هێز و توانای خۆیانەوە پشت ئەستوور نین و زۆر کانی هەن کە دەم بە هاوارن دەزانی، زنە لە لای ئێمە بەو کانیانە دەڵێن درۆزنە، ئەو کانیانەی کە بەینێک ئاویان لێ دێ و زۆری پێ ناچێ ویشک دەکەن. بۆیە دەڵێ:

**زنەی دەم بە هاواری هاری درۆزن هەزارن**

ئەم زنانە بۆیەش دەم بە هاوارن، چونکە لە بەهاردا ئاوێکی یەجگار زۆریان لێ دێ بە خوڕ و بە گرمەیەکی زۆر دێنە دەرێ، بەڵام لە ماوەیەکی کورتدا ویشک دەبن، ئەمە پێیان دەڵێن درۆزنە. ئەوانە لە نێو کێوەکە دا زۆر ترساون لە پێچاوپێچی کێو، ناتوانن ئەم شاخ و کوێستانە تە ی کەن، ناتوانن چۆڵ بڕی بکەن و سەخت و کێو ببڕن. هیچ حەول نادەن چارە یەک بۆ خۆیان بدۆزنەوە. بە هیوان هەوری بەهاریی بگرمێنێ ـ چونکە بەشێکی زۆر لەو کانییانە دەڵێن ئەگەر هەور گرماندی سەرچاوەی کانی دەتۆقێ ـ ئەوان بە هیوان هەوری بەهاریی بگرمێنێ و جا لە زیندانی بەردینی غاردا ڕەها بن و بێنە دەرێ.

دەشیهێنێتە دەرێ،هەورە بەهارییەکەش دەگرمێنێ، ئەوانیش دێن، بەڵام هێند کەوی و دەستەمۆ بوون لە نێو زیندانی دۆڵ و شێودا، هێند ڕاهاتوون بە ژێردەستەیی و دیلی و بێدەسەلاتی، توانای ئازادی وەرگرتنە کەیان نییە. هیوایان بە ئازادی نەماوە، بۆیە لەبەر سامی ڕێش، لەبەر ترسی ئەم ڕێگا سەخت و دژوارەی ـ کە زۆر جار سوارە لە شیعرەکانیدا باسی ئەم ڕێگایە سەخت و دوور و قاقڕە دەکا ـ لەبەر سامی ڕێش هێندە بەزیو و تەزیون، لەگەڵ بەیانی گزینگێک لە سەرانی دا، بۆ خۆی دەڵێ: "گۆچی کردن" بە یەکەمین گزینگی هەتاو چەواشە دەبن لە پێچی نزارێک و سەریان لێ دەشێوێ و تازە ناتوانن بڕۆن. ئەمانە ئەو کەسانەن کە باوەڕیان بە خۆیان نییە کە لە سەر پێی خۆیان ڕاناوەستن کە بە هیوان هەوری بەهاریی بۆیان بگرمێنێ، ئەمە ئەوعێک ئاوە.

**پ: لە سەر زمانی یەکگرتووی کوردی!**

و: بەڵام ئەوە کە زمانی ستانداردی یەکگرتووی کوردی بە کار دێنێ یەکێک لە خەسڵەتە باشەکانی ئەو ئەدەبیە کوردیی نوێیەی کە لە دەیە ی شەست لە ئێران سەری هەڵدا و لە نێوەڕاستی شەستەکانەوە گەیشتە لووتکەی هەرە بەرزی خۆی و سوارە ش نوێنەرێکی هەرە دیار و بەرچاوێتی، بەڵام ئەوانی تریش هەر بە شێوەی سوارە شیعریان گوتووە و تەنانەت پەخشانەکانیشیان هەر ئاوا نووسیوە.

یەکێک لە تایبەتمەندە باشەکانی، ڕەچاو کردنی ئەو ئەدەبە کلاسیکییە یەکگرتووە ستاندارەدیە لەگەڵ ئەوە کە بڵێی لە دەورەی "جمهوری کوردستان" و کۆمەڵەی "ژ.ک"دا زۆر تری ئەدەبی کوردستانی ئێران شێوەی موکریانی پێوە بوو و یا لە زۆر جاردا لە شارەکانی تری ئەم پارچەی ئێستای کوردستانی عێراقدا دەبینین، مۆرکی ناوچەیی پێوە دیارە. ئەدەبی دەیەی شەستی کوردستانی ئێران شیعری نوێی کوردی و پەخشانی نوێی کوردی لە کوردستانی ئێران زۆر حەولی ئەوەی دا کە زمانی ستانداردە، یەکگرتووەکە بە کار بێنێ و خزمەتێکی باشیشی لەو بارەوە کرد، کە ئەم برادەرە زۆر باشی بۆچووە.

ئەم جار دەگاتە سەر ئەو بەشە هەرە ئاوە خراپەکەی کە بۆم باس کردی، ئاوی گراو کە دەبێ بە بەرد و "خەوەبەردینە"ش ناوەکەی خۆی لەوە وەرگرتووە.

**هەتا بیری تاڵی گراوێ**
**بە دڵما گەڕاوە**
**هەتا یاد ئەکەم ئاوە بەو ورمە بەردینە کاری کراوە**
**ئەڵێم سەد مەغابن**
**وە جاخێ کە ڕووگەی هەزاران نزای شینە باهۆی بەتاسەن**
**وە بووژێنەوەی هەست و هان و هەناسەن**
**چلۆنە کە بیژووی گراوان ئەبینن**
**لە نێو چاوی ئەو خانەدانە**
**لەمی چۆنە پیتی براوە؟**
**نە سۆزەی بلاوێنی میری، خوناوەی بەهاری**
**نە تووکی برای ڕێبواری**
**لە کاسی خەوا، فێری ڕاسانی ناکەن**
**لە مانا، بە ئامان و بریا**
**پەشیمانی هەرمانی ناکەن**
**وەهاگەی لەشی بەوگەبەردینە گاوی دراوە**
**کە حێلێکە، کۆرژن و حیلەی نەماوە**
**وەهایە کە هەر گیایە لەو دەشتە شینن**
**لە سەر ماتەمی ئاوە بەردینە، سەرشێن و سەرگەرمی شینن.**

خەیاڵی هەیە بڵێ ئاوەکە دەبێ بە گراو، دەبێتە دژی خۆی من لە سەر ئەوە ڕۆیشتووم تازە لە سەری ناڕۆم، بەڵام من هەتا بیر لەوە دەکەمەوە ئەوە ئاوە، بەڵام بەو خەونە بەردینە ـ

وەرمیش هەر خەونە ـ بەو خەونە ورمە بەردینە ئاوا کاری کراوە و کۆڵەی کوتراوە. دەڵێم باشە هەزار مەغابن و هەزار حەیف، ئەم وەجاخە، وەجاخی ئاو، ئەوانە رووگە و قیبلەن بۆ هەزار نزا و ئاواتی باسکی شین، باسکی شینی دارەکان کە روو دەکاتە ئاو، هاواری بۆ دەکات، باشە وەجاخێک کە هەزاران باسکی شین هاواری ئاوی لێ دەکەن و هەست و هان و هەناسە دەبووژێننەوە. چۆن ئەوانە بیرژوو ئەبین؟ لە نێو چاوی ئەو خانەدانە، لە هی یا تۆفان چۆنە پیت و بەرەکەتی تێدا نەماوە؟

نا، ئەوەی کە میری خوناوەی بەهارییە، ئەوە ئەفسانەی کۆنە کە دەڵێ میرخوناوە هەبوو. ـ میرخوناوە لە واقیعدا بە ئەفسانەی کۆن و متیۆلۆژی کۆن خواوەندی بارانە ـ، نە خواوەندی بارانی بەهاریی، کە داوای لێ دەکا و سۆزەی بلاوێنی هەیە، نە برای ڕێبواری خۆی کە تووکی لێ دەکا و نفرینی لێ دەکا. ئەو برای خۆی کە لەگەڵ ئاو هاتووە و دەڕوا و ئەم بەجێ دەمێنێ، ئەویش ئاخە هەزار تووک و نەفرینی لێ دەکا.

جا نەپاڕانەوەی میری خوناوەی بەهار و نە ئەو تووک و نفرینەی برای ڕێبواری لەم کاسی خەوا کە تووشی هاتووە تازە فێری ناکەن. بەڕاستی فێری ناکەن ڕاست بێتەوە و ڕاپەڕێ بە هەزار ئامان و بریا، ئامان و بڕۆ و بریا هاتبای، فێری ئەم هەرمان و جاویدان مانەوەی ناکەن لە ناو بەرد بوونی خۆیدا.

گەی لەشی گاو دراوە، وەکو کەحێلێک وایە، کۆڕژنی حیلەی نەماوە. ئەسپێکی بێ حیلەیە. جا ئاخرییەکەی دەڵێ: هەموو ئەو گیایانەش لەو دەشتەن، لە سەر ماتەمی ئەو ئاوەیە شین دەگێڕن و سەرشینیشن، سەری خۆیان شین کردووە، چونکەلە ڕابردوودا لە تازیە و ماتەمدا سەری خۆیان شین دەکرد.

جۆرێکی دیکە ئاو بەیان دەکا. ئەمجا ئەو ئاوەیە کە ڕادەوەستێ و دەبێتە گۆل، کاری پێ ناکرێ. ڕاستە نەبۆتە گڕاو و نەبۆتە دژی خۆی، بەڵام ناشبزوێ.

**گەلێ گۆلە لەو چۆلە یەخسیری خاکن**
**بە ڕوویا گەڵا وەک چەمۆڵەی کلۆڵی وەڕیون**
**گەمارۆی زەلی نێزە، وا تەنگی پێ هەڵچنیون،**
**کە بێ دەرفەتی پێکەنینن بە سەد بەرزگی زەردە ماسی**
**لق و پۆپ و هەژگەڵ**
**وەها دەور و پشتی تەنیون**
**کە بێ فرسەتی چاوەبرکێ**
**لەگەڵ عەرشی پاکن.**

ئەوەش زۆر لە سەر، ڕۆیشتنی ناویّ. وەسفی ئاوێکە کە لق و پۆپ و هەژگەڵ دەوروپشتی گرتووە و توانای ڕۆیشتنیان نەماوە و بوون بە ئاوێکی ڕاکیدی ڕاوەستاو.

**هەتا جۆگە ئاویّ بە وشکی دەبینم**
**ئەڵێی مێرگی ڕوخساری کیژێکی کاڵ و مناڵە**
**بە کووزی تەمەن جاڕەجوانێکی پڕ خەوشوخاڵە،**
**تەشەنداوە جەرگی برینم.**

ئەمە یەکێک لەم شتانەیە کە باسمان کرد کە تەشبیهەکان دەکەونە لای یەکتر. ئەو خەیاڵی هەیە باسی جۆگە ئاو بکا، بەڵام جۆگە ئاوەکە تەشبیەدەکا بە روخساری کیژێک ـ کیژێکی کاڵ و مناڵ ـ ڕوخساری کیژەکەش تەشبیەدەکا بە مێرگێک، چۆن مێرگ دێنیّ کووزی بە سەر دادێنیّ، جووتی بە نێودا دەکەی و کووزی بە سەر دادێنی، دەیڕووشێنی. ڕوخساری ئەم کیژە کاڵ و مناڵەش ئێستا کە بۆتە ژنێکی پیر، بە کووزی تەمەن شوێن شوێن کراوە، خۆی ئێستا جوان نییە، بەڵام جاڕەجوانە، جاڕەجوانێکی پڕ خەوشوخاڵ. وەبیر دەکەوێتەوە کە ئەمە کاتی خۆی زۆر جوان بووە، ئەمە تەشبیەدەکا بە جۆگەیەک کە ئێستا ویشکە، بەڵام لە ڕابردوودا ئاوی تێدا بووە. ئەگەر حیسابی کەین ئەمە چوار یا پێنج تەشبیەلە نێو یەکتردا.

**بەڵێ: دوورە گەرمێنی دەریا**
**بەڵێ: وایە کانی هەژارن**
**ئەزانم**
**ئەوانەی کە پاراوی ئاون بژارن.**
**ئەزانم لە ڕێگا،**
**مەترسی گەلێ ژەنگ و ژارن.**
**بەڵام کاکە ئەو گشتە عەقڵی خەسارن**

ناڵێ هەر عەقڵە لە خەسارێک، هەموو ئەو خەسارانە دەبێ بکەون، تا ئینسانییەت ئەم عەقڵە پەیدا دەکا، عەقڵی ئینسان بەرهەمی ئەزموونێکی دوورودرێژی پرکەوتن و هەستانەوەیە و هەموو ئەو خەسارەتانە پێویستێ ڕوو بدەن تا بەشەرییەت ـ و لە نێو ئەوانیشدا دیارە مەبەستی گەلی کوردە ـ بتوانێ ئەم عەقڵە پێویستە پەیدا بکا کە بۆ گەیشتێ بە ئامانجی لازمی دەبێ. جا دەگاتە قسەی ئاخر.

**لە ناو ئەو هەموو ئاوە هەر چاوەیەک**
**باوی هەنگاوی خۆشە**

**بە تەنیا ئەوە شارەزای کۆسپ و کەندالی ڕێیە**
**هەوەڵ مەنزڵی ڕێیە، ئاواتی بەرزی زۆرێیە**

ئەمە قسەکەی ئاخری سوارەیە، بۆیە دەمهەوێ لە سەر ئەم بابەتە پتر بدوێم.

ئەمە خەباتی گەلی کوردە لە نێو خەباتی کۆمەڵگای ئینسانیدا. سوارە دەڵێ: هەموو کانییە چکۆلەکان، هەموو ڕووبارە چکۆلەکان، هەموو شێوەکان سەرەنجام دەگەنەوە یەک جێگا کە ڕێیەکی گەورە پێکدێنن. ئەوە تەکوینی یەکگرتوویی میللییە بۆ گەلی کورد. لە هەموو ئەو ناوچە جیا جیانە و لە هەموو ئەو خەباتە پەڕاگەندە و دوور لە یەکە، سەرەنجام یەکگرتنەوەیەک ساز دەبێ، ڕێیەکی گەورە پەیدا دەبێ و ئەمە ئەو سەربەخۆیی و ئازادی و یەکگرتنەوەی گەلی کوردە کە هەوەڵ مەنزڵێتی، پێویستە ئەمە بە دەست بێ،بەڵام بەوەوە ڕاناوەستێ و دەڵێ جا ئەم ڕێیەش لەگەڵ زۆر ڕێی گەورەی دیکە لە جیهاندا دەچنە نێو دەریا، ئەویش دەریای بەشەرییەتە. دەریای جیهانێک کە دەودا هەموو ئینسانەکان ئازاد بن. بۆیە سوارە هەموو قسەکانی لە سەر ئەوەیە کە ئەو هەموو ئاوە بە دوو ئامانج دەڕۆن. یەکێکیان ئەوەیە ببن بە ڕێیەکی گەورە، کە یەکگرتن و سەربەخۆیی گەلی کوردە، دوایە بچنە نێو دەریایەکی وەسیع و بەرین کە ئازادی تەواوی ئینسانییەت بێ.

ئینجا لە نێو ئەو هەموو ئاوە، هەر چاوەیەک باوی هەنگاوی خۆشە، بە تەنیا ئەوە شارەزای کۆسپ و کەندالی ڕێیە، یەکەمین سەبەب و شەرتی پێویست بۆ گەیشتن بە ئامانج شارەزایی و پسپۆڕییە، ئەم ئاوە شارەزا و پسپۆڕە. دوو، هەوەڵ مەنزڵ ڕێیە ـ فەرقی بەینی ئامانجی دوور و نزیک دەکا ـ ئەوڕۆ کە دەستی پێکردووە دەزانێ ئامانجێکی نزیک هەیە کە سەرکەوتنی گەلی کوردە و ئامانجێکی دوورتر هەیە کە سەرکەوتنی بەشەرییەتە، بۆیە دەڵێ فەرقی هەوەڵ مەنزڵ دەکا و فەرقی ئاواتێکی بەرزیش دەکا.

**ئەزانێ لە هەڵدێرە هاتی بەهێزی**
**ئاو ئەگەر لە هەڵدێرەوە دێتە خوارێ تەواو بەهێز دەبێ**
**لە ئەسکوند و چاڵایە هەڵدان و گێژی**
**بەرزی شینی سەر شانی دەریایە ژینی کەرێزی**

بۆ دەریا تازە ژینی کەرێزی، ژینی ژێرعەرز و بە نهێنی مایەی شەرمەزارییە، تۆ ئاوەکەت وا فراوان کرد، کە میللەتت ڕزگار کرد، کە گەیشتییە ئەو ئەسکوند و چاڵایە کە لەودا هەڵت دا و هەستای و بەرز بوویەوە، تازە ئیشت بە کاری نهێنیش نامێنێ، تازە ئیشت بە ژیانی کەرێزیش نامێنێت.

**ئەزانێ لە پێ ناکەوێ پێیە پێڵاوی تاسەی پیاسەی لە پێ بێ**

ئەگەر پێیەک پێڵاوێک لە پێ کا، کە ئەم پێڵاوە تاسەیەک بێ بۆ پیاسە کردن، یانی مەیلی حەرەکەت لە دەروونی خۆیدا هەبێ، هەرگیز لە پێ ناکەوێ، هەرگیز ماندوو نابێ و ناوەستێ بۆیەش دەڵێ: نا ـ دیارە لە چاپەکەدا ئەوەی تێدا نییە ـ کە دەبێ ویرگولێک دانێن دوای "نە"یەکە.

**نە، وەستان ئەوەستێ بە دەستێ**

**کە خاراوی ئێش و سواوی سوێ بێ**

وەستانیش تازە بەم دەستە ناوەستێ، کە دەستێک کە ڕاهاتبێ بە ئێش و ژان و سوا بێ لە نێو ڕەنج و میحنەت و کوێرەوەری و مەینەتدا. ئەمەیە کە وەستان پێی ناوەستێ و تەنیا ئەوەیە کە لە پێ ناکەوێ، ئەو ئاوە:

**لە هەر شوێنێ ڕاماوە، داماوە، کاری تەواوە**

ڕامان، لێرەدا مەبەستی بیرەبیرە و ڕاڕایی و وازوازییە، ئەگەر کەوتە وازوازی و ڕاڕایی ئیتر داماو دەبێ و کاری دەکرێ و لە پێ دەکەوێ.

**ئەزانێ ئەبێ هەر بڕێ و بازوێ، تا بڕێ تا بمێنێ**

لێرەدا، فەرقی بەینی بڕێ و بازوێ ـ ئەوەش یەکێک لە حەرەکە دیالیکتەکانی قسەی سوارەیە ـ بڕێ وەکو چۆن مەشکە دەژێ، حەرەکەتی دەروونییە. بازوێ یانی بڕوا بەرەو پێش، حەرەکەتی بیرونییە. ئەوی پێشیان ناوەکییە، ئەوی دوایان دەرەکییە. ئەم کارەی ئێمە، ئەم بزووتنەوەی کە ئاو دەیکا، ئەم حەرەکەتەی کە حەرەکەتی میللەتە و تەشبیەکراوە بە ئاو پێویستی بە دوو بزووتنەوە هەیە. بزووتنەوەیەکی داخیلی لە دەروونی خۆیدا و بزووتنەوەیەکیش بۆ بەرەو پێش هەنگاونان. ئەوەی کە پێی دەڵێن بزووتنەوەی ناوەکی و دەرەکی ـ کە دەڵێ تا بڕێ تا بمێنێ. ئەمە «تا»ی وەخت نییە، ئەمە «تا»ی عیللەتە، بۆ ئەوەی بڕێ، بۆ ئەوەی بمێنێ دەبێ هەرگیز نەوەستێ.

**هەر بڕێ و لە عەینی حاڵدا هەر بازوێ**

هەناوی بە هەنگاوە، بەوە دەژێ کە هەنگاو بنێ، ئەسرەوتنە کوولەکەی ڕووحی ئاوە. ئەمە "خەوەبەردینە" بوو.

بەڵام من هیوادارم مەعنای لێ بدەنەوە، بەڵام گوێگران و هەموو خەڵکی دیکە دەزانن پێویستی بە زۆر شیکردنەوەی دیکە بوو، کات ڕێگای نەدەداین.

**پ: پێم خۆشە وەڵامی ئەم چەند پرسیارە بدەیتەوە:**

**لەسەر تاپای ئەم شیعرە و لەسەرتاپای شیعرەکانی تری کاک سوارە، ئێمە ئەبینین**

**شیعری کاک سوارە، یانی خودی کاک سوارە، لە سەردەمێکا ژیاوە کە سەردەمی چوونە نێو ئەو شۆڕشانە و یان ئەو جەریانە سیاسییانەوە بووە کە جەریانی گشتی و کۆمەڵایەتی بوون، بەتایبەت جەریانی شار بوون، مەسەلەن ئەم هەموو حیزبە سیاسییانەی کە لە سەردەمی خۆیدا، ئەو جەریانە سیاسییانەی لە سەردەمی خۆیدا لە ئێرانا هەبوون، هەمووی ئەو ڕەوتە سیاسییانە بوون کە بنکەکەیان شار بووە، کاریان ئەکرد بۆ فراوان بوونی ئەو بنکە شارییە، بەڵام کاک سوارە دەگەڕێتەوە بۆ گوندەکان، لە شیعری شارا، ئەمە زۆر بە وازحی بەیان دەکا. ئەو جار ئەم لە جیاتی ئەوە لە دەریاوە ئەم ڕەوتە دەست پێ بکا، لە کانییەکەوە ئەم ڕەوتە دەست پێدەکا، ئەم حاڵەتە چۆن دەبینی؟**

و: وەڕزبوون و بێزاربوون لە شار. من خۆم لام وایە زیاتر لەوە کە بیرێکی سیاسی بێ، هەستێکی شاعیرانە و ناسک و خەیاڵاوییە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی منالّی سوارە. سوارە سەردەمی منالّی زۆر خۆش و گەش ڕایبوارد. گەڕان، سواری، ڕاو، مەلە، وەرزش هەموو ئەوانەی بۆ فەراهەم بوو و تەنانەت سەردەمی یەکەمی دلّداری و حەز لێکردن و خۆشەویستیشی بوو.

**پ: دەتوانێ شتێتر لە پشت ئەمەوە بێ؟**

و: من خۆم لە شیعرە شارەکەی زۆر باوەڕ ناکەم، دیارە ئەوە کە باسی شار دەکا دەڵێ: شار ڕەمزی ئاسن و منارەیە. لە ئاسنەکەش و لە منارەکەش تۆقیوە. نایهەوێ سەر دابنوێنێ بۆ ئەم خەسڵەت و تایبەتمەندییەی "شار"ەکە.

دەڵێ: ئەوەی کە دێتە دەر لە مالّی دەولّەمەند، ئەوە کە مەندی دووکەڵە. دەڵێ: جیاوازی بەینی فەقیر و دەولّەمەند زۆرە لە شار. دەڵێ: ئەم تەلانەی کە دەیبینم دارەتەلەکان، دەڵێی قەنارەیە و داندراوە، ملی ئینسانی پێوە دەکەن.

سوارە خۆی هەموو شتەکان دەڵێ، دەڵێ:

**تەسکە بۆ ئەوین و بۆ خەفەت هەراو**

ئەم دەیهەوێ، کۆلانێکی فراوانتر، دەشتێکی زیاتر، دەیهەوێ ـ ئەگەر بیلێیم پێدەشتەکەی قەرەگوێز و شاخە بەرزەکەی حاجی کیمی جارێکی دیکە ـ سوارە، ئارەزووی باوەشی ئەم شوێنە دەکاتەوە.

**پ: یەک شتی دیکە زۆر بەرچاوە، مەسەلەن لە سەرتاپای شیعرەکانی کاک سوارە بە جۆرێک لە ئەبەزی، بە جۆرێک ـ بەتایبەت تۆش "خەوەبەردینە"ت لێ تەفسیر کرد ـ زۆر بەگوڕە، بەتینە. بەس لە شیعرێکا، لە دیوانی "خەوەبەردینە" ئەگەر وا بزانم، "شەنگە سوار" لەم شیعرەیا زۆر ڕەشبینە، دەکرێ بە کورتی بڵێی ئەم ڕەشبینییەزۆرە یا کەم؟**

و: هەتا ساڵانی ۱۳٤۷ و ٤٨ و ٤٩ی ئێرانی کە دەکاتە ٦٧ و ٦٩ی میلادی، سەردەمی خەبات و بزووتنەوە و چالاکی سیاسی و نهێنی بوو. ئێمە هەموومان تێدا بووین و سوارەش تێیدا چالاک و بەشدار بوو، بەڵام لە ٦٩ی میلادی بەو لاوە بەردو ۷۰، دوای ئەوە کە من گیرام و کۆڕەکەمان بڵاو بوو، هەر کەسە ڕێگایەکی گرتە بەر، سوارە ناچار بوو بۆ ژیانی خۆی، چوو دامەزرا لە ئیدارەی ڕادیۆ تەلویزیۆنی تاران بوو بە کارمەند. ژیانی کارمەندی ـ ئەوەی کە "گۆران" باسی دەکا لە شیعرەکەیدا "ژیانی وەزیفە" ـ ئەم ژیانی وەزیفە وای لە سوارە کرد کە پێشی خۆی بگرێ و جڵەوی هەستی خۆی ڕاگرێ جگە لەوە، وردە وردە تێکشکانی ئەم حەرەکەتە لە سەردەمێکا خۆ ئەو تێکشکانە بەردەوام نەبوو، دوایە هەستانەوەی بە دوادا هات، بەڵام تێکشکانی لە سەردەمێکدا سوارەی ناهومێد کرد. ئەم تێکشکانە لە لایەکەوە تێشکانی خۆمان بوو، سوارە دەڵێ: "ڕووباری چووکی بە فیرۆچوو" ئەوە ئێمەین، بەڵام دەشڵێ: دەریای فراوان باوەڕ بە "چین" کە ئەفکاری "مائۆستۆنگ" ئەو کاتە سەرمەشقێک بوو، بۆ شۆڕشگێڕی لە زۆربەی زۆری دنیادا.

**پ: باشە پێت وانییە زۆربەی شیعرەکانی سوارە، بەشێکی زۆر گەڕانەوەی بۆ لادێ بەشێکی زۆر دەرباز بوون لە شار، موتەئەسیرە لە ئەفکاری "مائۆ".**

و: با، گومانی تێدا نییە ئەوەی تێدا هەیە، سەرەڕای ئەوەی کە من کوتم، بەشێکی گەڕانەوەیە بۆ ـ بۆخۆی دەڵێ بۆ "عاتیفە" ـ ی خۆم، بەڵام بەشێکی تێدا هەیە. سەردەمێک بوو کە "مائۆستۆنگ" قسە مەشهوورەکەی هەبوو کە "موحاسەرەی شار لە تەریقی دێیەکانەوە".

با بچینەسەر "چین". چین ئەم سیاسەتەی بەردا. چین سیاسەتی شۆڕشگێڕی خۆی گۆڕیوە بە سیاسەتی سێ جیهان و بڕیاری دا لەگەڵ دەوڵەتانی دیکە ڕێک بکەوێ و تەنانەت گەلێک لە شۆڕشە فراوانەکانی جیهان کە چین بەشداری تێدا دەکردن فەوتان، لەبەر ئەوە کە چین پشتیوانی لێ نەکردن. میسر یەکێک لەو شوێنانە بوو کە پیاوی وەک "جەماڵ عەبدولناسر"ی تێدا بوو، حەرەکەتێکی زیدی ئیستیعماری تێدا بوو.

با پێت بڵێم، "شەنگە سوار"، ئیدئۆلۆژی شکستە، دە زۆر سەردەمدا ئیدئۆلۆژی شکست دێنێ. وەختێک حەرەکەتێک لە سەردەمێکدا کۆسپی دەکەوێتە بەردەم یا تێکدەشکێ یا بۆ ماوەیەک بێدەنگ دەمێنێتەوە، بەڵام ئەم ئیدئۆلۆژییەشکستە بە دوو جۆر خۆی دەردەخا: یەکێکیان بێزاری و قسە پێکوتن و پشت تێهەڵکردن و ئینکاری ڕاستی و حەقیقەتەکەیە، بەڵام بەشێکیانیش خەم بۆ خواردن و دڵسوزی و پێدا هەڵکوتن و ناڕەحەتییە لەوەی کە بۆ نەماوە. دیارە "شەنگە سوار"، بەشی دووەمە. ئیدئۆلۆژی شکستە ـ هەرچەند من پێم وایە

ئێستاش شاعیره گەنجەکانی ئێمە لە حەڵقەیەکی ئیدئۆلۆژی شکستدا لەو دیو حەرەکەت دەکەن. بەڵام ئەم ئیدئۆلۆژییەشکستەی کە ئێستا شیعری شاعیرانی ئێمەی گرتۆتەوە، زۆر فەردییەت بەرجەستە دەکرێتەوە لە بەرامبەر کۆمەڵدا و ئینکاری زۆربەی ئیدئۆلۆژی و بیروباوەڕەکانی پێشوو دەکرێتەوە. من بە شتی مەنفی و خراپی نازانم. من پێم وایە ئەوە زەمینە خۆش دەکا بۆ ئیدئۆلۆژی تازە، بۆ سەرهەڵدانی تازە.

شیعرەکەی کاک سوارە ڕاست ئەو مەزموونە بوو، لە سالی بلێین حەفتاوە، سوارە دەڵێ:

**ئاسمان ئەوەندەخۆڵەمژە**
**قاز و قورینگ تەپوتۆزاوین**

ئیتر لەوە زیاتر چیتر بلێ بۆ ناڕەحەتی زەمانە. لە جێگایەک دەڵێ:

**ئەی سەرزەوی پڕ و پووچ**
**ئەی هەر هەناسەیەک:**
**نەفەسی دواییت**
**تەرمێ ئەچێ**
**ژنێ زانی منالی پێیا دێ**
**ئاخۆ هەموو ئەمە بوو ئەمبیست؟**
**دامێنی ژینی ئادەمیزاد**
**هەڵناتەکێ لە منال**
**لە ژیانی کرچ و کاڵ.**

جا لە جێگایەکدا دەڵێ:

**چەخماخەدانی هەوری نەزۆک**
**ئەستێ و بەرد و پووشوون**
**بە دەستی پیری لەرزۆک.**
**ڕووخان بەداخەوە بێقرمە**
**ڕووخان کۆشکی لە پۆڵا**
**دیواری چین و پەیکەری بولهەول**

**ئەم لێکدانەوە بەشێکە لە وتووێژی کاک سەلاحەددین موهتەدی، کە وەفەریدوون پێنجوێنیی ئامادەی کردووە.**

## سێبەری "سوارە" هێشتا سێبەرێکی سەنگینە...

**پ: زۆر سوپاس کاک سەلاح ...**

**ئێستا ئەگەر بتوانی خۆت کۆکەیتەوە و دووبارە بچیتەوە ئەو قۆناغەی کە گوزەراوە و تێپەریوە!!**

**دەتوانی ئەدەبێک کە لەو سی چل ساڵەدا کوردانی ئێرانی نووسیویانە، پۆلێن بکەی بە سەر چەند قۆناغ و چەند گرووپ و چەند دەستەی جیاوازدا؟ کێن ئەوانەی دەکرێ پەنجەیان بخەیتە سەر و لە ئەڵقەیەکدا کۆیان بکەیتەوە و پێیان بڵێی نوێنەری قۆناغێک؟ گرووپێکیتر لەملاوە نوێنەری قۆناغێکی دیکە؟**

**هەروەها پێم خۆشە قسە لە "سوارە" بکەین... قسە لە "هەژار" بکەین... قسە لە "هێمن" بکەین، کە هەموویان دۆستی ئێوە بوون...! ئەگەر بفەرموون لەوێوە دەست بە قسە بکەینەوە جارێکی تر...**

و: دیارە پرسیارەکە تەکیدی لە سەر ئەم چل ساڵەی کۆتایی ئەدەبی کوردستانی ئێرانە، بەڵام خۆ ناکرێ باسی ئەم چل ساڵە بکەی ئەگەر نەچیتە سەر ئەدەبی کوردستانی ئێران لە قۆناغی پێش ئەم قۆناغەدا! لە ڕاستیدا ئەدەبی کوردی کۆن لە کوردستانی ئێران، هەر وەک کوردستانی عێراق وابووە. لە کوردستانی عێراق "نالی و سالم و کوردی" بوون کە شیعری کوردییان خستە سەر ئەم ڕچەیە، ئەوان بوون شێوە و شێوازی ئەدەبی کوردییان لە سەر وەزنی عەرووزی بەم قافیە و بەم وەزنە دامەزراند و خەڵک لە سەری ڕۆیشتن... لە کوردستانی ئێرانیشدا تا دەڕواتەوە سەر دەورەی "وەفایی" و "حەریق" بەم شێوەیە ڕۆیشتووە. ئەمانە دەبێت بەراورد بکرێن لەگەڵ هاودەورەکانی خۆیان لە کوردستانی عێراق!

لە نێوان شەڕی جیهانیی یەکەم و دووەمدا وردە وردە بیری سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەدەبی کوردستانی ئێرانیشی خستە بەر کاریگەریی. ئەمە وای کرد گۆڕانکارییەک بە سەر شێوەی شیعری کوردیدا بێ، هەم لە شێوازی گوتندا هەم لە نێوەرۆکی گوتنەکاندا. مامۆستای ئەو گۆڕانکارییە (کە ناوەندەکەی موکریانە) "حەسەن سەیفی قازی" (ئەبولحەسەن سەیفی قازی)یە کە لە کۆندا پێیان گوتوە سەیفولقوزات"، (لە دەورەی پەهلەویدا ئەم لەقەبانە قەدەغە کران، ئەم لە "سەیفولقوزات"ەوە گۆڕیی بۆ "سەیفی قازی") "ئەبولحەسەن سەیفی

قـازی" مـامـۆسـتـای شێـوە گـوتنێکە کـە ڕەنگە پێی بگوترێ کـلاسـیکی نوێ لە ئەدەبی موکریانیدا... هەموو شاعیرەکانی دیکە کە لە سەروەختی کۆمەڵەی "ژ.ک" و "کۆماری کوردستانی"دا سەریان هەڵدا، شاگردی "سەیفی قازی" بوون: لە وانە: "هەژار، هێمن، خاڵەمین، سەیدکامیلی ئیمامی، حەقیقی..." ئەو شاعیرانە بە شاعیری کۆمەڵەی "ژ.ک" و شاعیری "کۆماری کوردستان" ناسراون!

"سەیفی قازی" وەزنی شیعر (وەزنە عەرووزیکەی) هەروەها قافیەی شیعر و ئەوە کە هەر دووک میسراعەکان وەکو یەک بن، هەموو قانوونەکانی شیعری کلاسیکی ڕەعایەت کرد! بەڵام دوو شتی گۆڕی: یەک، نێوەڕۆکی باسەکان، دوو شێوازی گوتنی... وشەی عەرەبی و فارسی گۆڕی بە شیعرێکی ساکار، کە کەلکی وەرگرت لە وشە ڕەسەنەکانی کوردی، چونکەخۆی کابرایەک بوو بەشی زۆری ژیانی لە گوند دەژیا (لەگەڵ کاری کشتوکاڵی و جووت و گا و بەخێوکردنی مەڕومالات و چوونی بۆ کوێستان و هاتنەوە...) لەگەڵ هەموو ئەوانەدا تێکەڵ و ئاشنا بوو، لەبەر ئەوە ژمارەیەکی ئێجگار زۆری وشەی ڕەسەنی کوردی دەزانی کە شاعیرەکانی هاوچەرخی خۆی لە کوردستانی عێراق نەیاندەزانی... بەمە جیاوازییەک کەوتە نێوان ئەم شێوە موکریانی گوتنە، لەگەڵ شێوە گوتنی بابان...! شاعیرانی سولێمانی لە نێوان شەڕی جیهانیی یەکەم و دووەمدا کە هەڵکەوتوون، لە شار هەڵکەوتوون!! بۆیە کەسانێک پەیدا بوون کە زمانی شارەکە باشتر بزانن تا زمانی لادێ... بۆ ئەو وشانەش کە لە زماندا بوونیان نییە و تۆ ئیشت پێیانە، کەوتنە سەر دروستکردنی وشەی نوێ! دیارە ئەدەبی کوردی بەوە هەنگاوێکی گەورەی هەڵهێنا، لە "تۆفیق وەهبی"یەوە هەتا دواتریش...، بەڵام لە کوردستانی ئێران و بە تایبەت لە ئەدەبی موکریادا ئەم حاڵەتە ڕووی نەدا! هەموو ئەو شاعیرە گەورانەی کە لە کوردستانی ئێران لە نێوان شەڕی جیهانیی یەکەم و دووەمدا تا سەردەمی کۆمەڵەی "ژ.ک" سەریان بەرز کردەوە، ئەوانە بوون کە لە لادێ گەورە ببوون! ئەمانە گەنجینەیەکی ئێجگار زۆری موفرەداتی وشەی کوردییان لە لا بوو کە خەڵکی شار نەیدەزانین، لەبەر ئەوە تەنانەت بۆ بەیانی چەمکی سیاسی و فیکری نوێ، کەلکیان وەردەگرت لەم وشانەی کە لە ژیانی خۆیان لە گونددا سەروکاریان لەگەڵی هەبووە و فێری ببوون...

**پ: کاک سەلاح "شیمۆس هینی" هەیە، شاعیرێکی ئیرلەندییە، خاوەنی خەڵاتی نۆبێلە، یەکێک لەو دەستکەوتانەی کە ئەو پێوەی دەنازێ و ئەدیبان و ڕەخنەگران باسی دەکەن ئەوەیە: "خاوەنی کۆمەڵێ موفرەداتە کە لە گوندەکاندا بەکار دەبرێن، هەر لە «شیرە»وە بیگرە تا دەگاتە ئەدەواتی کشتوکاڵ!"**

و: ئەوانیش وەهایان کرد!! شیعرەکانیان جارێکی دیکە ئاماژەیە بە ژیانی کشتوکاڵی، بەلام مەتەڵی سیاسیی پێ بەیان دەکەن: "کەنگێ عەرزێکی دەکێڵین بۆ تۆو؟! کەنگێ تۆوێکی دەچێنین بۆ شین؟! کەنگێ چێنراوێ دەگاتە بەروبۆ؟! کەی بە باهۆی کورە کوردێکی دەژین؟!"

چۆن لە دەرێ کشتوکاڵ دەکرێ، دەبێ بەروبۆی لێ پەیدا ببێ لە سیاسەتیشدا هەر ئەمە بەکار دێ.

"خاڵەمین" لەم بەهارییەی خۆیدا کە دەیڵێ، باسی چوونی خێڵات دەکا بۆ کوێستان، باسی گەرمیان و کوێستان دەکا (دیارە چاوی لە بەهارییەکەی "حاجی قادر"یش هەیە!) هەموو داخوازییە سیاسییەکانی خۆی بە ئاماژەی سەفەری گەرمیان و کوێستان دەست پێدەکات و هەر بە وەیش کۆتایی دێنێ...

"حەسەن سەیفی قازی" ڕچەشکێن و ڕێنوێن و دامەزرێنەر و مامۆستای ئەم ڕێگایە بوو. "هەژار و هێمن و خاڵەمین" و هەموو ئەوانی دیکە، هەموو بە دووی ئەو کەوتوون ئەمە بە سەر ئەدەبی کوردیدا زاڵ بوو تا کۆتایی پەنجاکان...

**پ: تا کۆتایی پەنجاکان ئەمە قۆناغێکە!**

و: ئەمە قۆناغی پەنجاکانی زایینییە، لە سەردتای شەستەکان و لە کۆتایی پەنجاکان، گۆڕانکارییەکی زۆر بە سەر ئێراندا هات، لە باری کۆمەلایەتی، لە باری ئابووری، لە باری سیاسی: "چاکسازی ئەرزی هات، نیزامی دەرەبەگایەتی وەکو نیزامی دەسەلاتدار بە سەر ژیانی کۆمەڵگای گوند و عێلاتی کوردەواریدا کۆتایی پێهات، شان بە شانی ئەوە کە نرخی نەوت زیادی کرد لە دنیادا و پارەی دەوڵەتانی خاوەن نەوت ئێجگار زۆر بوو و لە گەنجینەی دەوڵەتدا کەڵەکە دەکرایە سەر یەک..." دەست کرا بە کاری ئاوەدانی... ئەم کارە ئاوەدانییە لە شارەکان ئەنجام دەدرا و پێویستی بە هێزی کاری هەرزان هەبوو!! ئەم فەلاحەی کە لە دابەشکرانی زەویوزاردا، لە چاکسازیی کشتوکاڵیدا، زەویوزاری (پێی دەڵێن: ڕەشایی یان قەرە!) بەرنەکەوتبوو، بوو بە هێزێکی کاری هەرزان و ڕووی کردە شارەکان... ئەمە وای کرد خەڵکێکی زۆری کورد کە تا ئەو کاتە نێو ئێرانی نەدیبوو، شارەکانی ئێرانی نەدیبوو، "بە فراوانی بلاو بۆوە بە نێو شارە گەورەکانی ئێراندا! دیارە ئەم خەڵکە شتی تازەش فێر دەبێ، دابوڕەسم و نەریتی تازەش دێنێتەوە، هەر لەگەڵ ئەوە بڕێک پارەی تازە لەگەڵ خۆی دێنێتەوە بۆ ئەوەی ژیانی خۆی پێ بگۆڕێ و باشتری بکات! هاوکات لەگەڵ ئەوە قوتابخانە و مەدرەسەی زۆر دروست کران، زانکۆکان پەرەیان پێدرا، مافی ژنان درا و ڕێگا درا کچ بخوێنن و بە ئاسانی و بە فراوانی بچن بۆ شوێنە زانستییەکان! ئەم گۆڕانکارییە گەورەی نێو

ئێـران كـه هی كـۆتایی پەنجـاكـان و سـەرەتای شـەسـتـەكـانە، كـاریگەریی زۆری لە سـەر كـوردسـتـانیش هەبوو، یەكـێـك لە كـاریگەرییـە هەرە گـەورەكـانی بریتی بوو لە: زیاد بوونی ژمارەی ئەو كەسانەی كە واردی زانكـۆكانی ئێران بوون! گەنجێكی زۆری كـورد بۆ یەكەم جار هاتنە نێـو زانكـۆكـانی ئێـرانەوە، لە پێـشـدا هاتنە نێـو زانكـۆكـانی تارانەوە، بەڵام دوایی زانكـۆكانی دیكە وەكو "زانكـۆی تەورێز" و "زانكـۆی ورمێ" لە پلەی یەكەمدا و... پاشانیش ئەوانی تر "ئیسفەهان و شیراز و مەشهەد" پڕ بوون لە خوێندكاری كورد!! كۆبوونەوەی ئەو گەنجە كوردانە لە دەوری یەكتـر، فرسەتێكی هێنا بۆ ئەوەی گەلی كورد كە تا ئەو كات هەر لە دوورەوە ناوی یەكتریان بیستبوو، لە نزیكەوە یەكتر بناسن... مەریوانی و سنەیی زۆر كەم لە مێژوودا بۆیان هەڵكەوتبوو شنۆیی و نەغەدەیی بناسن یان بیاندوێنن، بازرگـانیی كـوردسـتـان دەگەڵ یەكـتر نەبوو تا لە ڕێگەی بازرگـانییەوە ئێـمە پەیوەندیان لەگەڵ یەكـتر هەبێ. ڕێگای ئاسنی گـەورە بە نێو كـوردسـتـاندا تێنەدەپەڕی و ئێـسـتـاش تێناپەڕێ. جـادەیەكی فـراوان و سـەرتاسـەری ئەو كـاتە لە كـوردسـتـاندا نەبوو، ئێـسـتـاش تەنهـا یەك جـادە هەیە كـە گـوایە كـوردسـتـان لەم سـەر تا ئەو سـەری ببات، پەیوەندیگرتن نەبوو. ئێـمە یەكـترمـان نەدەناسی، ئێمەی كورد بۆ یەكەم جار ئاوا بە فراوانی لە زانكۆ یەكترمـان ناسی... بۆیە تا ئەو كات كە حیزبایەتیش كرابوو هەر هی یەك ناوچە بوو ئەو ناوچەیەش "موكریان" بوو. خەڵكی موكریان یەكتریان دەناسی، هاتوچۆی یەكتریان دەكرد، دەیانتـوانی لە نێو دەزگای حیزبدا خۆیان تەنزیم بكەن، بەڵام ئەو ڕێكخراوە زۆر بە كـەمی پەلی دەهاویشـتە دەرەوەی ناوچەی موكریان، كە وا بوو هەم ژیانی حیزبایەتی، هەم یەكـتـر ناسین و ئاگادار بوون لە دەرد و مـەرگ و ئارەزووەكـانی یەكتر ئێمە بە هۆی زانكۆكانەوە دەستمان پێی گەیشت و دەسەڵاتمان بە سەریدا پەیدا بوو...

**پ: ئەو ئەدیبانە كێ بوون كە لە زانكۆكاندا پەروەردە بوون؟**

و: منیش خەیاڵم هەبوو ئەوەت بۆ بڵێم...

لە پەنجا و هەشت بۆ پەنجا و نۆ، ئەو ژمارەزۆرەی خەڵـك هاتنە زانكـۆكـانی ئێـرانەوە، لە یەكەمین دیداردا ئێـمە كەسانێـك یەكـترمان ناسییەوە، كە سەیرمان كرد هەمـوومان جۆرێك لە پەیوەندیمان بە ئەدەب و شیـعرەوە هەیە، وەكـو: "عەزیز ژیان"، "عـەلی حەسـەنیـانی"... دیارە ئەوانەی كـە یەكـەمـجـار یەكـتـرمـان ناسی، من لە هەمـوویان كـەم تەمـەنتر بووم، بەڵام ڕەنگە ڕابردووی خـەریكبـوونی من بە ئەدەبەوە، لە هەمـوویان لەمـێـژینەتر بووبێ. بە هۆی وەزعی بنەماڵە و عـادات و ئارەزووەكانی بنەمـاڵە، لە هەر شوێنێكدا شتێـك باوە، لە شوێنی ئێـمەدا قـسـەكردن لە ئەدەب و دانیشتن و بەحسی ئەدەبی و سیاسی شەوچەرەی دیوەخان بوو، لەبەر ئەوە من زۆر لە منداڵییەوە لەگەڵ ئەوە ڕاهاتبووم! كە هاتیشمە زانكۆ پێم وابوو هەر منم ئەو

شتانە دەزانم و زەوقم لەگەڵی هەیە، بەڵام دیتم نەختێر خەڵکی تر هەیە لە منیش زیاتر دەزانێ و لە منیش شارەزاترە و تەمەنیشی لە من زیاترە. ئەوە فرسەتێکی زۆر گەورە بوو. هێشتا "سوارە" نەهاتبوو بۆ زانکۆ، "فاتیح شێخولئیسلامی"ش نەهاتبوو، ئەوان بڕێک درەنگتر هاتن. "سوارە" لە تەمەنی ئێمەدا بوو، دەبوو دەگەڵ من بێ، بەڵام بە هۆی نەخۆشییەکەیەوە کە گرتی دواکەوت. تۆ دەزانی "سوارە" لە تەمەنی پانزە شانزە ساڵییەوە تووشی نەخۆشییەک هات کە ناچاری کرد سێ ساڵی ڕەبەق لە جێگادا بکەوێ، هەڵیشدەسایەوە بە نەخۆشی و بە شەلی هەڵدەستایەوە. ئەمە سێ ساڵی دوا خست، بەڵام سەرئەنجام ئەویش هات.

من خەیاڵم هەیە مێژووی سەرهەڵدانی شیعری نوێت لە کوردستانی ئێران پێ بڵێم... ڕاستی لە نێو هەمووماندا ئارەزوویەک هەبوو کە شیعری کوردی نوێ بکەینەوە.

**پ: ئەو قسانەی کە تا ئێستا لە سەر شیعری نوێی کوردی کراون، ڕاستکردنەوەیان دەوێ، ئایا ئەم قسانەی جەنابت ڕاستکردنەوەن، یان چی؟**

و: جا نازانم چی وتراوە لە سەر شیعری نوێی کوردی کوردستانی ئێران. من وەکو قارەمانی چیرۆکێک دەبم کە چیرۆکەکەی خۆی دەگێڕێتەوە. ئێمە هەموومان زۆرمان بیر لەوە دەکردەوە چۆن شیعری کوردی نوێ بکرێتەوە، لەوێنە (ئەوەی کە ڕووبەڕوو بووین) وەکو: "عەزیز ژیان" و "عەلی حەسەنیانی" و من: هەر سێکمان بە یەکەوە لە "کۆلێژی یاسا" قەبووڵ بووین و لە یەک پۆلیش بووین.

**پ: کەستان ڕشتەی ئەدەبیاتتان نەدەخوێند؟**

و: کەسمان ڕشتەی ئەدەبیاتمان نەدەخوێند. "سوارە" لە "تەبریز" دەیخوێند. "فاتیح" لە "مەریوان" بوو. ئێمە ئەو سێیە (عەلی حەسەنیانی و عەزیز ژیان و من) بە یەکەوە قسەی زۆرمان لە سەر نوێکردنەوەی شیعری کوردی دەکرد. لەگەڵ "سوارە"ش لە ڕێگەی نامەنووسینەوە. "سوارە" هەم هاوڕێم بوو، هەم ئامۆزام بوو.

**پ: زۆر لە "لەتیف هەڵمەت" و "لەتیف حامید"ی ئامۆزای دەچن ! من لە ژمارەیەکی بڵاوکراوەی "ڕۆژفار"دا کە تایبەت بوو بە "لەتیف حامید"، بەراوردێکم لە نێوان "سوارە ئیلخانیزادە" و "لەتیف حامید"دا کردووە. "لەتیف حامید" خاوەنی ئامۆزایەکی شاعیر و داهێنەرە کە "لەتیف هەڵمەت"ە، "سوارە ئیلخانیزادە" خاوەنی ئامۆزایەکە قسە لە نوێکردنەوەی شیعری کوردی دەکا! هەر زۆر لە یەک دەچن. نەخۆشییەکەی "سوارە ئیلخانیزادە" و نەخۆشییەکەی "لەتیف حامید"، دەورە ڕیادی و پێشەواییەکەی "سوارەی ئیلخانیزادە" لەگەڵ دەورە ڕیادی و پێشەواییەکەی لەتیف حامید" زۆر سەیرن!**

و: ئەم بۆچوونانەی ئێمە ڕێگای نەدەبردە هیچ جێگایەک. واتە کەلەبەرێکمان نەدۆزیبۆوە کە لەوێوە واردی نێو دنیای تازە ببین بۆ شیعر. ئێمە نزیکترین شت کە بەدەستمان دەگەیشت شیعری نوێی فارسی بوو، مامۆستای شیعری نوێی فارسییش "نیما یووشیج" بوو. دوای ئەوەش خەڵکی تر هاتن کە تیایاندا بوو لە "نیما"ش بەرزتر بوو، وەکو: "ئەحمەد شاملوو" کە ناوە شیعرییەکەی "ا. بامداد" بوو، "مەهدی ئەخەوان" کە ناوە شیعرییەکەی "م. ئومێد"ە، "سیاوەش کەسرایی" (ئەمە لە دەورەی یەکەمدا)، بەڵام هەر چۆنێک بێ دەوری مامۆستایی "نیما" لە جێگای خۆیدا بوو، بە هەر حاڵ دەستمان کرد بەوە کە چۆن دەکرێ ئەم گۆڕانکارییەی شیعری فارسی لە شیعری کوردیدا چاو لێبکەین یان تەقلیدی بکەین یان بیکوردێنین، بیگونجێنین لەگەڵ زمان و ئەدەبی کوردی...

**پ: لە زمانە کوردییە ئەدەبییەکدا بیچێنن!**

و: بیچێنینەوە و بیکەینە شێوەیەک شیعر کە نوێ کرابێتەوە! ئەو تایبەتمەندییانەی نوێکردنەوەی شیعر کە ئێمە لەبەر چاومان بوو ئەوە بوو: خۆمان نەبەستینەوە بە وەزنە عەرووزییەکەوە، خۆمان نەبەستینەوە بە وەی دوو میسراع بە قەد یەک بن، خۆمان نەبەستینەوە بە وەی کە لە دوای هەر شیعرێکدا قافیە دەبێ جارێک دووپات بکرێتەوە. ئەمانە لە شیعری نوێی فارسیدا هەبوون، ئێمە لەبەر چاومان بوون، بەڵام چۆن ئەمە بهێنینە نێو زمانی کوردییەوە؟ لەنەکاو ڕووداوێکی زۆر خۆش و باش و بەخێر و بەرەکەت، بەڵام زۆر لەنەکاو و کتوپڕ هاتە گۆڕێ!! لە پێش هەمووشیاندا بۆ من و "عەزیز ژیان" کە لە ئێمە بە ئەزموونتر و بە تەمەنتر بوو، ماوەیەک پێش ئەوە کاری کردبوو، هەم لە بواری سیاسی و هەم لە بواری کۆمەڵایەتی و هەم لە بواری ئەدەبیشدا، بەڵام دوای ماوەیەک هاتبۆوە سەر خوێندن و لەگەڵ ئێمە بۆ «کۆلیژی یاسا» قەبوڵ ببوو. "عەزیز ژیان" پێوەندی زۆری دروست کردبوو. خەڵک دەهاتن بۆ کوردستانی عێراق کتێبی تازەیان بۆ دەهێنا. دوو جەڵد کتێبی "گۆران"یان بۆ هێنابوو: "بەهەشت و یادگار" و "فرمێسک و هونەر"، من تا ئەوکات هیچ شتێکم لە "گۆران" نەدەزانی، سەرەڕای ئەوەی لە منداڵییەوە لەگەڵ زمان و ئەدەبی کوردی خەریک بووم و گوێم لێ ببوو و باسی ئەدەبم لە لا کرابوو، بەڵام هەموو ئەوانە تایبەت بوون بە ئەدەبی کلاسیکی کوردییەوە! ئەوەندەی لە سەر "نالی و سالم و کوردی و وەفایی و مەحوی" دەمزانی هەر هیچ شتێکم لە سەر ئەدەبی نوێی کوردی و شیعری نوێی کوردی و نوێبوونەوە نەدەزانی، تا زۆر پێ نەچوو "عەزیز ژیان" کتێبێکی دیکەی بۆ هات کە لێکۆڵینەوەکەی "ڕەفیق حیلمی" بوو لە سەر شیعر و ئەدەبی کوردی "بەرگی دووەمی"، ئەوەی لە کۆتاییدا چاپ بوو.

ئەم دوو کتێبە، بە تایبەت هەر دوو جڵد کتێبەکەی "گۆران" دنیایەکی تازەی لەبەردەم

ئێمەدا کردەوە. دیارە کتێبەکەی "ڕەفیق حیلمی" بێجگە لە "گۆران" خەڵکی دیکەی وەکو "شێخ نووری شێخ ساڵح"یشی بە ئێمە ناساند. ئێستا ئێمە تێدەگەیشتین کەپرۆسەی نوێکردنەوەی شیعری کوردی و دامەزراندنی بناغەیەک بۆ شیعری نوێ لە مێژەهەوڵی بۆ دەدرێ و ئێمە ئاگامان لێ نەبووە و بەر لەئێمە خەڵکێکی زۆر هەوڵی بۆ داوە، کاری تێدا کردووە، پیاوی گەورەشی تێدا پەیدا بووە. دیارە ئەمە نائاگایی ئێمەیە، ڕەنگدانەوەیەکی ئەم دابڕانەی کوردستانە لە یەکتر، ئەم دابڕانە سیاسی و فەرهەنگی و ئابوورییەی کە چەند ساڵێکە لە کوردستاندا تەحمیل کراوە، ئەمە وای کردبوو ئێمە وەکو گەنج هیچ ئاگایەکمان لە گۆڕانکارییەکانی نێو شیعری کوردی لە کوردستانی عێراقدا نەبێ، بەڵام کە شیعرەکەی "گۆران"مان بینی، بارودۆخەکە گۆڕا. من شاعیر نەبووم، من کارم کاری لێکدانەوە و ڕەخنەگری بوو، ئەم ڕەخنە گرتنە و دوو کتێبەکەی "عەزیز ژیان" وای لێ کردم ئەمجار بە چاوێکی وردتر و قووڵترەوە سەیری ئەم ئەزموونە تازەیە بکەم، کورد گوتەنی: "بە چاوی موشتەری سەیری بکەم." با لە پێشدا بڵێم شاگەشکە بووم بە دیتنی هەر دوو کۆمەڵە شیعرەکەی "گۆران" و تێگەیشتم کە ئەو شتەی لێی دەگەڕێین ئەمەیە! ئەمەیە تای تەرازوومان بۆ ڕاست دەکاتەوە لە بەرامبەر ئەو سەرچاوەیەی ئەدەبی فارسی کە لە "نیما"وە هاتبوو بۆ نوێکردنەوەی شیعری فارسی و ئێمە تەنیا ئەومان لەبەر دەستدا بوو بۆ چاولێکەری! "گۆران" تەرازووی بۆ ڕاست کردینەوە و تێیگەیاندین کە لە زمان و ئەدەبی کوردیشدا ئەم تێکۆشان و هەوڵ و تەقەلایە دراوە، ڕێگاکە دۆزراوەتەوە و نموونەی باشمان لەبەر دەستدایە... من ئەوەندەم پێ خۆش بوو، ئەوەندە خەریک بووم بە "گۆران"ەوە تەنانەت لە خۆشیان دەرس و سیاسەتیشم لە بیر چووبۆوە...

لە بیرمە "سوارە" لە تەورێز بوو، من هەر لە نێوان هەفتەیەک یان لە نێوان دە ڕۆژ جارێک نامەیەکم بۆ دەنووسی، نامەیەکی زۆر دوور و درێژ! جاری وا هەبوو دە پازدە لاپەڕە! لە هەر یەک لەو نامانەدا کردبوومان بە عادەت شیعرێکم لە شیعرەکانی "گۆران" بۆ دەنووسی، دوایی بۆچوونی خۆم و لێکدانەوەی خۆمم لە سەر ئەو شیعرە (چەندە دەتوانێ یارمەتییان بدات بۆ دۆزینەوەی ڕێگا) بۆ دەنووسی.

**پ: ئەو نامانەی دەتنووسین بۆ "سوارە"، هێچیان ماون؟ بۆ ئەوەی بزانین توانای ئەدەبی و لێکدانەوەی ڕەخنەگرانەی ئەو سات چۆن بووە و لە چ ئاستێکدا بووە؟ ئەوە یەک: دووەم، ئایا وەڵامی "سوارە"ت لە لا ماون کە لە ئەرشیفی خۆتدا پارستبێتن و تا ئێستا نەکەوتبنە بەرادەستی خوێنەر؟**

و: خۆ ئەگەر من لە کوردستان نەژیابایەم و لەو خەباتە سیاسییەدا بەشداریم نەکردبایە

ئێستا ئەوانە سەرچاوەی مادەیەکی زۆر باش بوون بۆ چاپکردنی کتێبێک، بەڵام نەک تەنیا ئەوانەم هیچی نەما و هەمووی سووتا و تالاَن کران (هەم هی من و هەم هی "سوارە") بەڵکو کاتێک من لەساڵی ۱۹٦۸ چوومە زیندان و دوای ماوەیەک کە ڕێگا درا ئیتر نامە ئاڵوگۆڕ بکەم و خەڵک بێتە دیدارم و جارێکی تر لەگەڵ "سوارە" شەڕەنامەمان دەستی پێکردەوە، ئەوانیشم هەمووی فەوتا!! دیارە ئەم سەفەرە چونکە دەمانزانی نامەکانمان دەخوێندرێنەوە، زۆر بە ڕەمز و ڕاز و لە توێی چەندین پەردەدا دەماننووسین! بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێجگار خۆش بوو!! من و "سوارە" هەر دووکمان قۆناغێکمان بڕیبوو. حەوت هەشت ساڵی پێ چووبوو، یەکەمین نامە نووسینمان لە سەر "گۆران" وا بزانم لە دەوروبەری ۱۹۵۹ ـ ۱۹٦۰ دا بوو، بەڵام کە لە زیندانەوە نامەم دەنووسی و "سوارە" جوابی دەدامەوە ۱۹٦۸ بۆ ۱۹۷۰ بوو. لانی کەم نامەکانی "سوارە"م لای خۆم ڕاگرتبوو لە زیندان، بەڵام لە کاتی هاتنە دەرێ هەرچی نامەی دۆستان و ڕەفیقان و تەنانەت کەسوکار و خزمیشم هەبوون کە لەگەڵ خۆم بیانهێنمە دەرێ، هەموویان دەستیان بە سەردا گیرا، هیچ شتێکیان پێ نەهێشتم جگە لەو جلوبەرگەی لەبەرمدا بوو!! ڕێگایان نەدا هیچ شتێک دەگەڵ خۆم بێنمە دەرێ، حکوومەت هەمووی برد و دەستی بە سەردا گرت! لەو نامانەدا کە ئاڵوگۆڕ دەکران من بۆچوونەکانی خۆم دەگوت: "چۆن ئەم شیعرە دەتوانێ ببێتە نموونە و سەرمەشقێک بۆ ئێمە؟ جیاوازاییەکەی چییەلەگەڵ شیعرە نوێیە فارسییەکە؟ چەندە دەتوانێ یارمەتیدەرمان بێ؟" "سوارە"ش لە بەرامبەردا هەم وەکو ئەدیب و هەم وەکو شاعیر بۆچوونەکانی خۆی دەگوت. بڕێک لەو بۆچوونانەی منی قەبووڵ دەکردن، بڕێکی وەڵام دەدانەوە، بڕێکی ڕەت دەکردنەوە. ئەمە وای لێ کردم تەنیا کابرایەک نەبم خوێنەر بم، بەڵکو من لە سەر "گۆران" دەست بکەم بە کاری لێکۆڵینەوە و بیکەم بە سەرچاوەی ئیلهام بۆ دۆزینەوەی ڕچە نوێکەی شیعری کوردی لە کوردستانی ئێران. بەڵام پێش ئەوە لە نێو ئێمەدا زیاتر شیعرە نوێیە فارسییەکان لەبەر دەستدا بوون یان ئەو شیعرانەمان لەبەر دەستدا بوون کە بە زمانی بێگانە گوترابوون وەکو: "فەڕەنسی، ئینگلیزی، ئەڵمانی" دەشزانی بزووتنەوەی وەرگێڕان لە ئێران بزووتنەوەیەکی زۆر بەربلاو و بەنرخ و دەوڵەمەندە، ئێمە نموونەیەکی زۆری شیعری کۆن و نوێی بێگانەشمان لەبەر دەستدا بوون کە بیکەین بە سەرمەشقی شیعری نوێی کوردی. وا بزانم ئەگەر من هەڵە نەکەم یەکەمین کەس کە بە شێوەی نوێ شیعری گوت لە کوردستانی ئێران "عەلی حەسەنیانی" بوو.

**پ: هاوقۆناغ لەگەڵ "گۆران"دا، یان لە ژێر کاریگەریی "گۆران"دا؟**

و: کاریگەربوونی "گۆران"، بەڵام کاریگەرییەکی جارێ سەرەتایی بوو. "عەلی حەسەنیانی" پێش ئەوەش کە دیوانەکەی "گۆران"مان دەست کەوێ، خۆی هەوڵی ئەوەی دەدا

نموونەیەکی شیعری نوێی کوردی بخاتە ڕوو. شیعرێکی هەبوو بە ناوی "جەللاد" شیعرێکی ساکار بوو، بەڵام شیعرێکی پڕ حەماس و پڕ شۆڕ و بوێرانە بوو... شیعرێکی تری هەبوو ناوی «بۆردوومان» بوو. هەر دوو شیعرەکە تەواو سیاسی بوون. شیعرەکەی باسی بۆمبارانی دەکرد، یەکەمین ڕەنگدانەوەی ڕووداوەکانی کوردستانی عێراق بوو لە سەر ئێمە، دەگەڕێتەوە بۆ ١٩٦٠ ـ ١٩٦١.

**پ: کاک سەلاح من لەم قسانەدا وا تێدەگەم کە بیرکردنەوەی ئێوە لە نوێکردنەوەی شیعری کوردی، پێوەندیی بە "ڕوانگە"وە نەبووە!**

و: زۆر ڕاستە. نەک ئاگامان لە "ڕوانگە" نەبوو، بەڵکو "ڕوانگە" هێشتا نەهاتبووە سەر شانۆی کوردی، ئەمە دەگاتە کۆتاییەکانی ١٩٥٩ و سەرەتاکانی ١٩٦٠.

**پ: کە واتە دەتوانی "سوارە" لە پێشی پێشەوە دابنێی و بیخەیتە پێش گرووپی "ڕوانگە"شەوە؟**

و: ئەوەیان با ئەو کەسانەی لێکۆڵینەوە دەکەن قەزاوەتی لە سەر بکەن. با ئەوەش بڵێم کە بەر لە "سوارە"، "عەلی حەسەنیانی" شیعری نوێی دەست پێکرد، دوای "عەلی" ئەوەی زۆرتر هاتنەمەیدانەوە"سوارە" و "فاتیح" بوون، بەڵام هیچیان نەیانتوانی ئەو کاریگەرییە لە سەر شیعری نوێی کوردی دابنێن کە دوایی "سوارە" داینا. ئێمە هەر ئەوە نەبوو کاری ئەدەبی بە یەکەوە بکەین، بەڵکو کۆڕێکی سیاسی بووین و حیزبێکی سیاسیش بووین.

**پ: ئەو حیزبە سیاسییە کامە بوو؟!**

و: ئێمە لە پێشدا (وابزانم ١٩٥٨ ـ ١٩٥٩دا، لەگەڵ یەکەمینساڵی چوونمان بۆ زانکۆ) یەکێتییەکمان دروست کرد بە ناوی "یەکێتیی خوێندکارانی کورد لە زانستگای تاران".

ڕێکخراوەیەکی نهێنی بوو، بەڵام ئەوەندە بە پەلە، ئەوەندە خێرا، ئەوەندە دەستوبرد، کاری کرد و لە نێو خوێندکارانی کورددا لە کوردستانی ئێران لایەنگر و هەواداری پەیدا کرد کە شەش مانگ یان ئەوپەڕی ساڵێک کەمتری پێچوو، هیچ خوێندکارێکی کورد نە لە "زانستگای تاران" و نە لە هیچ کام لە زانستگاکانی ئێران دەست نەدەکەوت سەر بەو ڕێکخراوە نەبێ و ئەندام نەبێ تێیدا!! هەر بۆیەش دوای ماوەیەک ناوی خۆی گۆڕی بە "یەکێتیی خوێندکارانی کورد لە زانستگاکانی ئێران" بۆ ئەوەی بۆ هەموو ئێران بێ.

**پ: تەقدیری ئەو ڕێکخراوە بۆ ئەدیب چۆن بوو؟ جموجووڵی ئەدەبی لە نێویاندا چۆن بوو؟**

و: باوەڕ بکە ڕێکخراوەکە بە هۆی ئەوە کە خوێندکار دروستی کردبوو، بە هۆی ئەوەش کە پێکهێنەران و دامەزرێنەرانی خۆیان ئەدیب و خوێندکار و ڕووناکبیر و زمانەوان بوون، وای لێهاتبوو دیاریی نەدەکرد کە ئەمە تەنیا ڕێکخراوەیەکی خوێندکارییەکە کاری سیاسی

دەکات یان کۆڕ و ئەنجومەنێکی ئەدەبیی کوردییە؟! ئەم دووەی وا تێکهەڵکێش کردبوو لەگەڵ یەکتردا نەدەناسرانەوە (ئێستا جێگای باسکردنی نییە)، بەڵام ئەوە گرینگ بوونی ئەدەب و زمان بۆ مان و بوونی نەتەوایەتیی کورد نیشان دەدا. زمان هەمیشە ئەو فاکتەرە گرینگە بووە کە بە درێژایی مێژووی ئێمە توانیویە بوونی نەتەوەیی بپارێزێ.

باسەکە درێژە... با بچمەوە سەر ئەو بەشە کە پاش ئەم یەک دوو شیعرەی "عەلی" وردە وردە کۆڕەکە زیادی کرد.ساڵی پێچوو "سوارە"ش هات بۆ تاران، ئەمجار کۆڕەکەمان دەوڵەمەندتر و گفتوگۆکانیشمان گەرموگوڕتر بوون... "فاتیح" جیاوازیی لەگەڵ زۆریان ئەوە بوو کە بە تەنیا شاعیر نەبوو، ئەدیبیش بوو.

**پ: (بۆ نموونە) چیرۆکی دەنووسی؟**

و: نەخێر... لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەدەبی کوردی باش و زۆر بوو، بەڵام چیرۆکی نەدەنووسی... کابرایەکی ئەدیب بوو، کابرایەک بوو سەرەڕای ئەوەی کە ئەوکاتە تەمەنی کەم بوو (شتێک لە من منداڵتر بوو)، بەڵام هاتە نێو کۆڕە ئەدەبییەکەوە، زۆر زوو (وەکو کەسێکی دەرەوەی ناوچەی موکریان) گەشەی کرد...

**پ: کاک سەلاح ئەم پێداگرتنە لەسەر ناوی "فاتیح" یان لەسەر ناوی دیکە سەندنەوەی ئەو ئیعتیبارە نییە لە "سوارە" و گێڕانەوەی بۆ ئەو کەسانەی کە لە ئەسڵدا خۆیان خاوەنی ئەو ئیعتیبارەن؟**

و: نا... ئەمە بەخشینی زانیارییەکە بەو کەسەی کە ئەم زانیارییانەی نییە. گێڕانەوەی مێژوو بەو جۆرەی کە واقیعەن بووە ئەرکێکی سەرشانی منە. ڕەنگە ئێستا تۆ نەزانی یا خەڵکێک نەزانن کە "فاتیح" لەو کەسانەیە کە من لە بواری سیاسەتدا بەوپەڕی توندی ڕەخنەم لەسەری هەیە و لە دوو تەوەری زۆر لێک جیاواز و زۆر دژ بە یەکتردا ڕاوەستاوین. لە سەر سیاسەت، لە سەر مەسەلەی میللی، لە سەر دواڕۆژی گەلی کورد و لێکۆڵینەوە لە سەر بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کورد!! "فاتیح" خاوەنی ئەو قسەیەیە کە (بەداخەوە!) دەڵێ: "هیچ بزووتنەوەیەکی ڕزگاریخوازیی کوردی، لە هیچ دەورەیەک لە زەماندا، هیچ حەقانییەتێکی نەبووە، هیچ پێشکەوتنخوازییەکی لە دەروونندا نەبووە و ئەگەر دەبێ بەرگرییەکی لێ بکرێ، تەنیا لەبەر ئەوەیە کە داگیرکەرەکانی زۆر بێڕەحمانە گرتوویانە و کوشتوویانە و لە ڕوانگەیەکی مرۆییەوە مرۆڤ دەبێ بەزەیی پێدابێتەوە"..."کەسێک وا بڵێ و بۆچوونی منیش دژ بەوە زۆر ئاشکرا و دیارە. لەبەر ئەوە من دەمەوێ بڵێم: هەڵوێستی سیاسیی ئێستای "فاتیح" نابێ دەوری گرینگی ئەو لە کۆڕ و کۆمەڵ و ئەنجوومەنە کوردییەکان لەبەر چاو ون بکا. نابێ دەوری ئەو لە داهێنان و دامەزراندنی ئەو بناغە

بەهێزەی کە شیعری نوێی کوردی لە کوردستان سەرئەنجام بە خۆیەوەی گرت لەبیر بکا.

سیاسەتێک لە چل پەنجا ساڵی ڕابردوو بەردەوام هەبوو و من لە دژی ڕاوەستاوم ئەویش ئەوەیە: "دەوری ئەدەبی و هونەریی شاعیرێک دەبەستنەوە بە هەڵوێستە سیاسییەکەیەوە." بۆ نموونە "گۆران" کە چووەتە نێو "حیزبی شیوعیی عێراق"ەوە ئیتر وا حیساب دەکرێ کە ئەمە شاعیری "حیزبی شیوعی"یە و تەنیا شیوعییەکان بۆیان هەیە پێیدا هەڵدەن و ئەوانەی لە نێو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردا بوون، بە تایبەتی ئەندام و لایەنگرانی پارتی لە ٥٠ ساڵی ڕابردوودا هەرگیز ناچنە سەر باسکردنی "گۆران" و تەعریف و پێداهەڵگوتنی.

**پ: واتە، پێت وایە بزووتنەوەی کوردی غەدری لە "گۆران" کردووە بەوەی نەیهێشتووە شۆرەت پەیدا بکا!! بەڵام هەن دەڵێن: "شێخ نووری شێخ ساڵح" پێش "گۆران"یش داهێنان دەست پێدەکا! کە چی بەو حوکمەی کە "شێخ نووری" حیزبێکی بەتوانای وەکو "حیزبی شیوعیی ئەوسای عێراق"ی لە پشتەوە نەبووە، ناوی دەرنەکردووە!! واتە، هەن پێچەوانەی قسەی جەنابت دەڵێن: ئەوە "حیزبی شیوعیی" بووە کە دەوری هەبووە لە گەورە کردنەوەی ناوی "گۆران"دا!! بە هەر حاڵ من بڕوا ناکەم "حیزب" یان "ڕێکخراو" یان "گرووپ" و "دەستەی سیاسی" بتوانن تا سەر ناوێک بخەنە ژێرەوە و یەکێکی تر بخەنە سەرەوە! زەمانە خۆی دواجار ئەم شتانە یەکلایی دەکاتەوە.**

و: جا ئێستا ئەو زەمانەیە نەگەیشتووەتە لای ئێمە!! ئێمە قسە لە ئێستا دەکەین.

من دژی ئەو بۆچوونەم کە "حیزبی شیوعیی" بەوە کە ناوی خۆی خستۆتە سەر ناوی "گۆران"ەوە، مانعی ئەوە بووە "گۆران" ئەو جێگا گرینگە و ئەم مەقامە بەرزەی کە بە ڕاستی شیاویەتی لە ئەدەبی کوردیدا بگرێتەوە. "حیزبی شیوعیی" بۆتە هۆی ئەوەی کە ئەوانەی لەگەڵ "حیزبی شیوعیی" جیاوازن "گۆران" فەرامۆش بکەن، وازی لێ بێنن، ناوی نەبەن.

ئەگەر نەبێتە بۆچوونێکی کرچ وکاڵ یان بۆچوونێکی توندوتیژ (مرۆڤ لە بواری ئەدەبدا نابێ ئێگجار توندوتیژ و دابڕاو بێ) ئەوا من بۆچوونێکم هەیە لە سەر "گۆران": "من دوای "نالی" لە هەموو ئەدەبی کوردیدا هیچ کەس نابینم بە قەد "گۆران" کاریگەریی لە سەر شیعری کوردی هەبووبێ! هیچ کەس نابینم بە قەد "گۆران" مافی خۆی بێ کە ئەم پاناوکە فراوان و بەرین و قووڵە لە ئەدەبی کوردیدا بگرێتەوە، بەڵام هیچ کەسیش نابینم بە قەد "گۆران" غەدری لێ کرابێ و مافی زەوت کرابێ! ئەمەش تازە نییە!! لە نیوەڕاستی پەنجاکان بە دواوە، بەتایبەت لە پەنجا و هەشت بە دواوە، کە دەوری سیاسی و چالاکیی سیاسی "گۆران" لە نێو "حیزبی شیوعیی"دا بە ئاشکرا پەرەی سەند، ئیتر ئەو لێکدابڕانەی بەینی "گۆران"، بەینی باقی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کورد ڕووی دا و وای کرد "گۆران" ئەو دەورە

گرینگەی نەدرێتێ!! ڕەنگە هەندێک کەس بڵێن: (کە لە ڕاستیدا ئینکاریشیان ناکەم!!) ئەم گرینگییەی "گۆران" لەبەر چاوی من، ڕەنگە لەبەر ئەوە بێ کە ئێمە یەکەم ئاشناییمان لەگەڵ ئەدەبی نوێی کوردی لە ڕێگای "گۆران"ەوە بووە، یان ڕەنگە پێیان وابێ من خۆم وەکو نووسەرێک یان لێکۆڵەرەوەیەکی ئەدەبی، کاری زۆرم لەگەڵ شیعری "گۆران" کردووە، لەگەڵی ڕاهاتووم، هەروەک چۆن بڕێک کەس پێیان وایە بە هۆی لێکۆڵینەوەکانم لە سەر "حاجی قادر" ئێجگار ئاوا موریدی "حاجی"م، جا قەی چ دەکا؟ ڕەنگە وابێ... ڕەنگە وابێ...، بەڵام من پێم وایە وەک چۆن شێعری کلاسیکی کوردی بە ناوی "نالی"وە دەناسرێ، شیعری نوێی کوردیش هەقە بە ناوی "گۆران"ەوە بناسرێ. چونکەئەو شیعری نوێی کوردیی چەسپاندو دایمەزراند و خستییە سەر ئەم ڕێچکەیە، با پێش ئەوە "شێخ نووری شێخ سالح" کاری گەورەشی کردبێ و یەکەمین ڕچەی شکاندبێ، بەڵام خۆ هەمیشە یەکەمین ڕچەشکێن گەورەترین کەس نییە لە نێو ڕچەکەدا...

**پ: بەڵکو ئەو کەسە گەورەیە کە زۆرتر لە نێو ڕچەکەدا دەمێنێتەوە...؟**

و: ئەو کەسەی زۆرتر دەمێنێتەوە و لە نێو ڕچەکەدا و ئەو کەسەش کە کاری بەرزتر دەکا ئەو کەسەی کە هونەر و فەنەکەی بەرزترە...

تا ئێستا هیچ کەس لە شیعری نوێی کوردیدا نەگەیشتۆتە ئەو هونەرە بەرزەی کە "گۆران" پێی گەیشت...، بەڵام سروشتییە کە چاوەڕوان بین لە سی چل ساڵی کۆتایدا، لە ئەدەبی کوردی و شیعری کوردیدا، چ لە کوردستانی عێراق و چ لە کوردستانی ئەو دیودا، خەڵکی دیکە بێن گەشە بکەن و لە "گۆران"یش تێپەڕن...، بەڵام تەنانەت تێپەڕبوونی ئەوانیش لە "گۆران"، لە مەکانەتی "گۆران" کەم ناکاتەوە...

جا با بچینەوە سەر شیعری نوێی کوردی لە کوردستانی ئێراندا...

**پ: با من بیرت بخەمەوە لە کوێوە دەست پێکەینەوە. من پرسیم: ئایا شیعری کوردی لە کوردستانی ئێران دەتوانی بە سەر چەند قۆناغدا دابەش بکەی؟**

**قۆناغی یەکەمت باس کرد کە قۆناغی "هێمن، هەژار و خاڵەمین و سەید کامیل و..." ئەوانە...**

و: کە هەموویان بە شاگردی "ئەبولحەسەن سەیفی قازی" دەناسرێن.

**پ: پاش ئەوەیش شیعری "سوارە" و شیعری ئەو گرووپەی کە لە زانکۆکاندا تەشەنە دەکا و جێ پێی خۆی قایم دەکا، بەڵام ئایا دەتوانی پاش ئەوانیش گرووپێک یان تاقمێکی ترمان بۆ دەستنیشان بکەی؟**

و: هەر ئەو گرووپەی کۆتاییی کە شیعری نوێی کوردیی دانا لە (٦٠ ـ ٦١ و ٦٢) خۆی

قۆناغێکی دووەمی بە سەر هات کە ئیتر زیاتر گەشەی کرد و پەرەی سەند... ئەوە بوو لە ئاخر ڕۆژەکانی ساڵی ١٣٤٣ی ئێرانی یان بە دیقەت بڵێم لە شەوی نەورۆزی ١٣٤٣ی ئێرانی کە دەکاتە ١٩٦٤ خەڵکێکی زۆر گیران، ئەوانەی گیران هەموویان ئەو کەسانە بوون کە من ناویان دەبەم و باسیان دەکەم و لە پەرەگرتن و گەشەپێدانی شیعر و ئەدەبی نوێی کوردیدا دەستیان هەبوو و دەوریان هەبوو "من نەبێ". چونکەمن ساڵ و نیوێک بەر لەوە هاتبووم بۆ ئەم کوردستانی عێراقە و پێشمەرگە بووم... دوای ساڵ و نیوێک لە دامەزراندنی یەکێتەکەمان پێوەندیم کردبوو بە "حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران"ەوە... ئەو کات ئێمە ئەندامێتیی ئەو حیزبەشمان وەرگرتبوو... جا هەم لە لایەن "کومیتەی حیزب"ەوە هەم لە لایەن "کومیتەی خوێندکاران"ەوە، منیان نارد بۆ کوردستانی عێراق لە بەر ئەوە من لە گیرانەکەدا بەشداریی ئەو هاوڕێیانەم نەکرد...، بەڵام کاتێک دوای سێ ساڵ مانەوە لە کوردستانی عێراق گەڕامەوە بۆ کوردستانی ئێران و گەڕامەوە بۆ نێو کۆڕە ئەدەبییەکان، گەڕامەوە بۆ زانکۆش، بۆ تەواوکردنی خوێندنە نیوەچڵەکەم، ئیتر ئەوانیش لە زیندان هاتبوونە دەرێ و گەڕابوونەوە بۆ زانکۆ و بۆ تەواوکردنی خوێندنە نیوە و ناچڵەکەیان... ئەوسا ئیدی ئێمە ئەزموونێکی زۆرمان پەیدا کردبوو (دیارە کە دەڵێم زۆر، لە چاو خۆمان لە چاو ئەوساش)، گیرانمان دیبوو، زیندانمان دیبوو، هەڵهاتنمان دیبوو، کوردستانی عێراقمان دیبوو... من هەڵگری ئەو بۆچوون و بیروڕایە بووم کە لە کوردستانی عێراق پەیدام کردبوو لە سەر چۆنییەتی شۆڕش و ڕەوابوون یان ڕەوانەبوون و باڵەکانی...: هەموو ئەو بیر و بۆچوونانەم لەگەڵ خۆم هێنابۆوە بۆ "زانکۆی تاران"، ئەوانیش بۆچوونەکانی نێو زیندانیان هێنابۆوە...

**پ: ئەی لە سەر شیعر هیچت نەبردبۆوە بۆ ئەوان؟**

و: من لە سەر شیعر هەر ئەوەم بردەوە کە تۆ ئێستا ئاماژەت پێکرد... کە گەیشتمەوە پێمگوتن: ئەو جۆرەی ئێمە ئاوا بە خۆشەویستی سەیری "گۆران" دەکەین، ئاوا بە بەرزی سەیری دەکەین لە کوردستانی عێراق سیاسەت نەیهێشتووە ئەو بەرزی و مەکانەتەی هەبێ...

**پ: کێیان قوت کردبۆوە لە بەرامبەر "گۆران"دا، خۆ دەبێ بۆ سەرکوتکردنی کەسێک، کەسێکت هەبێ لە بەرامبەریدا ڕایگری یان بەرزی بکەیتەوە...!**

و: زۆر کەسیان هەبوو...، بەڵام لە پەلەی یەکەمدا "کامەران موکری"...!

**پ: "کامەران موکری"یان بەرز کردبۆوە!!**

و: بەڵێ...!

گەڕانەوە بۆ تاران و... جارێکی دیکە سەر بە یەکەوەنان، هەم بەرهەمی سیاسی و هەم

بەرهەمی ئەدەبی... ، بەرهەمە سیاسییەکە ئەوە بوو: ئێمە جارێکی دیکە قەناعەتمان پەیدا کرد دەبێ ئەو کۆمەڵەیەی خۆمان دامەزرێنینەوە، بەڵام زەمانە گۆڕاوە، بیری نەتەوایەتی ناتوانێ بە تەنیا لەم سەردەمەدا کورد ڕزگار بکا... . لە بەر ئەوە هەموومان بەو قەناعەتە گەیشتبووین کە ئەم بیرە نەتەوایەتییە ڕزگاریخوازییەی کورد، دەبێ موتوربە بکرێ بە بیری چەپ... . ئێمە هەموومان کەوتینە سەر موتالایەکی (دەتوانم بڵێم) باش و فراوان لە "ئەدەبیاتی مارکسی"دا و دەستمان کرد بە خوێندنەوە... قەناعەتمان پەیدا کرد کە هەر ڕێکخراوەیەکی تازە دەبێ لە سەر بناغەی "مارکسیزم - لینینیزم" دابمەزرێ!!

**پ: ناشێ بە تەمابوون ئەدەبەکەش هەڵکێشن لە "بیری چەپ" و "مارکسیستی"؟**

و: بەڵێ، بەڵام ئەوە لەبەر ئەوە نەبوو کە بڕیارمان دابێ دەبێ وا بکەین. ئەوە لەبەر ئەوە بوو باوەڕەکانمان پاڵی پێوە دەناین وا بکەین! تۆ وەختێک شیعر دەڵێی لە سەر باوەڕی خۆت دەیڵێی، خۆ شیعر بۆ باوەڕی خەڵک ناڵێی؟! بەڵام هەوڵی ئەوەشمان دەدا کە سنووری بایەخە ئەدەبییەکان نەشێوێنین و نەیکەین بە قوربانی باوەڕەسیاسییەکە!!

بیرمە "فاتیح" شیعرێکی خۆشی گوتبوو بە ناوی "بەرخە مامز": "بەرخە مامز" شیعرێکی دڵدارانەی غەرامیی ئێجگار خۆش و جوان بوو، هەرایەکی ساز کرد، لەمەوە حەملەی پێ کرا کە: ئێستا چ وەختی ئەو شیعرە غەرامییەیە، لە کاتێکدا ئێمە لەو خەباتە توندوتیژەداین؟! کۆڕێکی بۆ گیرا، لەو کۆڕەدا من زۆر بە توندی دیفاعم لێ کرد! (ئێستاش کە پیر بووم ئەو عادەتەم هەر هەیە، وەختێک دەچمە نێو جەدەلەوە توندوتیژ قسە دەکەم): خۆشییەکەی ئەوە بوو "فاتیح" خۆی لەگەڵ ڕەخنەگرەکان بوو، دەیگوت: "بەڵێ کارێکی خراپم کردووە کە ئەم شیعرەم گوتووە!" من هەرای توندم لە سەر ئەوە بوو کە: "نەخێر...! کارێکی چاکت کردووە و دیسان دووپاتی بکەوە و حەیفە ئەو توانا و ئامادەییەی خۆت لە بواری دڵداری و ئەوین و غەرام و هەست و نەستی تاکەکەسی و مرۆیی خۆتدا بە کار نەبەی." خۆشییەکەی ئەوە بوو سەرەنجامیش من ئەوانم بەزاند!

**پ: تۆ ئەو هەموو ساڵە پێش ئێستا، بەرگریت لە تاکەگەرایی و خودگەرایی شاعیر کردووە لە نێو شیعردا، ئێستا سەیرە (کەم و زۆر) دەگەڕێیتەوە سەر ئەوەی کە شاعیران واز لەوەبهێنن و زیاتر تەرخان بن بۆ مەوزووعیەت، زیاتر تەرخان بن بۆ کێشە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییەکان!!**

و: ئەگەر وابێ ئێمە لە قسەکانی پێشوومان‌دا شوێنێک هەیە کە حەقمن لەو شوێنەدا باش لە یەکتر تێنەگەیشتووین! من ناڵێم شاعیران با وا بن!! ناڵێم دەبێ شاعیر چ بکەن!! باسی ئەوەم کردووە کە ئەدەبی کوردی بە کام قۆناغدا تێپەڕیوە؟، بۆ ئەم شاعیرانە وایان

کردووه؟ من ئەوەم لێکداوەتەوە کە ئەوە ناچارییان بووە!

**پ: ببووره کاک سەلاح... ساڵانی گەڕانەوەتان بۆ زانکۆکانی ئێران (تۆ لە کوردستانی عێراقەوە و هاوڕێکانیشت لە زیندانەوە) ساڵانی "قۆناغی دووەم"ی گرووپەکەی "تۆ" و "سوارە" و "فاتیح" و "عەلی حەسەنیانی"یە؟**

و: بەڵێ، "قۆناغی دووەم"یەتی، بەڵام قۆناغێکە جیاوازیی کەم نەبوو لەگەڵ "قۆناغی یەکەم". دوای گەڕانەوەی من لە کوردستانی عێراق و دوای گەڕانەوەی برادەران لە زیندان، لە رووی سیاسییەوە جارێکی دیکە خۆمان رێک خستەوە، بەڵام وەکو هەموو بزووتنەوەیەکی سیاسی کە دابڕانی بەسەر دادێ و جارێکی دیکە یەکتر دەگرێتەوە، مەرج نییە هەموو ئەو کەسانەی جاری پێشوو لەگەڵ بوون بۆ جاری دووەمیش لەگەڵ بووبن. ئێمەش بڕێک خەڵکمان لێ جودا بوونەوە، بڕێک خەڵکی تازەمان زیادی کرد، لە وانەی کە جودا بوونەوە یان گەرموگوڕییەکەی جارانیان نەما "عەلی حەسەنیانی"، "عەزیز ژیان" ... لە وانەش کە لە "دەوری یەکەم"دا لەگەڵمان نەبوون (چونکە منداڵ بوون) و پاشان هاتنە ریزەوە: "موسلیح شێخولئیسلامی - برای فاتیح" (وەکو لێکۆڵەر هەم لە بواری سیاسی و هەم لە بواری ئەدەبدا)، "عەبدوڵلا موهتەدی"، "ئەمیر حەسەنپوور"، "بایز مەردۆخی"... کۆڕەکەمان لەژێر باری عاتیفە و ئێحساس هاتە دەرێ. بوار کرایەوە بۆ لێکۆڵینەوە لە سەر ئەدەب لە روانگەیەکی زانستییەوە، تەنانەت بوار کرایەوە بۆ لێکۆڵینەوە لە سەر بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە روانگەی مەعریفییەوە، هەروەها بۆ لێکۆڵینەوە لە سەر مێژووی کورد، شۆڕشەکانی پێشوو، هەڵەکان، تەنانەت شۆڕشی ئەیلوول و هەڵەکانی...، ئەوانەمان هەموو لەبەر چاو بوو. رووداوەکانی نێو شۆڕشی کوردستان و نێو مێژووی گەلی کوردمان لێکدایەوەو رەنگی دەدایەوە لە نێو شیعرەکانماندا! شیعرە مەشهوورەکەی "فاتیح"، شیعری "شەوە"، رەنگە زۆر کەس نەزانن یان تا ئێستا باس نەکرابێ، ئەمە باسێکی شۆڕشی ئەیلووله کە دەڵێ:

"لە پێشدا دەنگێکی زۆر خۆش دەهاتە بەرگوێم، پێم وا بوو ئەمە دەنگی باڵندەیەکە کە شەو دەخوێنێ و مژدەی هاتنی بەیانی دەدا: دەنگی کەسێکە کە بە نێو لێڕەوار و جەنگەڵدا تێدەپەڕێ و دار و درەخت دەبڕێ بۆ ئەوەی رێگا بکاتەوە و مژدە ببات بۆ هاوڕێکانی، یان دەنگی ئاوی کانییەکە کە دەڕژێتە سەر خیزە وردەکان و لە دڵ کاری دەکا!! بەڵام وردە وردە کە ئەم دەنگە نزیک بۆوە، لێی حاڵی بووم کە نەخێر ئەمە شەقڕنێکی تاڵە!! پڕی کردم لە وەحشەت: پڕی کردم لە ترس و بە چاوێکی پڕ خۆف و ترسەوە سەیری ئێستا و داهاتووی خۆمانم کرد ئەمجا لێم بوو بە "شەوە"یەک ئێستا منی وەکو منالێک لە باوەشی خۆیدا گرتووەو خەریکە دەمخنکێنێ.

شیعری "شەوە" ئەو حاڵەتە دەگێڕێتەوە...، بەڵام دیارە ئەو کات پێمان باش نەبوو، ئەم شەرحەی لە سەر بدرێ! پێمان وا بوو خۆشییەکەی لە ڕەمزاوییەکەیدایە، لە نێوەرۆکەکەیدایە، لە ناوە داپۆشراوەکەیدایە.

هەروەها شیعرەکەی "سوارە" "خەوەبەردینە"، باسی هەموو ڕابردووەکان دەکا کە (چۆن ئاوێک خەریکە لە دەروون و دڵی کێوێکەوە دێتە دەرێ...، ئەم ئاوە چەندە خۆشەویستە! هەموومان چاوەڕێی هاتنی دەکەین! بەڵام کە دێتە دەرێ لکی زۆری لێ دەبێتەوە، بەڵام هەموو لکەکان بە ڕێگای ڕاست و ڕەوادا ناڕۆن! هی وا هەیە سەری لێ دەشێوێ، هی وا هەیە بە لاڕێدا دەڕوا، هی وا هەیە ئیتکای بە خۆی نییە، پاڵپشتی بە دەرەوەی خۆیەتی، بەڵام لە نێو هەموو ئەوانەدا یەک "چاوگ" هەیە کە بە تەنیا ئەو شارەزای کۆسپ و کەندالی ڕێیە...) ئێمە ئەوکات پێمان وابوو ئەو ڕێگایە ئەوەیە کە ئێمە دۆزیومانەتەوە! ئەمە مانیڤێستی "سوارە" بوو کە لە واقعدا نەک هەر بۆچوونە ئەدەبییەکان، بەڵکو بۆچوونە سیاسییەکانی سەردەمیشی بەیان دەکرد.

**پ: "سوارە" لە "خەوەبەردینە"دا، ڕۆشنتر بڵێی دەیەوێ بڵێ چی؟!**

و: من خەیاڵم هەیە لە سەر "خەوەبەردینە" شتێک بنووسم، بەڵام تا ئێستا سەرقاڵبوون نەیهێشتووە! سەرقاڵیی لە لایەک و دژوارییی کوردستان لە لایەک و کاری زۆری سیاسیش کە ماوەیەک پێوەی خەریک بووم لە لایەک و لە لایەکی ترەوە بیر لەوەش دەکەمەوە، ئایا من ئەم پەردەیە لە سەر ئەو بووکە لادەم، ئەو جوانییەی دەمێنێ لەبەر چاوی خەڵک کە ئێستا هەیەتی؟! یا لێی گەڕێم لەژێر ئەو تارایەدا خەڵک تارماییەک ببینن و خۆیان بە خەیاڵی خۆیان بیری لێ بکەنەوە کە دەبێ چەند جوان بێ؟!

"سوارە" لە شیعرەکەیدا مانیڤێستێکی بەیان کرد لە بۆچوونە سیاسییەکانی ئەم سەردەمەماندا...

**پ: جگە لەوەی کە لە دوو توێی شیعردا و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ "سوارە" دەری بڕیوە، ئایا گرووپی ئێوە لە هیچ کام لە دوو قۆناغەکەی ژیانیدا مانیڤێستێکی ڕۆشن و ڕاستەوخۆ و بەرچاوی دەرکرد وەک ئەوەی ڕوانگە؟**

و: نەخێر... لە بواری سیاسیدا نا. لە بواری ئەدەبیشدا ئێمە پێمان وابوو بەرهەمەکان خۆیان دەتوانن ئەو مانیڤێستە بن! من خۆم چەندین چیرۆکی کورتم نووسی، وەکو "براڕۆ"، وەکو "کێ ڕچەی شکاند"، وەکو "نان و فیشەک"، وەکوو "بەڕێوەبەری قوتابخانە"... خەڵکی تریش دوای من دەستیان کرد بە نووسین، وەکو "موسلیح شێخەلئیسلامی"، "مەحموود مەردوخی"... جگە لەوە لێکۆڵینەوە هەبوو لە سەر مێژووی کورد، لە سەر کاری

رۆژهەڵاتناسی، ئەمانە زیاتر "ئەمیر حەسەنپوور" دەیکردن، هەروەها "مەحموودی مەردوخی" دەیکردن. ئێمە پێمان وابوو بەم کارانە بیر و باوەڕێک دەخەینە نێو جەماوەرەوە کە کوردی پێ دەناسێنێ، بزووتنەوەکانی کوردی پێ دەناسێنێ، لەگەڵ کورد و کوردایەتیدا بیری چەپی پێ دەناسێنێ! هەموو لە سەر ئەو شتانە سوور بووین، بەڵام بەشی زۆری کارەکانی ئێمە لە "قۆناغی دووەم"دا دەستی پێکرد.

**پ: ئێوە لەگەڵ نەوەی پێش خۆتاندا، بەتایبەتی ئەوانەی کە بە زیندوویی مابوون و هەتا ئەو ساڵانەی کۆتایی هەر لە ژیاندا بوون، وەکو: "هێمن، هەژار ..." بەینتان چۆن بوو؟**

و: سەبارەت بە "هەژار" ئەو لە "کوردستانی ئێران" نەبوو، "هەژار" ئەو کات لە کوردستانی عێراق بوو. لەو بزووتنەوەیە دوور بوو، نە زۆری پێدەگەیشت، نە زۆری دەزانی، نە قسەی لە سەر دەکرد، نە خۆیشی لەم بوارە دەدا...! بەڵام "هێمن" لەگەڵ ئەوەی کە خۆی ئەم ڕێبازەی نەگرتبووە بەر، بەڵام پشتیوانیی لێ دەکرد. پشتیوانی لێ دەکرد و پەیامی بۆ دەناردین، یارمەتیی دەداین! دیارە جارجاریش ئەوەی دەگوت کە وا باشترە ئێوە پێوانەکانی ئەدەبی کلاسیکیی کوردی لەبەر چاو بگرن و لەم ڕیز و پێوانانە دەرنەچن! بەڵام بە هەر حاڵ بەینێکی باشمان لەگەڵی هەبوو. ئێمەش وەکو مامۆستایەک کە پێش ئێمە لە بواری ئەدەبی کوردیدا هەنگاوی گەورەی ناوە بە ڕێزەوە سەیرمان دەکرد، بەڵام کەسمان نەچووینە سەر ئەوە کە شێوازەکەی تەقلید بکەین و لە سەر خەتی ئەو بڕۆین.

**پ: پێم باشە باس لە ئاوابوونی ڕۆژ و دەورانی دەستەی دووهەمی ڕۆشنبیری و شیعر و ئەدەب لە کوردستانی ئێراندا بکەی.**

و: ئەو قۆناغەی کە وا من باسی دەکەم (٤) ساڵی خایاند. لە ساڵی (١٩٦٥)ەوە کە من هاتمەوە لە پێشمەرگایەتی و ئەوان هاتنەوە لە زیندان تا ساڵانی (٦٥ ـ ٦٦ ـ ٦٧ ـ ٦٨) لە کۆتایی یان لە نێوەڕاستی (٦٨)دا جارێکی دیکە پۆلیس دەستی لێ وەشاندینەوە... من چوومە زیندان!

**پ: دووبارە پەرتەوازە بوونەوە؟!**

و: ئەم کۆمەڵەیە پەرتەوازە بووینەوە. لەم قۆناغەدا "سوارە" بە تەواوی گەشەی کرد و هەموو قۆناغەکەی خستە ژێر کاریگەریی خۆیەوە! هەموو شیعرە باشەکانی "سوارە"، هەروەها هەموو شیعرە باشەکانی "فاتیح" هی ئەم "قۆناغی دووهەم"ەن.

"سوارە" لە بواری شیعریدا دوای ماوەیەک وای لێ هات کە ئیدی تازە موناقەسە و ململانێی نەکرێ!! هەر لە "قۆناغی دووهەم"ەوە هەمووومان بۆمان سەلماند کە قۆناغەکە لە سەر ناوی ئەو سەبت دەکرێ!! ئەمە قۆناغی دووەمە...

**پ: "سواره" پەیوەندیی لەگەڵ ئەدیبانی کوردستانی عێراق هەبوو؟**

و: لە ڕاستیدا لەبەر ئەوەی من نێوە نێوە لە هەڵهاتن و خۆشاردنەوە و هاتنەوەدا بووم زۆر ئاگادار نەبووم، بەڵام دەمبیست ئەوان برێک لە نووسراوەکانی نێو ڕۆژنامەکانی کوردستانی عێراقیان پێ دەگەیشت، بە تایبەتی لە قۆناغی دوای هاتنە دەرەوەی من لە زیندان پاش ساڵی (٧٠)، من یەکەم جار (وا بزانم ساڵی ٧١ یان ٧٢ بوو) شیعرێکی "شێرکۆ بێکەس"م خوێندۆتەوە، ئەوە بوو گۆڤارێک کەوتبووە دەست "سوارە". سوارە ئەو شیعرەی بە من نیشاندا! وا بزانم ئەمە ساڵی (٧٢)ە، بەڵام ئیتر لەو کاتەدا ئێمە ئەنجوومەنە ئەدەبییەکەمان وەک خۆی نەمابوو. "سوارە"ش تازە ئیتر دەوری لە شیعری کوردیدا نەمابوو!! "سوارە" دوای گیرانی من لە ٧٠ بە دواوە کەوتە ژێر چاودێری، ناچار هەم وازی لە کاری سیاسی و هەم تا ڕادەیەک وازی لە کاری ئەدەبی هێنا...

**پ: باری تەندروستیی سوارەخراپ بوو؟**

و: باری تەندروستییشی هەر خراپ بوو، وەزعی مادی و بەڕێوەچوونی ژیانیشی لە هەموویان خراپتر بوو...

**پ: وام دەزانی ئەو کە کوڕی خێزانێکی خانەدان بووە، هەرگیز پەکی لە پارە نەکەوتووە!!**

و: لە هەموو ژیانیدا بە دەستەنگی و بە فەقیری ژیاوە!! باوکی "سوارە" لەگەڵ ئەوە کە لە ڕابردوودا پیاوێکی بە دەستەڵات و خاوەن موڵک بوو، بەڵام کاتێک "سوارە" گەیشتێ هیچ شتێکی نەمابوو! براکانی خۆی یارمەتییان دەدا و دەیانژیاند! لەبەر ئەوە هیچی وای بۆ نەدەمایەوە تا یارمەتیی "سوارە" بدا! "سوارە" لە تاران یەکێک لە خوێندکارە هەژارەکان بوو! بەڵام لەبەر ئەوەی پیاوێکی هەتا بڵێی دڵتەڕ بوو، پیاوێک بوو هەمیشە خەریکی ئەوین و دڵداری و حەزلێکردوویی بوو، پارەیەکی کەمیشی مابایە هەر جلوبەرگی جوانی پێدەکڕی و خۆی دەڕازاندەوە و ڕۆژێ جارێک هیچ نەبوایە دەبوو بچێ دڵدارێک ببینێ، کچێک ببینێ، بەبێ ئەوە هەڵی نەدەکرد...

لە قۆناغی دووەمدا ئەگەر نووسینی پەخشانی حیساب بکەین، چیرۆکەکانی من لە هەموویان زیاتر ناوی دەرکرد. ئەگەر شیعریش حیساب بکەین شیعرەکانی "سوارە" بوون بە شیعری قبوولکراوی قۆناغی دووەم. هەر کەسێکی دیکەش کە تازە بەرەو لای شیعر دەهات، چاوی لە شیعرەکانی "سوارە" دەکرد. بۆیە ئیتر پاش ئەوە تا کۆتایی ئەو قۆناغە "سوارە" بوو بە شۆڕەسواری مەیدانەکە! "سوارە" لە (٧٠)دا پاش هەموو نەخۆشی و نارەحەتی و نەدارییەک ناچار بوو بچێ لە شوێنێک دابمەزرێ وەکو فەرمانبەر. بۆ ئەم مەبەستە چەند کەسێک کاریان بۆ کرد و یارمەتییان دا، لە وانە: (یادی بەخێر) مامۆستای شەهید "جەمیل

ڕۆژبەیانی" کە خۆی ئەو کاتە لە تاران بوو و ئیشی بۆ ڕادیۆ و TVی ئێرانی دەکرد. ئەو و کۆمەڵێکی دیکە یارمەتییان دا. "سوارە" کە دامەزرا ئیتر نەیدەوێرا زۆر پرکێشی بکا چونکەدەترسا ئیشەکەی لە دەست بچێ!! وای لێهات لە شیعر کەوتەوە! وەک چۆن مریشک لە هێلکە دەکەوێ "سوارە" تازە ئیتر لە شیعر چۆوە.

لە دوایین قۆناغەکانی ژیانی ئەدەبیی خۆیدا شیعرێکی بۆ من نارد بۆ زیندان، من ئەو کات حوکمی ئیعدام درابووم، دوای شەش ـ حەوت مانگێک حوکمەکەم بوو بە ئەبەد. یەکجار ڕێگایان دا چاوپێکەوتنم هەبێ، لەو چاوپێکەوتنەدا دایکم هات بۆ دیدارم، "سوارە" شیعرێکی دابوو بەو، ئەویش لە نێو چێشت و ناندا شاردبوویەوە (لە نێو یاپراخدا) هێنای بۆ زیندان، "سوارە" ئەو شیعرەی پێشکەش کردبوو بە من، ئەو شیعرەیە کە دەڵێ: "من دەڵێم پەپوولەیەک فڕی بە باڵی سەوز و سوورەوە" تیایدا کەسێک وەڵامی دۆستەکەی دەداتەوە کە پێی گوتووە:

واز بێنە دەتگرن و دەتکوژن! فەرموو ئەوانەی کە ڕۆیشتن و گیران چییان بە سەر هات؟

ئەمیش دەڵێ:

**من واز ناهێنم، چونکەمنیش واز بێنم خۆ زەمانە واز ناهێنێ!**

**"دنیا، دنیای جوانییە، لە پەنجەرەی نیوەتاکی بومەلێڵەوە چاوم لە دیەنی کچی بەیانییە!"**

ئەمە ڕەنگە ئاخرین شیعری "سوارە" بووبێ کە پڕ بە دڵ گوتبێتی!! لە دواییدا "سوارە" شیعرەکانی بۆ بۆنەیەک دەگوت! یان ئارامتری دەگوت! یا شۆڕشگێڕانە و ئاگرین نەبوو! یا جار جار ئەگەر زەوقی هەبایە و هاوڕێکانی زۆر ڕەخنەیان لێ نەگرتایە، شیعرێکی بە مەعشووقەکانی خۆیدا دەگوت! بەڵام تازە نەکەوتەوە سەر ئەم شیعرە!

شیعرێکی هەیە "تۆ دەریامی"، ماوەیەک بوو "سوارە"م نەدیبوو، جوابی نارد کە شیعرێکم گوتووە و لەمێژەگوتوومە ،بەڵام دەرم نەخستووە، با بۆت بنێرم. من لە بۆکان بووم، ئەو لە تاران بوو، گەرمەی ناڕەحەتی و توند و تیژیی ئێمە بوو، وەزعمان زۆر ناخۆش بوو، خەریکی کارێکی نهێنی بووین و لەژێر چاودێریدا بووین، دیارە "سوارە" بەشدار نەبوو، "سوارە" سەری خۆی داخستبوو و لە سەر هێلکەکانی کڕکەوتبوو!! بەڵام کە ئەم شعرەی بۆ من نارد، من بە هۆی ئەوەوە کە هەم هاوڕێ بووین و هەم ئامۆزا، شەڕە قسەمان هەبوو، شەڕە جنێومان هەبوو، لەگەڵ کۆڵێک جنێو ڕاسپاردەیەکم بۆ نارد کە: "ئەم شیعرە دوو بەشە، تۆ نیوەت لە کاتێکدا گوتووە، نیوەت لە کاتێکیتردا گوتووە!..." دیم نیوەی ئەوەڵی شتێکی زۆر گەشتی بوو بۆ خەبات و بۆ تێکۆشان و بۆ پێداهەڵگوتن بە جوانیدا نووسرابوو، بەڵام

نیوەی دووەم، باسی "شۆڕشی کوردستانی عێراق" و باسی "حیزبی بەعس"ی دەکرد، تێگەیشتم ئەمە لەبەر دڵی "حکوومەتی ئێران" دەڵێ، چونکەئەو کات ئێران ئەو جۆرە شیعرەی هان دەدا! لە عێراقیش خەڵکیان هان دەدا کە بە خەبات لە کوردستانی ئێراندا هەڵبدا و خەڵک بە ناوی کوردستانی عێراقەوە هەندێ قسەی خۆی دەکرد! من دەمزانی حکوومەتی ئێران ئەو شیعرەی پێ خۆشە،لەبەر ئەوە جوابم لێ گێڕایەوە گوتم: "نەڵێ نەیزانی!!" گوتم: "ئەم شیعرە دوو بەشە... لە دوو قۆناغی جیاوازدا گوتووتە!!" "سوارە" لە وەڵامدا گوتبووی: "پێی بڵێین بەو "سەگە!" دیارە سیاسەت هێشتا زەوقی ئەدەبیی لێ تێک نەداوە! ڕاست دەکا ئەمە دوو بەشە، بە دوو جۆر گوتوومە..."

مەسەلەکەش بەم جۆرە بوو:

"وەفدێکی کوردستانی عێراق، وا بزانم "دارا تۆفیق" و ئەوان بووبوون، چوو بوون بۆ ئێران، لە وێ دەوڵەت بردبوونی ڕادیۆ و TVیان پێ نیشان بدا، "سوارە"شیان وەکو شاعیر پێ ناساندبوون! وەفدەکە پرسیبوویان: "شیعری تازە چیت هەیە؟" "سوارە" گوتبووی: "بەڵێ شیعریشم هەیە، بەڵام هەموو لاپەڕەکانی لە لای خۆم نین، سبەینێ وەرنەوە دەتاندەمێ." سبەینێ ئەو شیعرەی کە کۆن گوتبووی دابووینێ و لەبەر دڵی ئەوان بەشی دووەمیشی خستبووە سەر.

**پ: جا "سوارە" هەر بە ڕاست لەبەر ڕازیکردنی دڵی ڕژێمێک ئەو شیعرەی گوتبوو؟!**

و: نیوەی یەکەمی شیعرەکەی: "ئێمە خەڵکی ڕۆژهەڵاتین، فێر نەبووین بەزین و دابەزین! ئێمە خەڵکی ڕۆژهەڵاتی سوورین!"وەها نەبوو کە دەوڵەتی ئێران تەحەمولی بکات لە هیچ شەڕایتێکدا!! لەبەر ئەوە دەبوو ئیزافەیەکی بخاتە سەر، کە "سوارە"، "دارا تۆفیق" و ئەوانی دیبوو، بە فرسەتی زانیبوو ئەو ئیزافەیەی لە سەر بکات و شیعرەکانی پێشکەش بە وان بکات، بۆ ئەوەی بتوانێ نیوەی یەکەمیشی بڵاو بکاتەوە!

**پ: با لێرەدا ڕاوەستین و قۆناغی دوای ئەو قۆناغانەم بۆ باس بکەی کە جێمانهێشتن.**

و: قۆناغی دوای ئەوە دەبێ لە خەڵکی تر بپرسی، من ئەوەی کە بۆم گێڕاینەوە، وەکو کەسێکم کە لە نێو چیرۆکێکدا، بەڵام خۆی چیرۆکەکە بگێڕێتەوە! من لەو قۆناغەدا لەگەڵ بووم.

لە حەفتا بە دواوە تا حەفتا و نۆ، وەها خەباتی سیاسی توند و تیژ بوو لە لایەن ئێمەوە، وەها لێدان و گرتن و کوشتن توند بوو لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە، هیچ بوارێکی وا نەمابوو بۆ کۆبوونەوەی ئەدەبی!! نەک تەنها بوار بۆ یەکتر بینینەوە نەمابوو، بەڵکو کەس نەدەپەرژا تازە بە ئەدەبەوە خەریک بێ!! ئێمە بۆچوونێکمان هەبوو (ئایا ڕاست بووبێ یان هەڵە) ئەوە

بوو: "خەباتەکە لەوە توند و تیژترە و لەوە دەستەویەخەترە بچی لە دووردوە سەنگەر و سێرەی لێ بگری!! (بۆتە شەڕە خەنجەر)..." ئێمە ئەگەر فرسەتمان هەبایە، ئەو فرسەتەمان بۆ کاری نهێنی، بۆ ڕێکخستن، بۆ تەشکیلات بە کار دەبرد. بڕێکمان سوور ماینەوە لە سەر کاری سیاسی، بڕێکیش سوور نەماینەوە وەکو "سوارە". "سوارە" خۆی لە سەر کاری سیاسی ئالوودە نەکرد، دوای ئەوەش نەهات دژی قسەکانی پێشووی خۆی قسە بکات. تازە ئیتر بوار نەمابوو بۆ ئەم ڕێبازە شیعر بڵێ! ئەگەر شیعری بۆ شتی دیکەش گوتبایە دەبوو هەموو شانازییەکانی خۆی تێک بدا! "سوارە" ئەم شانازییەی هەیە کە ئەو کارەی نەکرد! لەگەڵ ئەوەشدا کە لە ڕادیۆ بوو (ڕادیۆ مەرکەزێک بوو لە ژێر چاودێریی حکوومەتدا) و تەکلیفیان لێ دەکرد شیعر بڵێ، کەچی ساکت مایەوە، هیچی تری نەگوت!!

"فاتیح" کەوتە نێو کارێکی سیاسیی زۆر توند و تیژ، بواری شیعری بۆ خۆی نەهێشتەوە! "عەلی حەسەنیانی" چوو لە "وەزارەتی نێوخۆ" بوو بە فەرمانبەر، ناردیان بۆ شوێنێک، دوورکەوتەوە لە شیعر (ئەوەندەی من پێ بزانم) ئەو قۆناغە لە دوای حەفتا کۆتایی هات. لە حەفتا تا حەفتا و نۆ، بە نیسبەت ئێمەوە قۆناغی خەباتی توند و تیژی سیاسییە. من لەو قۆناغی حەفتا تا حەفتا و نۆیەدا سێ جار گیراوم!! سێ جار گیراوم و چوومەتە زیندان و هاتوومەتەوە. خەڵکەکەی دیکەش کەس حاڵی لە حاڵی من باشتر نەبووە! بەڵام ئەڵبەتە هیچ میللەتێک قسر نابێ و لە سک و زا ناکەوێ، خەڵک شتیشی گوتووە، نەسلی تازە هاتووە، ئەم مێژووەی نەسلی تازە خودی نەسلی تازەکە دەبێ بیگێڕنەوە... من تا کۆتایی حەفتام بۆ گێڕایتەوە... یەک شتت لە حەفتا و نۆدا بۆ ئیزافە بکەم، ئەوەیە کە "شۆڕشی کوردی" لە کوردستانی ئێران دەستی پێکرد، نەیتوانی بەپێی پێویست خزمەتی زمان و فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی بکا!! خەریکبوون بە کاری سیاسییەوە، خەریکبوون بە شەڕی پێشمەرگانەوە، بۆچوونێکی هەڵە لە سەر زمان کە گوایە زمان تەنها هۆی تێگەیشتن و تێگەیاندنە، نەشیاندەزانی زمان هۆی وجوودی مرۆڤە، هەموو ئەوانە وای کرد کە لە حەفتا و نۆوە شتێکی وەها لە بواری ئەدەب و زماندا نەکرێ کە قابیلی قسە لێکردن بێ و ئاگامان لێی بێ! بڕێک سروودی نیشتمانیی جوان جوان دەرکەوتن کە "فاتیح" دەیگوت، "موسلیح" دەیگوت، "ئەحمەد بازگر" دەیگوت، "سلێمان قاسمیانی" دەیگوت و کەسی وەکو: "نەجمە غولامی"، وەکو "ناسر ڕەزازی" دەیانکرد بە سروود. لە وانەیە بڵێم ئەمە تەنیا دەستکەوتی ئەدەبی هەموو ئەو قۆناغە بوو (کە کورد دەسەڵاتی هەبوو!!) ئەو کاتە کە دەسەڵاتمان نەبوو، لە ژێر زەخت و زۆری حکومەتدا بووین، کاری ئەدەبیمان زۆر بوو! بەڵام ئەو کاتەی کە دەسەڵات کەوتە دەست کورد و ڕێگا کرایەوە و ڕۆژنامەئازاد بوو، بەرهەمێکی وام نەدی! یان ڕەنگە

هەبووبێ و من ئاگادار نەبووبم!

**پ: لە سەر قسەی جەنابت ئەگەر دەیەی نێوان ٦٠ـ ٧٠ دەیەی "سوارە" و "فاتیح" و نێوە بووبێ، ئەمن پێم وایە دەیەی نێوان ٧٠ ـ ٨٠ش هەر بۆ ئەوان حساب بکەین، چونکەلەم دەیەیەشدا هیچ جموجوولێکی ئەدەبی لە کوردستانی ئێراندا نەبووە کە شایانی باس و مایەی دڵخۆشی بێ! تەنانەت دەیەی نێوان ٨٠ ـ ٩٠یش من پێم وایە دەتوانین هەر بە درێژەی شکۆمەندییەکانی قۆناغی "سوارە و فاتیح و نێوە"ی حیساب بکەین، بەڵام لە نەوەد بە دواوە تا ئێستا، جموجوولێک لە ئارادا نییە، دەتوانین ئەو قۆناغە بە قۆناغێکی سەربەخۆ حیساب بکەین (ئەگەر کەسێک ئەمەم لێ بە ئیراد نەگرێ)...**

و: نەخێر بە لای منەوە ڕاستە! من ئەسڵەن ئاگادار نیم ئەم نەسلە نوێیە، لەم قۆناغە نوێیەدا، چەند ئاگاداری ئەو کارانەیە کە لە ڕابردوودا کراون! من پێم وا نییە زۆر ئاگادار بن، لەبەر ئەوە باوەڕ ناکەم زۆر پشت ئەستووریش بن! هەر چەند ئەگەر بە تەواویش ئاگاداری تەواوی وردەکارییەکانی "سوارە" نەبن، بەڵام ئەو وەکو تارماییەکی ئێجگار گەورە و فراوان باڵی بە سەر هەموو دەیەی نەوەد بە دوای ئێستای کوردستاندا کێشاوە! من ئەوە لە ڕووی ئەو هەموو باس و گفتوگۆ و لە سەر نووسینانەوە دەڵێم کە لە سەر "سوارە" دەکرێن! جا بڕێکی باشی بۆچوون و بڕێکی باشی بۆ نەچوون... زۆر جاران تەعنە دەبینم، (بەبێ ئەوەی ناو بێنن) بە ئیشارە و کینایە دەڵێن: گوایە هەر کەسێک هەیە کە دەتوانێ لە سەر "سوارە" قسە بکا، بەڵام نایکا! خۆ دەزانم بە کێ دەڵێن، بەڵام هەموو ئەو قسانە نیشان دەدا کە "سێبەری "سوارە" هێشتا سێبەرێکی سەنگینە" من هەر ئەوەندە دەزانم لە ئەدەبی تازەی ئەم سەردەمە...!

**پ: من زۆر زۆر خوشحاڵ بووم...**

ئەگەر فرسەتی ئەوەمان هەبوو جارێکی تر قسەی دیکە بکەین و درێژە بە گفتوگۆکەمان بدەین، ئەوا تەوەری دیکە دەدۆزینەوە بۆ گفتوگۆ! بەڵام ئەوەکو ئەمە کۆتایی باسوخواس و گفتوگۆکەمان بێ، ئەگەر قسەیەک هەیە بۆ کۆتایی ئەم باسە، دەتوانی بیڵێی ...

و: من قسەی زۆرم کردووە و تۆش کەمت نەکردووە! لە بەر ئەوە با ئەمە دواقسەمان بێ و سوپاس.

# خوێندنەوەیەکی تازەی سەلاحەددین موهتەدی[1]
# لەسەر «خەوەبەردینە»

پێش ئەوەی بچمە سەر خوێندنەوەکەی و یەکەیەکە بۆتان بخوێنمەوە و بزانم ئەو شیعرە دەڵێ چی، دەبێ قسە لەوە بکەم خەوەبەردینە چۆن بە وجوود هات. هەدەفی ئەوەیە چ بڵێ. چی دەگێڕێتەوە و بۆچی بەو زمانە نووسراوە.

لە ڕاستیدا سەرهەڵدانی شیعری نوێی کوردی لە کوردستانی ئێران دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی دەیەی سی و دەسپێکردنی دەیەی چل ـ دیارە تاریخەکان ئێرانین ـ یانی کۆتاییەکانی پەنجاکانی زاینی و سەرەتای شەستەکان. لەو ساڵانەدا ژمارەیەکی زۆر خوێندکار قبووڵ بوون بۆ زانکۆی تاران، کە ئەو کاتەش زانکۆ لە ئێران کەم بوون، گەورەترینیان زانکۆی تاران بوو، دووهەمینیان تەورێز بوو.

بەو ئاڵوگۆڕە ئابوورییەی لە نێو ئێراندا، لە نەتیجەی گرانبوونی نرخی نەوت، هاتە گۆڕێ، پارەیەکی زۆر کەوتە دەست دەوڵەت. جێگیربوون و سەقامگیربوونی ڕژیمی شا، کە توانی دەست بکا بە بەرنامەی ئابووری و تەوسیعە و گەشەکردنی نێوخۆ لە جیهەتی تەقویەتی سەرمایەداریی داخڵیدا بوو. ئیسلاحاتی ئەرزیش بوو بەبنچینەیەک بۆ ئەوەی ئەو نەخشەیە بتوانێ سەربگرێ. لە لایەکەوە بە هۆی ئیسلاحاتی ئەرزیوە خەڵکێکی زۆر بوون بە خاوەن زەوی، خەڵکێکی زۆرتریش کە هەر زەوییان نەبوو لە دێ و پێیان دەگوتن ڕەشایی یان قەرە، بوون بە نیرووی کاری هەرزان بۆ سەرمایەداریی تازەپێگەیشتووی ئێران. ئەوانە نەک بە دەیان و هەزاران و دەیان هەزار، بەڵکو بە سەتان هەزار لە کوردستانەوە ڕوویان کردە شوێنەکانی دیکەی ئێران بۆ کارکردن لە شیرکەت، چونکە ئەو ئاوەدانی و گەشەکردنە کوردستانی نەدەگرتەوە ـ هەر وەکو ئێستاش وایە ـ ڕوویان کردە بەقیبیەی ئێران بۆ کارکردن. ئەو خەڵکەی کە نەخوێندەوار بووە، لە دێیەکەی خۆی بە دەگمەن چۆتە دەرێ و شارەکانی نیزیکی خۆشی کەمتر دیوە، وای لێهات ڕۆیی و گەیشتە دوورترین شارەکانی ئێران: بە چەند مانگ و شەش مانگ و ساڵ مایەوە، لە تاران و تەورێز و ئەهواز و شیراز و ئابادان و گورگان و بەلووچستان و بەندەر عەبباس، خەڵکی تازەی دیت، زمانی تازە فێر بوو، میقدارێک وەزعی ئابوورییەکەی باش بوو، پووڵ و پارەیەکی هێناوە بۆ ماڵ و منداڵ، لەگەڵ خۆی بڕێک وسایلی ژیانی تازەی هێناوە. فەرشێک، کەنارەیەک، چراتۆڕێک، زەبتێک، ڕادیۆیەک. ئەمە هەم لە باری فەرهەنگی، هەم لە باری کۆمەڵایەتی، هەم لە باری سیاسییەوە، وەزعی نێوخۆی کوردستانی زۆر گۆڕی. هاوکات لەگەڵ ئەوە دانیشگاکانیش

زیادیان کرد، خەڵک زیاتر توانی منداڵی خۆی بنێرێتە مەدرەسە و کە مەدرەسەشی تەواو دەکرد ڕووی دەکردە دانیشگا و خوێندن، لە نەتیجەدا ژمارەی خوێندکاران لە دانیشگادا زیادی کرد.

ساڵی ١٣٣٨ ئەگەر من هەڵەم نەکردبێ و لە بیرم مابێ، بە یەکەمین ساڵ دادەندرێ بۆ یەکەمین شیعری نوێی کوردی لە کوردستانی ئێران و دەبێتە ١٩٥٩-١٩٦٠ی زایینی. ژمارەیەک خەڵک کۆ ببوونەوە لە هەموو دانیشکەدەکانی تاران، بەڵام بەتایبەت وا هەڵکەوت بەشی زۆریان لە دانیشکەدەی حقووق بوون، کە هەم لە لایەکەوە سیاسی بوون و بیروباوەڕی سیاسی و نیشتمانپەروەری و کوردایەتییان لە لا هەبوو، هەم لە لایەکەوە زەوقی نووسین و ئەدەب و شیعریان لە لا هەبوو. بیر لەوەدەکرایەوە ئایا شیعری کوردی هەر لە سەر ئەو ڕچە کۆنە کلاسیکەی خۆی بڕوا و هەر چۆن وەکو نالی شیعری گوتووە تا ئێستاش هەر دەبێ وابێ؟ یا شێوەیەکی تازە دەبێ بگرینە بەر. من خۆم شاعیر نەبووم و ئێستاش هەر شاعیر نیم، بەڵام من کاری سەرەکیم لە نێو ئەو جەمعەدا،ڕەخنەگریی ئەدەبی بووە، بۆیە زۆر تێکەڵ بووم لەگەڵ ئەو مەسەلەیە کە چۆن ڕێگایەک بدۆزینەوە بۆ شیعری نوێی کوردی. ئێمە هەتا ئەو کات هیچ نموونەیەک و هیچ غەزەلێک، قەتعەیەک یا شیعرێکی تازەی کوردیمان پێ نەگەیشتبوو، ئاگادار نەبووین کە ئایا لە شوێنی دیکە شیعری کوردی هەیە یان نا، تا ساڵانی ١٩٥٩ - ١٩٦٠ دوو ڕێگامان لە بەر بوو، بەڕاستی وەبیر هەردوو ڕێگاکە کەوتبووین. یەکێکیان کە نیزیکتر بوو، لە بەر دەست بوو، شیعری نوێی فارسی بوو،جا هەر ئەو شیعرە نوێیە فارسییەی کە لە «نیما»وە دەستی پێکردبوو، دوایە بە ئەوانی پێشووتر،وەکو فەریدوون موشیری و ئەوانەدا هاتبووە پێشێ، گەیشتبووە نادر نادرپوور، ئینجا گەیشتبووە سەردەمی شیعری نوێی ڕاستەقینە،گەیشتبووە دەورانی شاملوو، گەیشتبووە دەورانی ئەخەوان سالیس. ئەوە هەر پێش ئەوە کە فرووغ وا یەکجار بەرز بێتەوە، بەڵام دەورانی شاملوو و ئەخەوان سالیس بوو.

چاولێکردن لەم شیعرە نوێیە فارسییە ڕێگایەک بوو. دوو: ئێمە حەولی ئەوەمان دەدا لە ڕێگای ئەو خوێندکارە کوردانەی کە زمانی خاریجی باش دەزانن، یا ئینگلیسی یان فەرانسە، دەستمان بگاتە شیعری نوێی ئورووپایی. باشە میللەتەکانی دیکە شیعری نوێی خۆیان چۆن دەڵێن دیارە ئێمە بەشێک دەستمان دەیگەیشتێ،لە ڕووی ئەو تەرجمانەی کە لەو شیعرانە دەکران بە زمانی فارسی. دەزانی کە زمانی فارسی بەتایبەت لە بواری تەرجمەکردنو وەرگێڕاندا زۆر دەوڵەمەندە.

قەدیمیش وابوو، ئێستاش وایە هەر بۆیەش ڕووناکبیری ئێرانی، بە کورد و غەیرە

کوردەوە، هەمیشە ئەو بوارەی بۆ ڕەخساوە. کە زوو دەستی بگاتە یەکەمین بەرهەمەکانی فکرو بیر و هۆشی نووسەران و شاعیران و فەیلەسووفان و کۆمەڵناسانی جیهانی. ئەوەش یارمەتی دەداین تا ڕووداوێک ڕووی دا: بۆ ئەم ڕووداوەش خۆم و هۆگرانی شیعری نوێی کوردی لە کوردستانی ئێران دەبێ لە بیرمان نەچێ و سپاسی «عەزیز ژیان» بکەین. عەزیز ژیان خوێندکار بوو،وەکو ئێمە دانیشجوو بوو لە دانیشگای تاران،پێکەوە دەمانخوێند و هەموومان لە دانیشگای حقوق بووین و لە یەک کلاس. عەزیز ژیان، قەدیم ناوی «نانەوازادە» بووە، چونکە ئەوانە لە بنەماڵەی نانەوازادەی سابلاغیێن. برای حاجی هاشمی نانەوایە کە ئەو ساڵانە فەوتی کرد، خزمی نانەوازادەن کە لە زەمانی جمهووریی کوردستاندا فەرماندەی هێز بوو، لە تەیارەکە بەربۆوە و شەهید بوو: یا بەریان داوە.

عەزیز ژیان لە ئێمە بەتەمەنتر بوو. هەرچەند ئەو ئەگەر ئەوەببینێ ئێستاش هەر پێی خۆش نییە ـ بەڵام ڕاستییەکەی ئەمە بوو لە ئێمە بە تەمەنتر بوو: دەشیویست خۆی جحێڵ کاتەوە، بەڵام پێم وابوو پێنج شەش ساڵ زیاتر بەینمان هەبوو. ئەو کە دەیگێڕاوە بۆ ئێمە، یەکێک لە شانازییەکانی خۆی،کە ئێمەش دیارە هەر پێمان زۆر گەورە بوو، ئەوە بوو دەیکوت: من ڕاستەمنداڵکار بووم، لە چاپخانەی ڕۆژنامەی کوردستان، کە لە زەمانی جمهووری کوردستاندا دەرچووە، لە مەهاباد کارم کردووە. دوایە کە گەورەتر بووە، کێشەی سیاسی و ڕەنگە وەزعی خۆی و وەزعی ژیانی و هەموو ئەوانە پاڵیان پێوە ناوە یا ناچاریان کردووە بڕوا و هەڵێ لە کوردستانی ئێران و هاتۆتە کوردستانی عێراق و تەنانەت چۆتە کوردستانی سووریە و سەرێکی ئەوێشی داوە. ئەمجا هاتبۆوە، وەکو کارمەند و وەکو موعەللیمیش کاری کردبوو. کاتێک کە ئەو هاتە دانیشگا ئێمە تەمەنمان کەمتر بوو، هەژدە ساڵ و نۆزدە ساڵ بووین، چونکە ڕاست دەبیرستانمان تەواو کردبوو و یەکسەر چووبووینە دانیشگا. ئەو بە هۆی ئەو هاتوچۆیەی کە کردبووی بۆ کوردستانی عێراق و خەڵکی ناسیبوو و پێش ئێمەش سیاسەتی کردبوو و لەگەڵ شیعر و ئەدەبیش خەریک ببوو، زیاتر لە ئێمە کتێبی بۆ دەهات، کتێبی دەست دەکەوت، ئەو کتێبانەی لە کوردستانی عێراق چاپ دەکران. ئەو دەیزانی من چەند خۆم خەریک کردووە بە شیعر و بە ئەدەب و بە نووسینی کوردیەوە، بەڵام غەیری شیعری کلاسیکی کوردی هیچی دیکەمان لە دەستدا نییە، ڕاستە ئێمە لە ئەدەبیاتدا خەریک بووین، بەڵام هەر ئەوەندە نەبوو: ئێمە ڕەفیقی سیاسیش بووین، پێکەوە یەکێتیی خوێندکارانی کوردستانمان دروست کردبوو کە بە نهێنی کاری دەکرد لە دانیشگای ئێران و بەڕاستیش پەرەیەکی یەکجار گەورە و یەکجار خێرای بەخۆیەوە دی. ئەو کاتە کە ئێمە هەموو خەڵکمان دەناسی، تەقریبەن پێمان شک نەدەهات، خوێندکارێک، خوێندکاری کورد بووبێ و

لە یەکێک لە دانیشکەدەکان یا دانیشگاکانی ئێران قەبووڵ بووبێ و نەهاتبێ و بە جۆرێک یا ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ سەر وە یەکێتیی خوێندکارانی کورد نەبووبێ، یانی کەس نەمابوو.

هەم من و هەم عەزیز ژیان لەگەڵ برادەرانی تر ئەندامانی چالاکی ئەم بزووتنەویە بووین و کومیتەی بەڕێوەبەریش بووین. لەبەر ئەوەی ئێمە ڕەفیق بووین، ڕەفیقی سیاسی بووین، بەڵام ئەوەی لە خەڵکی دیکەی زیاتر لێک نزیک دەکردینەوە، ئەوەیە کە ڕەفیقی ئەدەبی بووین. کاک عەزیز ژیان جارێکی بە منی گوت: «دیارییەکم بۆ هێناوی بۆ خۆشت باوەڕ ناکەی». کوتم چی؟ کوتی وەڵڵاهی دوو جلد دیوانی شیعرە، بە دانستە ناردوومە و ڕامسپاردووە و هێناومە و بەتایبەتیش بۆ تۆم هێناوە چونکە دەزانم تۆش چەند لەوە دەگەڕێی ڕچەیەکی تازە بۆ شیعری نوێی کوردی دروست بکرێ، جا ئەوە من سەرچاوەیەکت نیشان دەدەم کە هێنای دوو جلد کتێب بوو،زۆر جوانیش جلد کرابوون. لە بیرمە لە دوو جلدی ڕەشی شیک و جوان. یەکیان «بەهەشت و یادگار»، یەکێکیان «فرمێسک و هونەر». هەر دووکیان ئی مامۆستا گۆران. ئەمە سەرەتای ئاشنایەتی من و لە ڕێگای منیشەوە، سەرەتای ئاشنایەتی هەموو خوێندکارانی کورد و هەموو شاعیرانی کوردیش بوو، لەگەڵ بەرهەم و ئەسەری گۆران. ئەوە ڕێگای کردەوە کە ئێمە جگە لە شیعری ئوورووپایی - کە وەکو سەرچاوەیەک چاومان لێ دەکرد - جگە لە شیعری نوێی فارسی، سەرچاوەیەکی تازەمان دەست کەوێ، ئەویش شیعری نوێی کوردییە. دیتمان خەڵک پێش ئێمە و زۆر پێش ئێمەش ئەم ڕچەیەی شکاندووە و ئەو ڕێبازە خەڵکی پێدا ڕۆیشتووە، نەک خەڵکی ئاسایی و کەم و یا کەم عومق، کەم قووڵایی، بەڵکو کەسێک کە پڕاوپڕ مێشک و زیهن و دەروونی ئێمەی پڕ کرد لە خۆشەویستی و لە ئیعجاب بەرانبەر بە خۆی، لە تەحسین بەرامبەر بە شیعرەکانی. من هەر ئەو کاتە کە ئەو ئەسەرەی «گۆران» لە منی کردووە کە بڵێین دەوروبەری ساڵانی ۱۳۳۸ی ئێرانییە، دەکاتە ۵۹، کە تا ئەڵئان ئەوە پەنجا ساڵێکە. هەرگیز نەمتوانیوە خۆم لە ژێر تەئسیر و کاریگەریی شیعری گۆران بەرمە دەرێ.

ئەوە ڕێگای کردەوە ئێمە بچینە نێو دنیایەکی تازە، ئەم دنیایە هەر ئەوە نەبوو دیارە ئەوە بەشێکی گرینگ بوو، گۆران وەزن و قافییەشی گۆڕیبوو، درێژی و کورتیی میسرەعەکانیشی گۆڕیبوو، لە شیعری کلاسیک لایدابوو، بەڵکو گرینگتر ئەوە بوو کە شێوە قسەکردنیشی گۆڕیبوو، گرینگتر ئەوە بوو نێوەرۆکی قسەکانیشی دووبارە هەر گۆڕیبوو، کە وا بوو هەم لە شێواز و هەم لە نێوەرۆکدا شتێکی تازەمان هاتە بەر دەم. ئەگەر من هەڵە نەکەم یەکەمین کەسێک لە کوردستانی ئێران کە یەکەمین شیعری نوێی کوردی دانا و خۆی تاقی کردەوە،

عەلی حەسەنیانی بوو. ئەو وەختە ناوی خۆی نابوو «هاوار»، بە ناوی «ئاگری»شەوە شتی چاپ دەکرد ـ دواتر دیارە بە «هاوار» دەرچوو ـ عەلی کە گیرا لە زیندان شیعرێکی چاپ کرابوو بە ناوی «ئاگر سابلاغ» کە گۆیا «ئاگر» ئەو شیعرەی لە سابلاغ کوتووە. بازجۆکانی سازمانی ئەمنییەت نەیانزانیبوو بیخوێننەوە، دەیانخوێندەوە«ئاگرسا». جا نە دەیانزانی «ئاگرسا» بە تەنیا مەعنای چییە،نە دەشیانزانی ئەوەی دیکەش دەبێتە «بلاغ»، نەی «بلاغ» چییە؟ لەسەر ئەوەی گەلێکیان لێ دابوو، ئەوە دەڵێن ئی تۆیە، بابە وەڵلا ئی من نییە،ئاخە «ئاگرسا» مەعنای نییە، لە خەڵک بپرسن، لە ئەوانەی کوردی دەزانن، بزانن ئەمن شتی وا دەڵێم؟ نە «ئاگرسا» مەعنای هەیە، نە «بلاغ» مەعنای هەیە. گۆیا ئەم (-)ی خەتی کە بەینیان کێشابوو چاپخانەکە بە خراپی دانابوو «سا»یەکەی بە سەر«ئاگر» خستبۆوە و «بلاغ»ەکەشی بە جوێ دانابوو،ئەمە بوو بە نیعمەت.

وا بزانم ئەو یەکەم کەس بوو، ئەگەر من هەڵە نەکەم،هەرچەند قسەیەک هەیە کە لە شاری سنە برادەرێک بە ناوی «کوردۆ» یا «کاردۆ» پێش ئەوە تەجرەبەیەکی شیعری کوردیی نوێی کردووە، پێش ئێمە، ڕاستێکەی من نەمدیوە، بەڵام ئەگەر بووشبێ لەم دایرەی ئێمەدا نەبوو، ئەویش بۆخۆی تەجرەبەیەکی خۆی هەبوو. ساڵانی کۆتایی سییەکانی ئێرانی و چلەکان، کاری سیاسی زۆر پەرەی ئەستاندبوو. کاری سیاسی لە لایەکەوە یەکێتیی خوێندکارانی کورد بوو، لە لایەکیشەوە ئێمە، دوایە چووین و تێکەڵ بە حیزبی دێموکراتی کوردستانیش هووین، دیارە لەسەر پێشنیازی خۆمان و ئێمە خۆمان ناساند بە حیزب و حیزبیش زۆری پێخۆش بوو، تێکەڵ بووین، بەڵام تا ساڵی ۱۳٤۳ بڵێین نەورۆزی ۱۳٤۳ کە خەڵکەکە گیرا ئەم حاڵەتە ئیدامەی پەیدا کرد. من پێش ئەوە لە نێوەڕاستی ۱۳٤۱ کە دەبێتە تەقریبەن نێوەڕاستەکانی ۱۹٦۲ی میلادی ڕۆیشتبووم. هەر لەسەر داخوازی و پێشنیازی یەکێتیی خوێندکارانی کوردو کومیتەی حیزبی من ئێرانم بەجێ هێشت و هاتم بۆ بەشداری لە شۆڕشی کوردستانی عێراقدا و ئەوە ماجەراکەی دووردرێژە.

ساڵ و نیوێک دوای ڕۆیشتنی من کومیتەکەش گیرا. کە دەکاتە ئاخرین شەوی ساڵی ۱۳٤۲ و بەرەبەیانی ڕۆژی نەورۆزی ۱۳٤۳ واتە ٦٤ی میلادی. بە مە دەورەیەک لە شیعری نوێی کوردی سەری هەڵدا و بەڵام ڕاشوەستا، چونکە شیعری نوێی کوردی تا ئەو کاتە ئەوەندە فراوان و ئیقلیمگیر نەبوو، کە بڵێی بڵاو بووبێتەوە و هەموو کەس ئیستیقبالی لێ کردبێ و خەڵکێکی زۆر وەدووی کەوتبێ. بەپێچەوانە موخالەفەتێکی یەکجار زۆری دەکرا، لایەنگرانی شیعری کلاسیکی کوردی کە تەقریبەن یانی هەموو کەس، هەرچی خوێندەوارییەکی بوو، لە کۆلکە مەلا و کۆلکە میرزایەکەوە بگرە هەتا پیاوی خوێندەوار و

ڕووناكبیری سەردەم هەمووی دژی شیعری نوێ بوون، هەموو پێیان وابوو ئەمە تێكدان و ڕووخاندنی زمانی كوردی و شیعری كوردییە، بە قەولی خۆیان دەیانكوت بە دەولەتان دەرنەهات بناغەی زمانی كوردی، بەلام ئێوە خەریكن ئەم بناغەیە لە بنەڕەتدا دەردێن و زمان تێكدەدەن. لەبەر ئەوە سێ چوار سالی هەوەلێ، لەم دەورەی یەكەمدا شیعری كوردی نوێی هەرچەند حەولی بۆ درا، لە لایەن شاعیرەكانیەوە، كە ئێستا بۆت باس دەكەم، بە سوارەی ئێلخانیزادەوە، بە فاتیح شێخولئیسلامییەوە بە عەلی حەسەنیانییەوە، بەلام زۆر پەرەی نەسەند. ئەمما لەم سەردەمە ئەمە پێی دەلێین دەورەی یەكەم، من دوایە باسی دەورەی دووهەمت بۆ دەكەم، سوارە لە سالانی یەكەمدا لەگەل ئێمە، نەیتوانی بێتە دانیشگای تاران هەر چەند هاوڕێی ئێمە بوو، بەلكو سالێكیش لە من گەورەتر بوو، بەلام ئەو بە هۆی ئەو نەخۆشییە كە تووشی هات و سێ سالی تەواو لە سەر جێگا خستی دوا كەوت لە خوێندن. كاتێک چابۆوە بۆوەی جاری دەورەی دەبیرستان تەواو كا هات بۆ تەورێز بۆ خوێندن.

ئێمە لە تاران بووین، چووبووین بۆ دانیشگا، بۆیە دوو سالی پێچوو، ئەو دوای ئێمە گەیشتە دانیشگا، بەلام زۆر ئەهلی زەوق بوو، زۆر شارەزا بوو لە ئەدەبیاتدا، زۆریش زمانێكی پاراو و كوردییەكی جوانیشی دەزانی و من و ئەو جگە لە هەموو بوارەكانی دیكە،بواری ئەدەب و شیعر و جگە لە بواری سیاسەت كە بە یەكەوە بووین، ڕەفیقی درێژایی تەمەنی مندالیشمان بووین. لە عومری سێ سال و چوار و پێنج سالێوە كە ئینسان شتی وەبیر دێ و ڕابردووی وەبیر دێ، من و ئەو وەكو دوو ئامۆزا، وەكو دوو برا پێكەوە بووین، مالیشمان پێكەوە بوو، هەستان و دانیشتمان پێكەوە بوو، تا پێكەوە گەورە بووین، تا پێكەوە دلدارێمان كرد تا پێكەوە سیاسەتمان كرد. لەبەر ئەوە تەبیعی بوو كە من ئاگاداری بكەمەوە لەو دەسكەوتە تازەمان و لەو دیارییە تازەمان كە دیوانەكەی گۆرانە. من چم كرد: هەر بە نێوان دە ڕۆژ، پازدە، بیست ڕۆژ بە گوێرەی ئەوەی كە لە دەستم هاتبێ، شیعرێک لە شیعرەكانی گۆرانم هەلدەبژارد، كە خۆم بە لامەوە خۆش بوو یا تایبەتمەندییەكی بۆ ئێمە تێدابوو و بۆ ئێمە تازە بوو، شتێكی وای تێدا بوو دەكرا لێی فێر بی، یەكێكی ئاوام هەلدەبژارد، دەگەل نامەیەكی خۆم، من لەو نامەدا شەرحی ئەو شیعرەم دەدا، تایبەتمەندییەكانم بەیان دەكرد، ئێمە دەتوانین چی لێ فێر بین ، نامەیەک كە هەموو جارێ هەشت و نۆ و دە لاپەڕەی دەگرت، بێجگە لە شیعرەكە و ئەمەم بۆ دەنارد بە پۆستدا. ئەو كە دەیخوێندەوە هەم لەسەر شیعرەكەی گۆران و هەم لەسەر نووسراوەكەی من بۆچوونی خۆی دەنووسی. ڕەنگە بە درێژایی سالونیوێک بە دەیان نامەی ئاوا لە بەینماندا هات و چوو - ڕەنگە سی چلێک ئەمە خۆی كتێبێكی زۆر خۆشی لێ دروست دەبوو كە دەیتوانی ببێ بە

یەکێک لە سەرچاوەکانی مێژوویی بۆ ئەوەی خەڵکی دوای ئێمە بزانێ شیعری نوێی کوردیی لە کوردستانی ئێران چۆن سەری هەڵدا، بەڵام بەداخەوە ئەوە وەکو هەموو شتەکانی تر لە هێرشە یەک لە دوای یەکەکانی ڕژێمی ئێران بۆ سەرمان سووتا و هیچی نەما و پەرتوپەلا بوو، نە دەستخەتەکانی من نە دەستخەتەکانی کاک سوارە، ئەوەی لە لای یەکمان هەبوو، هیچی نەما. با ئەودت بۆ بگێڕمەوە: ئێمە جارێکی دیکەش دەستخەتەکانمان فەوتا، ئەویش ئەوە بوو لە ساڵی ١٣٤٧ من گیرام کە دەکاتە ١٩٦٨ی میلادی، دوای ماوەیەک کە هیچ ڕێگا نەبوو، شەش مانگی پێچوو چاوپێکەوتن نەبوو، بەڵام دوای ئەوە ملاقات و چاوپێکەوتن ئازاد بوو، نامە نووسین ئازاد بوو. چونکە زیندانەکەی ئێمە لە ورمێ زیندانێکی تایبەت بە خەڵکی سیاسی نەبوو، ئێمەیان تێکەڵ کردبوو بە زیندانی ئیعتیادی، زیندانە ئاساییەکان، کە ئەنواعی جەریمە و جنایەتیان کردبوو. تاوانی بەشی زۆریان هەر مەوادی موخەدیر و تریاکو قەتڵ بوو، دزی و ئەوانەبوون. لەبەر ئەوە کاربەدەستانی زیندانەکەی ئەوێ ڕانەهاتبوون لە باری سیاسییەوە کونترۆڵی نامە بکەن. ئەوان بەس کاریان بەوە بوو مەوادی موخەدیر و تریاک و هێرۆیین هاتوچۆ نەکا بۆ نێو زیندان. ئێمە لەوەی ئیستیفادەمان کرد - من‌و سوارە - بە درێژایی زیندان نامەمان پێکەوە هەبوو. جارجار ئێمە حیسابمان دەکرد مومکینە دەوڵەت بیبینێ، بۆیە حەولمان دەدا ئەو قسەی دەیکەین لە توێی هەزار پەردەدا بیپێچینەوە، بەڵام هەر دووکیشمان فرسەتێکی زۆرمان لەبەر دەستدا بوو بۆ نووسین.

من دەورانی لێدان و زیندان و شکەنجەکەم تەواو ببوو، ژوورم هەبوو، لە ئەوەڵی سبەیڕا هەتا ئێوارێ دەمتوانی فەقەت بنووسم، لە هەموو ڕەفیقەکانیشم دوور کەوتبوومەوە و بیرم دەکردن. جگە لەوە پێم خۆش بوو بزانم باشە دوای گرتنی من دەرێ چی لێهاتووە و خەڵک چۆن بیر دەکاتەوە.

سوارەش کە بێ من لە واقیعدا - بە قەولی خۆی گۆچانی دەستەکەی لێ گوم ببوو- لەگەڵ خەڵکەکەی دیکە بە قەد ئەو ئەندازەی لەگەڵ من بوو لەگەڵ وان تەبایی و تێکەڵاوی نەبوو و باوەڕی و دڵنیاییان ئاوا بە یەکەوە نەبوو لەبەر ئەوە هەرچی لەویش لەنێو خەڵکەکەی دیکە نەیدەکوت دەیکردە نامە و دەینووسی، ئەو نامانەش هەر دووکیان زۆر خۆش بوون. توانای خۆمان بە کار دەبرد لەوە چۆن بتوانی هەموو قسەکانت بکەی و سانسۆریش نەزانێ. ئێمە بۆ ئەوە ئیستیفادەمان کرد لەو زمانەی کە دواتر پێت دەڵێم زمانی خەوەبەردینەیە. ئەم زمانی خەوەبەردینەیە کە دوایە بۆت باس دەکەم زمانێکە بە نێوەرۆکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و بیروباوەڕێکە لە ژێر پەردەیەک ڕەنگ و ڕواڵەتی ئەدەبی و قافیە و وەزن و جیناس و تێکەڵکردنی وشەی هاووەزن یا هاوپیت، کە پیتەکانی لێک نزیک بن، وا لێکیان دەداتەوە

کە خەڵک پێی وایە ئەمە هەر ئینشا و نووسینێکە، هەر وشە ڕازاندنەوەیەکە. ئەمە کەڵکمان لێ وەرگرت بۆ ئەوە لە ژێر ئەم پەردەدا بتوانین شتەکانی خۆمان بنووسین. بەم جۆرە ـ دیارە نامەی دووهەم یا نامەی زیندان ئی دەورەی دووهەمە ـ دەورەی یەکەمی تەواو بوو.

من وەسەتەکانی ساڵی ١٣٤٢ ڕۆیشتم، ساڵ و نیوێک دوای من ئەو خەڵکە گیرا. ئەو شتەمان بە سەر هات کە عەلی حەسەنیانی لە شیعرێکدا باسی دەکا، دەڵێ: «پۆلە کۆترێک بووین بێ خەم، بێ خەیاڵ، جوانترین مێرگی خودامان بوو...» جا لەوێدا دەڵێ کە کێ چی بە سەر هات. ئیشارە بە هەموومان دەکا. دەبێ ئێمە خۆمان بزانین ئەمە بە کێ دەڵێ و ئەوە بە کێ دەڵێ ـ «کۆترێک سەر بڕا و کۆترێک گیرا و یەکیش لە شەققەی شاباڵی دا و فڕی... .» ـ ئەوەیان بە من دەڵێ ـ ئەوی دیکەش یەک گیرا و یەک چی کرد. دیارە سوارە کە لەگەڵ عەلی حەسەنیانی هەم ڕەفیق بوون و هەم شەڕەقسە و گاڵتە و شەڕەجنێوی بوو، قسێکیشی پێ کوتبوو کە دەیکوت لەو کۆترانە یەک چی کرد و یەک چی کرد و یەک فڕی و یەکیش چی لێهات، جا دەیکوت ئەوەیان کە وای لێهات، ئەوە عەلی خۆیەتی. ئەمە دەورەی یەکەم بوو.

دەورەی یەکەم بە تەسەوری من عەلی حەسەنیانی لە هەموان زیاتر دەوری هەبوو، نەخشی هەبوو،لە هەموان فراوانتر شیعری هەبوو. شیعرەکانی زۆر کەم نەبوون تا ئەو سەردەم. چونکە پێش وان دەستی پێکردبوو. دیارە کە ئەمن دەڵێم پێش، ساڵێک پێش وان، یا کەمتر لە ساڵێک ـ دواتر فاتیح، دواتر سوارە، ئەگەر بە ژمارەی زۆری شیعر و هاتنە نێو مەیدانی گوتنەوە بێ، بەڵام لە ساڵی ١٣٤٥ من گەڕامەوە بۆ کوردستانی ئێران. جارێکی دیکە هەم لە باری سیاسیدا کۆبوونەوەکانی خۆمان و کومیتەنهێنییەکەمان دەست پێکردەوە. من لە دەرەوە هاتبوومەوە و تەجروبەی کوردستانی عێراق و شۆڕش و پێشمەرگایەتیم لەگەڵ خۆم هێنابۆوە، ئەوانیش لە زیندان هاتبوونە دەرێ. تەجروبەی زیندان و لێدان و شکەنجەی نێو زیندانیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو. جگە لەوە دەستەیەکی دیکەی تازەشمان پێ ئیزافە بوو کە جەوانتر بوون لە ئێمە ـ تەقریبەن بە نەسلێک یا نیوە نەسلێک لە ئێمە جەوانتر بوون ـ وەکو عەبدوڵڵا موهتەدی و موسلیح شێخولئیسلامی، ئەمەش دەستەیەک بوون. ئەوانەی لە دەورەی پێشووشدا لەگەڵ بوون، وەکو ئەمیر حەسەنپوور، وەکو بایز مەردووخی، وەکو مەحموود مەردووخی، ئەوانیش دووبارە هەر هاتنەوە نێو ڕیزی پێشوو، بەڵام لەم سەردەمەی دووهەمدا کە لە چل و پێنجەوە دەست پێدەکا ئێران زۆر گۆڕاوە، ئەو تەحەولەی من لە ئەووەڵی قسەکاندا بۆم باس کردی کە لەگەڵ ئیسلاحاتی ئەرزی لە ١٣٤١ەوە دەستی پێکرد. ڕاستییەکەی لە ١٣٤٥ ـ ١٣٤٤ەوە ئەسەر و کارایی خۆی نیشان دا، کۆمەڵگای گۆڕی، ئەم کۆمەڵگا جووتیاری و دێهقانییەی ئێرانی گۆڕی و کۆمەڵگایەکی کە بە سورعەت بەرەو

سەنعەتی بوون دەڕوا بە سورعەت بەرەو زیادبوونی ژمارەی خوێندکاران دەڕوا، بەرەو گەورەبوونەوەی شارەکان دەڕوا، بەرەو زیادبوونی دەوری شار لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا دەڕوا. ئەم وەزعە ساڵی ١٣٤٥ لەگەڵ خۆی ئیدئۆلۆژی و بیروباوەڕی تازەشی هێنا، ئەمە سەردەمی هەرە توندی گەشەکردنی بیروباوەڕی چەپە لە ئێران. هەموو حیزبە سیاسییەکانی کە دوایە لە ئێراندا سەریان بەرز کردەوە و ناوێکیان پەیدا کرد، ئەوە چریکی فیدایییە، ئەوە ئیتیحادییەی کۆمۆنیستهایە، ئەوە سازمانی ئینقلابییە. لە نێو سەرتاسەری ئێراندا کە بیڵێین ـ هەموو ئەوانە بەرهەمی ئەم دەورەیەن.

لە کوردستانی ئێران ئەو حەرەکەتە چەکدارییە شۆڕشگێڕانەیە بوو کە بڕێک لە کادر و ئەندامەکانی دێموکراتی کوردستانی ئێران، سولەیمان موعینی، سمایل شەریفزادە، مەلا ئاوارەو ڕەفیقەکانیان، لە پێشدا لە کوردستانی عێراق بە هاوکاری بڕێک کەس، وەکو سالار حەیدەری، سەعید کوێستانی، لە حیزبی دێموکرات جیا بوونەوە، یانی لە سەرکردایەتیی حیزبی دێموکرات، سەرکردایەتیی سوننەتییەکە، جیا بوونەوە شتێکیان دروست کرد بە ناوی کومیتەی ئینقلابیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران. ئەمەش چاولێکەرییەک بوو لەو کومیتە ئینقلابییەی حیزبی توودە کە لە ئورووپا سەری بەرز کردبۆوە. لە سەرکردایەتییە سوننەتییەکەی حیزبی توودە جیا ببۆوە، ناوی خۆی نابوو کومیتەی ئینقلابیی حیزبی توودەی ئێران. یانی لە واقیعدا کومیتەیەکی ئینقلابییان لە دژی حیزبی توودە و ئەفکارەکەی پێکهێنابوو. دیارە ئەوانە لە دەرەوە بێ دۆست بوون، بەشێکیان وەک «سمایل شەریفزادە» هەر کاتی دەورەی یەکەمی پێکەوە بوونمان لە یەکێتیی خوێندکارانی کورد و لە هەموو فەعالییەتەکەدا بە یەکەوە ببووین. لەگەڵ هەموومان دۆست بوو. بەشێکی دیکەشیان وەکو «مەلا ئاوارە» و وەکو «سولەیمان موعینی» لەگەڵ خودی من دۆست بوون، کاتێک کە لە کوردستانی عێراق بووم و بە یەکەوە پێشمەرگە بووین، لەبەر ئەوە یەکەمین کاری ئەوان کە هاتنەوە بەرەو کوردستانی ئێران پەیوەندی گرتن بوو لەگەڵ ئێمە. نامەی دوورودرێژیان دەنووسی و ڕایانگەیاند کە ئێمە لەگەڵ بیروباوەڕەکەی ئێوە هەین. ئێوە ڕاستتان کوتووە، چونکە ئەوانە لە دەورەی یەکەمی کێشەی ئێمەدا لەگەڵ حیزبی دێموکرات و لەگەڵ ئەحمەد تۆفیق لە سەریان نەکردینەوە، بەتایبەت سولەیمان موعینی هەر دۆست و هاوکار و هاوپەیمانی «ئەحمەد تۆفیق»ی بوو ـ بڵێین سەید عەبدوڵلا ئیسحاقی ـ دەستی ڕاستی ئەو بوو، موخالەفەتی ئێمەی کردبوو، بەڵام دوای ماوەیەک خۆی کەوتە موخالەفەت لەگەڵ ئەحمەد تۆفیق. ئەویش هاتە نێو جەرەیانەکە، ڕەگەڵ سمایل و مەلا ئاوارە کەوت. ئەوانە ڕایانگەیاند کە ڕێگای ئێوە ڕاست بووە، ئێمە قسەکانی ئێوەمان قبووڵە و ئامادەین بۆ هاوکاری

لەگەڵتان. ئێمەش وەکو یەکێتیی خوێندکارانی کورد و کومیتەی تاران زۆرمان پێخۆش بوو: زۆرمان پێ چاک بوو هاوکاریمان دەست پێکرد.

جا ئێمە لە ژێر تەئسیری ئەم فەزایەیدا کە لە تاران هەبوو، یانی حەرەکەتی چەپ و شۆڕشگێڕی و ڕووناکبیری کە بە خێرایی و بەرفرەوانی خەریک بوو سەر بەرز کاتەوە. ئەوانیش لە ژێر تەئسیری ئەو حەرەکەتەدا بوون کە لە ئوروپا هەبوو لە ڕێی هەر ئەو کومیتە ئینقلابییەی حیزبی توودەوە و لە ڕێی بەعزێک کەسیانەوە کە لە ئوروپا بوون ـ وەکو محەممەد موهتەدی، برای من ـ کە ڕەفیق و دۆست و برادەری سمایل شەریفزادە بوو، پێش ئەوەی سمایل بچێ بۆ کوردستانی عێراق و محەممەد بچێ بۆ ئوروپا هەردووکیان بە یەکەوە لە دانیشگای تاران بوون پێوەندییان گرت لەگەڵ بڕێک کەسی ناسراوی ئەو کاتەی سازمانی ئینقلابی، وەکو کۆرش لاشایی کە لە چالاکەکانی ئەو وەختەی کومیتەی ئینقلابیی حیزبی توودە بوو: بە هاتوچۆی لە ئوروپاوە بۆ نێو عێراق و نێو کوردستان بوو بە حەڵقەی وەسڵ. ئەو وەختە دەوڵەتی عێراقیش تەمایولی چەپی هەبوو و لەگەڵ شوورەوی دۆست بوو و تەواو دەیانەویست موخالەفەتی ئێران بکەن. لەبەر ئەوە ڕێگای هێزی چەپ و شۆڕشگێڕیٔ ئێرانیان دەدا کە بتوانن موخالەفەتی شای ئێران بکەن. لەو حاڵەتەدا کومیتەی ئینقلابیی حیزبی توودە و کۆرش لاشایی و ڕەفیقەکانی پارسانژاد و ئەوەی کە من ئێستا ناوەکانم لە بیر بن، ئەوانە لە پیاوە مەشهوورەکانی چەپی ئێرانی بوون، هەرچەند دوایە ڕووخان و بە خاین دەرچوون، بەڵام ئەو کاتە لە هەرە ڕەهبەرانی بزووتنەوەی چەپی ئێران بوون. ئەوانە بوون بە حەڵقەیەکی وەسڵ لە بەینی محەممەد و سمایل شەریفزادە. سەردەمێکە کە باڵی مەکتەبی سیاسی لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانیش لە ئیختیلافدایە و مام جەلال بە خۆی و هەموو دۆستان و لایەنگران و هێزی چەپی کوردستانی عێراق مەقەڕیان بردۆتە بەکرەجۆ، بۆیە بەکرەجۆ بوو بە مەرکەزێک بۆ هاتوچۆی هێزە چەپەکانی ئێرانی، ئەم هێزە چەپانە لە ڕێگای مام جەلالیشەوە لەگەڵ ئەم کومیتە ئینقلابییەی حیزبی توودەی ئێران دەستیان کرد بە هاوکاری و پێوەندگرتن بە سولەیمان موعینی و مەلا ئاوارە و سمایل شەریفزادە و بە هەموویانەوە. بەم تەرتیبە ئەو هێزە شۆڕشگێڕە چەکدارە لە کوردستانی عێراقەوە هاتەوە نێو ئێران. ئەوان سەرچاوەی خۆیان هەیە بۆ وەی موتەئەسیر بن لە بیروباوەڕی تازە، ئێمەش لە تاران سەرچاوەی خۆمان هەیە بۆ وەی تەئسیر وەرگرین لە حەرەکەی تازەی هەم ئێرانی و هەم جیهانی. ئێمە یەکمان گرتەوە. ئەمن زۆر ناچمە سەر باسە سیاسییەکە، من باسە سیاسییەکەم بۆیە کرد تا زەمینەسازی بکەم بۆ ئەوەی بزانی ئەم ئەدەبیاتەی کە پێی دەڵێن ئەدەبیاتی ساڵی ٤٦ـ ٤٧ چۆن دروست بوو.

ئەم حەرەکەتە سیاسییە چەکدارییە، کە لە کوردستان چەکدار بوو، بەڵام لە بەقییەی ئێران ئێمە باڵە سیاسییەکەی بووین، لە واقیعدا ئەوان باڵە چەکدارەکە بە یەکەوە کارمان دەکرد. خۆشمان لە تاران لەگەڵ هێزی شۆڕشگێڕ و ئازادیخوازی ئێرانی، چەپ و غەیرە چەپ دۆستایەتیمان هەبوو. هەموو ئەوانە زەمینەیان خۆش کرد بۆ ئەوە کە ئێمە ئەمجار قووڵتر، بەرینتر و بە هەست بە مەسئوولییەتێکی زیاترەوە دەست بدەینە پەرەپێدانی ئەدەبی کوردی لە هەموو بوارەکاندا. لە شیعر،لە نەسر،لە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی،لێکۆڵینەوەی مێژوویی، نمایشنامە نووسین و ئەو شتانە. هەر ئەو سەردەمەیە کە بڕێک لە ئێمە دەستمان کرد بە نووسینی چیرۆکی کورت. من یەکێک لە وانەم، مەحموود مەردووخ یەکێک لە وانەیە، دواتر موسلیح هاتە نێو ئەو حەڵقەیە، بوو بە یەکێک لە وانە. لایەنەکەی دیکە دەستی کرد بە شیعر، دەورەی دووهەم ـ کە لە ١٣٤٥ەوە دەست پێدەکا - لە باری شیعرەوە دەورەی سوارەیە، یانی بەرجەستەترین و دیارترین بوو لە دەورەی دووهەمدا. من کوتم لە دەورەی یەکەمدا عەلی حەسەنیانی بەرچاوتر بوو.

سوارە لەم دەورەیەدا، هەم بەردەوام هەم زۆر بە پەلە گەشەی دەکرد ـ وەک دەڵێن یەک ڕۆژەی دوو ڕۆژەبوو ـ وەکوو منداڵێک وابوو. لە بواری ئەدەب و نووسیندا ڕۆژ دەگەڵ ڕۆژ فەرقی دەکرد، شیعر لەگەڵ شیعری نیشانەی کامڵ بوون و بەرزبوونەوە و قووڵ ڕۆیشتن بە ناخی ئەدەب و بە ناخی فکرەوەی دیار بوو. دیارە لووتکەی ئەم بەرزییە خەوەبەردینەیە، بەڵام فەزای سیاسیی سەردەم چ لەنێو ئێراندا چ لە نێو کوردستادا و چ لە نێو ئێمەدا فەزای چەپ بوو. بە گشتی بیرکردنەوەیەکی چەپ بوو، بەڵام ئەم بیرکردنەوەیە، بیرکردنەوەی چەپی کوردی بوو. جا با «کۆمەڵە» بۆخۆی هەزار جار تەفسیری سیاسی بۆ خۆی دابنێ کە من چۆن دروست بووم و چۆن دروست نەبووم، بەڵام «کۆمەڵە» میراتگری ئەم فەزایەیە. ئەم چەپە کوردییە ئەوەندەی سیاسەتی دەکرد دوو هێندە زیاتر خەریکی ئەدەب و شیعر و نووسین و خەریکی کاری فکری و کاری فەلسەفی و کاری کۆمەڵناسی بوو.

هەموو ئاساری ئەدەبی کە ئێستا مەشهوورن بە دەورەی ٤٦ـ ٤٧ کە دەکاتە ٦٧ـ٦٨ی میلادی لەو دوو خاڵەدا خۆیان دەبیننەوە: یەک: ئەندیشەیەکی چەپ. دوو: بیرێکی ڕزگاریخوازی کوردی. لە تێکهەڵکێشان و تێکەڵبوونی ئەم دووانە ئەندیشەیەکی چەپ لەگەڵ بیری ڕزگاریخوازی کوردی هەموو ئاسارە ئەدەبییەکانی گرتەوە،جگە لەوە خۆی شۆڕشە چەکدارییەکە و هاوکاریی ئێمەش لەگەڵ ئەو شۆڕشە چەکدارییە هەر تێکهەڵکێشێکی ئەم دوو فکرە بوو. هەم چەپ بووین و هەم کوردستانی بووین، هەم چەپ بووین و هەم ڕزگاریخواز بووین.

هەموو شیعرەکانی سوارە، شیعرە ئەساسییەکانی، شیعرە گرینگەکانی باش نازاندرێ ئەگەر شەئنی نزوولییان نەزاندرێ یانی نەزانی کە بۆ چی داندراوە و کەی داندراوە و ئیشارە بە کوێ دەکا. بەشی زۆری شیعرەکانی کاک سوارە لەم سەردەمەدا ئیشارەن بە ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە. کە تۆ شیعری مەسەلەن «دیواری چین» دەخوێنییەوە شیعرێکە کە ئەوە سەردەمێکە لە نێو ئێمەدا گومان پەیدا بووە ـ کە جاران هیچ گومانمان نەبوو ـ ئەویش ئەوە بوو کە باشترین ڕێبازی شۆڕشگێڕی ڕێبازی چینە و ڕێبازی ئەندیشەی مائۆتسیتۆنگە. یەکەمین گومان لەسەر ئەوە کە پەیدا بوو لە شیعری سوارەدا دیارە، بە ناوی «دیواری چین» کە باسێکی ڕووخانی دیواری چین دەکا. ئەمە لە واقیعدا باسێکی ڕووخانی ئەم ئیدئۆلۆژییە دەکا کە ئەو وەخت ئیدئۆلۆژیی موسەلەت بوو، تەقریبەن لە بەشێکی زۆری ئێران و لە نێو ئێمەی کوردیشدا.

زۆریش بە داپۆشراوی و سەربەستە باس دەکا، بەڵام باسی ڕووخانی دیواری چینە، دەڵێ: «سەردەمێکە زەمانە شت زۆر دەڕووخێنێ، دیواری چین سەردەمی ڕووخانێتی». ئەوە ئیشارە بە ئەم گۆڕینی ئیدئۆلۆژییە دەکا. یا باسی خێڵی درۆ:

**ئێوە کێن؟ خێڵی درۆ!**

**ئەی گەلی دەم پڕ لە هەرا**

ئەوە هی کاتێکە کە ئەم پێشمەرگانە دوای یەکدوو زەربە کە وێیان کەوت داوایان لە ئێمە کرد کە ئێمە سەرۆکەکانمان، مەسئوول و بەڕێوەبەرەکانمان بەشی زۆریان شەهید بوون، ئێوە وەرنە ناومان. ئێمە بە ئەندازەی پێویست پێشمەرگەمان هەیە، پێویستمان بە پێشمەرگە نییە، بەڵام پێویستمان بە کادری سیاسی و بەڕێوەبەر هەیە. خۆمان پێش ئەوەی ئەوان ئەو داوایەمان لێ بکەن لە کۆبوونەوەیەکی خۆماندا بڕیارێکمان دابوو. ئێمە چونکە بڕیارمان ئەوە بوو شەڕی چەکداری دەست پێ بکەین، پێش هاتنەوەی ئەو باڵە چەکدارە، بناغەمان ئەوە بوو ئێمە چەپین، مارکسیستین، ڕزگاریخوازی کوردین. لەبەر ئەوە بۆ ڕزگاریی کوردستان لەسەر بناغەی ئەندیشە و بیروباوەڕی مارکسیسم ئێمە پێویستیمان بە بەرپاکردنی شەڕی چەکداری بوو. ئەم بیروباوەڕە لە نێو ئێمەدا سەلمێندرابوو، بەڵام دامانانابوو کەی؟ خۆم ئێستا لە بیرمە ژمارەیەکمان دانابوو، ئەگەر ئێمە سەد کادری سیاسی و دوو سەد پێشمەرگە بتوانین ئامادە بکەین دەبێ یەکەمین حەرەکەتی چەکدارانە و یەکەمین تەقە دەست پێبکەین. جا کە ئەوانە هاتنەوە و ئێمە هاوکاریمان لەگەڵیان دەست پێکرد مەسەلەیەک هاتە گۆڕێ،ئێمە دەمانکوت خۆ ئەوانە لە دووسەت پێشمەرگە زیاتریان هەیە، ئێمەش خۆمان لە سەت کادر زیاترین. کە وابوو شەرتەکەی کە دامانناوە هاتۆتە دی. بەتایبەت خەبەر هات کە سولەیمان موعینی شەهید

کراوه، خەبەریش هات هەر لەو ڕێبازەدا سمایل شەریفزادە شەهید کراوە، مەلا ئاوارەش زۆری پێنەچوو لە دیوالآن لە دێیەک لە سەردەشت گیرا و دوایە ئەویش شەهید کرا.

هێزی پێشمەرگە داوایان لێ دەکردین هەرچی زووتر وەرن: ئێمە لە بەینی خۆماندا نەمانەدەتوانی ڕێک کەوین باڵە سیاسییەکە، یا بڵێین باڵە خوێندکارییەکە، ڕێک نەدەکەوتین. دەستەیەک لامان وابوو وەختێتی، بەڵێ دەبێ بچین، دەستەیەک دەیانکوت نەخێر کاتی نییە و نابێ بچین. ئاخرجار کە یەکترمان دیبەوە ئاوا بە فراوانی کۆبوونەوەمان کرد. کۆبوونەوەیەکمان کرد، بە کۆبوونەوەی سەقز دەناسرێتەوە. لەوێ ئیتر زۆر ئیختیلافی نەزەرمان پەیدا کرد، دەستەی بەینی بچین و نەچین. دەستەی بەینی بچین و نەچین بوون بە دوو قۆڵ. جا فاتیح شێخولئیسلامی لە لایەکەوە شاعیر بوو، ئەدیب بوو. وەکو موقابیل بە «سوارە» وابوو، بەڵام لە لایەکیشەوە سیاسی بوو. تێکۆشەر بوو بە یەکەوە بووین: دەیکوت نەچین.

دەلیلیش ئەوە بوو دەیکوت ئێمە کە کوتوومانە با سەت کادر بین و دووسەت پێشمەرگە بین، کوتوومانە هەموو کادری مارکسیست ـ لێنینیست بن، هەموو پێشمەرگەکان تەربییەت بووبن، هەموو مارکسیست بووبن، جا ئەودەمی ئێمە بچین شۆڕش بکەین. خۆ ئەوانە وا نین. ئەو پێشمەرگانە نە باشیان دەناسین نە دەزانین چەندە بیروباوەڕیان لەگەڵ ئێمە دێتەوە: چۆن بچین!

ئێمەش بەرامبەر بە وان دەمانکوت ئاخر بۆ پەروەردە کردنیشیان بێ دەبێ ئێمە بچین. ئەدی چۆنیان پەروەردە بکەین ئەگەر نەچینە نێویان؟ نەخێر با بچین.

جا سوارە ئەم شیعرەی کوت کە دەڵێ «ئێوە دانیشتوون وەدووی قسەی خۆڕایی کەوتوون)).

**ئێستە وا گرمە لە کێوان بەرزە**
**مێش ئەخاتە لەشی گا بوولەرزە**
**ئێوەن و ئێوەن و لۆکەی گوێتان**

دەڵێ ئێوە دانیشتوون هەر قسە دەکەن، مێشێکی چکۆلەش دەتوانێ گایەک بێنێتە لەرزەوە، وەختێک لە پێستەکەی نیشت، بەڵام ئێوە هاتوون قسە دەکەن، کە دەڵێ: «بووکی بن تارای سوور»، بۆیە دەڵێ خەڵک ڕەنگی سوور دەکا بە ئاڵای شۆڕشگێڕی، ئێوە ڕەنگی سوورتان کردووە بە تارا، خۆتان لە ژێردا شاردۆتەوە. «مل بە بەرمووری وشەی ڕەنگاوڕەنگ!» خەڵک وشە دەکا بە گوللە و لە سینگی دوژمنی هەڵدەکا، ئێوە وشەتان کردووە بە بەرموور لە ملی خۆتان کردووە خۆتانی پێ دەڕازێننەوە. ئێوە لە ژێر شوعاری

چەپبووندا ناشۆڕشگێڕی خۆتان دەشارنەوە. قسەکەی ئەوەیە: «خێڵی درۆ» هەموو قسەکەی ئەوەیە. دەڵێ ئێوە لە ژێر شوعاری چەپدا بە ناوی چەپبوون ناشۆڕشگێڕیی خۆتان دەشارنەوە. بۆیە دەڵێ وشەشتان خەسار کردووە،ئاڵای سووریشتان خەسار کردووە، کردووتانە بە تارای بووکێنی بۆخۆتان. هیچ تەئسیرتان نییە و حەتتا دەڵێ هەناسەی ئێوە ناتوانێ پەردەیەک لە بەر پەنجەرەیەک لابدا. ڕاستە خۆ ئەو شیعرە ئەگەر نەشزانی کەی گوتراوە و بۆ گوتراوە هەر کەس لە زەمانی خۆیدا دەتوانێ میسداقەکانی ئەمە ببینێتەوە، یانی بزانێ میسداقی خاریجیی ئەمە کێیە؟ شەرت نییە سەردەمێک بێ و بۆ فلان کەس بێ. هەر کەسە بە سەردەمی خۆیدا دەزانێ ئەمە بە کێ دەکرێ بگوترێ و ئەوە یەکێک لە خۆشی هەر شاعیرێکەو یەکێک لە ڕازی جاویدانە بوون و نەمریی شاعیرێکیشە. شیعرەکەی هەرچەند بۆ موناسەبەتێکی تایبەت بگوترێ، بەڵام وای گوتووە لە هەر زەمانێکدا هەر کەس دەتوانێ بە موناسەبەتێکی خۆی و بۆ بیرەوەری بەکاری بێنێ، ئەمە خەسڵەتی شیعری حافزە، یا لە کوردیدا خەسڵەتی شیعری سوارەیە ـ لە شیعری نوێدا دەڵێم ـ هەرچەند بە جۆرێک نالیش ئەم خەسڵەتەی تێدایە، لە شیعرەکانیدا، لە شیعری کلاسیکدا. بەڵام لە شیعری نوێی کوردیدا سوارە لە هەموو شاعیرێکی زیاتر ئەم خەسڵەتەی تێدایە کە شیعرەکەی وا گوتووە هەر کەس لە هەر سەردەمێکدا دەتوانێ ئەمە بە زمانی حاڵی خۆی و هی سەردەمی خۆی و هی دۆستەکان و هی ڕەقیبەکانی خۆشی بزانێ. ئەوە یەکێک لەو شتانەیە و سوارە شیعری دیکەشی لەو بابەتە کەم نین. شیعرێکیانی هەر بە موناسەبەت وەختێک کوت کە دەڵێ: من دەڵێم پەپوولەیەک فڕی بە باڵی سەوز و سوورەوە. ئەمە کاتێکە کە من گیراوم، دادستان حوکمی ئیعدامی بۆ داوا کردووم، هیچ پێوەندیم لەگەڵ دەرەوە نییە. خەڵک بیستوویانەتەوە داوای حوکمی ئیعدامم بۆ کراوە، بەڵام نازانن ئایا ئیجرا کراوە یا ئیجرا نەکراوە. سوارە ئەو شیعرەی بۆ من ناردبووە زیندان کە بزانێ بە دەستم دەگا یان نا ـ ئەو شیعرە دیارە بە دەستم گەیشت بەڵام درەنگتر. لەم شیعرەدا سوارە ئەوە دەگێڕێتەوە کە دۆستەکەی یا ژنەکەی پێی دەڵێ «وەدووی کڵاوی خوار مەکەوە، لە دووی چووان مەچوو، باشە کوان ئەوانەی ڕۆیشتن، کەس نەهاتەوە، دەزانی چییان لێهات؟ دە تۆش دامرکێ، دامەزرێ، ئاڵی زاڵی شەو چاوی بێخەوی چرە»، لە بەر ئەوە هانی دەدا بۆ ئەوە واز بێنێ و دامەزرێ و دامرکێ، چونکە دەڵێ «فەرموو ئەوەتا ئەوەی تۆ دەڵێی ئەو ڕۆیشت و ئەوە کوژرا،ئەوە ئیعدامیان کرد. تۆش وات لێدێ، خەڵکەکەی دیکەش هەموو وایان لێدێ، بێفایدەیە». سوارە جوابێکی دەداتەوە هەموو باری کۆمەڵناسیی سەردەمی خۆی تێدایە، بەڵام بێ ئەوەی تۆ پێت وابێ ئەوە بۆ کەسێکی دیاریکراوە. ئەمە لە هەموو سەردەمێکدا بۆ هەموو کەسێک دەگوترێ. نیشانەی ئومێدو

ئارەزووە بۆ دوارۆژ، نیشانەی هیوایە. هەر کەس لە سەردەمی خۆیدا کە ئیختیناق زۆرە، کە سەرکوتکردن زۆرە، کە داپلۆسین زۆرە، دەتوانێ ئەم شیعرە بێنێتەوە بۆ پەرەپێدانی هیوا. ئارەزوو و دڵنیایی لەوە کە سەرەنجام دوارۆژ هی ئێمەیە. بۆیە شیعرەکانی سوارە هەم جەنبەی تایبەتییان هەیە، هەم جەنبەی گشتی.

جا بێینەوە سەر خەوەبەردینە. خەوەبەردینە لە مەجموعی ئەو فەزایەی کە شیعرەکانی سوارەی تێدا کوتراوە بەدەر نییە. ڕاستە ئەوە لووتکەی بەرزی شێعرەکانێتی، بەڵام هەمووی لە دەروونی ئەم فەزا فیکرییە، ئەم فەزا سیاسییە و ئەم فەزا کۆمەڵایەتییە، لە عەینی حاڵدا ئەم فەزا فەرهەنگییەی خۆشی کە شیعری پێدەکوت و ئەم زمانە تایبەتییەی خۆیدایە. خەوەبەردینە دەڵێ چی؟ خەوە بەردینە دەیەوێ حەرەکەتی کۆمەڵایەتی بشوبهێنێ بە ئاو، لە پێشدا ئاو لە دەروونی کێوێکدایە حەبسە، سەرچاوەی ئاو عادەتەن لە نێو کێوەکاندایە - چۆن حەول دەدا یەکەم جار بێتە دەرێ - ئەمن دوایە ئەوەتان پێ دەڵێم، لەگەڵ مەعناکەی، بەڵام جارێ هەر بزانین خەریکە چی بڵێ، خەریکە چی بگەیەنێ. ئاو خەریکە لە دەروونی کێوێک دێتە دەرێ، ئەمە تەوەللودی حەرەکەتێکە، ئەمە لە دایکبوونی بزووتنەوەیەکی دیاریکراوە - کە دیارە ئەو کاتە ئێمە وامان بە بزووتنەوەکەی خۆمان و بزووتنەوە جەماوەرییە شۆڕشگێرانەکەی کوردستان دەکوت - کە هاتە دەرێ ئەوجار ئەو ئاوە چی لێدێ، ئاوەکان پەرەم پەرەم دەبن و چارەنووسی جیاواز بە خۆبانەوە دەبینن. یەک هەیە کاتییە، بەهاران فەقەت کانییەکە دەتۆقی دوایە ئاوی نامێنێ - ئەو بزووتنەوانەن کە بۆ سەردەمێک سەر هەڵدەدەن و بەڵام ڕیشەیی نین و ناتوانن بەردەوام بن - یەک هەیە دێ، بەڵام لەسەر جێی خۆ ڕاناوەستێ.

**بە هیوان بگرمێنێ هەوری بەهاری.**

**ڕەهابن**

**لە زیندانی بەردینی غارا**

یەک هەیە بە ژێر عەرزدا دێ، پێی وایە دەبێ خۆی بشارێتەوە. ئەوە ژینی کارێزییە، پێی وایە دەبێ هەتا قیامەت هەر لە نهێنیکاریدا بمێنێتەوە. - ئەوەش دیارە حەملە بوو بۆ ئەو کەسانەی کە زیاتر تەکیەیان لەسەر نهێنیکاری دەکرد - ئەدی کەی خۆمان ئاشکرا کەین. یەکی دیکە ئاوێکە پاش بەینێک دێ و لە شوێنێک دەوەستێ، دەبێتە گۆلاو. ئاو دەبێ بڕوا، کەچی ئەو ڕادەوەستێ. هەموو ئەوانە دەڵێ: یەک. دەم بە هاوارن. «زنەی دەم بە هاواری هاری درۆزن هەزارن» ئەوە زنەن و دەم بە هاوارن و لەم لا و لەو لا قسە دەکەن، بەڵام هیچیان پێ نییە. لە نێو هەموو ئەوانەدا خراپترینیان و چاکترینیان دەبینێتەوە: خراپترینیان ئەوەیە تەبدیل دەبێ بە دژی خۆی: دەبێتە بەرد، چونکە ئاو ڕەمزی بزووتنەوە و حەرەکەت و حەیاتو ژیانە، دەبێ نەسرەوێ، کەچی تەبدیل دەبێ بە شتێک کە ڕەمزی وەستان و نەگۆڕانە. دەبێتە

بەرد، ئەمە گراوە ـ ئەو کاتە ئێمە ئیستلاحێکمان هەبوو، دەمانگوت جا ئەوە جاشە. چونکە ئەوە کافی نییە بەوە کە هەر لە ماڵی خۆی دانیشێ و خەبات نەکا و شۆڕش نەکا، دەبێ بە دژی حەرەکەتەکەی خۆی ـ ئەوە جاشە ـ ئەمە خەون بە بەردەوە دەبینێ، خەون بە وەوە دەبینێ کە لە بزووتن و لە سەربزێوی دوور کەوێتەوە، بکەوێتە ژیانێکی بە ئاسایش و ئەمن، کە بۆشی دەست نادا بە قیمەتی خیانەت نەبێ، ئەمەیە ڕەمزی خیانەت.

**هەتا جۆگە ئاوێ بە وشکی دەبینم.**
**دەڵێی مێرگی ڕوخساری کیژێکی کاڵ و مناڵە**
**بە کووزی تەمەن جارەجوانێکی پڕ خەوشوخاڵە،**
**تەشەنداره چەرگی برینم.**

جا کە دەڵێ ئەو گراوە ئیتر وشک دەبێ و پاشان دەبێ بە بەرد، دەڵێ هەموو لایەکیش حەولی بۆ دەدەن وا نەکا. باسی ئەوە دەکا کە نە بارانی بەهار کە دێ، دەتوانێ بیبووژێنێتەوە ـ چونکە باران سەرچاوەی ئاوە ـ نە تووکی برای ڕێبواری، یانی ئەم برایەی خۆی کە وەکو ئەوە، بەڵام ئێستاش دەڕوا و ڕێبوارە. ئەو هەمووەدوعایەی لێ دەکا و ئەو هەمووە نفرینەی لێ دەکا. کوڕە نامەرد! کوڕە وەرە! ببزوو! هیچ کام لە وانە ناتوانن لە کاسی خەوا فێری ڕاسانی ناکەن. لە مانا، لە مانگرتنی سەخت و بەردینی خۆیا فێری هەستان و ڕاسانی ناکا.

جا ئەو شوێنە ئێستا لە بیرمە. ئەو جێگایەی کە من دەستم لێدا و کاک سوارە کوتی بەڵێ حەقییەتی ڕاست ئێرەیە. من کوتم بیکەین بە مانگرتنی سەخت و بەردینا. دەڵێ «لە مانا پەشیمانی هەرمانی ناکەن.» من کوتم ڕەنگە زۆر زەحمەت بێ کەسێک تێبگا مەقسوود لە «مان» مانگرتنەکەیە، بەڵام با بیکەین بە مانگرتن. مانگرتن یانی لە جێگای خۆ مانەوە، نەبزووتن ئەمە هەرە خراپەکەیانە یانی هەموو لایەنەکانی دیکە تەواو دەبن، ئەم دوو لایەنە دەمێننەوە. لای هەرە خراپ، لای هەرە چاک. لای هەرە چاک کامەیە،لای هەرە چاک ئەوەیە. کە دەزانێ دەبێ ببزوێ، حەرەکەت بکا.

**لە ناو ئەو هەموو ئاوە هەر چاوەیەک**
**باوی هەنگاوی خۆشە**
**بە تەنیا ئەوە شارەزای کۆسپ و کەندالی ڕێیە**
**ئەزانێ هەوەڵ مەنزڵی ژێیە، ئاواتی بەرزی زرێیە**

**..........................................**

**ئەزانێ ئەبێ هەربژێ و بازوێ، تا بژی تا بمێنێ**
**هەناوی بەهەنگاوە، نەسرەوتنە کوولەکەی ڕوحی ئاوە.**

ئەم ئاوە دوو شت دەزانێ، یەکێکیان جەوهەری وجوودی خۆی، جەوهەری وجوودەکەی بزووتنە، نەسرەوتنە و حەرەکەتکردن. دوو: ئەو وەختەی ئێمە دەمانکوت ئەمە تاکتیک و ئیستراتیژییە، تاکتیک و ئیستراتیژییەکەی خۆی دەزانێ، یا بە عیبارەتێکی دەقیقتر بڵێم ئامانجی دوور و ئامانجی نیزیکی خۆی دەزانێ. ئامانجی نیزیکی ئەوەیە هەموو جۆگە و جۆبارەکان پێکەوە کۆ ببنەوە، بە هەموویان زێیەکی گەورە دروست بکەن، ئەمە بزووتنەوەی رزگاریخوازیی کوردە. لە هەموو توانا و لە هەموو هێزەکان و لە هەموو ناوچەکان و لە هەموو پارچەکانی کوردستان، لە هەر جۆگە و جۆبارێ، لە هەر جێگا ئاوێک دەبێ هەموو بێن و خڕ بنەوە و پێکەوە ببن بە زێیەکی گەورەی بەهێزی بە توانای خرۆشان. ئەمە ئامانجێکی نیزیکمانە کە دەبێ بە دەستی بێنین. دوای ئەوەی ئەو ئامانجەمان بە دەست هێنا ئەوجار لەگەڵ هەموو گەلانی جیهان دەبێ بۆ دروستکردنی جیهانێکی گەورەی پڕ لە ئازادی، عەدالەت تێبکۆشین، ئەویش دەریایە. بۆیە لە پێشدا ئەم ئاوە دەیهەوێ ببێ بە زێ، دوایە ئەم زێیە دەبێ لەگەڵ زێیەکانی دیکە یا لەگەڵ رووبارە گەورەکانی جیهان یەکتر بگرنەوە و پێکەوە جیهانێک دروست بکەن کە جیهانی عەدالەت و ئازادی و بەرابەریی ئینسانە. ئەمە مەجموعەی بیرۆکەی خەودبەردینەیە، بەڵام خەودبەردینە ماوەیەکی زۆری پێچوو هەتا داندرا. ئەگەر لە بیرم بێ یەکەمین بەشی کە دانا ئەوەیە کە دەڵێ:

**وەهایە:**

**کە کانیی بە هیوا**
**بەهارانە لووزەو ئەبەستێ بەرەو شاری دەریا**
**بەڵام داخی جەرگم لەگەڵ هەر بەهارێ**
**کە دائەچڵەکێ سەوزەڵانی**
**لە خاکینە خەونی گرانا**
**لە دڵما خەم و داخی ئەم دەردە سەوزە:**
**کە دەردی گرانی هەموو رێبوارێ وەنەوزە.**

ئەمە بەشی یەکەمێتی. بەینی بەشی یەکەم لەگەڵ بەشەکانی دیکە فاسیلەیەکی زەمانی نیسبەتەن درێژی کەوتۆتە بەینەوە. زۆر کەس لە دۆستان، زۆر کەس لە وانە کە لەگەڵ شیعر و ئەدەبی کوردی و لەگەڵ کۆڕەکەی ئێمە لە نیزیکەوە ئاشنا بوون پێیان وابوو سوارە یا ناتوانێ تازە ئیدامەی بدا یا نابێ ئیدامەی بدا. بڕێک پێیان وابوو ئیتر هەرچی جوانە و جوانییە هەمووی گوتراون، مەعناکەی خۆشی داوە، ئەوەی کە دەبێ بیڵێ گوتوویە، ئیتر کافییە.

با لێرە بوەستین، بڕێک دەیانکوت سوارە گەیشتۆتە لووتکەی بەرزی شیعرەکەی، ئەگەر

لەوە زیاتر بڕوا دێتەوە خوارێ، لە بەر ئەوە ناتوانێ بیڵێ. من لەگەڵ کاک سوارە لە گەڵاڵەکردنی بیرۆکەی شیعرەکەدا پێکەوە بووین، یانی ڕۆژ بە ڕۆژ دادەنیشتین و قسە لەوە دەکرا ئەم شیعرە چۆن بچێتە پێشێ، چی لێ زیاد کەی، چی لێ کەم کەی. دیارە بەشێکی ئێمە ئەوەندەی کە قسەمان دەکرد لە شیعر و ئەدەب ئەوەندەشمان گاڵتە و شەڕەجنێو دەکرد پێکەوە، جا باسی ئەوەشمان دەکرد کە ئەوەیان بە کێ بلێیی، ئەوەیان بە کێ بلێیی. جاری وابوو ڕەفیقەکانی خۆمانی دەگرتەوە. ئەوەیان مەبەستمان کەس بێ یا جەرەیاناتی سیاسیی نێو کوردستانی ئێران: یا جاری وابوو جەرەیانە سیاسییەکانی نێو کوردستانی عێراقی دەگرتەوە. ئەمە بە کوێ بلێیی و بە کێ بلێیی، لەبەر ئەوە هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ شیعرەکە بووم. من دەمزانی پرۆژەکە دووررودرێژتر و تووڵانیتر و فراوانتر و بەرینترە،بۆیە گومانم لەوەدا نەبوو کە دەتوانێ، جگە لەوە ئەوەندەش لەگەڵ یەک تێکەڵ بووین، من لە باری شیعرزانین و توانا ئەدەبییەکەشییەوە و لەسەر دەسەڵاتە هونەرییەکەشییەوە شێوە گومانم نەبوو. بۆیە دەمزانی دەیڵێ، بەڵام ماوەیەکی زۆر پێچوو کە تەقریبەن هەموو کەس ئەوەندە شیعرەی لەبەر کرد و پێی وابوو تەواوە. ئەمجا جاری دووهەم سوارە لە سەری ڕۆیشت.

سوارە لە خەوەبەردینەدا ئەوەی لەبەر چاو گرتووە وەکو باقی شیعرەکانی خۆی و باقی شیعری شاعیرەکانی ئەو سەردەمە کە دەبێ زۆر زەق و ڕەق و ئاشکرا نەبێ، چونکە ئێمە لە سەردەمی زەمانی حوکمی پۆلیسیی دەورانی شادا بووین و ڕاستەوخۆ چاپ نەدەکرا و نەدەکرا لە ئێراندا بڵاو بێتەوە، بەڵام هەمیشە ئەو مەترسییە هەبوو خەڵکی دیکە بیداتە دەست دەوڵەت و نوسخەیەکی دەستکەوێ. دەبوو وابێ تا حەددی مومکین جێگای تەئویل و جێگای خۆ دزینەوەی هەبێ، دەبوو تا حەددی مومکین تێگەیشتنی مەعناکەی، تێگەیشتن و کەشفکردنی لە لایەن سانسۆرچییەکانەوە گران و ڕەق بێ. ئەمە بەشێکی کە سەرتاپا لەبەرچاو گیراوە بۆ خەوەبەردینە و ئەو کەسانەی کە دڵێن بۆچی شاردراوەیە دەبێ لەبەر چاو بگرن کە ئەمە پێداویستییەکی زەمانە بووە، بەڵام هەر ئەوەندە نییە، یانی ئەگەر هەر ئەوەندە بڵێین ناحەقیمان کردووە، سوارە خۆشی پێی ناخۆش نەبوو. گەیشتبووە ڕادەیەک لە شاعیری کە دەیەویست شیعرێک بڵێ ئەوجی شاعیرێتیی خۆی، لووتکەی شاعیرێتیی خۆشی تێدا نیشان بدا. دەسەڵاتی لە زمانەوانی، دەسەڵاتی لەسەر هێنانی ڕەمز و ڕازی جۆراوجۆر، دەسەڵاتی لەسەر تەشبیەو وێچواندنی باریک. تەنانەت ئەوەی من پێی دەڵێم تەشبیهی مورەکەب، یانی وێچواندنی تێهەڵکێش. شتێک بە شتێک وێکدەچوێنێ و ئەویش بەشتێکی دیکە و جاری وایە ئەویتریش بە شتی چوارەم، یانی جاری وایە سێ چوار شت بە یەکتر دەچوێنێ، هەتا لە نیهایەتدا دەگاتە ئەوەی کە خۆی مەبەستێتی بڵێ چییە، ئەمە لە

باری تەشبیهەکانیەوە. دووهەم لە باری هێنانی وشەی کوردییەوە سوارە دەیەویست نموونەیەکی زۆر بەرزی کوردی ـ ئەگەر بڵێین زمانێکی فاخیر، زمانێکی ئەشرافی ـ بێنێتە گۆڕێ: کە ئەم زمانە عادەتییە بەردستەی ئێمەمانان نییە کە دەیڵێین، ڕۆژانە قسەی پێدەکەین یا جاری وایە شتی پێ دەنووسین، یا شیعری پێ دەڵێین. زمانێکی بەرزترە، زمانێکی شیعری، بەڵام دەزانی، تۆ دەتوانی بە چەندین جۆر شیعر بڵێی، بەڵام زمانێک هەیە، وەکو چۆن لە نێو چینەکانی کۆمەڵدا چینی جیاواز هەیە، قەدیمتر ئەوانە پێیان دەکوت زمانی فاخیر، یا زمانێکی ئەشرافی. یانی ئەمە لە نێو جۆرە زمانەکاندا نەک زمانی چینی ئەشرافە، نا مەبەستەکە ئەوە نییە، وەلی زمانەکە خۆی حاڵەتێکی ئەشرافی هەیە لە نێو باقی زمانەکەدا. زمانێکە کەلک وەردەگرێ لە جوانترین وشە.

یەک: وشەی هەرە ڕەسەن نەبێ نایڵێ، وشەی عادەتی زمانی ڕۆژانەی خەڵک کەمتر بە کار دەبا، ئەو وشانە بە کار دەبا کە ڕەنگە نامۆ بن بۆ عامە، بەڵام ناسراون بۆ خەواس، جگە لەوە لە باری بە یەکەوە گونجانی وشەکان، زۆری پێ خۆش بوو ڕستەیەک دادەڕێژێ کە وشەکانی لە پەنا یەک نەوعێک جیناسیان تێدا بێ، پیتەکانیان وەکو یەک بچێ، ئەگەر شتێک بە سین دەست پێدەکا نیوەی جوملەکە هەر بە سین دەست پێ بکا، ئەگەر بە شین دەست پێ دەکا بە شین تەواوی بکا وەک دەڵێ:

**لە هەر گاز و ڕێبازێ وا گازی ئاوی ئەگاتێ**
**نیازی هەزاران گەزیزەی بەنازی وەدی دێ**

گاف و زێ حەوت هەشت جار تیکراری دەکاتەوە بێ ئەوەی ئەمە نافەسیحی بکا، بەپێچەوانە ئەمە فەسیحتر و بەلیغتر و جوانتر و ڕازاوەتری دەکا. یانی سوارە مەبەستیشی بوو دەسەڵاتی خۆی بە سەر زمانی کوردیدا دەربخا، جا ئەم مەبەستە هونەرییە بۆ دەرخستنی دەسەڵاتی خۆی بە سەر زمانی کوردیدا بوو. ئەم مەبەستەی خۆی کە پێی خۆش بوو لووتکەی هونەری شیعری، یانی لووتکەی دەسەڵاتی شاعیریی خۆشی دەربخا، لەگەڵ ئەم مەبەستەی کە دەیویست لە نێو پەردەیەکیشدا حەشاری بدا و لەبەر چاوی سانسۆرچی بیشارێتەوە. هەموو ئەوانە وایان کرد خەوەبەردینە بگاتە ئەم پلەیەی ئێستا لە شاردراوەیی، لەوە کە خۆی بە دەستەوە نادا و بە هاسانی نایزانی. زۆر کەس دەڵێ کۆکردنەوەی هەندێک وشەی ڕەنگاوڕەنگە لە پەنای یەک، ڕەنگە زۆر کەس وای بۆ بچێ کە خەوەبەردینە تەنها هونەرەکەی ئەوەیە بڕێک وشەی ڕەنگاوڕەنگی لە هەندێک ڕستەی زۆر ڕازاوە لە پەنایەک داناون، بەڵام شەرت نییە مەعنایەکی هێندە ڕێکوپێکیشی هەبێ. خۆی شاعیر دەیەوێ خەڵک وا تێبگا و ئەوە یەکێک لە مەبەستەکانی سوارە بوو کە مەگەر کەسانێک زۆری خۆ پێوە ماندوو بکەن و

ڕادەی تێگەیشتنی هونەری و ئەدەبیشیان بەرز بێ، دەنا خەڵکی دیکە با تێ نەگا.

جا ئەمە دیارە خۆ لە سەردەمێکدا ئەتۆ دەتوانی، ئەوە بە عەیبێک دانێی، بەڵام لە سەردەمێکدا ئەمە بە هونەرێکی زۆر بەرز حیساب دەکرێ. ڕەنگە لە کاتێکدا کە وڵات ئارام و ئازادە و خەڵک پێویستە قسەکانی خۆی بە شێوەیەکی زۆر ڕەوان و هاسان بکا، بۆ ئەم نەوعە خەڵکە ئەم جۆرە قسە بکەی عەیبێکی تێدا بێ، بەڵام لە زەمانێکدا کە لە لایەکەوە حکوومەتێکی پۆلیسی هەیە، تۆ دەتەوێ قسەکان و وتەکانتی لێ بشاریتەوە، لە لایەکەوە تۆ ڕیسالەت و پەیامێکت پێیە کە دەتهوێ زمانی کوردی بەرز بکەیەوە،ئەدەبی کوردی پەرە پێ بدەی، جوانی بکەی، بیڕازێنییەوە. لەم کاتانەدا ئەمە هونەرێکی زۆر گەورەیە.

من لەسەر خەوەبەردینە و باسەکەی ڕەنگە هەر ئێستا ئەوەی لەبەر چاومە هەر ئەوەندە بێ کە کوتم. ئەگەر ئێوە پرسیارێکتان هەیە لێم بکەن، ئەمجا هەوڵ دەدەم شیعرەکەتان بۆ بخوێنمەوە و لە هەر جێگایەک کە بۆم خوێندنەوە مەعناکەی لەگەڵ خوێندنەوەکەی بەیان دەکەم.

لە یەکەمین بەشیدا باسی ئەوە دەکا ئاو چۆن لە دەروونی کێوەکەدا بە نیازە بێتە دەرێ، بەڵام هێشتا ڕێگای لێ گیراوە و ناتوانێ بێتە دەرێ. ئەمە شەرحی گوورانی نوتفەی حەرەکەتێکی کۆمەڵایەتییە لە ژێر کێوی نەزانینی فراوانی توودەی بێ خەبەری خەڵک. ئەم توودە فراوانە بێ خەم یا بێ خەیاڵەی یا بڵێین ساویلکەیە کە پشتی چەماوەتەوە لە ژێر باری ستەم. چۆن بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی، سیاسی، فەرهەنگی، فکری خەریکە نوتفەی دەگوورێ و خەریکە سەر دەردێنێ، ئەمە لە واقیعدا وەلادەتی یەکەمە. لەوەدا سوارە کەوێک بە میسال دێنێ، کە لە زیندانی قەفەسدایە، بەڵام با شیعرەکەتان بۆ بخوێنمەوە جا مەعنای لێ دەدەمەوە.

**لە چەشنی گەرووی کەو،**
**کەوی دۆمی یەخسیری زیندانی داری،**
**پڕی سەوزەبەستەی خرۆشانی باری**
**تەڕەی باوەشی تاسەباری بناری**

وای داناوە کەوێک دێ، کەوەکە کەوی دۆمە، گیراوە لە زیندانێکی داریندا ـ چونکە قەفەسی کەو دارینە. بۆیە پێی دەڵێ زیندانی داری. بەستەی سەوز دەڵێ. بەستەی سەوز دیارە بەستەی ژیانە، بەڵام ئەو بەستەی سەوزە هەر ئەوەندە نییە، ئەمە بەستەی خرۆشانێکی گەنجێتیشە، بارەکەوە، بیری چی دەکا ئەم کەوە؟ ئەم کەوە بیری ئەو کاتە دەکا کە لە باوەشی بناردا بووە و تاسەی ئەو سەردەمەی هەیە. جا بۆیە وەسفەکە دووروودرێژە. کەوێکە لە قەفەسی

دارینی دۆمیێکدایە،گەنجە و پەرە لە سەوزەی خرۆشانی دەورەی بارێتی خۆی، لە باوەشی بناریش دوور کەوتۆتەوە و دەناڵێنێ بۆ مەوتەن و نیشتمانەکەی. ئەم کەوە گەرووی چۆن دەهاژێ و پەرە لە بەستە، ئاوەکە لە دەروونی کێوەکەدا ئاوا دەهاژێ. ئەمە لێرە کۆپلەیەکە و تەواو دەبێ. ئەمجا دەچێتە سەر بەشێکی دیکە.

**شەپۆلی لەگوێن خوێنی شەرمی کچانە**

**لەسەر ڕوومەتی ماتی بووکی ڕەزاسووک**

**بە تینی بتاوێنی ڕوانینی زاوا**

**گەرمتر لە پرشنگی تاوی بەهاری**

ئەمجا چۆن کاتێک بووکێک لەبەر دەم زاواکە ڕاوەستاوە، زاوا بە تین تێی دەڕوانێ و دەیتاوێنێتەوە، وەکو چۆن بەفر دەتوێتەوە. بەفریش چۆن دەتوێتەوە بە پرشنگی بەهار. جا چۆن پرشنگی بەهار بەفر دەتوێنێتەوە، ڕوانینی زاواش ئاوا خوێن دێنێتە «سەر ڕوومەتی ماتی بووکی ڕەزاسووک». ئەم حەرەکەتی خوێنە لەسەر کوڵمەی ئەم بووکەش جارێکی دیکە بە حەرەکەتی ئاوەکە لە نێو کێوەکەدا دەشوبهێنێ. ئەمەش کۆپلەیەکە لێرە تەواو دەبێ.

**وەکو نەرمەهەنگاوی لاوی بەرەو ژوان**

**لە جێژوانی زیندوو بە گیانی کچی جوان**

ئەمەش تەشبیهێکە، خۆی شیعرێکە. چۆن ئەگەر لاوێک هەنگاو هەڵدێنێتەوەدەچێ بۆ ژوان، ژوانێک کە دەزانێ ئێستا کچێکی تێدایە، زیندووە جێژوانەکە، ژوانگە زیندووە بە گیانی کچێکی جوان کە ئێستا لە وێ چاوەڕوانی دەکا، ئەم لاوە بە چ تین و تەوژمێک هەنگاو هەڵدێنێتەوەبۆ گەیشتن بەم ژوانە. ئاوەکەش دیسانەکە بەم تین و تەوژمە لە نێو کێوەکەدا دەبزوێ. ئەمجا کۆپلەیەکی دیکە دەست پێدەکا:

**وەکو گەرمەیاوی قەشەی دەستی ئاراو**

**لە بزۆێنی دەریای بلووڕینی بەرۆێ**

ئەمە دوو سێ تەشبیهە تێکی خستوونەوە. لە پێشدا دەستی شوبهاندووە بە ماسییەک ـ ماسی قەشە ـ چۆن قەشەماسی کە دوور دەکەوێتەوە لە دەریا هەڵدەبەزێ بۆ ئاو.ئەی ئەگەر دەستێک لە دەریای بزۆێنی سینگ و بەرۆکی مەحبووبەکەی خۆی دوور کەوتبێتەوە، ئەی ئەم دەستە چۆن خۆ دەکوتێ بۆ وەی جارێکی دیکە بگاتەوە نێو دەریای سینگ و بەرۆکی یارەکەی. جا ئەوەش وەکو ئاوەکە دەچێ کە لە نێو کێوەکەدا دووبارە دەبزوێ. هەموو ئەوانە دەڵێ، جا ئەمجار لە جێی دیکەدا دەڵێ: وەکو ئەوانە، وەکو ئەوانە، وەکو ئەوانە.

**بە خوڕ خۆ بە دیواری کێوا ئەدا ئاو**
**لەگەڵ گاشەبەردا سەر ئەسوێ، سەر ئەسوێ.**

ئەمە سەرەتای هاتنە دەرێتی. کە وابوو ئەم پێنج شەش کۆپلە جیاوازە هەر یەکە بە جیا بۆ ئەوەیە چۆنیەتی بزووتن و گەڕان و بە دەوری خۆدا، سووڕانی تەقەلای ئاو لە نێو کێودا دەربخا.

**کچی نوور قەتیسی دەستی دێوی کێوە**
**لە ئەنگوستەچاوی دڵی خێوی کێوا**
**بەرەو دەر، بەرەو شاری دەریا بەڕێوە.**

تەشبیهی دەکا بە کچێک کە دێوێک گرتوویەتی، قەتیسە لە دەستی دێودا کە ئەو دێوەش دێوی کێوە. ئەمە کچی نوورە کە ئاو مەزهەری نوورە و ڕەمزی ڕووناکییە. لە کوێدا،لەم ئەنگوستەچاوەی کە لە نێودڕاستی دڵی کێودا مەوجوودە، خەریکە دێتە دەر و خەریکە بڕواتەوە بەرەو ئەو شارەی کە هی خۆیەتی، کە کچی نوور ئی ئەوێیە و بەڵام دێوی کێو ئەسیری کردووە، خەریکە دێتە دەرێ بڕواتەوە بەرەو شارەکەی خۆی، بەڵام بە کوێدا دەڕوا، تا ئێرە هاتووە، خەریکە بێتە دەرێ.

سوارە لێرەدا خەریکە بڵێ: وەکو ئاو کە دەیەوێ بێتە دەرێ، دەرێش چاوەڕوانە ئاو بێ. من لە بیرمە لەگەڵ سوارە گەیشتینە ئەو جێگایە، ئەو شیعرەی مەولانا جەلالەددینمان لە بیر بوو کە دەڵێ:

**«گر کە تشنە آب جوید در جهان        آب هم جوید بەعالم تشنەگان»**

ئەمە بۆچوونێکی فەلسەفیی زۆر جوانە. خۆ هەر ئەوە نییە خەڵکی تینوو وەدووی ئاو کەوتوون، کوڕە ئاویش لە دنیادا وەدووی ئەوە دەکەوێ کێ تینوویە،چونکە ئاو پێویستی بەوە هەیە بخورێتەوە. ئەگەر ئاو نەخورێتەوە کێ بزانێ ئاو چییە، چەند خۆشە، چەند پێویستە، چەند پیرۆزە. جا ئەم دەیەوێ ڕابیتەیەکی فەلسەفی و مەنتیقی لە بەینی نیازی خەڵک بە ئاو و نیازی ئاویش بە خەڵک نیشان بدا.

سوارە لێرە ئەوە دەڵێ. ئاوەکە ڕاستە بە تەمایە بێتە دەرێ، بەڵام دەرێش بە تەمایە ئاو بیگاتێ. جا بۆیە باس دەکا، دەڵێ:

**گەرووی ویشک و چاوی سپی چاوەکانی**
**دەرووی ڕوونی ئاوە**

ئەوە نییە دەڵێین: «فلان کەس دەروویەکی ڕوونی هەیە، جێگای ئومێدە».
چاوەکانی گەرووی ویشک بووە لە توونییان، چاویشی سپی بووە لە ئینتیزار. چونکە

چاوی سپی هەمیشە نیشانەی چاوەڕوانییە. بۆیە کانی گەرووی ویشکە، چاوی سپییە لە ئینتیزار، هەر ئەم ئینتیزارەی ئەو، ئەو چاوەڕوانییەی ئەو یانی خواستنی ئەوەی کە ئاو بێتە دەر، ئەم خواستە دەرووی ڕوونی ئاوە، ئاو بەو ئومێدە دێتە دەر چونکە خەڵک دەیانەوێ، خەڵک داوای دەکەن. جا هەر ئەوە نییە لەسەر زەوی، لە تەبیعەت هەمووی داوا دەکا.

بە فانۆسی ئەستێرە بەرچاوی ڕوونە
ئەستێرەی بۆ بۆتە فانۆسێک و بۆی گرتووە هەتا بێتە دەرێ.
لە بەر پێی حەریری کەوەی سێوەڕە
بە پۆی مانگەشەو چندراوە.

کە لە سەرەوە فانۆسی ئەستێرەیان بۆ ڕاگرتووە، لە خوارەوەش مانگەشەو کە لە چیمەن دەدا و لە سێوەڕە دەدا دەڵێی حەریرێکە، بەڵام تیشکی مانگەشەو بۆتە ڕایەڵ و پۆ پێی چندراوە.

**ئەڵێی بورجی خاپووری مێژووی لەمێژین**
**لە درزی هەزار خشتی ڕۆژ و شەوانی**
**دڵۆپەی چپەی پۆلی پەریانی دادا**

تا ئێستا باسی ئەوە دەکا، ئاو دەیەوێ بێتە دەرێ، جەماوەر یا خەڵک و جیهانیش دەیەوێ ئاو بێتە دەرێ. لەم دوو نیازەوە، لەم دوو ئاواتەیە کە بزووتنەوە لەگەڵ خەڵک پێکدەگەن. بزووتنەوەیەک دەیەوێ بگاتە خەڵک، خەڵکێکیش دەیەوێ بزووتنەوە لە نێویدا دروست بێ. جا ئینجا کە دێتە دەرێ باسی خۆشیی دەنگی ئاو دەکا. ئەمەی کە خوێندمەوە باسی خۆشیی دەنگی ئاوەکەیە، بەڵام یەکجار زۆر- وەکو فارسی دەڵێ - موعەققەدی کردووە.

**ئەڵێی بورجی خاپووری مێژووی لەمێژین**
**لە درزی هەزار خشتی ڕۆژ و شەوانی**
**دڵۆپەی چپەی پۆلی پەریانی دادا**

ئەم حیسابی کردووە تاریخ وەکو قەڵایەک دەچێ، قەڵا یا بڵێین بورجێک بە چی دروست کراوە؟ بە خشت، خشت لەسەر خشت، تاریخیش بە ڕۆژ و شەو دانراوە، هەر ڕۆژ و شەوە خشتێکە لەم بورجە. پۆلی پەریش ئەوەن کە لە ئەفسانەدا دێ، لە پێش تاریخەوە، بۆیە لەم بورجە خاپوورەدا، لەم بورجە لەمێژینەدا مێژووی قەدیمی لە درزی شەو و ڕۆژەکانیدا لە خەیاڵی تاریخی کۆندا دەنگی پەرییانمان پێ دەگەیەنێ، دەنگی ئەو پەرییانەی لە ئەفسانەدان‌و ئێمە هەموومان پێی ڕاهاتووین، چونکە چیرۆکمان بۆ کوتراوە، کە دایکمان قسەی بۆ کردووین، کە ئەفسانەمان پێ کوتراوە، باسی ئەو پەرییانەمان کردوون کە لە

ئەفسانەی کۆندا ناویان هەیە. دەنگی ئەو پەرییانە چەندە خۆشە کە لە خیلالی مێژووی لەمێژین و ئەفسانەی کۆنەوە پێمان دەگەن ئەویش لە درزی خشتی ڕۆژ و تاریخدا، دەنگی ئەو ئاوەی دێتە دەرێ بە قەد ئەمە خۆشە، یانی هەموو ئەو تەشبیهانە بۆبە دەکا بلێ ئاوەکە دەنگی خۆشە.

**ئەڵێی پێکەنینی کچی سەرگوزشتەی قەدیی**
**لە ئەندامی تاپۆی وەکو بوومەلێڵی**
**- سنووری شەوی دوێنێ و ئەوڕۆی بەیانی -**
**پەچەی قورسی نیسیانی ئینسانی لادا.**

ئەمە وا دادەنێ سەرگوزشتەی قەدیی کە دەکاتە ئەفسانەی کۆن، وەکو سنوورێکە لە نێوان دوێنێ و ئەوڕۆدا. شەوی دوێنێ و ئەوڕۆی بەیانی، ئەمە سنووری بەینی تاریخ و پێش تاریخە. ئەم سنوورە نادیارەی بەینی دوێنێ و ئەوڕۆ دەشوبهێنێ بە کچێک کە ئەم کچە لەو دیوی مێژووە کە دەنگی قاقای پێکەنینی دێ، دەیەوێ ئەفسانە کۆنەکانمان بۆ بگێڕێتەوە، بەم ئەفسانەی کە ئەو دەیگێڕێتەوە بۆ ئێمە و لەگەڵ ڕابردوو ئاشنامان دەکا لەسەر ئەم تاپۆیە، لەسەر ئەم شەبەحی تاریخە، پەچەی قورسی لەبیرچوونەوەی ئینسان لادەدا، ئینسان شتی لە بیر دەچێتەوە ئەگەر بێتوو تاریخ یارمەتی نەدا.

ئەم کچەی کە سەرگوزشتەی قەدیی تەشبیهی دەکا بە کچێک کە پێبکەنێ دێنێ لەسەر ئەم بوومەلێڵە، لەسەر ئەم تاپۆی بوومەلێڵی بەینی سنووری شەوی دوێنێ و ئەوڕۆی بەیانی ئەم نیقابە هەڵدەگرێ کە نیقابی فەرامۆشیی ئینسانە سەبارەت بە ڕابردووی خۆی. ئێمە ئاشنا دەکاتەوە جارێکی دیکە بە تاریخی کۆن، جا ئەم پێکەنینە ئی ئەم کچە، ئی ئەو سەرگوزشتە قەدیییە، وەک دەنگی ئاوەکە دەچێ. ئەمەش دووبارە بۆ ئەوەیە کە جارێکی دیکە دەنگە خۆشەکەی ئاو بگەیەنێ. جارێکی دیکە هەر دەچێتەوە سەر بەندەکە و دەڵێ:

**ئەڵێی دەنگی شمشاڵە ڕەشماڵی دۆڵی دڕیوە**
**شمماڵی دەرەی دوورەشاری**
**پشووی پڕ لە عەتری بەهاری کچی کورد**
**بە بلوێری شووشی گەرووی زەردوزۆڵی**
**لە زەنوێری زێوئاژنی سای زرینگانەوەی شەو**
**بە خوڕ زەمزەمەی هەڵبڕیوە**

وای دادەنێ کچێکی کورد لە دەرەیەکی دوورەشار کە پڕە لە عەتری بەهار بە گەرووی خۆی کە دەڵێی بلوێرێکە، بە گەرووی زەردوزۆڵی کە دەڵێی بلوێرێکە، کەی؟ لەو کاتی

زەنوێری کە دنیا زێوئاژن کراوە، بۆچی؟ چونکە مانگەشەو لێی داوە و جیهانی سپی کردووە، بۆیە زێوئاژن کراوە دەڵێی بە زێو چاندووتە. لەو کاتەدا کە شەو دەزرینگێتەوە کچێک لەم دۆڵەدا لەو کاتی بەهارەدا ئەگەر بە خورِ زەمزەمەی هەڵبڕێ و گۆرانییەک بڵێ، ئە ئەمە وەک دەنگی ئاوەکە دەچێ.

جا ئینجا دێتە سەر هاتنە دەری شکڵی ئاوەکە. ئیشارە بە وەی دەکا کە شەقولقەمەر هەیە کە لە حەدیسی کۆندا هەیە، کە پێغەمبەر بە قامک ئیشارەی کرد و مانگ دوو لەت بوو، پێی دەڵێن شەقولقەمەر، دەڵێ:

**بە ئیعجازی ئەنگوستی پاکی محەمەد**

**شەتی نوور بە ڕووی مانگی عەرزا کشاوە**

نوور بە عاسماندا دەکشێ، بەڵام ئەم بە سەر عەرزدا شەتێکی لە نوور ڕاکێشاوە، ئە ئاوا قامکێک هێناویێتی.

**تروسکەی برووسکەی شەوی دەم بەهاری بە هەورە**

**لەسەر عاسمانی زەوی ڕاخوشاوە.**

چۆن برووسکە لەسەر ئاسمان ڕادەخوشێ، لە شەوێکی دەمەو بەهاریدا کە هەوری زۆرە، ئەم لە باتی بە سەر ئاسمانێدا ڕاخوشێ لەسەر زەوی ئەم برووسکەیە ڕاخوشاوە. ئەمە شێوە ئاوەکەیە کە دێتە دەرێ. جا ئەمجا دەڵێ ئەم ئاوە کە دەگاتێ ئیستیفادەکەی چییە:

**لە هەر گاز و ڕێبازێ وا گازی ئاوی ئەگاتێ**

**نیازی هەزاران گەزیزەی بەنازی وەدی دێ**

**دەبووژێتەوە داری چاکی بە ودمی هەناسەی**

**شنەی نەرمەلاوێنی دەم بای ئەخاتێ.**

لە هەر گاز و ڕێبازێک دیارە هەم گاز و هەم ڕێباز هەردووک یانی شوێن، یانی مەکان. گازی دووهەمیش یانی دەنگ، یانی سەدا. گازی دەکا یانی بانگی دەکا. جا لە هەر شوێن و ڕێبازێک کە دەنگی ئاوەکەی گەیشتێ نیاز و ئارەزووی هەزاران گەزیزەی بەناز وەدی دێ، پێی دەبووژێتەوە. «دەبووژێتەوە داری چاکی بە ودمی هەناسەی». چونکە داری چاکی ڕەمزی پیرێتی و وشکێتی و نەبووژانەوەیە. داری سەر شەخس یا داری چاکی، داری پیرە و وشکە و تازە قابیلی بووژانەوە نییە. «نووری» دەڵێ:

**لەسەر بستووی ژیان وەک داری چاکی**

**بە تەنیا مامەوە بێ بەرگ و بێ بەر**

**گەلێ بێ تینترە تاوی هومێدم**

**لە زەردەی ڕۆژبەری مانگی خەزەڵوەر**

له شیعری کلاسیکی ئەم سەردەمەی کوردستانی ئێراندا ئەمە یەکێک لە خۆشترین شیعرەکانە، ئەم شیعرەی نووری.

داری چاکیش کە وا پیرە و وشکە، تەنانەت ئەوەش بە بەرەکەتی هەناسەی دەبووژێتەوە، بە ودمی هەناسەی، دەزانی ودمیش ئەم هێزەیە کە بەپێی باوەڕی جەماوەری خەڵک هێزێکی سیحراوییە. کەسێک توانا یا بەرەکەتێکی تایبەتی هەیە بۆ چاککردنەوەی بڕێک شت، بڕێک مارانگەستی پێ چاک دەبێتەوە، بڕێک شێتی پێ چاک دەبێتەوە... ئەمە پێی دەڵێن «ودمی پێیە». جا ئەم دارە چاکەیە وا پیر و وشکە کە دەبووژێتەوە، وەهاشی دەبووژێنێتەوە وەکو داری لاوێنی بەر دەم شنەبای لێدەکا. دەزانی لاوێن داری بییە، بەڵام بی دوو جۆرە: ئەو بییەی کە بن ئەستوور دەبێ و زەلام دەبێ و گەورە دەبێ ئەمە جۆرێکە. ئەوی دیکەی کە شووڵە و خەڵفە و دەمێنێتەوە و سەوەتە و قەرتاڵەی لێ دەچنن، ئەمە نەرمەکەیەتی. ئەم جۆرە بییە پێی دەڵێن لاوێن. جا ئەم دارە لاوێنە هەتا ئاخری هەر زۆر نەرمە، کە با لێی دەدا دەشنێتەوە. ئەم داری پیری سەر شەخس و چاکە وا لێدەکا وەکو لاوێنی بەر دەم شنەبا. جا ئەمجا پاش ئەوەی ئاو هاتە دەرێ و وەڕێ کەوت ئەمجا ئاو بۆخۆی بیر دەکاتەوە.

بەبێ ئەم بیرکردنەوەیە، بەبێ ئەم ورەیە ئاو ناتوانێ بڕوا. مەبەستی سوارە لێرەدا ئەوەیە بڵێ ئاو لە خۆڕا ناڕوا، نیازێکی هەیە، بەرنامەیەکی هەیە، ئامانجێکی هەیە. وەدووی خەونەکانی خۆی کەوتووە، وەدووی ئامانج و ئارەزووەکانی خۆی کەوتووە،بۆیە لە دەروونی خۆیدا ئاوا بیر دەکاتەوە:

**ئەڵێن تاجی زومڕووتی دورگەی لە سەر ئاوە دەریا**
**هەتا چاو هەتەر کا، شەپۆلە، شەپۆلە**
**لە ڕوونا، لە چوونا**
**بە ئاهەنگە سەربەندی بزوێنی خۆشی**
**لە بەر خۆرەتاوا ئەڵێی سینگی ژینە ئەهاژێ**
**ئەڵێی: هانی هەستانە دەنگی خرۆشی**
**سروودی خوناوەی بەهارە لە گوێما**
**لە هەر شیوەجۆبارێ، هەر دەشتەچۆمێ**
**لە دڵمایە ڕەوای بەرینی بە دەریا گەیشتن**
**لە تاریکە تاراوگەکەم وا بە سەرچوو**
**زەمانی تەریکیم**
**ئیتر خێر و خۆشی لە ڕێما.**

ئاو ئاوا بیر دەکاتەوە. باشە ئەو جێگایەی من بۆی دەچم چییە؟ من ئارەزووم چییە؟ من هەڵوەدای چیم؟ ئەم هەموو حەول و تەقەلایە لەبەر چییە دەیدەم؟ من دەمەوێ بگەم بە دەریا، ئامانجی من ئەوەیە بگەم بە دەریا. جا ئەمجا دەڵێ دەریا چۆنە، دەریا جێگایەکە:

**هەتا چاو هەتەر کا، شەپۆلە، شەپۆلە**

**لە بوونا، لە چوونا**

چ بە وجوودی کە بوونەکەیە،چ بە چوونی،یانی بزووتنەکەیەتی، ئەمە دەریایە. دەریا سروودێک دەڵێ، ئەم سرووده:

**بە ئاهەنگە سەربەندی بزوێنی خۆشی**

سروودی دەریا سروودێکی بزوێنە و سروودێکی بە ئاهەنگە. دەریا چۆنە:

**لە بەر خۆرەتاوا دەڵێی سینگی ژینە ئەهاژێ**

دەریا ڕاکشاوە، لە ژێر خۆرەتاوا و سینگی کە دەهاژێ دەڵێی عەینی ژیانە، دەڵێی ئەمە ژیانە هەناسە دەدا.

**دەڵێی هانی هەستانە دەنگی خرۆشی**

دەنگی خرۆشی دەریا دەنگێکەبۆ ڕاپەڕین، هاندانە بۆ ڕاپەڕین. من سروودی خوناوەی بەهارم لە گوێدایە، من دەزانم باران دەبارێ، بارانی بەهارە و ئەویشە کە هومێدی ژیان و هومێدی بزووتن بە من دەدا. لە بەر ئەوەی خوناوەی بەهار سروودێکە لە گوێما، بەڵام چۆن ئەمن یەک دەگرمەوە، هەر بە تەنێم، من بە تەنێ نیم:

**لە هەر شیوە جۆبارێ، هەر دەشتەچۆمێ**

ئێمە ئەو هەموو جۆبارە و ئەو هەمووە چۆمەین کە یەک دەگرینەوە. خوناوەبارانی وردە بە گشتی. خۆشییەکەی ئەوەیە هەر کەسە دەتوانێ مەعنای خۆی لێداتەوە، بەڵام لێرەدا دەیەوێ بڵێ من سەرچاوەکەم لەو خوناوەی بەهارییەوەیە. ئەم ئاوەیە کە ژیان دەدا بە من، بەردەوامبوون دەبەخشێ بە من. پاکیی خۆشی سابیت دەکا کە من لەو خوناوە پاکەم، بەڵام من ئاوا یەک دەگرمەوە:

**لە هەر شیوە جۆبارێ، هەر دەشتەچۆمێ**

هەمووماان پێکەوە دەتوانین ببینە ئەوە، لە نەتیجەی ئەوەدایە کە هەمووماان یەک دەگرینەوە:

**لە دڵمایە بڕوای بەرینی بە دەریا گەیشتن**

بۆیە ئاوا ئیمانم پەیدا کردووە کە ئێمە دەتوانین بە دەریا بگەین، چونکە بە تەنێ نیم، چونکە ئێمە زۆرین.

**لە تاریکەتاراوگەکەم وا بەسەر چوو**

**زەمانی تەریکیم**

ئەو زەمان نەماوە من لە دڵی کێوەکەدا بە تەنێ تەریک مابێتم و کەسم لەگەڵ نەبێ.

**ئیتر خێروخۆشی لە ڕێما.**

ئیتر ئەوە کەوتوومە ڕێ و ئەمە سەرەتای حەرەکەتمە، ئەمە سەرەتای بزووتنمە، لە بیرمە کاتێک لەگەڵ سوارەی بە یەکەوە ئەو شیعرەی «کوش آبادی»مان دەخوێندەوە: «رستگاری قدمیست کە زجا برکندت. خستە ای می‌پرسد رستگاریمان کو/ بە عبث قلەکوهی را در پیلە می‌نمایانمش/ و کسی نیست بگوید باری رستگاری قدمیست کە ز جا برکندت».

ئەم شیعرەی سوارە ئەوەیە کە من هەر لە ڕێگا وەڕێ کەوتم ئیتر خێر و خۆشی لە ڕێما. من ڕزگار بووم لە نێو کێوەکەدا. ئیتر هەرچی دێتە پێشێ تازە ڕزگارییە. جا تا ئێرە قسەی ئاوەکە بوو. ئەمجا شاعیر خۆی دەڵێ:

**وەهایە:**

**کە کانیی بە هیوا**

**بەهارانە لووزەو دەبەستێ بەرەو شاری دەریا**

ئەو هەمووە کانییە کە بەهارێ دێنە دەرێ و ڕوو بە دەریا لەبەر ئەو هیوایەیە ئاوا دەڕۆن.

**بەڵام داخی جەرگم لەگەڵ هەر بەهارێ**

**کە ڕائەچڵەکن سەوزەڵانی**

**لە خاکینەخەونی گرانا**

ئەوە ئەووەڵی بەهارە و کاتی ئەوەیە کە ئیتر لەو خەوە خاکییە ڕابچڵەکن و وەخەبەر بێن و ببووژێنەوە و بکەونە سەر ڕێگا، کەچی لەو کاتەدایە من:

**لە دڵما خەم و داخی ئەم دەردە سەوزە:**

**کە دەردی گرانی هەموو ڕێبوارێ وەنەوزە.**

تۆ دەچی، ڕێبواری، بە ڕێگادا دەڕۆی خەریکی بگەیەی، بەڵام لە نێو ڕێگاکەدا خەونووچکە دەتگرێ و وەنەوز دەدەی و ناگەیە مەقسەد. کەمدەوامی، نیوەچڵی، نەگەیشتن بە مراد و دەست هەڵگرتن لە خەبات مێژووی کوردە، کە ئەویش ئاوا داخی بۆ دەخوا و دەڵێ بەداخەوە لە نیوەی ڕێگادا خەڵک دەوەستێ. ئەگەر ئەو وەستانە نەبایە دەگەیشتینێ. بەم تەرتیبە ئەم بەشەی خەوەبەردینە کە سوارە کوتی، لە قۆناخی یەکەمدا تا ئێرە بوو. جا لێرە بە دواوەسوارە خەریکە ئیتر پەرەی پێدەدا، گەوردی دەکاتەوە و وردەکارییەکانیشی یەکەیەکە بەیان دەکا، بەیانی دەکا هەر ئاودی چۆنە. ئەم ئاوە چۆنە و ئاوەکەی دیکە چۆنە، دەڵێ:

**لە بەر نووری خۆرا**

**گدلێ کوێرەکانی شەوارەن**

وەکو باڵندە وان. باڵندە ئەگەر لە تاریکی‌را هاتە ڕووناکایی شەوارە دەبێ. کانیش،کانی چکۆلە پێی دەڵێن کوێرەکانی، بۆیە دەڵێ ئەم کوێرەکانییانە شەوارە دەبن، عادەتیان بە نوور نەگرتووە.

**زنەی دەم بە هاواری هاری درۆزن هەزارن**

دەزانی زنە لەپڕا هەڵدەقوڵێ، زۆر بزۆز و هارە، بەڵام بەداخەوە ئاوەکەی کەمە و درۆزنەو هیچی تێدا نییە و بیدەیەوە نە دەبێتە کانی و نە دەبێتە چۆم. جا خۆشییەکەی ئەوەیە ئێمە دادەنیشتین و دەمانکوت ئەمە لەسەر کێ دێتەوە و ئەمە لەسەر کێ نایەتەوە.

**زنەی دەم بە هاواری هاری درۆزن هەزارن.**

ئەوانە چۆنن، ئەم زنانە:

**کە تەسلیمی سیحر و تەلیسمی بنارن**

بنار، بناری شاخ هێندە ترساندوونی، هێندە تەلیسمیی خۆی بە سەریاندا زاڵ کردووە کە تەسلیم بوون. لە بەر ئەوەی تەسلیمی بنارەکە بوون،تەسلیمی کێوەکەن. لە زیندانەکەی خۆیان ناوێرن بێنە دەرێ. لە بەر ئەوە:

**بەبێ هەوڵی هەڵدان و چارانی چارن**

لە بەر ئەوەی چونکە ئەوان هیچ هەوڵێک نادەن عیلاجێک بۆخۆیان بکەن،هەڵدانێک، بەرزبوونەوەیەک بە خۆیانەوە ببینن، چونکە تەسلیم بوون بە شاخ و کێوەکە، تەسلیم بوون بە زیندانەکەی کە تێیدا هەن و تەسلیم بوون بەو کۆمەڵگایەی کە لە نێویدا دەژین و پڕیشە لە ستەم. ئەوانە دەڵێ:

**بە هیوان بگرمێنێ هەوری بەهاری**

**ڕەها بن**

**لە زیندانی بەردینی غارا.**

ئەوە نییە ئەگەر هەور دەگرمێنێ دەڵێن کانی تۆقی، ئەوانە بە هیوان لە دەرەوە هەورێک بگرمێنێ و ئەوان جا لەو زیندانە بەردینەی نێو غارەکەیاندا ڕزگار بن و بێنە دەرێ، خۆیان ئەوەندە توانایان نییە وەکو خۆی دەڵێ سەری دەگەڵ بسوون و سەرەنجام ڕێگایەک بدۆزنەوە بۆ هاتنە دەرێ. ئەمانە بە تەمای هەوری بەهارن بۆیان بگرمێنێ، لەم زیندانەدا بیانهێنێتە دەرێ، لە ئومێدی مەوعوود دەگەڕێ، لە یارمەتیدەرێکی دەرەوە دەگەڕێ.

بەڵام ئەوانەش کە خۆیان ناتوانن بێنە دەرێ. ورەیان نییە، بە تەمان کەسێک لە دەرێ

بێ ڕزگاریان کا، لەسەر پێی خۆیان ناتوانن ڕاوەستن. ئەگەر کەسەکەش هاتوو بە جۆرێک هێنانیە دەرێ لەم زیندانی بەردینی غارە، ئەمجا ناتوانن بڕۆن، ڕێگا نادۆزنەوە، بۆیە دەڵێ:

**بە هیوان بگرمێنێ هەوری بەهاری**
**ڕەها بن**
**لە زیندانی بەردینی غارا.**

لە دوایە لێی زیاد ددکا، دەڵێ:

**کەچی وا کەوی و دەستەمۆی دەسەلاتی ڕکەی دۆڵ و شیون**
**لەبەر سامی ڕێ وا بەزیو و تەزیون**
**لەگەڵ گۆچی کردن گزنگێ،**
**چەواشەن لە پێچی نزارا.**

ئەوانە هێندە کەوین، وەها دەستەمۆ و کەوی بوون لە موقابیل دەسەلاتی ڕکەی دۆڵ و کێودا، زیندانی (قەفەسی) دۆڵ و کێو، لەبەر سامی ڕێگاکە و ترسی ئەو ڕێگا دوورودرێژە هێند بەزیو و تەزیون هەر لەگەڵ گزنگی بەیانی لێی دان، لەگەڵ گزنگی هەتاو گۆچی کردن چەواشە دەبن دە نێو نزارێکدا،لە پێچی شاخ و کیوێکدا، یانی کە لە پێشدا ناتوانن لە زیندانەکەیان بێنە دەرێ تا یارمەتیدەرێک دوایە دەستیان نەداتە دەستی. هاتیشنە دەرێ ناتوانن بە ڕێگاکەدا بڕۆن، لەبەر ئەوە لە ڕێگا ترساون. ئەمە جۆرێک ئاوە.

**ئەمجا دەگەینە جۆرێکی دیکە. ئەو ئاوەی کە ڕاوەستاوە، نا، ئەوە جۆری ئەو ئاوەیە کە خۆی دەڵێ ئەمە خراپترینیانە.**

**هەتا بیری تاڵی گراوێ**
**بە دڵما گەڕاوە**
**هەتا یاد ئەکەم ئاوە بەو ورمەبەردینە کاری کراوە**
**ئەڵێم سەد مەخابن**
**وەجاخێ کە ڕووگەی هەزاران نزای شینەباهۆی بەتاسەن**
**وەبووژێنەوەی هەست و هان هەناسەن**
**چلۆنە کە بیژووی گراوان ئەبیهێ**
**لە نێو چاوی ئەو خانەدانە**
**لەهی چۆنە پیتی براوە.**

باسی ئەوە دەکا کە من وەختێک باسی بیری تاڵی گراوێک بە دڵما دێ گراویش ئەو بەردەیە، ئەو ئاوەیە لە ئاست خۆی ڕادەوەستێ، ئاوی مەعدەنەکە پاش بەینێک ڕادەوەستێ لە

جێگای خۆی، دەبێ بە بەرد. ئاو جەوهەری بوونی بزووتن و نەوەستانە. بەردیش جەوهەری بوونی وەستانە و نەبزووتنە. ئەمە تەبدیل بوونە بە دژی خۆت. جا لێرەدایە دەڵێ من تا بیر لەوە بکەمەوە بەو ورمەبەردینەیە، یانی بەو خەونەبەردینەیە کاری کراوە و ئاوا کۆڵەی کوتراوە ئەوە ئاوە. ئەوەش ئاو. جا دەڵێم سەد مخابن، هەزار حەیف. هەزار حەیف لە نێو چاوی ئەو بنەماڵەیەدا- بنەماڵەی ئاو- کە زەمانێک قیبلە بوون بۆ هەزاران دوعای باسکی شینی هەزاران گیا، هەزاران دار و درەخت. هەر دارێک،هەر درەختێک،هەر گیایەک کە بەرز دەبێتەوە دەڵێی باسکێکی شینە و هاواری ئاو دەکا. ئەم هەزاران باسکە شینەی کە هاواری ئاو دەکەن ڕوویان لە کێ بوو؟ ڕوویان لەم بنەماڵەیە بوو، ڕوویان لە وەجاخی ئاو بوو. ئەم ئاوەی کە بووژێنەرەوە و زیندووکەرەوەی هەست و هان و هەناسەیە. باشە ئەو چۆن دەبوو بیرژوویەک ببینێ، چۆن دەبوو زۆڵێک ببینێ، کە ئەم زۆڵە گراوە،چۆن دەبوو ئاوا لە نێو خۆیدا ئەم وەجاخە تەبدیل بێ بە دژی خۆی و چۆنە بیرژووی گراوان دەبینێ. باشە لە چارەنووسی ئەو خانەدانەدا بۆ لەهی، یانی تۆفان، لافاو،لافاو و تۆفانیش تەنانەت بەرەکەتی نەماوە،پیتی براوە. باشە ئێوە خانەدانێکن لە نێو ئێوەدا تۆفان دروست دەبێ، کوا تۆفانەکەتان؟ بۆ بوون بە بەرد؟ جا ئەمجا دەڵێ کە خۆیان گەیشتنە ئەو قەناعەتەوە بوون بە بەرد، تازە نە بە تەشویق و لێ پاڕانەوە، نە بە جنێودان و ڕەخنەگرتن چاریان ناکرێ.

**نە سۆزەی بلاوێنی میری خوناوەی بەهاری**

لە چیرۆکی کۆندا نەقڵێک دەگێڕنەوە: «پادشایەک بوو پێیان دەکوت میرخوناوکە. ئەمە یادگاری ئەو زەمانەیە کە ئینسان باوەڕی بەوە هەبووە کە هەر مەزهەرێک لە مەزاهیری تەبیعەت خوایەکی هەیە. خوای ئاو، خوای باران، خوای خۆرەتاو و ڕۆژ و مانگ و با». لە زمانی کوردیشدا میرخوناوکە.. میری خوناوکە بە میری باران دەڵێن - دەیەوێ ئیشارە بەم ئەفسانە کوردییە بکا، دەڵێ: نە ئەم سۆزەی بلاوێنە، ئەم سۆزەی کە پێی دەلاوێنێتەوە کە خوای باران دەیلاوێنێتەوە، نە ئەوەش کە برا ڕێبوارەکەی خۆی تووکی لێ دەکا و ڕەخنەی لێ دەگرێ و قسەی پێ دەڵێ (تووککردن، فەرقی بەینی نزا و تووک: نزا، پاڕانەوە و دوعای خێرە، تووک دوعای شەڕە و نفرینە) جا نە ئەوەی کە میرخوناوەکەی بەهار دەیلاوێنێتەوە، نە ئەوەی کە برای ڕێبواری تووکی لێ دەکا و نفرینی دەکا:

**لە کاسیی خەوا، فێری ڕاسانی ناکەن**

**لە مانا، بە ئامان و بریا**

**پەشیمانی هەرمانی ناکەن**

لە مانا، یانی لە مانەوەدا و لە مانگرتندا لەم مانگرتن و مانەوەیدا، چ بە ئاماندا

برۆی و چ به بریا هاتبایەی پەشیمانی هەر مانەوەکەی خۆی ناکا. یانی جاویدانەیی هەیە. تازە لە بەرد بوونی خۆیدا قابیلی ئیسلاح نییە، تازە ناگۆڕێ.

**وەها گەی لەشی بەو گە بەردینە گاوی دراوە**

**کەحێلێکە، کۆرژن و حیلەی نەماوە**

گە، یانی بەند، گاو کردنیش ئەوەیە کە شتێک دەشکێ پێی پێوە دەنووسێننەوە.وەها گەی لەشی بەو گە بەردینەی کە کراوە،گاو دراوە و پێکەوە نووساوە، وەکو ئەسپێک دەچێ کۆرژن و حیلەی نەمابێ، تازە لەوە کەوتووە بگۆڕێنێ. ئاخرەکەی دەڵێ:

**وەهایە کە هەر گیایە لەو دەشتە شینن**

**لەسەر ماتەمی ئاوەبەردینە سەرشین و سەرگەرمی شینن**

عادەت وایە لە وەختی تازێ و ماتەمدا قەدیم خەڵک سەری خۆیان بە خم شین دەکرد، خمیان لە لکی سۆرانی و لەسەر شانیان دەدا، بۆیە پێی دەڵێن سەرشین، سەرشین کەسێکە کە تازێباره. دەڵێ هەر گیایەک لەو دەشتەیە یا شینە یا سەرگەرمی شینە، یا سەری شینە، یانی ماتەمی گرتووە، هەموو ماتەمیانە کە بۆ ئاو نایە. من لام وایە ئەم بەشەی کە ئێستا بۆم خوێندییەوەدەبوو ئاخر بەش بێ پێش ئەوەی کە دەگاتە ئەوەی دەڵێ:

**لە نێو ئەو هەموو ئاوە هەر چاوەیەک**

**باوی هەنگاوی خۆشە**

یانی ئەم دووانە، ئەوەی ئێستا خوێندمەوە، ڕەمز و نیشانەی هەرە خراپی ئاوە. ئەوی تریش کە دەڵێ:

**لە نێو ئەو هەموو ئاوە هەر چاوەیەک**

**باوی هەنگاوی خۆشە**

ئەویش ڕەمز و نیشانە و میسالی کامیلە بۆ چاکی و بۆ حەیات و حەرەکەتی ئاو، ئەو دووانە دەبوو بکەونە ئاخری شیعرەکان، بەڵام لە هەر حاڵدا ئەم نوسخەیە وای نەکردووە. بۆبە ئێستا دەگەینە نەوعێکی دیکەی ئاو، ئەو ئاوەی کە ڕادەوەستێ، ئەویش گۆلە.

**گەڵێ گۆلە لەو چۆلە پەخسیری خاکن**

**بە ڕوویا گەڵا وەک چەمۆڵەی کلۆڵی وەرین**

وەختێک ئاو دەچێ و لە گۆلێکدا ڕادەوەستێ تەبعەن دارەکانی دەوروبەری بە سەریدا شۆڕ دەبنەوە، گەڵاکانیان کە دەکەونە نێو ئاو دەڵێی چەمۆڵەی لێ دەنێن. چەمۆڵەی کلۆڵی لێ دەنێن. دیارە ئەوە دوو مەعنای هەیە. یادی بەخێر، جاری وابوو ئێمە لەسەر ئەو دوو مەعنایە کێشەمان بوو، کە مەعنا ئەسڵییەکەی کامەیە. تۆ دەتوانی دوو مەعنای لێ بدەی.

«وەکو چەمۆڵەی کلۆڵی وەریوە» یانی ئەم گەڵایەی کە کەوتۆتە خوارێ دەڵێی چەمۆڵەیەکی کلۆڵییە وەریوە. نوونەکەی دوایە نوونی جەمع بێ، ئەمە جۆرێکە. جۆرێکی ئەوەیەبڵێ. «وەکو چەمۆڵەی کلۆڵی وەریون»، ئەمە دوو جۆرە. بڵێی بە ڕوویا گەڵا وەک چەمۆڵەی کلۆڵی وەریون.

**گەمارۆی زەلی نێزە، وا تەنگی پێ هەڵچنیون،**
**کە بێ دەرفەتی پێکەنینێ بە سەد بەرزگی زەردەماسی**

تۆ دەزانی زۆر جار لە نێو چۆمدا کە سەیری ماسی دەکەی، ماسی بەینێک خۆی هەڵدەگێڕێتەوە بەرزگی دەردەخا و بەرزگیشی سپییە، ئەوە وەرزشێکە ماسی دەیکا لەنێو ئاودا. جا ئەم خۆ هەڵگێڕانەوەی ماسی ئەم بەرزگ دەرخستنەی کە سپی و جوانە، سوارە ئەوە دەشوبهێنێ بە پێکەنینی چۆم یا بە پێکەنینی ئاو، ئاو بە وەسیلەی ئەم هەمووە زەردەماسییە کە هەڵدەگەڕێنەوە و بەرزگی سپیی خۆیان دەردەخەن دەڵێی ددانی سپی خۆی دەردەخا. بۆیە ئەمە بە پێکەنینی ئاو دەشوبهێنێ.

بەڵام زەلی نێزە یانی نێزەی زەل دە واقیعدا، پاش و پێش کردنە، یانی قامیش، نێزەی قامیش، وەها تەنگی پێ هەڵچنیوە و گەمارۆی داوە کە ڕێگای نەماوە تەنانەت ماسییەکانیشی جارێک خۆیان هەڵگێڕنەوەو بەرزگی زەردی خۆیان نیشان بدەن و ئاو جارێک وەکو پێکەنین، پێکەنینێک بکا بە مانە.

**لێ و پۆپ و هەژگەڵ**
**وەها دەوروپشتی تەنیون**
**کە بێ فرسەتی چاوەبڕکێ**
**لەگەڵ عەرشی پاکن.**

ئاو دەبێ لەگەڵ ئاسمان چاوەبڕکێ بکا ئەستێرەکان ڕەنگی خۆیان و عەکسی خۆیان لە نێو ئاودا ببیننەوە، بەڵام هێندە لێ و پۆپ و هەژگەڵ لە دەوروپشتی کۆ بۆتەوە و تەنیوێتی ئاسمانی لێ دیار نییە تا چاوەبڕکێیەکی لەگەڵ بکا. ئەمەش بەشێکە. ئەمجا بەشێکی دەگاتە ئاوێک، کە ئەمە ئاوێکە ڕادەوەستێ، کە هیچ ناکا، ئاوێکە کە دەڕوا، بەڵام پاش بەینێک تەواو دەبێ و وشک دەبێ و جۆگەکە وشک دەبێ، دەڵێ:

**هەتا جۆگە ئاوێ بە ویشکی ئەبینم**
**ئەڵێی مێرگی ڕوخساری کیژێکی کاڵ و مناڵە**
**بە کووزی تەمەن جارەجوانێکی پڕخەوشوخاڵە،**
**تەشەنداره جەرگی برینم.**

جارِ ئەو شتەیە کە پێشوو حاسڵێکی لێبووە، زەرعاتێکی لێبووە، گەنمێکی لێبووە، جۆیەکی لێبووە، بەڵام درواوەتەوە، ئێستە هیچی لێ نییە، بەڵام جێگەکەی دیارە کە ئەمە جێگای گەنم بووە، ئەمەیە جارِەگەنم، ئەمەیە جارِەجۆ، ئەمەیە جارِەنۆک. دەڵێ ژنی جوان کە سەیری دەکەی با پیریش بێ، ئەگەر خۆشی جوان نەبێ جارِەجوانە بە جحێڵی جوان بووە جا جۆگە ئاویش وایە، چ ئێستا وشک بێ، یادگاری ئەوەیە زەمانێک ئاوی پێدا هاتووە، وەکو ژنێکی خاوەن تەمەنە کە بە کچێتی جوان بووە، بەڵام چۆن؟ تەشبیهی دەکا بە ڕوخساری کیژێکی کاڵ و مناڵ. ئەم ڕوخسارەش دەشوبهێنێ بە مێرگ. تەمەن وەکو گاسن کووزی بە سەردا هێنابێ، چۆن مێرگێک گاسن دەیڕووشێنێ، کووزی لێ دەدا، تەمەنیش لەسەر مێرگی ڕوخساری کیژێکی کاڵ و مناڵ ئاوا کووزی خۆی دادەنێ و پیری دەکا و دەیکا بە جارِەجوان. جا هەموو ئەوانە وەکو جۆگە ئاوێکن کە لە پێشدا ئاوی تێدا بووبێ، بەڵام ئێستا وشک بووبێ، ئەوەیە کە تۆ دەبینی تەشبیهەکانی سوارە سێ چوار تەشبیهن لە نێو یەکدا. حاڵەتێک بە حاڵەتی دووهەم، حاڵەتی دووهەم دەشوبهێندرێ بە حاڵەتی سێهەم جا لە حاڵەتی چوارەم و پێنجەمدا دەگاتە ئەو جێگایەی کە ئەو مەبەستێتی، جا دەڵێ، کە وا دەبینم.

**تەشەنداره جەرگی برینم.**

دەتوانێ دوو مەعنای هەبێ. یەکیان ئەوەیە وەری گێڕییەوە، یانی تەشەنداره برینی جەرگم، جەرگم کە بریندارە برینەکەی تەشەندارە. ئەمە جۆرێکە، یەکیانیش ئەوەیە، دەبێ بڵێی جەرگ بە مەعنای عومقە، یانی قووڵایی، ئەوە نییە دەڵێن نێو «جەرگە» قووڵایی برینم تەشەندارە، لەبەر ئەوە جەرگی برینم بە هەردووک جۆر دەتوانی حیساب بکەی. برینی جەرگم یا قووڵایی برینی جەرگم.

پاش ئەو هەمووانە بۆ خۆی بیر دەکاتەوە ئەو هەمووە ئاوە یەک بە خەسار چوو، یەک بە فیڕۆ ڕۆیی، یەک ڕاوەستا، یەک بوو بە دژی خۆی، یەک بوو بە جاش، پاش ئەوانە هەمووی، دەڵێ:

**بەڵێ، دوورە گەرمێنی دەریا**
**بەڵێ، وایە، کانی هەژارن**
**ئەزانم**
**ئەوانە کە پاراوی ئاون بژارن**
**ئەزانم لە ڕێگا،**
**مەترسی گەلێ ژەنگ و ژارن.**
**بەڵام کاکە ئەو گشتە عەقڵی خەسارن**

ئەمە لە دوو مەسەلی کوردی دەیەوێ کەلک وەرگرێ. یەکێکیان ئەوەیە بە کوردی دەڵێ «گەرمێن دووره بۆ پیاوی هەژار» یان «گەرمێن دووره بۆ پیاوی فەقیر». قەدیم خەڵک لە کوێستانەوە دەبوو بێنە گەرمێن بۆ کار و کاسپی، کار و زەراعەت و فەلاحەت لە کوێستان کەم بوو، خەڵک دەبوو بڕوا و بچێتە وڵاتی گەرمێن و گەرمەسێر و لەوێ کار و کاسپییەک بکا و پاشان زستانەکەی [ئەوەی پەیدای کردووە] بیهێنێتەوە لەگەڵ ماڵ و منداڵی خۆی بیخوا. جا دەیانکوت خەڵکی فەقیر ناگاتە گەرمێن. ئەمە یەکێکیان ئەوەیە دەڵێ گەرمێن دووره بۆ پیاوی هەژار.

یەکێکیانیش لە مەسەلێکی دیکە ئیستیفادە دەکا، دەڵێ «هەر عەقڵە لە خەسارێک» یانی تۆ دەبێ خەسارەتێکت تووش هاتبێ، تۆ دەبێ زەرەرێکت کردبێ جا دەرسی لێ وەردەگری، دەڵێ بەڵێ وایە، ئەو هەمووە شناختەی کە تۆ بۆت باس کردم، یا خۆم دیتم بە چاوی خۆم ئەم دەردە و ئەم کۆڵەمەرگییەی بە سەر ئاو هات خۆ منیش ئاگادارم، بەڵێ وایە. بەڵێ دووره گەرمێن و دەریا، بەڵێ کانیش هەژارن، کوتیشمان گەرمێن دووره بۆ پیاوی هەژار، ئەوە ڕاستە، دەشزانم ئەو ئاوانەی کە دەڕۆن هەموو بە جێگای خۆیان ناگەن: بەشێکی بژار ئاو دەدەن، یانی گیای بێکەلک، ئیستیفادەیەکیان لێ دەکرێ کە لە جێی خۆی نییە. دەشزانم لە ڕێگادا مەترسی زۆر ژەنگ و ژار و موشکلە و دەردەسەری و کۆڵەمەرگی هەیە، بەڵام ئاخر چی بکەی؟ ئەی ئەگەر ئەوە نەکەی چی بکەی؟ دەبێ ئەو ئەزموونانە بکەی، دەبێ بەم ڕێگایەدا بڕۆی چونکە کاکە ئەوە گشتی عەقڵی خەسارن. «هەر عەقڵە لە خەسارێک» ئەگەر تۆ ئەو خەسارەتەت بە سەردا نەیە و هەموو ئەو زەرەرانە نەکەی و هەڵنەستییەوە ئەزموون پەیدا ناکەی. لەبەر ئەوە ناتوانی بە مراد بگەی، لەبەر ئەوە سەیر نییە کە ئەم کوێرەوەرییانەمان بە سەر دێ. ئەوانە هەمووی دەبنە ئەزموونی تازە و هەر خەسارێک دەبێتە عەقڵێک. بەم تەرتیبە قسەی ئاخری خۆی دەکا. دەڵێ ئەم ڕێگایانەی کە کەوتنە بەرمان، ئەم زەحمەتە، ئەم کوێرەوەرییە، ئەم کۆڵەوارییە ئەمە چارەی ناکرێ. ئەمە دەبێ ببێ، ئەمە بەشێکە لە ئەزموونی پێگەیشتن، بەبێ ئەوەپێگەیشتن نییە. جا ئەمجا دەگاتە سەر ئاوی ئاخر.

**لە ناو ئەو هەموو ئاوە هەر چاوەیەک**

**باوی هەنگاوی خۆشە**

**بە تەنیا ئەوە شارەزای کۆسپ و کەنداڵی ڕێیە**

چونکە بۆ ئەوەی تۆ پێبگەی موهیم ئەوەیە ڕێگاکەت بزانی، شارەزا بی کە لەم ڕێگایەدا چەندەی کۆسپ و کەنداڵ تێدایە، جگە لەوە دەبێ باوی هەنگاویشت خۆش بێ، دەبێ بە ورە

بی، دەبێ دڵت پێی خۆش بێ، دەبێ زەوقت لەسەری هەبێ. ئەو ئاوە «هەوەڵ مەنزڵی زێیە، ئاواتی بەرزی زرێیـە» هەوەڵ مـەنزڵی کـە دەبێ بیگاتێ ئەوەیە وەکـو مـیللەت ڕزگـار بێ. لێرەدایەکە قۆناخی یەکەم و قۆناخی دووهەم یا ئاواتی نیزیک و ئاواتی دوور دیاری دەکا، ئاواتی نیزیک ئەوەیە، ئەو جۆگە و جۆبارانە هەموو کۆ ببنەوە پێکەوە ببنە زێیەک و ئەو زێیە شوبهێنراوە بە ڕزگاریی میللی. دەبێ تۆ وەکو نەتەوە سەربەخۆ بی. بێ ئەوە تۆ ناتوانی لەگەڵ دەریا یەک بگرییەوە کە وابوو شەرتی لازم ئەوەیە کە تۆ بزانی یەکەم هەنگاوت دروستکردنی ئەم زێ گەورەیەیە کەبریتییە لە یەکگرتنەوەی میللەت و سەربەخۆیی و ڕزگاریی میللەت، بەڵام وەکو سوارە دەڵێ شەرتی دووهەمی ئەوەیە، جا بە وەش نەوەستی، ئاواتێکی دوورتر و بەرزتریشت هەبێ، ئەویش ئەوەیە لەگەڵ بەشەرییەت، لەگەڵ دەریای ئینسان تێکەڵ ببیەوە، بۆ دروستکردنی جامیعەیەکی پڕ لە عەدالەت و ئازادی و بەرابەری، جا بۆیە دەڵێ:

**هەوەڵ مەنزڵی زێیە، ئاواتی بەرزی زرێیە**

**ئەزانێ لە هەڵدێرە هاتی بەهێزی**

هاتی بە هێزییەکەی کەیە. ئەو کاتەی هەڵدەدێردرێ. تۆ تا حەوادیست بە سەر نەیە و تا نەکەوی و تا هەڵنەنگووی پێی قەوی نابی.

**لە ئەسکوند و چاڵایە هەڵدان و گێژی**

وەختێک جێگایەک ئەسکوندە و چاڵە، بەرزاییەکە و نەوییاییەکە ـ ئەسکوندەکە بەرزاییە و چاڵەکەش نەوییایەتییە ـ لە کاتێکدا،لەو نێوەدا هەڵدەدا و گێژیش دەخوا، تا نەچێتە نێو ئەم بەرز و نزمییەوەنە دەتوانێ هەڵدا، نە دەتوانێ گێژ بخوا، جا دەڵێ:

**پەڕۆی شینی سەر شانی دەریایە ژینی کەرێزی**

ئەم دەڵێ ژیانی کەرێزی بۆ ئاوە ـ کەرێز ئەوەیە ئاوەکە بە ژێر عەرزدا دێ ـ دەڵێ تا کەی بە ژێر عـەرزدا بڕۆی. «پەڕۆی شین» پەندێکی لەمێـژینەی کـوردییـە. ئەگـەر پەڕۆی شـینیـان لەسەر شانی کەسێک بەستبایە نیشانەی عەیب و شوورەیی و شەرمەزاری بوو.

**ئەزانێ لە پێ ناکەوێ پێیە پێڵاوی تاسەی پیاسەی لە پێ بێ**

ئەم پێیـەی کـە پێـڵاوێکی لە پێ بێ، ئەو پێـڵاوەش لە چی دروست کـرابێ، لە مـەیلی پیاسـەکردن، یانی مـەیلی پیاسـەکردن و حەڕەکەت بۆی بووبێتە پێـڵاوێک و چووبێتـە نێو پێیەوە، ئەو پێیە لە پێ ناکەوێ.

**نە وەستان ئەوەستێ بە دەستێ**

**کە خاراوی ئێش و سواوی سوێ بێ**

وەستانیش، یانی ماندووبوون، ماندووبوون ناتوانێ بەم دەستە بوێرێ یا پێی بوەستێ،

دەرەقەتی بێ، کە ئەم دەستە خاراوی ئێشە ـ شتێک کە دەخارێ یانی ڕادێ ـ و سواویشە لە ژان و ئازار، هێند ژان و ئازار و ناڕەحەتی و مەینەتی چێشتووە، هێند لە نێو خەم و خەفەت و کوێرەوەریدا ژیاوە و ڕاهاتووە کە تازە خاراوە. جا دەستێک لە جێگایەکی ئاوادا گەورە بووبێ و خارابێ وەستان پێی ناوەستێ. جا دەڵێ:

**لە هەر شوێنێ ڕاماوە، داماوە، کاری تەواوە**

دەکرێ بڵێی کاری کراوە. ئەگەر لە جێگایەک ڕاما، بیری کردەوە ـ لێرەدا مەبەست لە بیرکردنەوە و تەزەلزوول و ڕاڕاییە ـ لە هەر جێگایەک کە ڕاما، کەوتە بیرەبیر، کەوتە خەیاڵاوی بوون،کەوتە سەر ئەوەی گومانی لێ پەیدا بوو سەبارەت بە ڕاستی و ڕەوایی ڕێبازەکەی خۆی، لەو جێگایەدا ئیتر داماوە و کاریشی کراوە. ئیتر تەواوە. هەناوی بە هەنگاوە. ئاو بەوە کە هەنگاو بنێ هەناوی هەیە و هێزی هەیە و توانای هەیە. «نەسرەوتنە کوولەکەی ڕوحی ئاوە»، بەڵام هەموو زیندەوەرێک کوولەکەیەکی هەیە کە ڕوحی لەنێو ئەو کوولەکەدایە. ئەگەر ئەو کوولەکەیە شکا ڕوحەکەی دەفەوتێ. کوولەکەی ڕوحی ئاو نەسرەوتنەکەیەتی. بەم تەرتیبە خەوەبەردینە تەواو دەبێ. جا لێرە من حەولم داوەلە کورتترین مووددە،لە کەمترین وەختدا ئەو مەعنایە لێ بدەمەوە، ئەگەر تۆ بەڕاستی بتهەوێ خەوەبەردینە بزانی، جگە لە مەعنا ڕاستەقینەکەی، ئەمن تەنیا مەعنا ڕاستەقینەکەم لێک دایەوە. ئەگەر بتهەوێ هونەرە شیعرییەکەشی بێنییە گۆڕێ، پێکەوە گونجاندنی ئەم هەمووە وشە جوانانە لە نێو ڕستەیەکدا. داڕشتنی کۆپلە و مەقتەعە جیاجیاکان، جگە لەوە دەورێکی کە خەوەبەردینە بوویەتی لە بەرزکردنەوەی زمانێکی فاخیر، زمانێکی هونەری بۆ شیعری کوردی، تەئسیری لەسەر هاوزەمانانی خۆی، یان سی ساڵ دوای خەوەبەردینە کە ئێستا بێ، ئەگەر بتهەوێ لە سەر ئەوە قسە بکەی یەکجار زۆری وەخت دەوێ. ئەمن خۆم لام وایە ئەگەر عومرم هەبێ. یەکێک لە باشترینی ئەو کارانەی کە من ئارەزووم هەیە لە ژیاندا دوو شتێ. زۆر شتە، بەڵام لانیکەم دوو شتیان لە لام مەبەستێ، بەڵام بەعزە وەختێک خەوەبەردینەکە ئەوەڵیانە. پێم خۆشە کتێبێک بنووسم هەر ناویشی بنێم «لەسەر خەوەبەردینە». ئیتر جا هەموو شتێک لەسەر خەوەبەردینە. پێشەکییەکانی، زەمینە فکرییەکانی، زەمینە فەرهەنگییەکانی، خەسایس و تایبەتمەندیی زمانەکەی، تەئسیری لە چی وەرگرتووە،تەئسیری لەسەر کێ داناوە،ئەوە بەشێکیتی. من لە ڕاستیدا پێشم خۆشە لە پلەی دووهەمدا لەسەر ئەدەبیاتی کوردیی ساڵی ٤٦ـ٤٧وە تێکەڵبوونی ئەو ئەدەبە لەگەڵ بزووتنەوە سیاسی و لەگەڵ بزووتنەوە چەکدارییەکەی ٤٦ـ٤٧یش شتێک بنووسم. چونکە ئەوەیان بە تاقیتەنێ ئەدەبیات نییە، ئەمەیان بەشێکە لە تاریخ، لە مێژووی گەلی کورد. ئەدەبیاتی ئەم سەردەمە بەشی زۆری لە

پێوەندی لەگەڵ ئەو حەرەکەتە سیاسییەدایە،نەک حەرەکەتە چەکدارییەکە: لە بەر حەرەکەتە سیاسییەکەی کە لە دەورەی دووهەمی چالاکیی ئێمەدا، لە ساڵی ١٣٤٥ بەم لاوە دەستی پێکرد. بەشێکی زۆری ئەو چالاکییە ئەدەبی و فکری و فەرهەنگییە لەگەڵ ئەوە سەری هەڵدا، جا تەئسیری دانیشگای تارانی لەسەرە، تەئسیری ڕاپەڕینەکانی ئورووپای لەسەرە. تەنانەت تەئسیری حەوادیسی پاریسی ١٩٦٨ی لەسەرە، هەتا دەگاتە دەورەیەک کە ١٩٦٨ی میلادییە. هەموو ئەو دەورەیە هەتا دەگاتە تەواوبوونی دەهەی شەست، دەهەی شەست دەهەیەکی تاریخییە لە مێژووی ئورووپاشدا، دەهەیەکی جوولانەوەی فکری، فەرهەنگی ـ شۆڕشگێڕی و ڕادیکاڵە لە عالەمدا.

ئەم تەئسیرە جیهانییە ئێمەشی گرتەوە و ئێمەشی بردە نێو باوەشی خۆی، بەڵام ئێمە ڕەنگێکی کوردیان لێدا و بەم تەرتیبە یەکێک لە شوعبەکان یا یەکێک لە لقەکانی ئەم بزووتنەوە جیهانییە لە کوردستاندا سەری هەڵدا، بە لای منەوە ئەوە شتێکە کە تا ئێستا یا تەوەجوهی پێ نەکراوە یا کەمی لەسەر نووسراوە. هیوادارم ئەگەر عومرم مەودا بدا لەسەر ئەو دووانە بتوانم بنووسم ـ بەڵام لە ڕاستیشدا سی ساڵە وا دەڵێم ـ لەبەر ئەوە ئێوە زۆر بە تەما مەبن.

بۆکان بە خەوەبەردینە و بە سوارەوە جوانە. خۆ دیارە گومان لەوەدا نییە کە سوارە ئی هەموو گەلی کوردە، ئی هەموو ئەدەبیاتی کوردییە،ئی هەموو ئینسانێکی ئازادیخوازیشە، کە بیری لە عەدالەت و بەرابەریی ئینسان کردبێتەوە، بەڵام هیچ گومان لەوەدا نییە کە وەکو هەموو کەس شانازیی یەکەمی ئی وڵاتەکەی خۆیەتی، شانازیی یەکەمی ئی ئەو شارەیە کە زمان و فەرهەنگەکەی لە وێ فێر بوو، لە وێ وەری گرت. جگە لەوە لە بیرتان نەچێ کە بەشێکی زۆری شانازییەکەی نەک ئی شارەکە، بەڵکو هی ئەو دیوەخان و بنەماڵەشە کە لەوێدا زمانی کوردی، فەرهەنگی کوردی، شیعری کوردی هێندە باو بوو،هێندە بەیان دەکرا، هێندە دەکوترا، جەدەل و لێکۆڵینەوە و گوفتوگۆ و شەڕەشیعر ببوو بە شەوچەلەی دیوەخان. سوارە یەکەمین زمانەوانی و فەرهەنگ و زمانناسیی کوردی لە وێ پەیدا کرد. جگە لەوە بۆکان جێگایەکە کە شاعیرانی دیکەی وەکو هەژار، وەکو خاڵەمین، وەکو حەقیقی، وەکو سەید کامیل، وەکو نووری ـ لێ هەڵکەوتووە، ئەوە لە دەورەی جمهووری کوردستاندا – پێش جمهووری کوردستانیش ئی وەکو ئەدەب،وەکو سەیفی قازی لێ هەڵکەوتووە: ڕاستە سەیف زیاتر ڕەنگە بەرەو مەهاباد حیساب بکرێ، بەڵام ئەتۆ دەزانی لە ئێران مەهاباد و بۆکانە ئەو پیاوە گەورانەی لێ بوون. میسباح خۆی لە قۆناغی نێوان وەفایی و سەیفی قازیدایە. لە ساکارکردنی زمان، لە پاراوکردنی زمان، لە دەرخستنی شیعرە کۆنە ڕەق و تەقەکانی

عەرەبی‌و فارسیی کۆن لەوانەدا ئەدەب خۆی دوور خستەوە لە عەسری وەفایی و سەردەمی وەفایی و پێش وەفایی، بەلام جیاشە لە سەیفی قازی. ڕاستە زمانەکەیان، زۆر وەکو یەک دەچێ ـ هاودەم و دۆست و برادەریش بوون ـ بەلام لە نێوەرۆکدا سەیفی قازی زیاتر بەرەو نێوەرۆکی کۆمەلایەتی ـ سیاسی چوو. بۆیە ئەگەر تۆ بە حیسابی دانێی ئەدەب قۆناغی گواستنەوەیە لە وەفاییرا بۆ سەیفی قازی ئەوەی هیچ گومانی تێدا نییە، ئەوەی لە ئەدەبی کوردیدا دەبێ حیسابی بۆ بکرێ ئەوەیە کە سەیفی قازی مامۆستای شیعری کوردییە لەسەر شێوەی کلاسیزمی نوێ. شیعرێکە بۆیە پێی دەلێن کلاسیک چونکە لە وەزن و قافیەدا وەزن و قافیەکانی خۆی تا ڕادەیەک پاراستووە. هیچ کەس نییە لە ژێر تەئسیری ئەودا نەبووبێ لە هەموو شاعیرانی دەورەی جمهووری و پاش جمهووریش.

سەیفی قازی بەو ئیعتیبارە کە شاعیرێکی کلاسیکە کە وەزن و قافیەی ڕیعایەت کردووە، بەلام کلاسیزمی نوێیە چونکە دووری خستەوە لەو کلاسیزمەی کە تەنیا بە شیعری غەرامیوە خۆی دەبەستێتەوە، بە عیشق و عاشقی و پێداهەلگوتن و زولف و خالی دولبەرەوە، بەلکو شیعری خستە سەر ژیانی ڕۆژانەی خەلک و شیعری خستە سەر بواری لێپرسینەوە، کە ئەو میللەتە بۆ وا دواکەوتووە. هاندەری ئەوە بوو کە ئێمە دەبێ ڕاپەرین، ئێمە دەبێ دەولەتی خۆمان هەبێ، ئێمە دەبێ دواکەوتوویی خۆمان چارەسەر بکەین. جگە لەوە مەوزووعی شیعرەکەشی لە خەیال بردە دەرێ و هێنای کردی بە واقیع، دێیەکی کوردی، زستانێکی کوردی ساز کرد. زستانەکەی سەیفی قازی شاکارێتی. «سالی هەزار و سێسەد و دوازدە، بیستی فەروەردین داد و بێدادە». یانی بیستی فەروەردین بووە ـ خاکەلێوە ـ کە ئەو بەفرە زۆرە هەبووە و مەڕ و مالات هەموو قڕیان تێ کەوتووە. ئەم جۆرەی کە ئەو باسی ولات دەکا زستانێکی واقیعییە نەک زستانێکی خەیالی،بەڕاستی قات و قڕێکە ڕووی داوە. کە باسی کۆچ و کۆچبار دەکا، باسی عێل و عەشیرەتەکان دەکا، ئەو عێل و عەشیرەتەن کە هەن، مەوجوودن، بە ئەسپیانەوە، بە زین و بەرگیانەوە، بە ڕمبازییانەوە،بە مەردۆشییانەوە.

پاش ئەوانە دەچێتە نێو قوولایی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کوردی، هاندانی بیری کوردایەتی. بۆیە سەیفی قازی بە مامۆستای دوو شت حیسابە، بە شێوەیەکی هیچ قسە لەسەر نەبوو کە ناتوانێ کەس گومانی تێدا بکا، یەک، مامۆستای بیری کوردایەتییە. دوو، مامۆستای ئەدەبی کوردییە، ئەدەبی نوێ ـ ئەمن مەبەستم شیعری نوێ نییە، مەبەستم ئەدەبی نوێیە بە مەعنا و نێوەرۆکەوە ـ هەر هەموو کەس لە ژێر تەئسیرێتی، لە نووسەرانی نەسریش مەسەلەن یەکێکی وەکو قازی کاکە حەمە، قزلجی، یەکی وەکو مەلا ئەمجەد قەلایی، یەکی وەکو حاجی ڕەحماناغای باوکی من، یەکی وەکو حەقیقی، یەکی وەکو خالەمین، یەکی وەکو

سەید کامیل، وەکو نووری، هەژار و هێمن بە تەواوی پێیان لە جێگا پێی سەیفی قازی داناوە و ڕچەکە ئەو شکاندوویەتی. بۆیە نووسین لە سەر سەیفی قازی یەکێک لە مەبحەسە زۆر گرینگەکانی باسکردنی ئەدەبی کوردییە لە کوردستانی ئێران و بەداخەوە زۆر کەمی باس لەسەر کراوە. ئەویش تایبەتمەندیی خۆی هەیە.

---

١ - ئەم وتوویژەی کاک «سەلاحەددین موهتەدی» (سالی ٢٠٠٤ ز) کراوە کە لە ئینترنێت وەرگیراوە.

# شیعری سواره
## کوڕمی دووهەم

ڕەهبەر مەحموودزادە

(۱)

لە بارەی چێژی «بژاردەبێژی»دا، ڕۆلان بارت لە شوێنێکدا دەڵێ: «ئەو هەموو بژاردەیە، ئەو هەموو سەرەتایە[1] وەک ئەوەی گوتبێتی گرفتی دۆزینەوەی ڕاستییەکان، لە ڕاستیدا گرفتی دۆزینەوەی دەسپێکەکانە و لەبەر ئەوەی بۆ دووان لەمەڕ بابەتێکەوە، دەکرێ چەندان دەسپێکی جۆراوجۆر دەستنیشان بکرێ، کە واتە هەر سەرەتایەک ڕێگا بەرەو حەقیقەتێکی جیا لەوەی تر دەردەبا. ئەگەر ئەم لێکدانەوەیە لە بارەی گوتەی بارتدا ڕاست بێ، بۆمان هەیە بۆچوونەکەی بەم شێوەیە ڕاڤە بکەین: «ئەو هەموو سەرەتایە، ئەو هەموو حەقیقەتە».

ئەم گوتەیەی بارت، خزمایەتییەکی نزیکی لەگەڵ پێرسپێکتیویسمی (ڕوانگە باوەڕی) نیچەدا هەیە کە دەڵێ: «ئەوەی من بۆ لای نیچە کێش دەکا، فلانە یان فیسارە کتێبەی نییە بگرە بژاردەبێژییەکەیەتی، واتە ئەو مێتۆدەی بۆ نووسین ڕەچاوی دەکا. «بارت دواجار بەم ئەنجامە دەگا کە» لە هەرچی شوێنە بۆت هەیە دەفتەری یادداشتەکانت هەڵگری و نە ئەندێشەیەک، بگرە تەکانێک بنووسییەوە.»[2] و بەم جۆرە لە ڕوانگەی بارتەوە سات و سەودای مرۆڤ هەر بەتەنێ لەگەڵ وردەکارییەکاندا دەبێ نەک لەگەڵ گشتایەتییەکان و لەم ڕێگەوە زەینییەتی نیزامسازیی مرۆڤ دەچێتە ژێر پرسیارەوە، بەڵام مەبەستی من لە هێنانەوەی ئەم گوتەیەی بارت ئەوە نییە کە ڕێگە بۆ نووسینێکی تەواو بژاردەبێژانە لەسەر شیعری سوارە ئێلخانیزادە خۆش بکەم، بگرە مەبەستم ئەوەیە نەهێڵین ئەو گوتەیە بەبێ پرسیار لێکران و ڕەخنەکاری لە چنگی سەرنجمان قوتار ببێ، یان هەر نەبێ وابکەین سەلماندنی ئەم بۆچوونە لە لایەن ئێمەوە دوای خۆڕاگرتنی لە بەرامبەر پرسیارەکان و ڕەخنەکانمان، ڕوو بدا. ڕاستە سەرەتاکانی دووان لەمەڕ بابەتێکی دیارەوە دەکرێ فرەجۆر بن، بەڵام ئایا هەموو سەرەتاکان وەکو یەک شیاون بۆ خستنە سەر پشتی دەرگای باس‌وخواستێکی ڕەوشتمەند و مەنتیقی لەسەر بابەتێکی دیاریکراو؟ من پێم وایە دەتوانین ئەو شیمانەیە لەبەر چاو بگرین کە هەندێک جار، هەڵبژاردنی هەندێک لە سەرەتاکان بۆ چوونە نێو جیهانی باسێکی تایبەتی شیاوتر و پتر جێگای متمانەیە.

ئەگەر ئەم گوتەیە ڕاست بێ بەڕاستی چ سەرەتایەک بۆ هێنانە بەرباسی بابەتی «شیعری سوارە» شیاوترە و ئەگەریش نەمانهەوێ بە داسەپاندنی ئەم بۆچوونە کە تاقە سەرەتایەکی

باشتر، بۆ ئەم بابەتە لە گۆڕێدایە. باسەکە مۆنۆپۆل بکەین ـ بێ گومان ناشمانهەوێ ئاوا بکەین ـ وا باشترە پرسیار بکەین ئەو چەند سەرەتایەی وەکو یەک شیاوی بوون بە نوختەی دەسپێکن بۆ قسەکردن لەسەر شیعری سوارە کامانەن؟ فۆرمی شیعرەکانی یان ڕاڤەیان؟ سەمبولیزمی شیعری سوارە یان ڕۆمانتیزمی؟ چۆنیەتی تێپەڕاندن لە ئەزموونی گۆران یان چۆنیەتی پێوەندی لەگەڵ شیعری فارسی؟ لەوانەیە ئەو سەرەتایانە هەموویان بۆ مەبەستی ئێمە لەبار بن، بەلام من لەم وتارەمدا، بەدوای دەستەمۆکردنی دەسپێکێکی ترم. ئەو دەسپێکە «شار»ە، شار وەکو چەمک و وەکو مۆتێڤ. چەمک و مۆتیڤی شار لە نێو شیعری سوارەدا چ ڕۆڵێکی لە ئەستۆدایە، وەکو پاژێک چۆن لە گشتایەتی شیعری سوارەدا جێی پێ دەدرێ و بە چ شێوەیەک سات و سەودای لەگەڵدا دەکرێ؟

(٢)

مۆتیڤی شار یەکێک لە مۆتێڤە سەرەکییەکانی شیعری سوارە و لە ڕاستیدا سوارە یەکەم شاعیر و (تا ئێستا تاقە شاعیرێکە کە) لە چوارچێوەی ئەدەبی کوردیدا، چەمکی شاری کردبێتە مۆتیڤی شیعرەکانی. سەرنج بدەنە دووپاتبوونەوەی ئەم وشەیە لەم بەندانەی خوارەوەدا:

**تۆ دەشتی ئەوپەڕ نادیاری**
**بۆ چۆڵەری لە پێکەوتوو**
**تاپۆی شاری**

**کچی نوور قەتیسی دەسی دێوی کێوە**
**لە ئەنگوستەچاوی دڵی خێوی کێوا**
**بەرەو دەر، بەرەو شاری دەریا بەڕێوە**

**وەهایە**
**کە کانی بەهیوا**
**بەهارانە لووزەو ئەبەستێ بەرەو شاری دەریا**

**ئەڵێی دەنگی شمشاڵە ڕەشماڵی دۆڵی دڕیوە**
**شەماڵی دەرەی دوورە شاری**

**زمستان بەپێی بارن هەرمسی تانی**
**شەوەزەنگی تەنی**
**هەرچی هەیە بەرز و نەوی**
**شار و دەری لێم گرتە بەس**

**ئێوە کێن؟ خێڵی درۆ**
**گەلی دەم پڕ لە هەرا**
**نیشتەجێی شاری بەگرمە و دووکەڵ**

* * *

دەبێ شیعری «شار»یش بە نموونەکانی سەرەوە زیاد بکەین کە ئەم مۆتیڤە پازدە جار تێیدا دووپات دەبێتەوە.

لە قەسیدەی خەوەبەردینەدا،لەبەر ئەوەی «شار» وەکو (مشبە بە)ی «دەریا» کەلکی لێ وەرگیراوە، بە شێوەیەکی سروشتی هەموو ئەو وەسفانەی بۆ دەریا کراون، پێوەندییان بەشاریشەوە دەبێ، لە خەوە بەردینەدا، دەریا بەم شێوەیەی خوارەوە وێنا کراوە:

**هەتا چاو هەتەر کا، شەپۆلە شەپۆلە**
**لە بوونا لە چوونا**
**بە ئاهەنگی سەربەندی بزوێنی خۆشی**
**لەبەر خۆرەتاوا ئەڵێی سینگی ژینە ئەهاژێ**
**ئەڵێی هانی هەستانە دەنگی خرۆشی**

لەم قەسیدەیەدا، «شار» و «دەریا» دوو مۆتیڤی لێک جیانەکراوەن. ئەگەر بە حوکمی مانای سەمبۆلیکی ئەم قەسیدەیە بمانهەوێ لە گوزارەی «کانی بڕوای بەرینی بەدەریا گەیشتنی لە دڵدایە»، چەمکێکی تر جێنشینی چەمکی «کانی» بکەین (بۆ نموونە مرۆڤی خەباتکار) ئەودەم دەبێ چ چەمکێک جێنشینی «دەریا» بکەین؟ بێ گومان یەکێک لەم چەمکە ڕێ تێچووانە چەمکی شارە. کە واتە ئەوە شارە کە دەنگی خرۆشی وەکو هانی هەستان وایە و دەڵێی سینگی ژین ئەهاژێ و گەیشتن بەم شارە بڕوای بەرینی زۆر لە تاکەکانو کۆمەڵگاکانە. بەم شێوەیە چەمکی شار لە چەمکی بەربڵاوتری مۆدێرنیتە گرێ دەدرێ، چونکە هەر لە جێدا بیچم گرتنی سووژەی مۆدێرن و هەروەها هەموو گۆڕانکارییەکانی ئەم سووژەیە، لە شوێنێکی (تێکەڵاوی واقیعی و مەجازی) بەناوی «شار»دا ڕوو دەدەن، بەڵام لە دووهەمین شیعری بەناوبانگی سوارە دوای شیعری «خەوە بەردینە»، واتە لە

شیعری «شار»دا، ڕوانگەیەکی تەواو جیاواز لەم ڕوانگەیە بۆ چەمکی «شار» ڕەچاو کراوە. لەم شیعرەدا شار و هارە هاڕی ئەو، گیانی منی شیعری وەڕەز دەکەن. لەم شارەدا کە ڕەمزی ئاسن و منارەیە (یان ڕەمزەکەی ئاسن و منارەیە) مەلی ئەوین نامۆیە و لە هەر شەقام و کوچەیەکییەوە شەپۆڕ و شین بەرز دەبێتەوە. لەم شارەدا شێر زەلیلە و ڕێوی باویەتی و...

ئەوە جێگای سەرنجە کە لە هەردوو شیعری «خەوە بەردینە» و «شار»دا کە بەناوبانگترین شیعرەکانی شاعیرن، چەمکی شار بە شێوەیەکی بەرچاو، بەرجەستە دەبێتەوەو لە هەردووکیاندا، دەورێکی سەرەکی دەگێڕێ و جگە لەمە، لە چەند ڕوانگەی جیاوازیشەوە بۆی دەڕوانرێ. هەر لێرەوە بە شێوەیەکی مەنتیقی بەم ئامانجە دەگەین کە چەمکی «شار» لە شیعری سوارەدا، لە ئاستی مۆتیڤیش بەرزتر دەبێتەوە و دەبێ بە پرس و بە پرۆبلێمی نێو شیعری سوارە. کەواتە من گوتەیەکی پێشتری نێو ئەم وتارە کە باسی مۆتیڤی شاری لە شیعری سوارەدا دەکرد، بە شێوەیەکی تێروتەسەلتر دووبارە دادەڕێژمەوە و دەڵێم سوارە یەکەم شاعیر و تا ئێستا تاقە شاعیرێکە کە لە چوارچێوەی ئەدەبی کوردیدا، چەمکی شاری کردبێتە پرۆبلێمی شیعرەکان و من پێم وایە هەر لە سۆنگەی ئەو بە پرۆبلێماتیک کردنەی چەمکی شارە کە شاعیر توانیویەتی حەقی ئەم چەمکە بدا. چونکە مانای شار بەم کۆێێوەندییانە کە لەگەڵ چەمکەکانی مۆدێرنیتەوە و سووژەی مۆدێرندا هەیەتی، لە زاتی خۆیدا چەمکێکی تێکچنراو و کۆمپلێکسە و ڕوانگەیەکی تاک ڕەهەند ناتوانێ حەقی ئەم چەمکە بدا. هەڵسەنگاندنێکی ساکار و سەرپێیی مۆتیڤی «شار» لەگەڵ چەند مۆتیڤی تری شیعری سوارە، واتە چەمکەکانی «تاپۆ/ تراوکە «پەنجەرە»، «داری چاکی» و «ئەسپ/ کەحێل/ جانوو»، ڕاستی بۆچوونی سەرەوەمان پێ دەسەلمێنێ.

هەندێک لەم مۆتیڤانە، لە شیعری سوارەدا، دەورێکی نەگۆڕی ناسراویان هەیە و لە هەموو ئەو شیعرانەی دەوریان تێدا دەگێڕن، کەسایەتییەکی زۆر و کەم پێناسە بۆکراویان هەیە. لەمانە دەکرێ ئاماژە بە مۆتیڤەکانی «ئەسپ/کەحێل/ جانوو»،تاپۆ/تراوکە» و هەروەها مۆتیڤی «پەنجەرە» بکەین.

مۆتیڤی ئەسپ، لەگەڵ چەمکی سەربەستی و لەگەڵ کەسایەتیی سەربەستیخواز، پێوەندییەکی ئەپساوەی هەیە و بەم شێوەیە شوێنێکی دیاریکراوی لە نێو شیعری سوارەدا هەیە.

**کوا شەنگە سوار**
**کە درەوشانەوەی پەڕی سەری ئەسپی**
**چاوێک بخاتە بیری تلووعێ**

**دڵ وەک دوو تەپلەی**
**سوارەی کوردی**
**جوانووی نەگیراو**
**مەیل ئەخاتە باڵ**

تەنانەت ئەو کاتەش کە دەڵێ (وەها گەی لەشی بەو گە بەردینە گاوی دراوە/ کەحیلێکە کورژن و حیلەی نەماوە) کۆنتراست و دژوەستانێکی بەرچاو لە نێوان دۆخی ئایدیاڵ و چاوەڕوانکراوی نەوەستان و سەربەستی لە لایەک و دۆخی نەخوازراوی دامان و بێ دەربەستی لە لایەکی تر، ساز دەدرێ. مۆتیڤی «تاپۆ/تراوکە»ش ئەگەرچی وەکو وێنە، کارکردەکەی سازکردنی تەم ومژێکی ئەوتۆیە کە ناهێڵێ دیاردەکان بە شێوەیەکی بەرچاو خۆیان بنوێنن، بەڵام هەر ئەو وێنە و ئەو کارکردە، وەکو وێنە و ڕۆڵێکی پێناسە بۆکراو، بۆ ئەو مۆتیڤە چەسپاون.

**ئەڵێی پێکەنینی کچی سەرگوزشتەی قەدیمی**
**لە ئەندامی تاپۆی وەکو بوومەلێڵی**
**- سنووری شەوی دوێنێ، ئەورۆ بەیانی -**
**پەچەی قورسی نیسیانی ئینسانی لادا.**
**تۆ تراوکەی جارێ دیار گاهێ نادیاری**
**هیوای تینوێتی ڕێبواری**

بەڵام لە پرۆسەی وەگەڕخستنی مۆتیڤەکاندا، لەم دۆخە ئامارە پێکراوە - کە تێیدا مۆتیڤەکان، بە شێوەیەکی نەگۆڕ دەبن بە خاوەنی ڕۆڵێکی دەستنیشانکراو. حەرەکەتێکی بەرچاو بۆ لای شێوە بەکارهێنانێکی تێکچنراوتر و کۆمپلێکستر وەبەرچاو دەکەوێ. مۆتیڤی (داری چاکی) خاوەنی ئەم شێوە ڕۆڵە فرە لایەنەیە.

لە هەندێک شوێندا «داری چاکی بێ نەشە و شنە» سەمبولی پەککەوتەیی و لە کار وەستانە. لە هەندێک شوێنی تردا وەک «بە هەر بۆمبای سووتێنەرێک پێشمەرگەیەک/ داری چاکێک دائەقرچێ» داری چاکی، سەرەڕای بەتاقکەوتنی، دیاردەیەکی هەڵکەوتەیە و بە شێوەیەکی ئیجابی بۆی دەڕوانرێ. هەر لەم کاتەشدا چییەتی «داری چاکی» بۆی هەیە بۆ ماهییەتی «شۆڕەبی» - و بەپێچەوانەشەوە - بگۆڕدرێ و ئەم دوو مۆتیڤە لە بووتیقای شیعری سوارەدا، دەبن بە دیاردەیەک بە دوو سیمای جیاوازدوە. لە هەندێک شوێندا، شۆڕەبی جێگەو پێگەی خۆی لەگەڵ لایەنی سەلبی داری چاک دەگۆڕێتەوە (شۆڕەبی کە بۆتە داری چاکی بێ نەشە و شنە/ زەلکە گەر تەیاری تیر و قۆشەنە/ خۆشەویستەکەم لە پەنجەرەی نیوەتاکی

بوومەلێڵەوە/ چاوی من لە دیمەنی کچی بەیانییە)، بەڵام ئەگەر داری چاکی بە ودمی هەناسەیەکی پیرۆزەوە ببووژێتەوە، تەنانەت ئەگەر لە نێو شۆرەکاتێکیشدا بەتاق کەوتبێ، نەخشی بووژێنەرەوە دەگێڕێ.

**تۆ شۆڕەبی ناو شۆڕەکاتێکی گەرمی**

**لەبەر نیگای تاسەباری ئەویندارا**

**خۆداپۆشیو بە لک وپۆی گەزیەی نەرمی**

کاتێک لە مۆتێڤی وەک ئەسپ و تاپۆوە دەست پێ بکەین و بە ئاراستەی تێکچنراویدا بگەینە «داری چاکی/ شۆڕەبی»، بۆمان هەیە ئەم ڕێڕەوە کۆمپلێکسە بەرەو پێشتریش ببڕین. لە نێو سەرجەمی شیعری سوارەدا، مۆتێڤی شار لەوپەڕی تێکچنراویی خۆیدا، لە لووتکەی بەپرۆبلێماتیک کردندا ڕاوەستاوە. لە جیهانی شیعری سوارەدا ئەم چەمکە لە سێ گۆشەنیگای جیاوازەوە بۆی ڕوانراوە. ئەم ڕوانگانە بریتین لە:

ـ ئ) گۆشەنیگای ئیجابی: (تۆ دەشتی ئەوپەڕ نادیاری/ بۆ چۆڵ بڕی لە پێ کەوتوو/ تاپۆی شاری) و (کچی نووری قەتیسی دەسی دێوی کێوە/ لە ئەنگوستەچاوی دڵی خێوی کێوا/ بەرەو دەر، بەرەو شاری دەریا بەڕێوە).

ـ ب) گۆشەنیگای سەلبی: (وەڕەز بوو گیانی من لە شار و هاڕە هاڕی ئەو/ لە ڕۆژی چڵکنی نەخۆش و تاو و یاوی شەو/ ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت/ لە شاری چاو لەبەر چرای نیئۆن شەوارەکەت) و (ئێوە کێن؟ خێڵی درۆ/ گەلی دەم پڕ لە هەرا/ نیشتەجێی شاری بەگرمە و دووکەڵ).

ـ پ) گۆشەنیگای بێ لایەن: (ئەڵێی دەنگی شمشاڵە ڕەشماڵی دۆڵی دڕیوە/ شەماڵی دەرەی دوورە شاری) و (زمستان بەپێی بارن هەرەسی تانی/ شەوەزەنگی تەنی/ هەرچی هەیە بەرز و نەوی/ شار و دەری لێم گرتە بەس).

هەر لەبەر ئەو تێکچنراوبوونەی چەمکی شار لە شیعری سوارەدایە کە نیسبەتدانی ڕوانگەیەکی تاک ڕەهەندانە بۆ ئەم چەمکە، وەلای دەقی ئەم شیعرانە هەوڵێکی تەژی لە پەلەپرووزێ و ناواقیع بینانەیە.

**(٣)**

ئەو ناواقیع بینییە، جگە لە پشتگوێ خستنی ڕوانینی تێکچنراوی سووژەی شیعری یان منی شیعری بۆ چەمکی شار لە خوێندنەوەی شیعری سوارەدا، لە ئاراستەیەکی گشتی دیکەشەوە سەرچاوە دەگرێ، کە ئەم ئاراستە لەنگ و لۆرە تا ئێستا کاریگەرێتییەکی سەلبی

لەسەر خوێندنەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی داناوە. ئەم ئاراستەیە بریتییە لە بەرتەسک کردنەوەی ڕەخنەی ئەدەبی بارتەقای شیکاری نێوەڕۆکی ڕووت. ئەو کاتەی دەقی ئەدەبی بە شێوەیەکی تاک ڕەهەندانە هەر بەتەنیا وەکو مەخزەنێکی مانایی چاوی لێ دەکرێ و «چی گوتن» دەبێتە تاقە پرسیارێک کە ئاراستەی دەق دەکرێ و «چۆن گوتن» بە ئاشکرا هەڵدەپەسێردرێ و ناڕەوشتمەندانە بن گۆم و بێ شوێن دەکرێ، ئەو کات «دانەر»ی دەقی ئەدەبیش، ئیتر نەک وەکو نووسەر، بگرە وەکو نووسیارێک چاوی لێ دەکرێ و کە کەڵکەڵەی نەک زمان و قووڵاییەکانی بگرە هەندێک بابەت لە دەرەوەی زمانە، وەکو بابەتەکانی کۆمەڵناسانە یا سیاسی یا فەلسەفی و... هتد.

هەر لەسەر ئەم بنەمایە کە بۆ نموونە لە خوێندنەوەی مێژووی شیعری کوردیدا، شیعری حاجی قادری کۆیی وەکو نوختەگۆڕانێکی بەرچاو قسەی لەسەر کراوە. ئەوە لە حاڵێکدایە کە ئەگەر وەکو ئافراندنێکی هونەری چاو لە شیعر بکەین، دەبینین شیعری حاجی لە شیعری شاعیرانی وەکو نالی و کوردی و سالم تێی نەپەڕاندووە و بگرە لە باری هونەرییەوە لە ئاستی شیعری ئەم شاعیرانە ژێراترە. هۆی دەربڕین و وەرگێڕانی ئەم بۆچوونە ناڕاستە، هەر ئەو ئاراستەیە کە داکۆکیی سەرەکی لەسەر شیکاری نێوەڕۆکی ڕووتە و شیعر نەک وەکو ئافراندنێکی هونەری زمانی، بگرە وەکو وتارێکی کۆمەڵناسانە یان سیاسی لە بەرچاو دەگرێ. حاشا لەوە ناکرێ کە شیعری حاجی لە باری نێوەڕۆکەوە، شیعری کوردی بەرەو ئاراستەیەکی نەتەوەخوازانە برد. من پێم وایە ئەگەر بڵێین بیری حاجی نوختە گۆڕانێکی لە مێژووی بیری مرۆڤی هزرڤانی کورد پێک هێنا، بۆچوونێکی ڕاست و واقیع بینانەمان ڕەچاو کردووە، بەڵام پێم وانییە، شیعری حاجی لە باری هونەرییەوە وەرچەرخانێکی لە شیعری کوردیدا پێک هێنابێ.

هەر ئەو ڕوانینە ناڕەوشتمەندانەیە کە شیعری حاجی زیاتر لەوەی هەیە سەرخستووە، هەوڵی ژێرخستنی شیعری سوارەی داوە. هەڵبەت هاوبەشییەکە لە بەپێوانەکردنی بیری نەتەوەخوازیدا نییە، بگرە لە بەکێشانەکردنی شیکاری نێوەڕۆکی ڕووتدایە. هەندێک لە ڕەخنەگران کاتێک ڕوانیویانەتە شیعری سوارە ـ هەڵبەت ڕوانینەکەشیان هەر بەتەنێ شیعری «شار»ی گرتووەتەوە ـ سوارەیان وەکو کۆمەڵناسێک لە بەرچاو گرتووە کە خەریکە بۆچوونی کۆمەڵناسانەی خۆی فۆرمووڵە دەکا. ڕاستە سوارە لە نووسینی شیعرەکانیدا کەڵکەڵەی فیکری جۆراوجۆری هەبووە و لە نووسراوەکانی سوارە لە «تاپۆ و بوومەلێڵ»دا دەردەکەوێ کە ئەو بڕوای بە ئەدەبی دەروەست هەبووە، بەڵام لە بیرمان نەچێ سوارە لە پلەی یەکەمدا شاعیر بووە و هەر نەبێ ئەوەندەی کەڵکەڵەی نێوەڕۆکی هەبووە، کەڵکەڵەی فۆرمیشی هەبووە. ئەو

له شیعرەکانیدا ویستوویەتی قالبی تازە و دارشتنی نوێ و سیستەمی جیاوازی رۆنانی وێنەو ڕێکخستنی پەیڤ بە تاقی بکاتەوە.

ئەم باسانە لەوانەیە بەرەو ڕووی پرسیارێکی مێتۆدۆلۆژیکمان بکەنەوە: لێکدانەوەی نێوەڕۆکی دەقی ئەدەبی چ جێگە و پێگەیەکی لە ڕەخنەی ئەدەبیدا هەیە و هەتا چ ئاستێک دەتوانێ پەل باوێژێ؟ من پێم وایە لێکدانەوەی نێوەڕۆکی دەق بە دوو مەرج دەتوانێ جێگە و پێگەیەکی شیاو لە ڕەخنەیەکی ڕێکوپێک و بەرنامە بۆ دارێژراودا بدۆزێتەوە. ئەم مەرجانە بریتین لە:

- لە ڕەوتی لێکدانەوەی دەقدا بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە کە «ئەم دەقە لە بارەی چیدایە» ئەو خاڵە دەبێ لە بەرچاو بگرین کە ئەگەر وەڵامی ئەم پرسیارە بەڵگەنەویست بێ، ئێمە لە کایەی ڕاڤەدا خیچاوین و کایەکەمان داناوە.

- ڕاڤەی هێرمینۆتیکی دەبێ ببێتە بنەمایەک بۆ تەتڵەکردنی بووتیقایی (لە تەتڵەکردنی بووتیقاییدا،ڕەخنەگر مانایەک یان کارکردێکی دەق وەکو مانا و کارکردێکی فیکس لە بەرچاو دەگرێ و ئەو پرسیارە دێنێتە گۆڕێ کە چ تەمهیدگەلێکی فۆرمیک بوونەتە هۆی وەدیهاتنی دەق وەکو مانا و کارکردانە و دواجار هەوڵی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەدا.)

مەرجی یەکەم لەسەر بناغەی بۆچوونێکی جاناتان کالێر دامەزراوە. کالێر بۆ ڕوونکردنەوەی بۆچوونەکەی نموونەیەک دێنێتەوە. ئەو دەڵێ: ئەگەر لە وەڵامی پرسیاری «دەقی هاملێت لە بارەی چیدایە؟» بڵێین «دەقی هاملێت لە بارەی شازادەیەکی دانیمارکیدایە» لێکدانەوەکەمان نەگەیشتووەتە ئاستی ڕاڤەیەکی سەرکەوتوو، بەڵام ئەگەر بۆ نموونە بڵێین دەقی هاملێت لە بارەی ترسی پیاوان لە هەوەسی جینسیی ژناندایە توانیومانە پێشەکییەک بۆ ڕاڤەی ئەم دەقە دابڕێژین[٤]. من هەر لەسەر بنەمای بۆچوونەکەی کالێر لە ڕوانگەیەکی تازەوە چاو لەو بابەتە دەکەم و دەڵێم وەڵامی پرسیاری «ئەم دەقە لە بارەی چیدایە». نابێ لە قاڵبی گوزارەیەکی شیکراو (تەحلیلی - analytic)دا بدرێتەوە. (گوزارەی شیکراو، گوزارەیەکە کە بکرێ مانای مەحموولەکەی لە مانای مەوزووعەکەیەوە دەربکەوێ، وەکو «پیاوی سەڵت بێ ژنە» یان «پیاوی سەڵت، سەڵتە.»)

بۆ نموونە کاتێک ڕۆمانی «باڵندەکانی دەم با»ی عەتای نەهایی دەخوێنینەوە، هەموومان دەتوانین زۆر ساکار بە جارێک خوێندنەوەی ئەم ڕۆمانە، لەسەر ئەمە ڕێک کەوین کە ئەم ڕۆمانە باسی دوو کەسایەتیی سەرەکی دەکا کە دوای دۆڕاندنی تەمەنیان پەی بە تراویلکەبوونی ئاواتەکانیان دەبەن و تووشی خەمۆکی دەبن، بەڵام لەو ڕستەیەدا کە ئێمە لە وەڵامی پرسیاری «ئەم ڕۆمانە لە بارەی چیدایە؟» دروستی دەکەین، ئەم کورتە شەرحەی

سەرەوە لە حوکمی مەوزووعی ڕستەکەماندایە و ئەگەر ئێمە هەر بەوەندە شەرحەوە بوەستین (یان بکریّ هەمـوو لێکدانەوەکانمان لەو ڕستەیەدا کورت بکرێتەوە) لە ڕاستیدا هیچ ڕاڤەیەکمان لەو ڕۆمانە بەدەستەوە نەداوە. لەبەر ئەوەی وەڵامی ئێمە بەم شێوەیە بووە:

«ئەو دەقە کە لەمەڕ دۆڕانی ژیانی دوو کەسایەتی لە پێناوی ئاواتێکی تراویلکەییە،لە باردی بەئاوات نەگەیشتن و تێداچوونی تەمەنی ئەو دوو کەسە دایە.»

دەبینین لەم ڕستەیەی سەرەوەدا، مانای مەحموولەکە، لە ڕاستیدا هەر بریتییە لە مانای مەوزووعەکە. لە بەرامبەر ئەم وەڵامەدا دەتوانین وەڵامێکی دیکە بەشێوەیەکی تر ڕێک بخەین:

«ئەو دەقە لەمەڕ دۆڕانی ژیانی دوو کەسایەتی لە پێناوی ئاواتێکی تراویلکەییە، لە بارەی سەردەمێک دەدویّ کە لەم سەردەمەدا، پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی و شارستانیی ئەوتۆ زاڵە کە هەرەس بە ئایدۆلۆژییەکان و ڕیوایەتە هەراوەکان دێنیّ.»

ئەم دەربڕینە تا ئاستی ڕاڤەیەکی سەرکەوتوو بەرز دەبێتەوە. بەڵام هەر ئەو کاتەی بەو سەرکەوتووییە گەیشتین، دەبێ بەگوێرەی مەرجی دووهەم. ئەم سەرکەوتووییە بکەین بەپێشەکی هەڵێنانەوەی هەنگاوێکی دیکە و ڕاڤەکەمان بکەین بە بنەمای تەتڵەکردنێکی بووتیقایی.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ باسی شیعری سوارە و بمانهەویّ وەدیهاتن یان وەدی نەهاتنی ئەو دوو مەرجانە لە شەرحی شیعرەکانی کە لە لایەن هەندێک ڕەخنەگرەوە کراوە. بەتاقی بکەینەوە، دەبینین هیچ کام لەم مەرجانە لەو لێکدانەوانەدا ڕەچاو نەکراون.

شیعری «شار» بەپێی دیارترین چینی مانایی خۆی باسی سووژەیەک دەکا کە دەیهەویّ شار بەجێ بێڵێ و بچێ بۆ دێ. لەبەر ئەوەی ڕۆژەکانی شار، چڵکن و نەخۆشن و شەوەکانیش تاو و یاوین، بەڵام بناری پڕ بەهاری دێ، ڕەنگی سوور و شین لە شیعر و عاتیفەی گەشی دەدا. ئەو سووژەیە پەروەردەکراوی ژێر دەواری عەشیرەتە. هەر لێکدانەوەیەکی وا ئەو مەبەستانەی سەرەوە کە لە دیارترین چینی ماناییی دەقدا خۆیان دەنوێنن، دووپات کاتەوە. ناتوانێ بگا بە ئاستی ڕاڤەیەکی شیاو.

هەندێک لەو لێکدانەوانەی لە بارەی ئەم شیعرەدا کراون. کەم و زۆری دەکرێ لە قالبی گوزارەیەکی شیکراودا بەرهەم بێنەوە بۆ نموونە:

«ئەو سووژەیەی لەبەر چڵکن بوونی شار دەیهەویّ شار بەجێ بێڵێ و بچێتەوە نێو ژیانی پاقژی دێ، لە شار تووڕەیە و پەروەردەکراوی ژێردەواری عەشیرەتە». هەر ئەو کاتەی لە زمانی سووژەی گۆرینەوە باسی چڵکن بوونی شار دەکەین دەتوانین پەی بە تووڕەیی ئەم

سووژەیەش ببەین. ئەوە لەحاڵێکدایە کە مەرجی دووهەمی ڕاڤەش وەدی نەهاتووە و ئەو لێکدانەوانە بۆ هیچ چەشنە تەتڵەکردنێکی بووتیقایی کەلکیان لێ وەرنەگیراوە.

هەر لەسەر ئەو بنەمایە کە لێکدانەوەی مەرجداری نێوەڕۆکی دەقی ئەدەبی دەتوانێ بۆ ڕەخنەکارییەکی یەکانگیر و ڕەوشتمەند ڕێگا خۆشکەر بێ. هەوڵ دەدەین لەم بەشەی وتارەکەماندا، ڕاڤەیەک لە شیعری شار بخەینە ڕوو و هەر لەم ڕێگەوە ڕوانینێکی دروست لە پرس و پرۆبلێمی «شار» لە شیعری سوارەدا دەستەبەر بکەین، هەتا بتوانین لە بەشەکانی تری ئەم وتارە، بپەرژێینە سەر هەندێک لایەنی بووتیقایی شیعری سوارە.

من ئەو ڕاڤەیە بە هێنانە بەر باسی دوو خاڵ کە بە بڕوای خۆم دەتوانن لەم بارەوەدا بەکەلک بن. پەروەردە دەکەم.

ئەلف ـ ئەو تێڕوانین و تێفکرینەی سووژەی ناسکاری نێو شیعری شار ڕەچاوی دەکا ـ و واش نییە کە ئەم سووژە ناسکارە، ناچارەکی خودی سوارە بێ ـ بەشێکە لە چنراوەی (بافت) ئەو تێڕوانین و تێفکرینانەی وەختی خۆی باو بووە. لەو سەردەمیدا، شۆڕشی چەپی مائۆ لە ولاتی چین ببووە هۆی ئەوەی ڕووناکبیرانی چەپ، لەو پارادایمە مارکسیتییەی لە ناویاندا باو بوو بکەونە گومان و دڕدۆنگی و هەوڵی خوێندنەوەیەکی نوێ لە مارکسیزم بدەن. لەم خوێندنەوە نوێیەدا، دێ وەکو نوختە دەستپێکی شۆڕش دادەنرێ نەک شار. چونکە لە ولاتێکی وەک ئێران و بەتایبەتی لە کوردستاندا پرۆلیتاریایەک کە بەو ڕادەیە لە هێز گەیشتبێ بتوانێ ببێتە داینەمۆیەک بۆ وەدیهێنانی گۆڕانکاریی بەرچاوی کۆمەلایەتی و سیاسی، بوونی نییە و لە بەرامبەر ئەو پرۆلتاریا وەهمییەدا، ئەوە وەرزێرەکانی گوندین کە دەتوانن هێزێکی خۆڕێکخەر و بزوێنەر بن.

ئەم تێڕوانینە. بە چاوپۆشیکردن لە ڕادەی مەنتقی بوونی، کاتی خۆی کاریگەرییەتی لەسەر شیعری «نیما یووشیج»یش هەبووە و ناشێ سوارە ئاگاداری بۆچوونی ئەو ڕەخنەگرانە نەبێ کە باسی هەندێک ئاماژە لە شیعری «برف»ی نیما، بۆ شۆڕشی چین دەکەن. نیما لەو شیعرەدا، باسی شۆڕشی «سوور»ی ولاتی «زەرد»ی چین دەکا و ئێرانی شێواوی زەمانی ڕەزا شا لەگەڵ ولاتی چین کە خۆری شۆڕشی لێ هەلاتووە بەرئاورد دەکا. وشەی دیوار لەم شیعرەدا هێمایەکە بۆ دیواری چین.

**زردها بی خود قرمز نشده‌اند**
**قرمزی رنگ نیانداخته است**
**بی خودی بر دیوار**
**صبح پیدا شده آن طرف کوه «آزاکو» اما**

«وازنا» پیدا نیست
گرتەی روشنی مردەی برفی همه کارش آشوب
بر سر شیشەی هر پنجره بگرفته قرار
وازنا پیدا نیست
من دلم سخت گرفته است از این
میهمانخانەی مهمان کش روزش تاریک
که به جان هم نشناخته انداخته است
چند تن خواب آلود
چند تن ناهموار
چند تن ناهشیار

هەر لێرەدا دەبینین وشەی «سوور» لە مەنزوومەی شیعرەکانی سوارەدا، وەکو سەمبول، خزمایەتی لەگەڵ وشەی «قرمز»ی شیعری نیمادا هەیە. ئەو کاتەی دەڵێ:

ئێوە
حاشارگری ڕووبەندی وشە
بووکی بن تارای سوور

یەکێک لە دەلالەتە ڕێتێچووەکانی ئەم شیعرە دەتوانێ ئەوە بێ کە «خەڵک ڕەنگی سوور دەکـا بە ئاڵا و هەڵی دەدا، ئێـوە کـردووتانە بە تارا و بە سـەری خـۆتان داداوە بۆ خۆدزینەوە»[(٥)].

زۆر بەڵگەی ئەوتۆ بەدەستەوەیە کە نیشـان دەدەن سـوارە وێڕای باڵی ڕادیکاڵی بزووتنەوەی کوردستـان لەو سەردەمیدا، ئەو خوێندنەوە نوێیەی لە تێفکرینی چەپ، قبووڵ کردبوو.

لەسەر بنەمای ئەم ڕاڤەیە، بەم ڕاستییە دەگەین کە جارِ ڕاهێلانی سووژەی ناسکاریی شیعری، لە شیعری شاردا بۆ ڕووکردن لە دێ، دوا جار گەڕانەوە بۆ شاری بەدواوەیە، بەڵام ئەو شارە کە سووژە بۆی دەگەڕێتەوە، ئیتر هەر ئەو شارە چڵکن و نەخۆشە نییە کە لە شیعری گۆڕیندا لە ڕوانگەیەکی سەلبییەوە بۆی ڕوانراوە. بگرە ئەو شارەیە لە شیعری خەوە بەردینەدا بە شێوەیەکی ئیجابی چاوی لێ کراوە. کەواتە بۆ شیکاری مانایی شیعری سوارە، شیعرەکانی «شار» و «خەوەبەردینە». دەبێ وەکو ئاواڵ دووانە چاویان لێ بکرێ. سووژەی ناسکاریی شیـعری لە «شـار»دا بەرەو دێ ڕێگە دەگرێتە بەر و لە «خـەوەبەردینە»دا بە ڕێکخستنی تەکووز و لەسەر بنەمای هەندێک بۆچوونی ئامانیدا دیسان دەگەڕێتەوە بۆ شار.

ئەو بۆچوونە تەتەڵەکردنێکی شیاومان لە بارەی تێکچنراوبوونی مۆتیڤی شار لە شیعری سوارەدا بۆ دەستەبەر دەکا.

ب ـ «چۆلفگانگ فۆن گۆتە» لە بەرهەمی خۆی دا. (فاوست) دەبێتە گێڕەرەوەی گۆڕانکارییەکانی سووژەی مۆدێرن لە کاتی دابڕانیەوە لە سوننەت هەتا گەیشتنی بە سووژەیەکی بەتوانای گەشە پێدەر. گۆتە باسی گۆڕانکارییەکانی سووژەی مۆدێرن لە سێ قۆناغ یان لە سێ سەفەردا دەکا[٦]. ئەوە پێوەندی بە باسی ئێمەوە هەیە. هەر بەتەنیا قۆناخی یەکەمی گۆڕانکارییەکانی سووژەی مۆدێرنە. لەم قۆناخەدا سووژە لەسەر بناغەی هەندێک خەون و خەیاڵی تازەوە ئاسۆی ڕوانینەکانی زۆر هەراوتر دەکا. ئەو خەون و خەیاڵانە دەبن بە پێشەکی ئاڵوگۆڕێکی زۆر بەربڵاو لە ڕەوتی بەرەوپێش چوونی سووژەی مۆدێرندا و هەرچی نێوەڕۆکیان دەوڵەمەندتر بێ. سووژە لە ڕۆیشتنی بەرەو مۆدێرنیتە بە هەشتاو و تاودانێکی پترەوە ڕێگای نوێبوونەوە دەگرێتەوە، بەڵام بەرەوڕووبوونەوەی ئەم سووژە خەون دیتووە لەگەڵ واقیعی دەوروپشتی دوو دژکردەوەی جیاوازی تێدا بەدی دێنێ:

ـ دژوازیی جیهانی نێو خەونەکانی سووژەی مۆدێرن لەگەڵ جیهانی ڕاوەستاو و داوەستاوی دەوروپشتی لە قاڵبی هەندێک دەنگ هەڵبڕین و شۆڕش و یاخیبووندا وەدیار دەکەوێ. سووژەی مۆدێرن ئیتر ئەو هاوسەنگییەی کە پێشتر لەگەڵ جیهانی دەوروبەری خۆی هەیبوو لە کیس داوە و ناتوانێ وەکو پێشوو ئارام و ڕەزامەندانە تەعامولی لەگەڵدا بکا.

ـ ئەو هەستە شۆڕشگێڕانەیە هەر ئاوا خالیس و ڕووت بیچم ناگرێ و هەر بەتەنیا ڕووی لە داهاتوو نییە. بگرە بە ئاگایانە یان نابەئاگایانە لەگەڵ هەستێکی نۆستالژیکیش ئاوێتە دەبێ. «ڕابردوویەکی جوانی لە دەست چوو، دەبێتە بابەتی خەون بینین و شەپۆلی سۆزی لە کیسدراو و ئەوین و ئاوات و دلۆڤانییەکان، لە زەیندا وەگەڕ دەکەون و لەم ڕێگەیەوە سووژە، خۆی بە کانگای وزەی ئەتۆ دەبەستێتەوە کە دەتوانن بیبووژێننەوە... کاتێک فاوست تووشی ئەم حاڵەتە دەبێ، هەڕەتی منداڵی دێتەوە بیر. ئەو پێودانە، هەمان پرۆژەی ڕۆمانتیکی ڕزگاری ڕۆحی و دەروونییە کە لە پرۆسەی مێژوویی مۆدێرنیزاسیۆن و لە پانتاییی شارسازیی مۆدێرندا ساڵانی زۆر دوای نووسراوەکەی گۆتە، لە سەرەتادا بە ڕوانینێکی نۆستالژیک بۆ ڕابردوو و دوایەش بە ڕوانینێکی ژیان بەخش بۆ چنراوە کۆنەکان وەدی هات[٧].»

حەز دەکەم سەرنج بدەنە ڕستەی دوایین پەیڤی سەرەوە و لەگەڵ دوو ئاراستەی جیاواز لە شیعرەکانی شار و خەوە بەردینە، بەراوردی بکەن. سووژەی شیعری «شار» هەردوو ئاراستەی سەرەوەی گرتووەتە بەر. یاخیبوون و مل ڕانەکێشان بە دژی نۆرمەکانی «شاری مەوجوود» لە لایەک و هەستێکی نۆستالژیکیش بۆ گەڕانەوەی فاوست بەرەو هەڕەتی منداڵی ـ کە لەم

شیعرەدا لە قالبی گەڕانەوە بۆ دێ خۆیا دەبێ ـ هەردووکیان وەک یەک لە «شار»ی سوارەدا وەبەر چاو دەکەون.

من پێم وایە ئەگەر ئەو سووژەیە، بە شێوەیەکی بەئاگایانە ڕوانینە مەیلە و مائۆئیستییەکە ڕەچاو دەکا، ئەمجارە بە شێوەیەکی نابەئاگایانە وەبەر شەپۆلی ئەو ڕەوت و گۆڕانکارییانە دەکەوێ کە هەموو سووژە مۆدێرنەکان کەم و زۆر دەگرێتەوە و گۆتە لە قالبی گێڕانەوەی سەربووردەی فاوستدا، تاوتوێیان دەکا.

ئەم دوو خاڵە ئاماژە پێکراوە،لەم شوێنەدا یەک دەگرنەوە کە لە هەردووکیاندا سووژەی شیعری دەیهەوێ لەسەر بنەمای پرۆژەیەکی ڕزگاری کە هاوکات خاوەنی لایەنی شۆڕشگێڕانەو لایەنی ڕۆمانتیکە، بگەڕێتەوە بۆ دێ و بەمەشەوە نەوێستێ و جارێکی دیکە بە پرۆژەیەکی تازەوە ڕوو لە شار بکاتەوە، بەڵام ئەم شارە، هەمان شاری مەوجوود نییە، بگرە شاری مۆدێرنە کە سووژە لە خەونەکانیدا دیویەتی. بڕوانە ئەم ڕۆیشتن و گەڕانەوە یە لەم دوو پاژەی خوارەوەدا:

**ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت**<br>
**گوڵم هەرێمی زۆنگ و زەل**<br>
**چلۆن دەبێتە جارە گوڵ**<br>
**وەهایە**<br>
**کە کانی بەهیوا**<br>
**بەهارانە لووزەو ئەبەستێ بەرەو شاری دەریا**

لە کۆتایی ئەم شیکارییە مانابیەدا کە تێیدا باسێکیشمان لە پێوەندیی شیعری سوارە لەگەڵ شیعرێکی نیمادا کرد، لەسەر بنەمای لێکۆڵینەوەی زیاتر لەسەر ئەو پێوەندییە نێوان دەقییانە و هەر لە چوارچێوەی ئەو مەنتقە ناوەڕۆکییەدا کە لەو بەشەی وتاردکەماندا ڕەچاومان کردووە، هەوڵی دەسنیشانکردنی هەندێک لە پێوەندییەکانی تری شیعری سوارە لەگەڵ شیعری شاعیرانی دیکە دەدەین.

تا ئێستا، لەسەر بنەمای پێوەندییەکانی نێوان دەقی، تەنانەت لە تاقە لێکۆڵینەوەیەکیشدا، هەوڵی دەسنیشانکردنی هەندێک لەو پێوەندییانەی شێعری شار لەگەڵ تێکستە ناسراوەکانی بەر لە شیعری سوارە لە نێو ئەدەبی گەلانی هاوسێدا نەدراوە. لە حاڵێکدا یەکێک لە بەرچاوترین وێنەکانی شیعری شار ـ کە تەعبیر لە دژوەستانی نێوان تیشکی دەسکردی چرای نیئۆن و تیشکی سروشتیی مانگەشەو دەکا، لە چامەیەکی بەناوبانگی سۆهراب سپێهری واتە لە چامەی «خشپەی پێی ئاو»ەوە وەرگیراوە سۆهراب

دوای ئەوەی باسی داڕووشان و خەوشداربوونی سەفای سروشت بەهۆی سەرهەڵدانی هەندەسی دیاردەکانی نێو شار دەکا، دوای باسکردنی شەڕەکان و هێرشەکان و دەستبەسەر داگرتنەکان، دەگاتە باسی قەتڵەکان و لەم باسەشدا دوای:

**قتل یک جغجغه روی تشک بعدازظهر**

**قتل یک قصه سر کوچه‌ی خواب**

**قتل یک غصه‌به دستور سرود**

دەگاتە ئەم وێنە باسکراوەی ئێمە:

**قتل مهتاب به فرمان نئون**

شاعیری شیعری شار ئەم وێنەیەی داڕشتۆتەوە و گۆڕانکاری بەسەردا هێناوە:

**دەڵێم بڕۆم لە شارەکەت**

**لە شاری چاو لەبەر چرای نێئۆن شەوارەکەت**

**بڕەمە دێ کە مانگەشەو بڕێتە ناو بزەم**

**چلۆن بژیم لە شارەکەت**

**کە پڕ بەدڵ دژی گزەم**

بەڵام سەرکەوتوویی بەرچاوی شیعری سوارە لەوەدایە کە لەو کەڵک وەرگرتنەی لە ئەدەبی گەلانی تر، وێنەکانی زۆر ساویلکانە وەرنەگێڕاوەتە سەر زمان و شیعری کوردی، بگرە بە دووبارە داڕشتنێکی هونەرییەوە لە نێو ئەزموونی تایبەتیی خۆیدا قاڵبی کردوونەتەوە. حەز دەکەم ئەم سەرکەوتوویییەی سوارە لەگەڵ ئەو وەرگێڕانە وشە بە وشەیەی شیعری فارسی هەڵسەنگێنم کە هەندێک شاعیری کورد، سی ساڵ دوای سوارە ئەم وەرگێڕانانە، بە ناوی تەجرەبەی شاعیرانەی خۆیان بڵاو دەکەنەوە. هەروەها ئەو چەشنە سەرکەوتوویییانە بە سانایی ئەو بۆچوونە ڕەت دەکەنەوە کە دەڵێ سوارە هەر بەتەنیا کەڵکی لە شیعری نیما وەرگرتووە و کاریگەرێتی شەپۆلە تازەکانی شیعری فارسی زەمانی خۆی بە شێوەکانییەوە دیار نییە و ئەو شەپۆلانەی نەناسیوە.

هەر لە سۆنگەی ئەم سەرکەوتوویییەوەیە کاتێک دەنگی سۆهراب دەبیستین کە دەڵێ:

**شهر پیدا بود:**

**رویش هندسی سیمان، آهن، سنگ**

**سقف بی کفتر صدها اتوبوس**

**گل فروشی گلهایش را می کرد حراج**

هەست بەوە دەکەین بەر لە خولّقانی شیعری شار لەم شیعرەشدا لە بەرامبەر هەندێک دیاردەی ژیانی شارنشینی، دەنگ هەڵبڕدراوە و هەروەها هەست بەوە دەکەین ئەم شیعرە لە باری نێوەرۆکەوە لە هەندێک بارەوە لەگەڵ «شار»ی سوارەدا هاوبەشی هەیە، دۆزینەوەی ئەو هاوبەشییانە، بە هیچ کلۆجێک بەم ئاکامەمان ناگەیەنێ کە «شار» لەبەر هەڵگرتنەوەیەکی سووک و چرووک و بێ تاو لەم وێنانەیە، بگرە بەپێچەوانە بەم ئاکامە دەگەین کە ئەزموونی سوارە کەلک وەرگرتنی لە هەندێک سەرچاوەی جیاواز ـ کە چامەی «خشپەی پێی ئاو» بەتەنێ یەکێک لەو سەرچاوانەیە ـ ئەزموونێکی تایبەت بە خۆیەتی و مۆرکی دیاری پەیڤی سوارەی پێوەیە و ناسینەوەی وێنە وێکچووەکان و تەعبیرە هاوبەشەکانی لەگەڵ هی شاعیرانی تر،ئێجگار دژوارە:

**لە شارەکەت کە رەمزی ئاسن و منارەیە**
**مەلی ئەوین غەوارەیە**
**ئەڵێی لە دەوری دەست و پێم**
**ئەوەی کە تێل و تان و رایەڵە، کەلەبچەیە**
**ئەوەی کە پەیکەرە میسالی داوەڵە**
**ئەوەی کە دارتێلە، مەزهەری قەنارەیە**
**لە شارەکەت کەمەندی دووکەڵە**
**کە دێتە دەر لە ماڵی دەوڵەمەند**
**وە تیشکی بێ گوناهی خۆر ئەخاتە بەند**

* * *

**(٤)**

بڕیار وابوو خوێندنەوەی تێماتیکی شیعری سوارە بکەین بە بنەما و بیانووی شیکاریی بووتیقایی ئەم شیعرانە. ئەگەر ئەم ڕاڤەیە کە لە بەشی پێشووی ئەم وتارەدا خستمانە ڕوو، ڕاست بێ دەتوانین بەم ئەنجامە مەنتیقییە بگەین کە لە شیعری سوارەدا بەگشتی ڕوانینی سووژەی شیعری بۆ بابەتەکان و دیاردەکان ڕوانینێکی تێکچنراو و کۆمپلێکسە، هەندێک چاو هەتا ئەو ڕادەیە دەچێتە پێش کە هەر وەکو پێشتر باسمان کرد بەشێک لەو بابەتە بەرباسانە، بە شێوەی پرس و پرۆبلێم بەرهەم دێنێتەوە. پرسیار لێرەدایە کە ئایا ئەم بە پرسکردنە هەر بەتەنێ لە ئاستی نێوەرۆکی شیعردا ماوەتەوە یان لە ئاستی فۆرمیک و پێکهاتەیی شیعرەکانیشدا پرۆسەی بە پرۆبلێماتیک کردن لە گۆڕێدا هەبووە. بە دەربڕینێکی

دیکە ئایا هەر ئێمە بەتەنیا لە ئاستی نێوەرۆکی شیعری سوارەدا لەگەڵ تێکچنراوی بەرەو ڕووین یان لە ئاستی فۆڕمیکیشدا تووشی کۆمپلێکس دەبینەوە؟

بە سووکە سەرنجێک بۆمان دەردەکەوێ کە هاوڕێژەیی (تناسب) و پێکەوە گونجانێکی زۆر لە نێوان فۆڕم و نێوەرۆکی شیعری سوارەدا بەدی دەکرێ. هەروەک چۆن لە خوێندنەوەی یەکەمی سەرجەمی شیعرەکانی سوارەدا لەوانەیە تێکچنراویی نێوەرۆکیی شیعرەکانی سەرنجمان بۆ لای خۆی ڕاکێشێ، هەر ئاواش دەکرێ تێکچنراویی فۆڕمیی و پێکهاتەییشیان هەر لەم خوێندنەوەیەدا، لە لایەن خوێنەرەوە پشتڕاست بکرێ. نێوەڕۆکی کۆمپلێکسی شیعری سوارە لە چوارچێوەی فۆڕمێکی کۆمپلێکسدا بپێچم دەکرێ.

سیستمی تێکچنراوی ڕۆنانی پەیڤ و خوڵقاندنی ئیماژ لە لایەن سوارەوە، هەر لە یەکەم بەندی چامەی خەوە بەردینەدا وەدیار دەکەوێ. لەم بەندە سەرەتاییەدا، تێکچنراوکردنی فۆڕم لە دوو لایەنەوە کاری بۆ کراوە. لە پلەی یەکەمدا بۆ وێناکردنی ناوێک کە بە تاسە و تامەزرۆییەوە دەیهەوێ ڕکەی بەردین بەجێ بێڵێ و بە دەریا بگا، چوار وێنەی جیاواز لە پاڵ یەک دانراون و بە شێوەیەکی «عرضی» وێنە تێکچنراوەکەی دواییان پێکهێناوە:

**لە چەشنی گەرووی کەو**
**کەوی دۆمی بەخسیری زیندانی داری**
**پڕی سەوزە بەستەی خرۆشانی باری**
**تەرەی باوەشی تاسەباری بناری**

*** * ***

**شەپۆلی لە گوێن خوێنی شەرمی کچانە**
**لە سەر ڕوومەتی بووکی ڕەزا سووک**
**بەتینی بتاوێنی ڕوانینی زاوا**
**گەرمتر لە پرشنگی تاوی بەهاری**

*** * ***

**وەکو نەرمە هەنگاوی لاوی بەرەو ژوان**
**لە جێژوانی زیندوو بەگیانی کچی جوان**

*** * ***

**وەکو گەرمە یاوی قەشەی دەستی تاراو**
**لە بزوێنی دەریای بلووریی بەروێ**
**لەگەڵ گاشەبەردا سەر ئەسوێ، سەر ئەسوێ**

*** * ***

«ئەم ئاوە وەک گەرووی کەوەکە، وەک شەپۆلی خوێنەکە، وەک نەرمە هەنگاوی لاوەکە و وەک دەستە تاراوەکە، خۆ بە دیواری ئەو کێوەدا دەدا کە تێیدا یەخسیرە[8]، بەڵام ڕەوتی ئەم تێکچنینە، هەر بە لەپاڵیەک دانانی وێنە عەرزییەکان کۆتاییان پێ نایە، بگرە لە پلەی دووهەمدا هەندێک لە وێنەکان، جیا لەوانی تر بە شێوەکی «طولی» و بە سازکردنی وێنەی بەنێویەکداچوو، بەرەو تێکچنراویی زیاتر دەڕۆن. بۆ نموونە لەو جێگایەدا کە تامەزرۆیی ئاو بۆ گەیشتنی بە دەریا بە تامەزرۆیی دەستی تاراو لە سنگ و بەرۆکی خۆشەویستێک شوبهێنراوە، تامەزرۆیی دەستی تاراویش جارێکی دیکە بە تاسەی ماسییەکی لە ئاو دەرهاوێژراو شوبهێنراوە. بەم شێوەیە لە دوو تەشبیهی بەنێویەکداچوودا، سێ ماکەی جیاوازی: ئاوی دوورکەوتە لە دەریا، دەستی تاراو لە بەرۆک و ماسی دەرهاوێژراو لە ئاو لەسەر بنەمای مەنتقی شیعری، پێوەندییەکی گونجاویان لە نێواندا ساز کراوە.

لە چەشنی ئەم وێنە بەنێویەکداچوونە، نموونەی تریش، هەر لەم چامەیەدا دەدۆزرێنەوە. بڕواننە ئەم بڕگەیە:

**هەتا جۆگە ئاوێ بە وشکی دەبینم**
**ئەڵێی مێرگی ڕوخساری کیژێکی کاڵ و مناڵە**
**بە کووزی تەمەن جارە جوانێکی پڕ خەوش و خاڵە**
**تەشەنداوە جەرگی برینم**

لەم بڕگەیەدا، جۆگە ئاو شوبهێنراوە بە ڕوخساری کیژێکی کاڵ و مناڵ و ڕوخساری کیژەکەش شوبهێنراوە بە مێرگێک. «چۆن مێرگ دێنی... جووتی بەنێودا دەکەی و کووزی بەسەردا دێنی و دەیرووشێنی، ڕوخساری ئەم کیژە کاڵ و مناڵەش ئێستاکە بۆتە «ڕوخساری» ژنێکی پیر (کە) بە کووزی تەمەن، شوێن شوێن کراوە»[9].

هەر ئەم تێک تەنران و بەنێویەکداچوونی پەیڤ و وشەی وێنەیەیە کە لە ساکارترین شێوەی خۆیدا بە چەشنی «تتابع اضافات» بەرهەم دێتەوە:

**منێ کە گۆچی تاوی گەرمی بەردەوارەکەی عەشیرەتم** (٥ ئیزافە بە دوای یەکدا)
**بە دارتەرمی کووچە تەنگەکانی شارەکەت** (٣ ئیزافە بەدوای یەکدا)
**ڕانەهاتووە لەشم**

* * *

**بەو دەمەت کە بۆنی سەد بەهاری لێوە دێ**
**بۆنی دەشتی بەختیاری باوەشی چیای بە دەشتی با**
**بە گوڵ چناوی لێوە دێ** (٧ ئیزافە بەدوای یەکدا ـ لەگەڵ دێڕی پێشوودا)

**بۆنی سەر سەکۆی بە کاگڵی بە ئاو پژاوی لێوە دەی** (٣ ئیزافە بە دوای یەکدا)

**پێم مەڵێ کە داکەوم**

جگە لە تەنەوەپێدانی وێنە بە دوو ئاراستەی جیاوازدا، هەر لە بنەڕەتدا سیستمی وێنەسازی لە بووتیقای شیعری سوارەدا، سیستمێکی جیاواز لەو شێوە وێنەسازییانەیە بەر لە شیعری سوارە تەجرەبە کراون.

دەزانین لە ئەدەبدا وشەکان «بە شت دەکرێن». لە دۆزەخێکی ئارامدا، وشەی نێو دەقێکی ئەدەبی، نەک وەکو نیشانەی شتێکی تر، بگرە وەکو شت یان چشتێکی (عین) سەربەخۆ چاوی لێ دەکرێ. ئەم گوتەیە بەم مانایەیە لە نێو دەقی ئەدەبیدا، وەک دیاردەیەک دەور دەگێڕێ کە بەر لەوەی پێویست بێ فام بکرێ، گەرەکە بە گشتیترین مانای هەست پێکردنەوە ـ هەستی پێ بکرێ. بیرۆکەی بە چشت بوون یان کریستاڵیزەبوونی وشەی نێو دەقی ئەدەبی، دەکرێ تەنەوەی پێ بدرێ و دەقی ئەدەبی لە گشتایەتی خۆیدا، وەکو شتێک کە دەکرێ ڕاستەوخۆ بەبێ نێوبنج هەستی پێ بکرێ، لە بەرچاو بگیرێ. بەم شێوەیە نووسەر دەتوانێ بە ستراتیژییەکی تازەوە، وێنەیەکی تەواو زەینی لە دیاردەیەک ساز بکا کە ئەم وێنە زەینییە بتوانێ هەمان ئەو شوێندانانە وەدی بێنێ کە ڕووداوە واقیعییەکان لەسەر زەینی دادەنێن. لێرەدا دەڵێین ئەم وێنەیە بە شت کراوە.

بەر لەوەی قسە لەم شێوە تازەیەی وێنەسازی بکەین، با چەند نموونەیەک لە شێوەی کۆنی وێنەسازی بێنینەوە. پێکەوە هەردوو بڕگە شیعری خوارەوە دەخوێنینەوە:

هێمن:

**وەنەوشەی جوانی خۆش بۆ**
**هاتە دەر لە لێوی جۆ**
**دار دەری کردووە چرۆ**
**کەرۆیشکەی کرد گەنم و جۆ**

گۆران:

**قژکاڵی لێوئاڵی، پرشنگی نیگا کاڵ**
**ئەی کچە جوانەکەی سەرگۆنا نەختێ ئاڵ**

لەم دوو شیعرەدا دوو وێنەی جیاواز خوڵقاون، بەڵام لە هەردووکیاندا کەڵک لە شێوەیەکی هاوبەشی وێنەسازی وەرگیراوە. لەم شیعرانەدا، ڕاستە کە دوو چشتی کریستالیزە کراوە زمانیان لە بەردەستدایە، ئەمما لەوانەیە هەمان ئەو شوێندانانەی خوێندنەوەی ئەم وێنە

شیعرییانه لە سەر زەینمان دەبێ بە بینینی دوو دیمەنی واقعییش وەدی بێن، بەڵام ئەو وێنەیەی خوارەوە دەخوێنینەوە، پەی بەم ڕاستییە دەبەین کە گەرچی ئەم وێنەیە تا ڕادەیەکی زۆر زەینییە و ئێمە لەسەر بناغەی تێگەیشتنی هاوبەشمان (Common sense) ناتوانین لە جیهانی واقیعدا تووشی وێنەیەکی ئاوا بین، بەڵام ئەو وێنە شیعرییە زەینییە هەر ئەو شوێندانانە لەسەر زەینمان بەجێ دێڵی کە دیمەنێکی واقیعی دەیبێ.

**گەڵێ گۆلە لەو چۆمە پەخسیری خاکن**
**بە ڕوویا گەڵا وەک چەمۆڵەی کلۆڵی وەریون**
**گەمارۆی زەلی نێزە، وا تەنگی پێ هەڵچنیون**
**کە بێ دەرفەتی پێکەنینێ بە سەد بەرزگی زەردەماسی**

لەم شیعرەدا، دیمەنی ئەو زەردە ماسییانەمان پێشان دەدرێ کە لە بن ئاوی گۆلێک دا، خۆیان وەردەگێڕن و ئەگەر ڕوون بێ، بەم کارەیان بەرزگی سپییان وەدیار دەکەوێ. ( لە زمانی کوردیدا بەم خۆوەرگێڕانەی ماسی دەڵێن سپیاو کردن[١٠]) شاعیر ئەو بەرزگە سپییانە بە ددانی مرۆڤێک دادەنێ کە لە کاتی پێکەنیندا وەدیار دەکەون و دەیهەوێ بڵێ ئەم گۆلانە کە گەڵای وەریویان وەک چەمۆڵە لێنراوە دەرفەتی پێکەنینیان لێ سەندراوەتەوە. بە ئاشکرا دەبینین کە لێرەدا سیستمی وێنەسازی، سیستمێکی جیاوازە. لێرەدا، وێنەیەکی ناواقیعی، ڕێک وەک دیمەنێکی واقعی ئۆبژەکتیڤ کراوە و قەبارەی پێ دراوە. نموونەی ئەم چەشنە قەبارە و بارستانە بە دیاردەیەکی زەینی، لەم وێنەیەی خوارەوەشدا بەدی دەکرێ:

**کوا شەنگە سوار**
**کە درەوشانەوەی پەڕی سەری ئەسپی**
**چاوێک بخاتە بیری تلووعێ**

هەر لەسەر بنەمای ئەم ڕوونکردنەوەیە، دەتوانین پەی بە چۆنیەتی تێپەڕاندنی شاعیر لە شێوەی ڕۆنانی پەیڤ بەر لە خۆی ببەین کاتێک سوارە دەڵێ:

**لە پەنجەرەی نەوەتاکی بوومەلێڵەوە**
**چاوی من لە دیمەنی کچی بەیانییە**
**لە حەنجەرەی زەمانەوە**
**گوێم لە زەمزەمەی زوڵاڵی خیزە وردەکانی کانییە**

زۆر ڕێگای تێدەچێ بۆ وەسفی خیزە وردەکانی کانی، کەلکی لەم شیعرەی گۆران وەرگرتبێ:

کـانیـیـەکی روونی بەر تریفـەی مـانگەشـەو
لە بـنـیـــا بلـەرزێ مـــرواری زیخ و چەو
جــــوانتـــرە لە لای من لە دەریای بێ سنوور
شــەپۆلی باتە تیـشکی رۆژ شـلـپ و هوور

ئەوە لە حالێکدایە دیمەنی خیزی وردی بن کانییەکی بەر تریفەی مانگەشەو، لە شیعری گۆراندا، هەر لە ئاستی وێنەیەکی رۆمانتیکیی ساکاردا دەمێنێتەوە. کەچی سوارە ئەم وێنەیەی وەکو مادەیەکی خاو، بۆ دروستکردنی وێنەیەکی تێکچنراوتر بەکار هێناوە. ئەم وێنە تێکچنراوە، بە پاڵدانی دەنگی «زەمـزەمـەیەکی زولاڵ» وەلای ئەم خـیـزە وردانە کـە «لە حەنجەرەی زەمان»ەوە دەگاتە گوێی منێکی شیعری،کە ئەو منە شیعرییەش لە «پەنجەرەی بوومەلێڵەوە» دەروانێتە «دیمەنی کچی بەیان»، بیچم دەگرێ.

هەر تێکچنراوبوونی فۆرمی ئەو شیعرانەیە کە شیعری سوارەی ـ تا کاتی خۆی ـ کردووە بە شاریترین شیعری کوردی. لە پێکهاتەخوازی ڕسکانەییدا (ساختارگرایی تکوینی genetic structuralism) باسی ئەوە دەکـرێ کـە لە پرۆسـەی پێکهـاتنی دەقـدا، فـۆرمـاسـیـۆنی کۆمەلایەتی پێوەندی لەگەڵ داڕشت و پێکهاتەی دەقی بەرهەمهاتوو لەو کۆمەڵگایەدا دەبێ. ئەگـەر ئەو گـریمانەیە قـبـووڵ بکەین کـە «شـار» وەک چەمـک و وەک چشت، بابەتێکی تێکچنراوە،دواجار دەتوانین هاوشێوەی ئەم تێکچنراوییە، هەم لە نێوەرۆک و هەم لە فۆرمی شیـعری سوارەدا بدۆزینەوە. – هەروەک چۆن ئەگـەر لێکتـرازان و لەبەریەک هەڵوەشانەوەی پێوەندییەکان لەو کۆمەڵگایەی «وێرانە خاک»ی «ت.س ئەلیۆتی» تێدا بەرهەم هاتووە قبووڵ بکەین، هاوشێوەی ئەم لێکترازانە لە فۆرم و پێکهاتەی ئەو قەسیدەیەشدا بە جوانی بەدی دەکرێ. ـ

من پێم وایە چەواشەترین ئاراستە کە لەم بارەیەدا دەکرێ بە نیسبەتی شیعری سوارە ڕەچاو بکرێ ئەوەیە کە هەر بە بەڵگە هێنانەوە لە موفرەداتی شیعری سوارە و لەسەر بنەمای لێکدانەوەیەکی مانایی پەتی، بمانهەوێ بە دوای ڕوونکردنەوەی سروشتی ئەو شیعرانەدا بین. ڕاستە لە گەڕان بەدوای ئەم موفرەداتەدا، زۆر جار لەگەڵ مۆتیڤی ئەتۆ بەرەو ڕوو دەبینەوە کە باری ڕۆمانتیک یان ناتووراڵیستیان هەیە، بەڵام لەم بارەوە نابێ دوو خاڵمان لە بیر بچێ:

ـ ڕۆمانتیزمی شیعری سوارە گونجاو لەگەڵ سەمبولیزمەکەیەتی و سەمبولیزمەکەش گونجاو لەگەڵ ڕۆمانتیزمەکەیەتی. هەر ئەم تێکەڵاوبوونەیە کە سروشتێکی تایبەتی داوە بە شیعرەکانی سوارە.

ـ ئاراستـەی ڕێشـاندەتر ئەوەیە کـە بۆ دۆزینەوەی سروشـتی شـیـعـری سـوارە نەک لە موفـرەداتی شـیـعـرەکـان، بگرە لە پلەی یەکـەمـدا لە سـینتـاکس و هەروەها لە پێکهـاتەی

شیعرەکان ورد ببینەوە و لە دووهەمدا،ڕادەی هەراوبوونی جیهانی ئەو مانایانەی شیعر دەیانخولقێنێ بکەینە پێوانەی ڕادەربڕینمان.

ئەگەر ئەو ئاڕاستە ناڕاستەی باسی لێوەکرا ڕەچاو بکەین، دەبێ بڵێین لە زەمانی نیمادا، شیعری نیما نموونەی گوندیترین شیعری کاتی خۆی بووە. چونکە موفرەداتی شیعری نیما زۆربەیان دەلالەت دەکەن بۆ ژیانی نێو سروشتێکی دەست لێ نەدراوی دوورە شار، بڕوانن لەم نموونە شیعرەی خوارەوەی نیمادا، چۆن سینتاکس کۆمپلێکسی شیعرەکە، موفرەداتی گوندیی هەندێک جار ڕۆمانتیک و هەندێک جار ناتۆرالیستی شیعرەکەیان لە ڕایەڵەیەکی تۆکمەی ئەوتۆدا ڕێک خستووە کە وات لێ دەکەن هەست بکەی ئەم سیستمی پەیڤە، نەک لە زەینێکی ساکارەوە بگرە بەپێچەوانە لە زەینێکی سیستماتێکی تێکچنراوەوە، سەرچاوەی گرتووە:

**ترا من چشم در راهم شباهنگام**
**که می گیرند در شاخ «تلاجن» سایەها رنگ سیاهی**
**وزان دلخستگانت راست اندوهی فراهم،**
**ترا من چشم در راهم**
**شباهنگام، در آن دم که برجا دره ها چون مرده ماران خفتگانند:**
**در آن نوبت که بندد دست نیلوفر به پای سرو کوهی دام**
**گرم یاد آوری یا نه، من از یادت نمی کاهم**
**ترا من چشم در راهم**

هەر بەم شێوەیە، تەنیا بۆ ساتێکیش ناتوانین بیر لەوە بکەینەوە کە ئەو سیستمە داڕشتەی لەو بڕگەیەی خوارەوەی شیعری سوارەدا بەدی دەکرێ لە سیستمێکی تێکچنراوی بەرهەمهێنانی پەیڤ کە تایبەت بە زەینییەتێکی کۆمپلێکسە بەرهەم نەهاتبێ:

**هەتا بیری تاڵی گڕاوێ**
**بە دڵما گەڕاوە**
**هەتا یاد ئەکەم ئاوە بەو ورمە بەردینە کاری کراوە**
**ئەڵێم سەد مەخابن**
**وەجاخێ کە رووگەی هەزاران نزای شینە باهۆی بەتاسەن**
**وە بزۆینەوەی هەست و هان و هەناسەن**
**چلۆنە کە بیژووی گڕاوان ئەبینن**
**لە نێو چاوی ئەو خانەدانە**
**لە هی چۆنە پیتی بڕاوە**

## (٥)

قسەکردن لە بابەتی تێکچنراوی یان ساکاریی فۆڕمی شیعر، دەرفەتێکی لەبارە بۆ هەڵسەنگاندنێکی شیکارانەی شیعری سوارە لەگەڵ شیعری گۆران. لەوانەیە یەکەمین جیاوازی و دژوەستان کە لە خوێندنەوەیەکی بەراوردکارانەی سەرپێیی بەرهەمی هەردوو شاعیری سەرەوە سەرنجمان بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ، ساکاربوونی چنراوی شیعری گۆران لە بەرامبەر تێکچنراوی شیعری سوارەدا بێ، ئەم ساکاربوونە وای کردووە دەرەتانی ئەوە هەبێ شیعری نوێی گۆران ـ جگە لە چەند نموونەیەکی دەگمەن ـ لە لایەن زەینی خوێنەرێکی نائاشنا بە شیعریش بە سانایی هەڵتاوێندرێ.

کوڕ:

**بڕوانە شـــایـیـــیـــە چۆیـیـــیـــە لەو مـــاڵە**
**گـــوێ بگرە زوڕنایە دەهۆڵە شـــمـــشـــاڵە**
**زەرد و ســـوور تێکەڵ بوون، ژن و پیـــاو هەرایە**
**لەو ناوە هەر هاڕەی هەیاســـــەی تۆ نایە**

کچ:

**گـــوڵ نەبێ بۆ ســـەرم، ئاڵ چەپکێ زەرد چەپکێ**
**نایەم بۆ زەمـــاوەند نایەم بۆ هەڵپـــەرکێ**

لە بیرمان نەچێ کە ساکاری یان تێکچنراوی نابێ وەکو فاکتەرێک لە لای فاکتەرەکانی دیکە چاویان لێ بکرێ. لە ڕاستیدا ساکاری یان تێکچنراوی لە ئەنجامی تەرکیبی چەندین فاکتەری ورد و هەراوی فۆڕمی و مانایی، بیچم دەگرێ. بە دەربڕینێکی تر، دەق بەر لەوەی لەسەر ساکاربوون یان تێکچنراو بوون ساغ بێتەوە لەسەر هەندێک فاکتەری دیکە ساغ دەبێتەوە کە کۆی ئەم فاکتەرانە دەبنە هۆی ساکاربوون یان تێکچنراوی دەق.

خاڵی شیاوی سەرنج لەمەڕ شیعری گۆران ئەوەیە کە لە شیعرە کلاسیک و عەرووزییەکانیدا ـ لە چاو شیعرە نوێیەکانی ـ تێکچنراوییەکی قووڵتر و بەرفراوانتر بەدی دەکرێ. لە ڕاستیدا هەڵگەڕانەوەی گۆران لە ڕێساکانی شیعری عەرووزی، هەڵگەڕانەوە لە فۆڕمی گران ڕۆیشتنی بەرەو جۆرە پەیڤێکی ساکاریش بوو. هەر بۆیە تێکچنراوترین و فۆڕمیکترین شیعری گۆران، کاتێک دەنووسێ کە شاعیر دیسان سیلەچاوێکی کردووەتەوە ڕێساکانی شیعری عەرووزی. بە بڕوای من «جیلوەی شانۆ» تێکچنراوترین و پێکهاتەمەندترین شیعری نوێی گۆرانە:

**لە جەرگی پەردەوە تک تک دڵۆپی عوود ئەڕژا**
**بە نووکی تەئسیری**
**تەرەب ئەهاتە خرۆش تالعی سروور ئەپژا**
**بە ئاهی دڵگیری**
**کەمان ـ شەهیق و زەفیری فرشتەیی ئەلحان ـ**
**ئەکەوتە ناو دڵی مردوویش هەناسەی هەیەجان**

دەزانین ئەم یەکەم پلەبوونە لە بارەی پێکهاتەمەندییەوە لە شیعری سوارەدا، بە باڵای «خەوە بەردینە» دەبڕێ. هەر لەسەر ئەو بڕوایەم کلیلی سەرکەوتوویی بۆ پێکەوە هەڵسەنگاندنی شیعری گۆران و شیعری سوارە، بەراوردی نێوان ئەو دوو شیعرانەیە. خاڵی شیاوی سەرنج ئەوەیە کە خودی سوارە لە شیعری «خەوە بەردینە»دا ئاماژەیەکی زۆر زیرەکانەمان بۆ ئەو بەراوردکارییە دەداتێ.

**ئەڵێی پێکەنینی کچی سەرگوزشتەی قەدیی**
**لە ئەندامی تاپۆی وەکوو بوومەلێڵی**
**ـ سنووری شەوی دوێنێ ئەوڕۆ بەیانی ـ**
**پەچەی قورسی نیسیانی ئینسانی لادا**

سەرنج بدەنە تەعبیری نیسیانی لەم بڕگەیەدا. هەردوو وشەی نێو ئەم دەستەواژەیە بەجیا لە نێو شیعری «جیلوەی شانۆ»ی گۆراندا هەن و لەم شیعرەدا بوونەتە وشەی سەروا:

**مەتاعیی گوزەران**
**هێواش هێواش ئەتکێتە دەروونی نیسیانێک**
**کە رەمزی لەززەتە، میفتاحە بۆ تەلیسمی ژیان**
**ژیانی ئینسانێک**

جگە لەم چەمک خواستنە هەندەکییە، هیچ چەشنە وێکچوونێکی پێکهاتەیی و مانایی دیکە لە نێوان ئەم دوو شیعرەدا بوونی نییە. بە بەراوردکردنی ئەم دوو شیعرە، بە سانایی دەیسەلمێنین کە سوارە شیعری نوێی کوردی بەرەو جوغرافیایەکی دیکە و کەش وهەوایەکی دیکە گواستۆتەوە.

حەز دەکەم بۆ ساتێک بیر لە وەڵامی ئەم پرسیارە بکەنەوە کە درێژەی مەنتقی شیعری گۆران و شیعری سوارە، هەر کامەیان بەجیا بۆیان هەیە بەرەو چ ئاقارێک ڕێگە ببڕن؟

ڕەخنەگرانی ئێرانی پێیان وایە شیعری نیما وەکو ڕووبارێک وایە کە شاعیرانی دواتری لە هەر شوێنێکی ئەو ڕووبارە کە ویستوویانە، ئاویان هەڵگرتۆتەوە. مەبەستی ئەو

ڕەخنەگرانە ئەوەیە کە بۆ نموونە شیعری ساکاری شاعیرێکی وەکو فەرەیدوونی موشیری و شیعری تێکچنراوی شاعیرێکی وەکوو یەدوڵڵا ڕوئیایی هەردووک وەکو یەک، ڕیشەیان دەگەڕێتەوە سەر شیعری نیما. شیعری نیما دەرەتانی هەر دوو شێوە بەرهەمهێنانی شیعری هەیە.

داوەرییەکی لەم چەشنە لە بارەی شیعری گۆراندا وەڕاست ناگەڕێ. هەر لەم سۆنگەیەوەیە کە لە شیعری شاعیرانی نەوەی پاش گۆران، واتە لە شیعری شاعیرانێکی وەک کاکەی فەللاح و ع. ح.ب و کامەران موکریدا، دۆزینەوەی بە لێشاوی شیعری ساکار و سست و ناهونەری، کارێکی دژوار نییە. ئەو مەنتیقەی بنەمای نووسینی شیعرێکی وەک ئەم شیعرەی خوارەوەی کاکەی فەللاحی پێک هێناوە، مەنتقی باوی زۆر شیعری شاعیرانی دوای گۆرانە:

**خواپەرست بم، لە خوا زیاتر**
**خۆم خۆش ئەوێ**
**ئەگەر دنیاپەرستیش بم**
**زۆر زۆر لەم دنیایە زیاتر**
**خۆم خۆش ئەوێ**
**ئەوەندە من خۆم خۆش ئەوێ**
**لەبەر تۆیە، تۆم خۆش ئەوێ**

هیچ کام لە شاعیرانی دوای گۆران ـ لەگەڵ ئەوەی کە هەندێ جار جیاوازییەکی زۆر لە نێوانیاندا بەدی دەکرێ و بۆ نموونە شیعری ئەحمەد هەردی لە شیعری هاوالانی بەرچاوترە ـ لە گۆرانیان تێنەپەڕاندووە. من پێم وایە ئەم تێپەڕاندنە لە کوردستانی باشووردا، هەتا سەرهەڵدانی گەڕیانێکی ئەدەبیی وەک ڕوانگە یان سەرهەڵدانی شاعیرانێکی وەک ڕەفیق سابیر لە دەرەوەی جەغزی ڕوانگەدا، دوا دەکەوێ. بەشێک لە هۆیەکانی ئەم دواکەوتنە دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی شیعری گۆران.

ئەوە تێزێکی ناڕاستە بڵێین وەک چۆن شیعری نیما بە گوڕمێک، شیعری فارسی نوێ کردەوە. هەر ئاواش گۆران بە تەکانێک شیعری کوردی نوێ کردەوە، بەڵام تێزی ناڕاستتر ئەوەیە بڵێین شیعری گۆران لە نوێکردنەوەی شێعری کوردیدا دەورێکی کەمی هەبووە. من پێم وایە لە نێوان ئەم دوو بۆچوونە ناڕاستەدا، دەتوانین تێزێک ڕەچاو بکەین کە لەگەڵ واقیعی مێژووی ئەدەبی کوردیدا، زۆر باشتر ڕێک دەکەوێ: شیعری کوردی نەک بە گوڕمێک و لەسەر دەستی تاقە کەسێکدا،بگرە بە شێوەی پرۆسەیەکی بەر درێژتر وەکوو گەڕیانێکی مێژوویی نوێ بۆوە. یەکەمین گوڕم سەرکەوتووانە لە لایەن گۆرانەوە وەدی هات. لە شیعری

گۆراندا جگە لە تێکدانی ڕێساکانی وەزنی عەرووزی،لەگەڵ هەندێک تایبەتمەندیی وەک پێکهاتنی جوانیناسییەکی پاژبینانەی ماددی،لە بەرامبەر جوانیناسیی گشتبینانە و لاهووتیی شیعری کلاسیک و هەروەها پێکهاتنی کەش وهەوایەکی دراماتیکی زیندوو، لە زۆربەی شیعرەکاندا بەرەو ڕووین. ئەم گوژمە بەراییە تەکانێکی لە گوێن گوژمی شیعری سوارەی پێویست بوو هەتا پێکەوە، لانی خوارووی مەرجەکانی تازەکردنەوەی شیعری پێک بێنن.

نکۆڵی لەوە ناکرێ کە بە هۆی بارودۆخی تایبەتی و لێکدابڕانی بەشەکانی کوردستان، مێژووی ئەدەبی کوردی لە دەیەکانی ڕابردوو، لە کات و شوێنێکدا نووسراوەتەوە کە نووسەرەکانی ئاگاداری هەموو گەڕیانە ئەدەبییەکان نەبوون. حەق نییە کە توێژەران و ڕەخنەگرانی ئەمڕۆ، کە ئاسۆیەکی بەرفراوانتریان لەبەر چاوە و زانیاری زۆرتریان لەبەر دەستدایە، بە شێوەیەکی ڕەخنەگرانە ڕەوتی نووسەرانی مێژووی ئەدەبیی گەلەکەیان تاوتوێ نەکەن.

من پێم وایە لە نوێکردنەوەی شیعری کوردیدا، شیعری سوارە، گوژمی دووهەم بوو، گوژمێک کە قەرەبووی هەندێک لە کەم وکوورییەکانی شیعری گۆرانی کردەوە.

(٦)

سەمبولیزمی شیعری سوارە، سەمبولیزمێکی کۆمەلایەتییە. واتە مانای شاراوەی نێو شیعرەکانی، زۆر جار ئاراستەیان بەرەو بابەتگەلی کۆمەلایەتی و سیاسییە. هەر ئەم تایبەتمەندییە وای کردووە هەندێک جار شیعری سوارە لەجیاتی کەلک وەرگرتن لە سەمبۆلی فرەمانای ئەوتۆ کە بۆ مانایەکی دەسنیشانکراو دانابەزێندرێن، لەو چەشنە کۆدانە وەربگرێ کە بەپێی هەندێک گرێبەستی دیاریکراو، ماناکانیان ڕوون و ئاشکرایە. هەندێک جار شیعرەکان لەم دۆخەش دەترازێن و مەبەستەکان تێیاندا دەرووتێننەوە. ئەمە لایەنی بێ هێزی شیعری سوارەیە. ئەگەر بەم پێوانەیە بڕوانینە شیعری سوارە، لەگەڵ دوو جەمسەری دژ بەیەک بەرەو ڕوو دەبینەوە:

جەمسەرێک کە تێیدا سەمبولیزمێکی هونەریی فرەمانا وەبەرچاو دەکەوێ و لە نموونەی وەک «کوا شەنگە سوار/ کە درەوشانەوەی پەڕی سەری ئەسپی/ چاوێک بخاتە بیری تلوعێ» وەدیار دەکەوێ و جەمسەرێکیش کە تێیدا، ئاماژەکان ئاشکرا دەبن و «تاپۆ» لە کەش وهەوای کاتی «بوومەلێڵ» دەردەکەوێ زەق و زۆپ لە چاوتدا خۆی دەنوێنێ، وەک:

«بەلام ئەمڕۆ / کە هەر ساتێ دڵی دایکێ / لە کوردستان هەڵئەقرچێ/ بە هەر بۆمبای

سووتێنەرێک، پێشمەرگەیەک/ داری چاکێک دائەقرچێ/ نەتکوتبایە لایەکی بیرم لای تۆیە»

ئەم ململانێیە بە ئاشکرا لە شیعری سوارەدا وەدیار دەکەوێ. سوارە لە لایەکەوە خەریکی گواستنەوەی تازەترین تەجرەبەی هونەری و تەکنیکییەکان بۆ پانتایی شیعری کوردی دەبێ و بۆ نموونە لە شیعری «بانگەوازی پەنجەرە»دا، سەرکەوتووانە هاوشێوەی ئەو ئەزموونەی فرووغ فەرڕوخزاد بە کەلک وەرگرتن لە ڕاوێژ و زمانی ئاخافتنی ڕۆژانە تێیپەڕاند، بەتاقی دەکاتەوە. بە چەشنێک کە زمانی ئەم شیعرە لەگەڵ زمانی «خەوە بەردینە» تەعبیر لە دوو تەجرەبەی زمانیی سەرکەوتووی تەواو لێک جیاواز دەکەن:

**تەوژم و تین ئەگەڕا**
**ئەگەڕا نوتفەدانی پەنجەرەکان**
**وە مالی بێ زگ و زا**
**پڕ ئەبوو لە تۆوی بەهار**
**شنە هەمیشە وەکوو**
**وێردی زاری پەنجەرە**
**ئەبوو بە سەر بەندێ**
**لە قاپی سەوزی زەمەندا**
**دووپات ئەکراوە**
**منیش دڵم پشکووت**
**بەڵێنی دەعوەتی ڕەنگینی پەنجەرەی تاکی**
**بەرەو بەهاردا**

لە لایەکی دیکەشەوە کاتێک سوارە بۆ هەرێمی شیعری فارسی دەڕوانێ، دەبینێ تەنانەت «پێشمەرگە» وەکو مۆتیڤێک چۆتە نێو شیعری سیاسی فارسیشەوە. ئیتر لەم پێوەندانەدا، شاعیر نەیتوانیوە خۆی لە ختووکەی ڕووتاندنەوەی مەبەست ببوێرێ. شاعیرێک بە ناوی «میرزا آقا عسکری» دەڵێ:

**ای نبرد افزارت همه**
**مهربانی و انتظار**
**بنگر**
**از کوه به زیر می آورند پیشمرگه‌را**
**پیچیده در شولای بلند مرگ**
**نامش شهابی است سوزان**

هەر لەم سۆنگەیەوە دەبینین شیعرێکی وەک «کچی بەیان» کە خاوەنی دەسپێکێکی بەرزو هونەرییە، کاتێک دەگاتە ئەم دێڕانەی خوارەوە، لەباری هونەرییەوە ئیتر بەرەو لێژایی دەچێ:

**ئێمە نوێنەری خەباتی ڕۆژهەڵات**
**ڕۆژهەڵاتی سووری ئاگرین**
**فێر نەبووین بەزین و دابەزین**
**ڕانەهاتووە چاوی قارەمانی کورد**
**بە شەوغی گرین**

بەلام ئەوانە «ئەسکوند و چالی» شیعری سوارەن. تۆ ناتوانی ئەسکوندەکانی شیعری سوارە بناسی هەتا چاڵەکانیشی نەناسی. ئەزموونی شیعری سوارە بەگشتی، ئەزموونێکی سەرکەوتوو بوو. هەموو ئەو ئەزموونە سەرکەوتووانە، ئەزموونە سەرەتاییەکانی سوارە بوون. لەوانەیە بەرزترین شێعرەکانی سوارە، ئەو شێعرانە بووبن کە قەدەر نەیهێشت هەرگیز لە گەرووی پڕی سەوزە بەستەی، بەلووزەو بڕژێنە دەرێ و چاویان بە دنیای ڕوونی ئەدەب هەڵبێ.

* * *

* مانای هەندێک وشە و زاراوەی نێو ئەم وتارە:
گوژم: (تەکانی توند)
بژاردەبێژی: گزینگویە، قطعە نویسی
تێکچنراو: پیچیدە
تێکچنراوی: پیچیدگی
دژوەستان: تقابل
خیچان: سوختن در بازی
تەتڵەکردن: تبیین (explanation)
یەکانگیر: منسجم
ناچارەکی: ناگزیر
چنراوە: بافت
گوندی: (خەڵکی دێ)
ڕێتێچوو: محتمل

شیمانە: احتمال

گۆرین: مذکور

تەکووز: منظم

هەشتاو: شتاب

هەراو: ١ـ وسیع ٢ـ کلان

دەنگ هەڵبڕین: اعتراض

داوەستاو: (مەییو)

هاوسەنگی: تعادل

پێودان: ١ـ (ڕێ وشوێن) ٢ـ حالت

ئاراستە: ١ـ جهت ٢ـ جهت گیری

خۆیا بوون: ظهور کردن

لەبەرهەڵگرتنەوە: کپی (Copy)

هاوڕێژەیی: تناسب

هاوڕێژە: متناسب

بەنێویەکداچوو: متداخل

تەنەوە پێدان: بسط دادن

چشت: (تشت) ـ عین

ڕسکانە: ژێن (gene)

ڕسکانەیی: ژنتیک، تکوینی

هەڵتاواندن: هضم کردن

هەڵتاوێندران: هضم شدن

هەندەکی: جزئی

هەمەکی: کلی

گرێبەست: قرارداد

---

(١) - بابک احمد، ساختار و تاویل متن، نشر مرکز، تهران، ١٣٨٠، ص ٢١٣

(٢) - همان ، ص ٢١٣

(٤)- جاناتان کالر، نظریەی ادبی، ترجمه ی فرزانه طاهری، نشر مرکز، تەران، ١٣٨٢، ص٨٢

(٥) - ئەم لێکدانەوەیە هی سەلاحەددینی موهتەدییە. بڕوانە ئەم سەرچاوەیە:

- محەمەد بەهرەوەر، سوارە و پەخشانی کوردی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ٢٦٣

(٦) - بڕوانە ئەم سەرچاوانە:

- یوهان ولفگانگ فون گوته، فاوست، ترجمەی م.ا. بەآدین،انتشارات نیلوفر، تهران ١٣٨٢
- مرتضی هادی مقدم، شهر و مدرنیته، سازمان چاپ و انتشارات وزارت فرهنگ و ارشاد اسلامی، تهران، ١٣٧٩
- مارشال برمن، ترجمەی مدرنیته، ترجمەی مراد فرهادپور، انتشارات طرح نو، تهران ١٣٧٩

(٧) - مرتضی هادی جابری مقدم، شهر و مدرنیته، سازمان چاپ و انتشارات وزارت فرهنگ و ارشاد اسلامی، تهران ١٣٧٩، ص ١١١

(٨) - ئەم لێکدانەوەیە هی مارف ئاغاییە. بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٤ی ل ١٦٨

(٩) - ئەم لێکدانەوەیە هی سەلاحەددین موهتەدییە. بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٤ی ل ٢٨٢

(١٠) - ئەم لێکدانەوەیە هی ئەحمەد قازییە. بڕوانە سەرچاوەی ژمارە ٤ی ل ٢٠٤

# وتوویژ لەگەڵ فاتیح شێخولئیسلامی

**سەرچاوە: رادیۆ هاوپشتی، ٢٠٠٣/٦/١٤**

من هیچ ڕووداوێکی ئەدەبی و فەرهەنگی بە جیاواز لە زەمینەی کۆمەڵایەتی و سیاسی نابینم. ئێستا گەڕانەوە و باسکردن لە حدوودی چل ساڵ لەوە پێش دیارە لایەنێکی ئەدەبی و ئەوانەی هەیە، بەڵام قەتعەن لەم وتوویژەدا ناکرێ لە لایەنی کۆمەڵایەتی و سیاسییەکەی بە تەواوی چاوپۆشی بکەین.

ئەویش [سوارە] هاتۆتە دانیشگای (جامیعەی) تاران، منیش لە جامیعەی تاران بووم، پێش ئەوەی کە ئەو بێ. ساڵی ١٩٦٢ یانی چل ویەک ساڵ لەوە پێش. ئەوەی کە من بتوانم وەبیر خۆمی بهێنمەوە، ئەو وەختە هاوکات بوو لەگەڵ مەرگی گۆران. گۆران مرد، ئێمە لە جامیعەی تاران جەماعەتێک خوێندکاری ئەم سەردەمە کە لەگەڵ ئەدەبیات و شیعر و ئەوانە سەروکارمان بوو، هەوڵێکمان دا بۆ ئەوەی کە ژمارەیەکی تایبەتی ڕۆژنامەیەکی کوردی، کە ئەو سەردەمە لەوێ دەرئەچوو، بە ناوی «کوردستان» ،دەربێنین، بە بۆنەی مەرگی گۆران و بۆ ڕێزگرتن لە گۆران. دوای ئەوە بوو، یانی لەو کۆششە دا کە ئێمە کردمان سوارەی تیا نەبوو. سوارە دوای ئەوە هاتە تاران. لە دوای ئەوە ئیتر ئێمە بە یەکەوە هاوڕێ بووین، هەتا وەختێک کە من تارانم بەجێهێشتووە و هاتوومەتەوە بۆ کوردستان، بۆ ئیشکردن لەوێ. کە من ئەو وەختە موعەلیمی سانەوییە بووم. ئەو ماوەیە، تەقریبەن پێنج ساڵ، ئەمە بە یەکەوە بووین لە تاران. زۆر نزیک بووین. دوای ئەوەش بە ماوەی حەوت ساڵی تر کە من لە کوردستانەوە ئەهاتم بۆ تاران، هەموو جارێک سوارەم ئەدی. دیارە ئەم حەوت ساڵەی دوایی کە من لە کوردستان بووم ئەویش لە تاران لە ڕادیۆی بەشی کوردیی ئەو وەختە ئیشی ئەکرد و ئیتر ساڵێ جارێک، ساڵێ دوو جار، یەکترمان ئەدی. دیارە ئەو پێنج ساڵەی ئەوەڵ زۆر لە یەک نزیک بووین، چ لە باری دۆستایەتییەوە. چ لە باری زەوق و چ لە باری ئەوەی کە هەردووکمان ڕۆڵێکمان هەبوو لە نوێکردنەوەی فۆرمی شیعر و حەتتا نێوەرۆکی شیعر بە دەرەجەیەک، شیعری کوردیی ئەو سەردەمە. ئەمە تەواوی ماجەراکەیە.

لە ساڵی ٧٥ ئیتر سوارە لە بەین چوو. زۆر لە ناکاو و لە سەردەمی جەوانیدا، ئەگەر جەوان لە خوار چل ساڵ دابنێین، ئەو لە خوار چل ساڵەوە بوو وەختێک کە بەو ڕووداوە، کە ڕووداوێکی ناگەهانی بوو، ماشێن (سەیارە) لێی دا، بەڵام دوایە کە بردیانە خەستەخانە،

لەوێ تووشی نەخۆشینی زەردوویی (یەرەقان) بوو. بەو نەخۆشینە لە بەین چوو. زستان بوو، لە کوردستان بووین، ئاگادار بووین و دوایە چووین بۆ سەرەخۆشی لە بۆکان. ئەمە کوللی ماجەرای دۆستایەتیی من و سوارەیە، بەڵام هەروەک باسم کرد ئەو سەردەمە سەردەمێکی تایبەتی بوو. دوایە ئەتوانین بچینە نێوەوە کە چ سەردەمێک بوو لە باری کۆمەڵایەتییەوە و هەروا لە بارەی سیاسییەوە.

من پێموایە ئێستا، ئەو شتانەی کە لە بیست ساڵی ڕابردوودا دیومن لە بارەی سوارەوە نووسراون، بەشێکی میتۆلۆژی تێکەڵە، بەشێک ئەفسانە دروستکردنی تێکەڵە. دیارە من سەر و ساختێکم لەگەڵ ئەفسانە دروستکردن نییە، بەڵام ڕێزێکی زۆرم هەیە بۆ بیرەوەرییەک و بۆ ژیانێکی ئەم سەردەمە کە لەگەڵ سوارە بوومە. زۆرم خۆش ویستووە و ئەڵێنیش خۆشەویستی لە دڵمایە. دیارە کە بچینە نێو بەحسەکە باسی ئەوە ئەکەم کە ئەفسانەسازییەک کە مەعموولەن لە دەوری ئینسانی هونەرمەند و ئینسانی مەشهوور ئەکرێ، لە مەوریدی سوارەدا چۆن بووە تا ئێستا.

«سوارە و عەلی حەسەنیانی و من هاوکات بووین، لە یەک سەردەما بووین. سەردەمێک بوو کە شیعری کوردی لە کوردستانی ئێران لە شیعری کلاسیک و سوننەتی و کۆنەوە تێپەڕ بوو بۆ سەردەمێکی فۆرمی نوێ و نێوەرۆکی نوێ، بەڵام دیارە ئەم سێ کەسە هەر یەک بە جۆرێک بەشدار بووین. ...عەلی حەسەنیانی نەقشێکی وا زۆر بەرجەستەی نەبوو، ئەو جۆرەی کە سوارە بە جیددی گرت. منیش هەر نەقشێکی وەک سوارەم نەبوو، بەڵام ئەکرێ بڵێم من و سوارە وەکو یەک تەقریبەن نەقشمان نواندووە. ئەوەی کە وەکو یەک ناومان نابرێ دوو هۆی هەیە: یەک ئەوە کە سوارە بە جەوانی مرد، یانی جوانەمەرگیی سوارە بۆتە هۆی ئەوە کە ناوبانگێکی زیاتری لەو پەیوەندە دا دەرکردووە. یەکیش هۆی سیاسی هەیە.......، ،ەڵام بێجگە لەوە، بە بڕوای من ناسیۆنالیزمی کوردیش هەر تەئسیری بووە لەوە دا. بەڵام یەک شت من ئەسەلمێنم، ئەویش ئەوەیە کە سوارە بە شێوەیەکی پرۆفیشناڵ شاعیر و نووسەر بوو، من وا نەبووم. من هیچ کات، ئەو ماوەی پێنج ساڵە کە باسم کرد، ئەوە ئەکتیوترین دەورەی ئەدەبیی من بووە کە لەو کاتەشا هەر کاری ئەسڵیی من نەبووە. من خۆم وەکو شاعیر یان وەکو نووسەر نەناساندووە. ...لە حاڵێکدا سوارە عەمەلەن وای لێهات. من زۆرتر وەکو ئاکتیوێکی سیاسی بووم ......، بەڵام بە هەر حاڵ لەو دەورەدا ئێمە نەقش و دەورێکمان بوو لە هێنانی شێوەی نوێ لە شیعری کوردی لە کوردستانی ئێران. لە کوردستانی ئێران ئەوە ڕەوتێکی تازە بوو کە لە ساڵەکانی ٦٠ دەستی پێکرد. من و سوارە و چەند کەسی تر. دواتر مەسەلەن ڕێبوار (موسلیح شێخولئیسلامی) تەئسیرمان بووە لە سەر ئەو ڕەوتە، بەڵام

گێڕانەوەی ئەو مێژووە وەکو یەک نییە. لە چەند ڕوانگەوە دەتوانی بیگێڕیتەوە. پەیوەندە بەوە کە تۆ لە کوێ ڕاوەستابی و چۆن تەماشای ئەو مێژووە بکەی. بە هەر حاڵ سوارە، ئەڵبەتە ئەوەش بڵێم کە پەخشانی زۆر جوانی ئەنووسی، لە شیعرەکانی زۆر جوانتر بوون. «تاپۆ و بوومەلێڵ» بەشێک لە کاری ئەو بوو کە بە بڕوای من چ بە حەجم، چ بە فۆڕم، زۆر غەنیتر و دەوڵەمەندتر بوون تا شیعرەکانی. سوارە سەرجەم شازدە شیعری کوردی لێ ماوەتەوە، بەڵام ئیتر وەکو شاعیر ناوی دەرکردووە. ئەوەش بۆخۆی بەحسێکە کە لە نێو وڵاتانی ڕۆژهەڵاتا، بە تایبەت لە نێو کوردا، ئەگەر کەسێک دە ئەوەندەی شیعر، پەخشانی نووسیبێ، بەڵام ئەگەر چوار شیعری نووسیبێ هەر بە ناو شاعیر ناوی دەرئەکەن.

هەر وەک باسم کرد، بە تایبەت لە فەرهەنگ و ئەدەبیاتی کوردییا، کە ناسیۆنالیستییە، شاعیر بڕێک مێتۆلۆژی تێکەڵ ئەکرێ. شاعیر ئەکرێ بە ئینسانێکی تۆزێک زیاد لە حەد، لە حەدی ئینسانیی خۆی گەورە ئەکرێتەوە و نوورێک بە دەوریا دروست ئەکرێ. بۆ سوارەش هەر وا بووە. لە حاڵێکا سوارە زیاتر نووسەر بوو، زیاتر پەخشاننووس بوو، دیارە هەردووکی هەر ژانری ئەدەبی بوون، بەڵام سوارە نووسەری پەخشان بوو، زیاتر لەوەی کە شاعیر بێ، بەڵام شاعیرییەکەی زیاتر بەرجەستە کراوەتەوە. دیارە ئەوە ئەڵبەتە ئیشکالێکی وای نییە، یانی موشکیلەیەک ئیجاد ناکا، بەڵام هەر وەکو تۆ باست کرد پەخشانی سوارە زۆر زۆر پاراو و جوان و سوار بوو و خۆشی دەنگێکی زۆر خۆشی بوو بۆ شت خوێندنەوە، مەنزوورم ئەوە بوو پێرفۆرمێنس و ئیجراکەی لە ڕادیۆوە لە توولی چوار پێنج ساڵدا بوو بە باعیسی ئەوە کە سوارە لە لایەن ڕادیۆوە ناوبانگی دەرکرد. چونکە ئەو وەختە شیعر بە دەسنووس ئەنووسراوە، زۆر مەجالی ئەوە نەبوو کە شیعر چاپ بکرێ و بە ئاشکرا بڵاو بکرێتەوە، بەڵام ڕادیۆ مێدیۆمێکی موناسبتر بوو. سوارە بەو بۆنەوە ناوبانگی دەرکرد.

... ئەگەر شیعرەکانی من لەبەر چاو بگری، هەر هی ئەو سەردەمە، کە منیش حدودی بیست شیعرێکم هەیە، هی ئەو سەردەمە، زۆر شتێکی وا عەجایب نییە، بەڵام فەرقێک کە لە بەینی شیعرەکانی من و شیعرەکانی سوارە دا هەیە لەو بابەتەوەیە کە سوارە زۆر خۆی بەند کردبوو بە زمانێکی پەتیی کوردی و هەرچی کوردیکردنی کوردی. من بە پێچەوانە زۆرتر زمانێکی کۆمەڵایەتیم بەکار ئەبرد، ئەوەی ژیانی خەڵک بوو، زۆر پەتی نەبوو و هەر لەوێش ئیشارە بکەم کە بە هەر حاڵ لەو کەسانەی کە ئەو دەورەیە، لە حەیاتی ئەدەبیی ئەو دەورەیە لە کوردستانی ئێران، ئەکتیو بوون، دوو ڕەوت ئەکەوتە ڕێ کە ڕەوتێکی بەرەو کوردایەتی چوو و ڕەوتێکی بەرەو کوردایەتی نەچوو و بەرەو چەپ و بەرەو کۆمۆنیزم و بەرەو سیاسەتی چەپ هات. کە ئەمە ڕەنگی داوەتەوە لە مەسەلەی چاولێکردن لە ژیان و لە شیعر و لە فۆڕم و

له هەموو شتێک، بە هەر حاڵ چونکە بەحسەکە بەحسی سوارەیە من با بچمەوە سەر ئەوە. بەڵێ خەوەبەردینە بەو مەعنایە قورسە، خەڵکی ئاسایی لێی حاڵی نابێ. من خۆم یەکێک لەو کەسانە بووم کە تەقریبەن خەوەبەردینەم ئەو زەمانە لەبەر بوو، بەڵام بە تەجروبەی خۆم لە زۆر شوێن، کەسی خوێندەوار، کەسی دانیشگادیتوو، لە جامیعە دەرچوو، کە من بۆم ئەخوێندەوە مەجبوور بووم دێڕ بە دێڕ بۆی باس بکەم کە ئەوە باسی چی ئەکا و لە ئاخریشا هەر سەرکەوتوو نەئەبووم لەحاڵیکردنیان. یەعنی نەوعێک زمانی ئێلیت، زمانی ڕووناکبیر بوو، زمانێک کە نەیئەتوانی زمانی کۆمەڵانی خەڵک بێ و ئەوە دوایەش کێشەیەک بوو. وەختێک کە من بەرپرسی ڕادیۆ کۆمەڵە بووم هەر ئەو کێشەیەم بوو، کە من پێموانەبوو زمانی پەتی زۆر زمانێکی باشە و دواتر عەقیدەم پەیا کرد کە لە هیچ زمانێکا زمانی پەتی باشتر نییە لە زمانێک کە خەڵک قسەی پێ ئەکا، بەڵام بە هەر حاڵ خەوەبەردینە گەورەترین شیعری سوارەیە.

من پێموایە یەکێک لە جەعلیاتێک کە لە بارەی سوارەوە کردوویانە ئەوەیە. من مەنزوورم ئەوە نییە کە ئەو شیعرانەی کە باسی مەزهەبییان تێدایە یا باسی شێخیان تیایە شیعری سوارە نین. بەڵام [وەک] من سوارەم ناسیبێ، سوارە ئیمانی مەزهەبی نەبوو و خۆی بە ئینسانێکی لامەزهەب ئەزانی، بەڵام دواتر لە چ تەحەولاتێکا، کە لە ڕادیۆ ئیشی ئەکرد، بوو، چ سازشکاریبهایەکی ئەو سەردەمە لەگەڵ مەزهەب کردووە، کە لەگەڵ زۆر شتی تریشی کردووە، بۆتە باعیسی ئەوە، من زۆر ئاگادار نیم، بەڵام ئەوەی کە ئێستا ئەو کەسانە ... ئەو بەشەیان هێناوە قوتیان کردۆتەوە، بەرجەستەیان کردۆتەوە، بە بڕوای من زۆر زۆر غەیری واقیعییە. سوارە بەوەوە نەناسراوە. ئەو کەسانەی کە سوارە ئەناسن ئەزانن کە سوارە هەرچی بووبێ مەزهەبی نەبووە، بەڵام دیارە ئەو شیعرانەشی وتووە. من ناتوانم بڵێم کە ئەو شیعرانە هی ئەو نین. منیش ئەو شیعرانەم دیون. ... وەختی خۆی شیعری بۆ تاریخی کۆنی ئێران و ئەوانەش وتووە. بەڵام پێموایە ئەو شیعرانە، بە هەر مەبەستێکی وتبێتی، هی خۆی نەبووە. بە بڕوای من ئەوانەی ... ئەو بەشەیان بەرجەستە کردۆتەوە، ناسیۆنالیزمی کورد، بەشی کوردایەتییەکەیان زۆر بەرجەستە کردۆتەوە، کە ئەڵبەتە ئەمە واقیعییەتی زیاترە، بەڵام بە هەر حاڵ سوارە ڕووناکبیرێکی موخالیفی ڕژێمی شا بوو. لەو سەردەمەدا، دیارە عەلاقەی بە کوردایەتی بەهێز بوو، بەڵام لە هەمان کاتدا ئینسانێکی پێشکەوتووش بوو، بە نیسبەت زەمانی خۆی. دواتر وتم ئەو حەوت ساڵی ئاخری ژیانی کە لە ڕادیۆ بوو، من ساڵ بە ساڵ ئەمدی. زۆر ئاگاداری نیم و زۆر شارەزا نیم لەوەی کە لەو دەورەدا چ ئاڵوگۆڕهایەک بە سەر فکریا هاتووە. ...من نەمبیستووە سوارە لە سەردەمێکا بەرەو مەزهەب چووبێ.

نێوەرۆکی خەوەبەردینە حەرەکەتی کانییەکە کە ئەیەوێ بڕوا بەرەو دەریا، بەو سادەگییە و ئەم شتە لە ئەدەبیاتی ئەو زەمان و لە نێو ڕووناکبیری ئەو زەمانی موخالیفی وەزعی مەوجوود تەمسیلێک بوو. مەسەلەن «ماهی سیاه کوچولو»، هی «سەمەد بێهرەنگی»، ئەویش حاڵەتێکی ئاوای هەیە. بە بڕوای من سێ، چوار دێڕی ئاخری خەوە بەردینە هەموو نێوەرۆکی خەوەبەردینەیە کە باسی ئەوە ئەکا، ئەڵێ:

**«لە هەر شوێنێ ڕاماوە، داماوە، کاری تەواوە**

**ئەزانێ ئەبێ هەر بڕێ و باڕوێ، تا بڕێ، تا بمێنێ**

**هەناوی بە هەنگاوە،**

**ئەسرەوتنە، کوولەکەی ڕووحی ئاوە.»**

باسی ئەوە ئەکا و ئەسڵەن ناوی خەوەبەردینە، ناوەکەشی ئەوەیە. کانی ئەگەر بتوانێ بڕوا و حەرەکەت بکا و ڕانەوەستێ، ئەگا بە دەریا و ئەگەر ڕاوەستێ ئەبێ بە بەرد، وەکو گراو، یانی ئەگەر خەوی لێ بکەوێ، ئەگەر وەنەوز بدا، ئەگەر لە حەرەکەت بکەوێ. ئەمە تەمسیلێکە بۆ حەرەکەت و ئیشارەم کرد بەوە کە سوارە فکرێکی پێشکەوتنخوازی بوو، یەکیان هەر ئەمەیە: عەقیدە بە حەرەکەت، عەقیدە بە ئاڵوگۆڕ، عەقیدە بەوە کە ڕانەوەستی، بەرەو ئامانجێک بڕۆی و هەوڵدەی کە بەو ئامانجە بگەی و لە ڕێگا خەوت لێ نەکەوێ و دانەمێنی. چونکە ئەگەر دابمێنی، ڕانەمێنی و ئەبی بە بەرد و مونجەمید ئەبی، موتەحەجیر دەبی. ئەمە نێودرۆکی خەوەبەردینەیە، بەڵام ئیتر ئەوەندەی تەفسیلات تێدایە، لەخەوەبەردینەدا ئینسان ئیحساس ئەکا کە سوارە بە شوێن کەلیمەدا چووە، بە شوێن وشەدا، وشەیەکی تر ڕایکێشاوە، ئەڵبەتە زۆر هونەرمەندانە بە شوێن وشەدا ڕۆیشتووە، بەڵام خەتەکەشی بەرنەداوە، یانی ئەگرا ئەو شتە کورتتر بێ، شاکارەکەشی وا لەوە دا کە درێژیشە، بەڵام ئەگەر کەسێک لێی تێبگا وەڕەز نابێ.

نوکتەیەکیش لە بابەت وەزنەکەیەوە بڵێم: ئێمە ئەو سەردەمە لە دوو شت موتەئەسیر بووین، یەکێک لە گۆران و نوێکارییەکانی گۆران لە شیعردا، کە من پێموایە ئێستاش ئەو نوێکارییانەی کە گۆران لە شیعری کوردی کردوویە لە کوردستانی عێراق زۆر تەئسیرێکی موهیمی بووە. ... من زۆر ڕێز بۆ گۆران قایلم. ئێستا ناتوانم بچمە نێو ئەو بەحسەوە. بەحرێکی گەورەیە ئەو بەحسە، بەڵام بە هەر حاڵ گۆران وەزنی پەنجەی هێنا. دیارە ئەو ناوی نا وەزنی نەتەوایەتی کە من پێموانییە وەزنی پەنجە وەزنی نەتەوایەتییە. وەزنێکە، بەڵام وەزنێکی ئاشنایە، ئاشناترە بە گوێی خەڵکی کورد زبان. بە دەلیلی ئەوەی ئەکسەری فۆلکلۆری کورد زبان بە وەزنی پەنجەیە. ئێمە وەزنی پەنجەمان لە لایەک وەرگرت. لە لایەک

شیعری نوێی ئەو وەختەی فارسی. دوای نیما کە سەرەتای دامەزراند، شاملوو لە ئەوجی خۆیا بوو و فرووغ فەڕوخزاد. ئێمە، هەم من، هەم سوارە زۆر موعجیب بووین بە شاملوو وە فرووغ فەڕوخزاد، کاری ئەو دووانە لە کاری ئێمە دا ڕەنگی داوەتەوە، بەڵام ئەو سەردەم هێمن بە ئێمەی ئەوت، بە بێ وەی ئێمە ببینێ، لە دوورەوە حەرەکەتەکەی ئێمەی باش هەڵئەدەسەنگاند. ئەڵبەتە دوایی هێمن نەزەری گۆڕا لەو بابەتەدا، بەڵام ئەو وەختە بە ئێمەی ئەوت «جووجە گۆران»، «جووجەلە گۆران»، بەڵام واقیعییەت ئەوەیە ئەو وەختە ئێمە هەم لە گۆران موتەئەسیر بووین هەم لەشاملوو و فرووغ فەڕوخزاد و لە شیعری نوێی ئەو زەمانەی فارسی و نوێکارییەکانی ئەو زەمانە.

...خودی سوارە لەگەڵ شانامە زۆر ئاشنا بوو. کەسێک بە ناوی «ڕەزا بەراهەنی» هاتبوو وەزنی شانامەی شکاندبوو، درێژی کردبۆوە. زۆر هەوایەکی خۆشی بوو ئەو وەزنە. من و سوارە بڕیارمان دا کە بەو وەزنە شیعری کوردی بڵێین. بۆ یەکەم جار، ئەو خەوەبەردینەی وت، منیش حەوتەوانان. ئەم دووانە هەردووکی لەسەر وەزنی شانامەیی، بەڵام وەک شانامە دوو دێڕیی نییە. دێڕێکی مومکینە چوار کەلیمە بێ، دێڕێکی دە کەلیمە بێ، ئاوا ئیتر. ئەم وەزنەش وەزنێکی تازە بوو و بە داخەوە هەر تەنیا خەوەبەردینە و ئەو شیعرەی من کە «حەوتەوانان»ە و ئاوا دەست پێ ئەکا:

**«بەڵێ وای ئەتۆ**
**وەک زرێباری بن خێوەتی مانگەشەو**
**بە مەندی شکۆدار و گەورە و گرانی»**

ئەویش:

**«لە چەشنی گەرووی کەو**
**کەوی دۆمی یەخسیری زیندانی داری»**

ئەمەش وەزنێکی زۆر سوار بوو، ئەیخوارد بەو نێوەرۆکە کە حەرەکەتی ئاو بەرەو دەریا و ئەوانە بوو. لەم بارەوە سەرکەوتنێکی باش و نوێ بوو، هەم بۆ سوارە، هەم بۆ من، بەڵام وەک باسم کرد دوایی ئەو، کە بە داخەوە عومری زۆر نەکرد، منیش کاری شیعریم زۆر ئیدامە نەدا. کەسی تریش ئەم وەزنەی بە دەستەوە نەگرت، یا ئەم جۆرە نوێکردنەوانە. بە نەزەری من ئێستا شیعری نوێ لە کوردستانی ئێران لە سەر ڕچەی ئەو شتەی وا ئێمە دامانمەزراند نەڕۆیشتووە. ئێستا گەڕاوەتەوە سەر ئەو نوێکارییانەی کوردستانی عێراق، دوای مەکتەبی ڕوانگە. زۆرتر وەزنی ئەستێرەکان، ئێستا لە کوردستانی ئێرانیش باوە. بە بڕوای من وەزنێکی زۆر خۆش و موتەنەویع نییە. بە هەر حاڵ ئەویش وەزنێکە بۆخۆی. بە هەر حاڵ

ئەمانە باری فەننی شیعرەکانن، بەڵام قەسدم ئەمە بوو ئیشارە بکەم بەوە کە سوارە چۆن بە شوێن نوێکارییا ئەگەڕا و چۆن لە شیعری نوێی فارسی کەلکی وەرئەگرت، وەکو منیش هەر لەو سەردەمەدا و خەوەبەردینە یەکێک لە کارە باشەکان بوو. حەوتەوانانی منیش ئەو سەردەمە هەر بەو بۆنەوە زۆر ناوبانگی دەرکرد و دەست بە دەست گەڕا. ئێمە ئەو وەختە تێکەڵێک لە وەزنی عەرووزی و وەزنی پەنجە کارمان لە سەر کرد. بۆ هیچ کامیان تەعوسویمان نەبوو، مەسەلەن وەزنی عەرووزی بەجێ بێڵین بە حیسابی ئەوەی کە گۆیا ئەوە وەزنێکی عەرەبییە و بێگانەیە. ئەو سەردەمە ئێمە وامان بیر نەئەکردەوە و سوارەش وای بیر نەئەکردەوە.

ئەوەی کە جەماعەتێک پێیانوابێ ڕەخنە لە سوارە نابێ بگیرێ، بە بڕوای من ناسیۆنالیزمی کورد سوارەی موسادەرە کردووە، سوارەی کردووە بە هی خۆی و بوتێکی لێ دروست کردووە. ئەفسانەیەکی لێ دروست کردووە نەگۆڕ. بۆیە پێی خۆش نییە هیچ نەوعە ڕەخنەیەکی لێ بگیرێ. لە حاڵێکا سوارەش وەک من، وەک تۆ، وەک نەوعی بەشەرییەت، ئەکرێ مەوزووعی ڕەخنە بێ، ئەکرێ مەوزووعی لێکۆڵینەوە بێ. ئینساف ئەوەیە کە ئینسان بزانێ سوارە لە چ سەردەمێکا ژیاوە و ئەو شتانەی کە لە شیعری سوارەدا خۆی دەرخستووە نیشانەی چییە.

...بە هەر حاڵ ڕووناکبیری ئەو سەردەمە لە ئێرانا بە هۆی دژایەتی لەگەڵ ڕژێمی شا و بە هۆی تەحەولاتی کۆمەڵایەتییەک کە ئەو سەردەمە، مەسەلەی لاچوونی موناسباتی فێئودالی و ئیسلاحاتی ئەرزی بوو، کەوتبوونە ڕقەبەرییەکی، بە بڕوای من، دواکەوتووانە بەرامبەر بە مۆدێرنیزم و بەرامبەر بە شار و بەرامبەر بە گەڕانەوە بۆ دێ. ... ئەو سەردەمە سەردەمێ بوو کە زۆربەی خەڵکی عادی لە کوردستان و لە باقی ئێران لە دێوە باریان ئەکرد، ئەهاتن بۆ شار، بەڵام ڕووناکبیری ئەو سەردەمە بەشێک لە چەوتبینییان ئەوە بوو کە لە سەردەمێکا کە خەڵک ئەهاتن بۆ شار، ئەوان لە شارەوە ئەچوونەوە بۆ لادێ. ئەمە قەتعەن کۆنە پەرستانەیە، قەتعەن بەرەو دوا گەڕانەوەیە. شیعری «شار» ئەگەر بخوێنیتەوە ئەمەیە، بەڵام من خۆشم ئەو وەختە هەر شیعری وام هەیە. مەسەلەن من شیعرێکم هەیە، شیعری حەوتەوانان، دێڕێکی ئاوایە، باسی سەرنج ئەکا، باسی نیگای خۆی ئەکا شاعیر، من گوتوومە: «سەرنجم دەمێکە زوڵاڵیی نەماوی چەپەڵگەی هەراسانکەری گەورەشارە». ئەو وەختە من پێموابوو شاری گەورە چەپەڵگەیە، ئینسان هەراسان ئەکا و سەرنجی ئینسان لە نێو شاری گەورە دا زوڵاڵیی نامێنێ، ئەبێ بگەڕێتەوە بۆ دێ، بۆ داوێنی تەبیعەت تا سەرنجت زوڵاڵ بێتەوە. ئەڵئان وەختێ من تەماشای ئەکەم، ئەبینم ئەوە دواکەوتووانە بوو.

شاری گەورە و بە تایبەت لەو دەورانە، ئەوە دەورەیەک بوو، دەورەی گۆڕانی کۆمەڵگای ئێران لە فیئۆدالییەوە بۆ سەرمایەداری،زۆر شتی ناحەز و خراپی تیا بوو، زۆر ماڵوێرانیی خەڵکی تیا بوو. سەرمایەداری لە هەموو جێگەیەک لە نێو خوێن و ئارەقی خەڵکا هاتۆتە پێش، مەعلوومە خۆ. ... ئێمە لە زۆر بابەتەوە نەمانزانی کە ئەمە باشە. من خۆم یەکێک لەو کەسانە بووم کە موخالیفی ئیسلاحاتی ئەرزی نەبووم لەو سەردەمەدا، لە حاڵێکا کوردایەتی، ناسیۆنالیزمی ئێرانی، لەو سەردەمەدا، موخالیفی ئیسلاحاتی ئەرزی بوو، بەڵام ئیتر ئەمە بوو ئەو شتە. سوارەش تەحتی تەئسیری ئەو جەوە بوو و خۆشی لە بنەماڵەیەکی فیئۆدالیی گەورە بیوو. من پێمـوایە سەردەمی لاویی سوارە هاوکات بوو لەگەڵ ئەو سەردەمە کە بزووتنەوەیەکی جووتیاری لە ناوچەی بۆکان بوو و تایفەی ئەوان دەرگیر بوون لەگەڵ جووتیاران. ئەوە بەشێکە لە مێژوو کە من پێمـوایە قەتعەن تەئسیری کردۆتە سەر سوارە کە زۆر تەمایولی بە لادێ و بە ئەفسانەکردنی لادێ، ئیدەئالیزەکردنی لادێ، بوو. ئەوە لە هەموو شیعرەکانیا تەقریبەن هەیە. من پێموایە ئەگەر کەسێک ئەو ڕەخنەیە بگرێ ئیمڕۆ، ڕەخنە لەو شیعرە ئەگرێ نە لە سوارە. سوارە ئینسانی ئەو سەردەمە بوو، ڕووناکبیری ئەو سەردەمە بوو. دواکەوتووییەکانی ئەو سەردەمەی ڕووناکبیریی ئێران و کوردستانی لە خۆیا نیشان داوە، ئەز جوملە لە پێوەند لەگەڵ شار و دێ. ... من خۆم پێموایە ئەو ڕەخنەیە دروستە، بە تایبەت ئێستا. ئێستا تۆ بێنی شار بە شتێکی خراپ دابنێی و دێ بە شتێکی باش دابنێی، خودی خەڵکی دێ لێت تووڕە ئەبن، بە حەق.

«کچی بەیان»م پێ یەکێک لە جوانترین شیعرەکانی سوارەیە. «بانگەوازی پەنجەرە»ش هەر شتێکی باشە. من پێموایە «کچی بەیان» ئومێدێکی تێدایە، ڕەبتێکی تیایە بەینی ئینسان و سیاسەت، ئینسان و خەبات، کە ڕەبتێکی واقیعییە. لە هەموو جێگەیەکی شێعرەکانی سوارە وا نییە. لە زۆر جێگا ئینسان فیدای سیاسەت کراوە، ئیحساسات فیدای خەبات کراوە. من پێموایە کوللەن لە ئەدەبیاتا کارێکی باش نییە، یانی وەجهێکی باش نییە لە ئەدەبیات. ئەدەبیات مەجالێکە بۆ ئەوەی کە ئینسانبوونی ئینسان، ئینسانییەتی فەردیی ئینسانەکان زۆرتر خۆ بنوێنێ و ئەگەر زۆر بێ بە سیاسی، زۆر بێ بە خەباتکارانە، زۆر بێ بە شوعار، ئەوەی خۆی لە دەست ئەدا. لە بیرمە مایاکۆفسکی شیعرێکی هەیە، مەشهوورە بە ناوی «لێنین». من هەمیشە، لە سی ساڵ بەر لەئێستەوە، هەموو جارێک ئەو شیعرەم خوێندۆتەوە، بەشێکی هەیە زۆرم پێ ناخۆشە، شوێنێکە باسی فەرد و حیزب ئەکا، ئەڵێ: «فەرد چییە؟ فەرد ئەگەر بە هەموو دەنگی خۆی هاوار بکا، دەنگی ڕەنگە فەقەت بگاتە گوێی ژنەکەی، ئەویش بە شەرتێک کە ژنەکەی نەچووبێ بۆ کڕین. فەرد چییە؟ فەرد هیچ

نییە. ئەوەی کە هەیە حیزبە.» بە هەر حاڵ حیزب مەعلوومە........ بەڵام لە تەقابول لەگەڵ فەرد، لەگەڵ ئینسان، ئاوای لێ بکرێ من زۆر موخالیفی ئەوەم و زۆر موخالیفی مایاکۆفسکی بووم لەو شیعرەدا کە فەرد ئاوا لێ ئەکا. بە هەر حاڵ ئێستە جێگەی ڕەخنەی مایاکۆفسکی نییە، بەڵام سوارەش لە چەند شوێنێک ئەو کارەی کردووە، مەسەلەن شیعرێکی فارسی هەیە «زرد و سیاەو رنگی» و لە چەند جێگەی تر ئەوە هەیە، بەڵام یەکێک لە خەسڵەتەکانی سوارە ئەوە بوو کە ئینسانێکی موتەنەویع بوو، جۆر بە جۆر بوو، بە بڕوای من خۆی شەخسەن ئینسانێک بوو ئەهلی عیشق بوو، ئەهلی خۆشەویستی بوو، ئەهلی گوزەرانی خۆش بوو. زۆر دەستەنگ بوو، بەڵام زۆر حەزی ئەکرد لە ژیان. هەر کام لە شیعرەکانی ئەو خەسڵەتەی خۆی تیا دەرخستووە، بە بڕوای من شیعرێکی جوانە. «کچی بەیان» لەوانەیە و «بانگەوازی پەنجەرە»ش هەر لەوانەیە، تیانا ئەو هەستە ئینسانییە، هەستی عیشق و ئەوانە دەرکەوتوون.

من ئەوەم باس کرد، وتم ئەو سێ کەسە، لە زۆر جێیان ناوی ئێمە سێ کەس بە یەکەوە براوە، وەکو ئەو کەسانەی کە ڕۆڵیان بووبێ. دیارە ئەو دوو کەسەکەی تر [سوارە و عەلی حەسەنیانی] نەماون بە داخەوە، بەڵام من وەکو شتێکی ئۆبژێکتیو و عەینی دەمەویست ئەوە باس بکەم کە لەنێو ئەم سێ کەسەدا سوارە زیاتر تەئسیری بووە، عەلی حەسەنیانی کەمتر تەئسیری بووە. ... مەبەستم کەمکردنەوەی جێگا و ڕێگای ئەو نییە، ئەویش دۆستی زۆر خۆشەویستی من بووە. هەتا ئاخری ژیانیشی پێوەندیمان، ئەوەندەی توانیومانە، بە یەکەوە هەر بووە....، بەڵام وەکو واقیع پێموایە عەلی حەسەنیانی لە بواری نوێکردنەوە و دەرهێنانی شیعری لە کوردستانی ئێران، لە ڕەوتی نوێ، ئەو تەئسیرەی نەبوو کە سوارە بوویەتی. دیارە من باسی خۆم ناکەم، چونکە من حیرفەیی شاعیر نەبووم، نەبووم بە شاعیرێکی حیرفەیی....

ئەو سەردەمە دوو حەرەکە لە سەر ڕووناکبیر تەئسیری دانابوو. یەکێک حەرەکەی چریکیی ئێران، بێجگە لەوە لە سەتحی جیهانیشا حەرەکەی چریکیی ئەمریکای لاتین....ئەو سەردەمە ئەو حەرەکەتەی ئەمریکای لاتین و حەرەکەتێک کە لە ئێران مونعەکیس بۆوە، حەرەکەی چریکی، وە هەروەها حەرەکەی ساڵی (٤٦-٤٧ (٦٧ - ٦٨ی زایینی) لە کوردستانی ئێران، کە بە ناوی سمایلی شەریفزادە و مەلا ئاوارەوە مەشهوورە، ..... ڕووناکبیران ببوون بە دوو بەش ئیتر. ئەم «خێڵی درۆ» و هەروەها یەک دوو شیعری فارسیشی هەیە سوارە، لە ژێر تەئسیری ئەو جەوە دایە، ... لە شیعرە فارسییەکەشیا مەسەلەن باسی ئەوە ئەکا کە ئەگەر تۆ ئەتەوێ حەقیقەت ببیسی، حەقیقەت ئەبێ لە زمانی

خەتیبەوە،...، مەسەلەن ئەڵێ:

**«من و تو هر دو نیک آگاهیم**
**که دهانهای انباشته از باد جدل را**
**باید بست**
**و فصاحت را**
**در رواق کوهستان**
**از خطیبی کەکلامش سربی است**
**باید آموخت».**

... من پێموایە لە ژیانی خۆیا سوارە وا نەبوو بە تەوری واقیعی، بەڵام ئەوەش فەزایەک بوو، جەوێک بوو، هات و زاڵ بوو، وە دوای ئەوەش سوارە هەر ما و هەر لەگەڵ ئەوەشا نەما، بەڵام ئیتر شیعرەکانی ماون. «خێڵی درۆ» هی ئەو سەردەمەیە. مەسەلەن ئەڵێ «کرمی کتێب»، «یاری غاری هۆدە»، ئەوەش یەکێک لە ئیختلافاتێک بوو کە ئەو سەردەمەش لەنێو ئەو جەماعەتەدا بوون. من خۆم یەکێک لەوانە بووم کە پێموانەبوو ئەکرێ بە کەسێک بڵێی «کرمی کتێب»، چونکە کتێب ئەخوێنێتەوە. کتێب خوێندنەوەم پێ بایەخێکی باش بوو، یا جەدەلکردن، ... بە هەر حاڵ نەمەیە. ئێستا کێ ئەمڕۆ «خێڵی درۆ» دووبارە دێنێ باسی ئەکاتەوە، بەبێ ئەوەی بە قەولی تۆ لە ڕابیتەی واقیعی و تاریخیی خۆی، ئەو ڕۆژەدا باسی بکرێ. ئەوە ئیشی من نییە ئێستا باسی لەسەر بکەم. ئەگەر شتێکی کۆنکرێت با ئینسان دەیتوانی جوابی بداتەوە، بەڵام بە هەر حاڵ وەک باسم کرد ئەفسانە دروستکردن لە سوارە بەشێکە لە مێژووی سوارەشناسیی ناسیۆنالیزمی کورد. ئەفسانەی لێ دروست ئەکەن، بوتی لێ دروست ئەکەن، وەک ئەوەی سوارە هەمیشە هەروەکو «خێڵی درۆ» بیری کردۆتەوە. لە حاڵێکا مەسەلەن شیعرەکانی تری تەماشا کەی، تەماشا ئەکەی ئەوەشی وا تیایە، ئەویتریشی وا تیایە. دوایەش ئەو شیعرەی بۆ «تەختی» وتووە، تەختیی کوشتیگیر، کە زۆر ناسیۆنالیزمی ئێرانیی تیایە... شیعرەکە بە فارسییە، ناوی «امشاسپند هشتم»ە. بە بڕوای من ئەو شیعرە زۆر کۆنەپەرستانەیە. ...، بەڵام بە هەر حاڵ سوارە وەکو مەوجوودێکی واقیعی، زیندوو، کە ژیاوە، نانی خواردووە، عیشقی کردووە، سیاسەتی کردووە. شیعری وتووە، نووسراوەی هەیە، لە زەمینەی واقیعی مێژوویی خۆیا ئەگەر باسی لێ بکرێ، بە بڕوای من جێی ڕێزە. جێی خۆشەویستییە، بەڵام جێی بوت کردن و ئەفسانەکردن نییە.

ئەو حەرەکەیە، حەرەکەیەکی فەرهەنگی، سیاسی بوو، لە ساڵەکانی شەستەکانا، لە کوردستانی ئێران، کە تێکەڵاوە لەگەڵ وەزعی ئەو وەختەی ئێران، لەگەڵ وەزعی ئەو وەختەی

کوردستانی عێراق، کە ئەو شتەی پێی ئەڵێن شۆڕشی ئەیلوول، تازە دەستی پێکردبوو، بەڵام ئەو کەسانەی کە لەو سەردەمەدا وجوودیان بوو، حوزووریان بوو، فەعال بوون، زیاتر بە دوو ڕەوت هاتن. دیارە سوارە نەما تا شۆڕشی ئێران، بەڵام بە دوو ڕەوت هاتن، بە دوو ڕەوت چوون. کە مەسەلەن، فەرز کەین عەلی حەسەنیانی بۆ نموونە لە ڕەوتی ناسیۆنالیزما مایەوە و لەوێ جێگیر بوو. بۆ نموونە مەسەلەن منیش لە ڕەوتی ناسیۆنالیزما نەمامەوە و ئەڵێن یەکێکم لەو کەسانەی کە دژایەتی ئەکەم لەگەڵ کوردایەتی و لەگەڵ ناسیۆنالیزم. لەم تاریخەدا، ئەمانە لە نەزەر ناگیرێ. وەک ئەوەیە کە مێژوو هەر لەو سەردەمەدا قەتیس ماوە.... ئەوەی کە لەو کەسانەی کە ئەو سەردەمە فەعالی ئەو ڕەوتە ئەدەبییە بوون، بۆ نموونە دوایی ڕێبوار [موسلیح شێخولئیسلامی] کە شاعیرێکی ئەکتیو بوو، تا ئێستاش هەر بووە، یا دواتر سولەیمان قاسمیانی [کاکە] یا سەردەمێک من. ... ناسیۆنالیزمی کورد ئێمە بە سەرمایەی خۆی دانانێ، بەڵام سوارە، چونکە ئەتوانێ بیکا بە سەرمایەی خۆی، بە بڕوای من ناسیۆنالیزمی کورد شاعیرەکان و ئەدیبەکان موسادەرە ئەکا، ئەیانکا بە ماڵی خۆی و لە حاڵەتی واقیعی و ئینسانی خۆی دەریانئەهێنێ. ئێستا من باسی ئەم ڕەوتی چەپە ناکەم، بەڵام باسی ئەوە ئەکەم کە سوارە لە ئاوێنەی ناسیۆنالیزمی کوردا تەسویرێکی واقیعی لێ نەدراوە و ئەو تەسویرەی لێی دراوە، «سروە» کە تەسویرێکی مەزهەبیشی لێ داوە کە بە بڕوای من جەعلێکی زۆر قێزەونە، بەڵام ئەوانەش کە تەسویرێکی تەواو ناسیۆنالیزمی کوردییان لێ داوە، بە بڕوای من تەسویرێکی واقیعی نییە ئەوە. ئەڵێم بووە، بەڵام بەو ئەندازە نەبووە. بە هەر حاڵ باسی مێژوویەکی سی، چل ساڵ لەوە پێشە، زۆر شتی هەیە. بە تایبەت من ئەمەویست زۆرتر باسی ئەو لایەنە بکەم، لایەنی تەحەولاتی کۆمەڵایەتی، کە کۆمەڵگای کوردەواری، بە تایبەت ئەو وەختە لە ژێر موناسباتی فیئۆداڵی دەرئەهات. ئەچوو بەرەو سەرمایەداری. ئەو وەختە ئێمە، بە هەر حاڵ بە تەفاوەت ئەو شتەمان دەرک ئەکرد یا دەرکمان نەئەکرد و هەڵوێست بەرامبەر بەوە لە شیعری سوارەدا، ئەمانە بە بڕوای من ئەو شتانەیە کە ئەکرا، یەعنی لە ئەدەبیاتی ئەو زەمانەدا من خۆم شیعرێکم هەیە: «لە ڕواڵەتێکی قەتیسا نەزیرەی چ نابینێ». ئێستا وەختی ئەوەنییە، بەڵام بە هەر حاڵ ئەگەر فورسەتێکی تر بێ باسی ئەو بزووتنەوە ئەدەبییە لە ڕوانگەی کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە بکرێ، ئەو وەختە جێگا و ڕێگای سوارەش و هی کەسانی تریش باشتر دەرئەکەوێ.

# لە «ئەفسانە»ی «نیما یوشیج»ەوە
# تا «خەوەبەردینە»ی «سوارەئیلخانیزادە»

«مراد ئەعزەمی»

چالاکانی پانتایی ئەدەب، کەم و زۆر لەسەر ئەم پایە کۆکن کە سوارە لانیکەم یەکێکە لە نوێکەرەوەکانی شیعری کوردی. یەکەم بوون و نەبوونی سوارەش لەم پرۆژەیەدا هەر هەبووەو ئەم وتارە زۆر لەسەر ئەم کێشەیە ناڕوا. بەم حاڵەش هەندێک لە نووسەران بە لێکدانەوەیەکی سەرپێیی تێمخوازانە و ئایدۆلۆژییانەوە هەوڵ دەدەن بسەلمێنن کە سوارە شاعیری لادێیە.

ئەم وتارە بەم پێشفەرزانەوە لە دوو بەشدا هەوڵی ڕوانینێکی دیکە دەدا بۆ ڕەخنە بەگشتی و شیعری سوارە بەتایبەتی. یەکەم بە شێوەی مەجازیی پاژ بۆ گشت، سوارە دەکاتە نیشانەیەک بۆ ئەوەی باسێکی مێتۆدێک سەبارەت بە ڕەخنە و خوێندنەوەی شیعر بورووژێنێ، دووهەم دێتەوە سەر پاژ و پراکتیکانە باسی زمانی تایبەتی سوارە دەکا.

### ١- شیعر، سەرەتا وەک بەرهەمی زمانی دەخوێندرێتەوە یان چەمک؟

بووتیقای مۆدێرن و تەنانەت زۆربەی ڕێبازە ڕەخنەییەکانی کلاسیکیش شیعر بە بەرهەمێکی زمانی دادەنێن کە مانا دەخولقێنێ. ئەرەستوو گرینگترین ئاسەواری خۆی سەبارەت بە خوێندنەوەی دەقەکانی ئەدەبی بە Politic ناودێر کردووە. بەو پێیەی کە زمان لەو پەڕی چڕبوونەوەی خۆیدا، دەگاتە لووتکەی شیعر.

ئەگەرکوو زمان خۆبژێو بێ. ئەدەب دەکارکەری ئەم خۆبژێوەیە. دواجار ڕەخنە بەتیئۆرییەکانیەوە کار لەسەر ئەدەبییەتی دەقەکان دەکا. بەو پێشفەرزەوە کە ئەمان بەرهەمی زمانین. نەک بەم ڕوانگەیەوە کە کارکردی فەلسەفە و تیئۆرییەکانی و کۆمەڵناسیو... لە دەقەکانیدا چۆنە و تا چ ڕادەیەکە؟

بە کورتی ڕەخنەی ئەدەبی دەواری لەسەر دەقێک هەڵدەدا کە سەرەتا بەرهەمی زمانی بێت و دواجار دیاردە و چەمکەکانی زانستی و فکری و سروشتی دەناخی خۆیدا بتوێنێتەوە و کەلکیان لێ وەرگرێ.

پرۆسەی خوێندنەوەی دەق لە دوو جەمسەردوە بۆی هەیە رووبدا یەکەم جەمسەری نائەدەبی (کۆمەڵناسی، دەروونناسی و دەروون شیکاری، فەلسەفە، مێژووناسی، ڕامیاریو...)یە. جەمسەری دووهەم، جەمسەری ئەدەبییە کە ڕاستەوخۆ دەچێتە سەر دەقی

ئەدەبی و دۆزینەوەی لایەنە داهێنەرەکانی زمانی لە دوو توێی دەقدا.

ئەم دوو جەمسەرە پێکهێنەری «پێرسپێکتیو»ێک نین کە نێوەڕاستیان هەبێ و تێکەلاوێک لە هەر دووکیان ببێتە جۆرە ڕوانینێک. بەڵکو هەردوو دەلاقەن و بەس. بە لەونێک کە لە یەک ئاندا هەر لە یەکیان ڕاڕوانین بۆ دەق مەیسەر دەبێ.

خوێندنەوەی دەق لە ڕەهەندی نائەدەبییەوە لە یەکەم هەنگاودا بە سڕینەوەی بەرهەمی زمانی بوونی شیعرەوە دەست پێدەکا. لە درێژەشدا هەنگاو زیاتر لە باسە نائەدەبییەکاندا ڕۆدەچێ و لە politic دوور دەکەوێتەوە. ئەم شیعر خوێندنەوەیە و گەڕان بە دوای نیشانەکانی کۆمەڵناسی، ئایدیلۆژیک، دەروونناسی، فەلسەفی و... و دیاریکردنی کارکردی ئەم چەمکانە لە دوو توێی دەقدا و شێوەی بۆچوون و لێکدانەوەی سیستمی تێفکرینی بەرهەمهێنەرەکەی سەبارەت بەم دیاردانە لە جێی خۆیدا شیاوی سەرنجە، بەڵام لە ئاکامدا هەر نائەدەبییە، لەبەر ئەوەی دەلاقە هەڵبژێردراوەکە بۆ چوونە نێو ژووری باسەکە لە سەرەتاوە نائەدەبی بووە. واتا لە ڕووی مێتۆدێکەوە، شێواز و ڕەهەندی نائەدەبی گرتووەتە بەر و ئەگەریش جار نا جار لارێ بیت و بۆ لای باسە زمانی و ئەدەبییەکانەوە تووشی ئاڵۆزکاوی مێتۆدێک دەبێ و باسەکە مەنتقی لێکدانەوەی خۆی دەدۆڕێنێ. ئەم شێوازە بە ڕاشکاوی بەدوای چی گوتندایە نەک چۆن گوتن.

ڕەهەندی دووهەم واتا ئەدەبی سەرەتا بەو پێشفەرزەوە دەڕوانێتە دەقی ئەدەبی کە بەرهەمێکی ئەدەبی و زمانییە. بەو پێیە لێکدان و لێکۆڵینەوە زمانییەکان دەکاتە تەوەری باسی خۆی و لە پاڵ ئەم باسە سەرەکییەدا، ئاوڕ دەداتە سەر لایەنە مانایی و نێوەڕۆکی و چەمکییەکانی دەق و چۆنییەتی هەڵسوکەوتی لە تەک زمان و نۆژەنی و ژیاندنەوەی لایەنە زمانییەکان و چۆنیەتی خوڵقاندنی مانا دەبێتە هەوێنی باسی ئەم شێوازە ڕەخنەییە. واتا چۆن گوتن، ناوەندی باس و خواسەکانیەتی.

ئەم دوو دەلاقە و مێتۆدە ڕەخنەییە، هەردووک بوونیان هەیە و نکۆڵی لە هیچیان ناکرێ. هەردووک لایەنیش لایەنگری تایبەتی خۆیان هەیە و خوێنەری خۆیان.

تیۆریی ئەدەبیی مۆدێرن، لە ڕەهەندی دووهەمەوە دەڕوانێتە ئەدەب و ڕەخنەی مۆدێرن بەگشتی. بەرهەمی ئەدەبی و بەتایبەت شیعر سەرەتا بە بەرهەمی زمانی و خوڵقاوی زمان دەناسێ و ئەوەی بۆ ڕەخنەگری مۆدێرن سەرەتی هەیە، کایە زمانییەکان و چۆنیەتی تەقینەوەی زەرفییەتە کەڵەکەبووەکانی زمانە لە ناخی دەقدا. ئەوەی مرۆڤ تووشی سەرسووڕمان دەکا و دژوازییەکی سەیر پێک دێنێ، ئەم ڕووداوەیە کە تاقمێکی نوێخواز و بەبڕوای خۆیان ئاڤانگارد (کە حازر نین یەک بستیش لەم پلەیە دابەزن) لەسەر بەرهەمێکی تەواو ئەدەبی

(دەقی شیعری نوێ) بە دەلاقەی ئائەدەبی و نامۆدێرنەوە دەڕوانن و حوکمی بۆ دەدەن.
تەنانەت لە مەودای شۆڕبوونەوە یان لەم دەلاقەیەوە بۆ دەقی ئەدەبی، سووکەئاوڕێکیش لەلایەنی زمانیی دەقەکە نادەنەوە. ئەم جۆرە پاڕادۆکسە سەیرانەش لەوانەیە هەر لە کۆمەڵگای قەیراناوی و ئاشی مجێورانەی خۆماندا بەدی بکرێ، کۆمەڵگای سوننەتی، مۆدێرنخوازی پۆستمۆدێرنگەرا! دیارە ئەم ئاڵۆزکاوییە لە بواری ڕەخنەدا، هەڵەی میتۆدی ساز دەکا و هەر لە بنەڕەتدا لێکدانەوە و بۆچوونەکان لە مەنتقی ڕەخنەیی و «تحلیلی» بێبەش دەبن.

* * *

**٢- شیعری سوارە، مۆدێرنە یان نامۆدێرن؟**

ساڵی ١٣٠١ی هەتاوی ١٩٢٢، ساڵی خوڵقانی «ئەفسانە»ی نیما و نوێبوونەوەی شیعری شێدار و تۆزاوی و گنخاوی فارسییە. نزیک لە چل پەنجا ساڵ بەر لە خوڵقانی «خەوەبەردینە» و «شار»ی سوارە.
نیما ،بە تەریک بوونەوە لە شار و دیاردەکانی و هەراوهوریای شارنشینی و کەش‌وهەوای ئاکادێمیک و دەمەتەقەی دەرس و مەدرەسە و زانستگاکان و (کە بە لەونێک دۆستی دێرین‌و شاعیری جاران و مامۆستای زانکۆی ناسراوی ئێستا. دکتۆر ناتل خانلەریشی وەدەنگ هێناو مۆرکی لادێیی و پاشکەوتوویی و دوورەپەرێزی لە نیمادا) لەنێو دڵی دارستانەکانی چرو‌پڕی گیلان و لە بناری شاری دەریا و چۆم و کانیاو و شالیزارەکاندا. کۆشک و تەلاری ئانتیک و تۆزاوی و درزبردووی شیعری فارسی تووشی هەژان کرد و هەوڵی ڕووخان و بنەماشکێنی و دووبارەبنیات نانەوەی شیعری فارسیدا.
لە سەرجەمی شیعرە ئەزموونخواز و پارادایم ئاساییانەی نیمادا، دیمەنەکانی سروشتی‌و دیاردەلادێیی و ناشارییەکان، لەگەڵ گاشەبەردی تێرمەکانی سواوی شیعری فارسی سەر ئەسوێن.

...

**چه در آن کوهها داشت می‌ساخت**
**دست مردم بیالود در گل**

* * *

**سالها طی شدند از پی هم**
**یک گوزن فراری در آنجا**
**شاخه‌ای را ز برگش تهی کرد**

* * *

**گلەی چند بز در چراگاه**
**بعد از آن، مرد چوپان پیری**
**اندر آن تنگنا جست خانە**

**«بەشێک لە ئەفسانەی نیما»**

**١ـ ڕەخنەی ئائەدەبی:**

سەرجەمی ئەفسانەی نیما، وێناکردنی جیهانی لادێیی و ناشارە،کێو و دەشت و لێرەوارو شوان و ڕەوە و... کۆڵەکەکانی شیعری نیما پێک دێنن. کۆی ئەم مۆتیفانە و کارکردیان، پازێلی تابلۆی ئەندێشە بەرهەمهێنەرەکەی پێک دێنن، ئەندێشەیەکی ناشاریی و لادێیی. واتا ئەم واژە نامۆدێرنانە. وەک تێز و ئانتی‌تێز، لە ئاکامدا ڕێگەیەک جگە لە سەنتێزی ئەم بۆچوونە ناگرنە بەر.

**٢ـ ڕەهەندی ئەدەبی:**

ئەم شیعرەی نیما، لە چەند بارەوە لە شیعری کلاسیکی باوی بەر لە خۆی تێپەڕاندووە و بینای فەزایەکی نوێی شیعری دامەزراندووە.

١- گوتاری باوی شیعری کلاسیکی وەلاناوە و لە گوتاری سوبژێکتیو و دەرهەست و ڕۆمانسییانەی ناسیاو هاتووەتە نێو فەزایەکی بەرهەست و ئابژێکتیوانەی نوێ و داڕشتنی دیمەنی دەوروبەری خۆی.

٢- فۆرمێکی ناسواو و دەکارنەکراوی بەخۆوە گرتووە، کە نە غەزەلە و نە قەسیدە و نە مەسنەوی و نە فۆرم تایبەتە بەم شیعرەوە، فۆرم و نێوەڕۆک پێکەوە خولقاون. سەروا سەروەریی خۆی لە دەست داوە، بەپێی پێویست و بۆ خولقاندنی مۆسیقای دەروونی دەکار کراوە. «داشت، می‌ساخت/شاخه‌ای/ بعد از آن ، چوپانی، اندر آن/...» هەر بەم چەند کارکردەوە، بناغەی گوتاری شیعری نوێی فارسی دامەزراندووە.

لەنێو بینای تازەی نیما و هەوای نۆژەنی ئەم فەزایەدا، شیعری نوێی فارسی چەکەرەی داو گەشەی کرد و لق و پۆپی وەک «نوسرەت ڕەحمانی، ئیبتیهاج، کەسرایی، شاملو، ئەخەوان سالس،نادرپوور، ئاتەشی، فرووغ، ڕۆیائی، سپێهری، سپانلوو، ئەحمەدی و...» و سەدان داهێنەری دیکەی لێ‌کەوتەوە. لە ١٩٢٢دوە تاکو هەنووکە، گەلێ لەسەر لایەنە جۆراوجۆرەکانی زمانی، جوانی‌ناسی، مانایی و تەنانەت نێوەڕۆک و کەسایەتیی داهێنەرو... وتار و نووسراوە و باس‌وخواس دامەزراوە، بەڵام کەمتر هەبووە شک لە مۆدێرن بوونی نیمادا

بکەن و گوزارەی داهاتوو پێک هاتبێ:
«نیما، بەپێی ئەو واژە و دیاردە و دیمەنە لادێییی و ناشارییانەی لە نێو بەرهەمەکانیدا کەلکی لێ وەرگرتوون لادێیی و نامۆدێرنە».
(بە پێچەوانەی فەزای شیعری و ڕەخنەیی ئێمە کە بە سانایی ئەم گوزارەیەئاراستەی زۆر شاعیر و لەوان سوارە دەکرێ.)
بۆچ لە پانتایی شیعری فارسیدا ئەم گوزارەیە پێک نەهاتووە؟ دیارە سەرجەمی نووسەران و ڕەخنەگران و شاعیران دەلاقە و ڕەهەندەکەیان لێ تێک نەچووە. زانیویانە و چاوەڕوانییان هەر ئەمە بووە کە نیما نە کۆمەڵناس بووە، نە فەیلەسووف و نە دەروونناس. نیما شاعیر بوو، ڕەفتاری شاعیرانەشی لێ چاوەڕوان دەکرا. ئەرکی شاعیر، سەرەتا پالاوتنی زمانە. نیما پابەند بوو بە بایەخەکانی ئەخلاقی ئەدەبی. ئەم بایەخانە لە جیهانی ئەدەب و لە پانتایی شیعردا، لە ڕوانگەی شاعیر سەبارەت بە ئایدویالۆژیا و کۆمەڵگە و ئەخلاق و... پێک نایە، بەڵکو لە بۆچوون و هەڵسوکەوتی سەبارەت بە زمان دەردەکەوێ و ئەو شاعیرەی هەڵسوکەوتی لە تەک ئەم دیاردەیە بە مەنتیقێکی شاعیرانەوە بێ و خۆی بە پالاوتنیەوە ماندوو بکا، ئەخلاقی شاعیرانەی پاراستووە و ئەرکی خۆی بەجێ هێناوە، نەک بە دەکارکردنی سەرێتیی زمان و پێهەڵاگوتن بە مۆدێرنە و نوێگەرایی و نۆژەنی.
دەروونی ئێمە خاوەنی چەند دەنگ و ڕووحی جیاواز و دژ بەیەک ئەرکی شاعیر سەبارەت بەم ڕووحە چەند پارچە و دژوازەی دەروون و هەمزادی (دژەمن) ئیزن پێدان بە وەدەنگ هاتنی ئەم دەنگە دژانەیە، دیارە ئەم ئەرکەش سەرەتا لە ڕێگەی زمانەوە بەجێ دەگەیەنرێ، بەم پێیە ئەخلاق و ئەرکی ئەدەبی، خزمەت بە زمانە بۆ ئەوەی دەنگە دژەکان وەدەنگ بێن.
نیما بەم ئەسڵە سەرەکییەی زانی و ئەرکی زمان و ئەدەبی بەجێ هێنا و خوێنەران و ڕەخنەگرانی جیددیی شیعری فارسیش ئەم هەوڵەی نیمایان قۆستووەتەوە، بۆیەش گوزارە گۆڕینەکە ڕێگەی پێکهاتن و تەنەوەکردنی نەبووە.

* * *

سوارە، لە پانتایی شیعری کوردیدا، هەوڵێکی مەیلەونیمایی داوە و شێعری کوردی نوێ کردووەتەوە، زۆرکەس لەسەر ئەم بڕوایە نین و گۆران بە نوێکەرەوەی شێعری کوردی دەزانن و سوارە بە پەیڕەوی گۆران دادەنێن.
کێشەکەی مۆدێرن بوونی نیما، بە لەونێک بۆ گۆڕانیش لە حەوزەی شێعری کوردیدا

کارکردی هەیە، واتا کەم کەس هەبووە بە نوێخواز و مۆدێرنی نەناسێ،بەڵام تاوانبارکردنی سوارە بە نامۆدێرن و لادێیی بە ئاشکرا و بە ڕەها بینراوە و بیستراوە. بەڵگە بۆ ئەم تاوانبار کردنەش، تێم و وێنە و بۆچوونەکانی نێو دەقە شیعرییەکانە سەبارەت بە شار کە نامۆدێرن و دژە شار و لادێیین. ئەم تاقمە، سەرەڕای ئەوەی بە ڕەهەندی نائەدەبییەوە دەقی شیعری سوارەیان خوێندووەتەوە، بە گوزارەیەکی ساکاریش ئەم تاوانبارکردنە جێبەجێ دەکەن. گوزارە فۆرموڵ ئاسایەکە ئەمەیە: «هەرکەس بۆ مۆدێرنیتە بنووسێ و پێی هەڵبڵێ و دەسکەوتەکانی بە پیرۆز بزانێ مۆدێرنە و بەپێچەوانە نامۆدێرن».

بەر لەوەی ڕێک بچینە سەر بەرهەمەکانی سوارە بۆ هەڵسەنگاندنی ئەم بۆچوونانە،با بەراوردێکمان هەبێ لە مابەینی شیعرێکی مۆدێرن و شیعرێکی لادێیی بە پێوانەی فۆرموڵە گۆرینەکە، بۆ ئەوەی کارکردی ئەم فۆرموڵەمان زیاتر بۆ ڕوون بێتەوە.

**مەدەنییەت**

**مەدەنییەت: گوڵی بەهاری حەیات**

**مەدەنییەت: هەوای نەشوغا**

**مەدەنییەت: وەسیلەی ئەحیا**

**بۆ هەموو میللەت و عمومی وڵات!**

**مەدەنییەت: ئەلەکتریک، قەمەر**

**ئەی زیانبەخشی حاڵی نەوعی بەشەر**

(دیوانی گۆران، لاپەڕەی ٨٤)

ئەگەر بە ڕەهەندی نائەدەبییەوە بڕوانینە ئەم دەقە. بەو ماکە و دیاردانەی کە لە نێو دەقدا حزووریان هەیە. (مەدەنییەت، ئەلەکتریک، قەمەر...) و بەو دەلالەتانەی کە پێکەوە بەدی دێنن، (واتا مەدەنییەت، بە دیاردەگەلی وەک ئەلەکتریک و قەمەر... بۆ نەوعی بەشەر بەرهەمهێنەری ڕووناکی و گەشە و بووژانەوەیە)، ئەمەش دیارە، پوختەی ئەو زەینە مۆدێرنیتەخوازییەیە نەک مۆدێرن بەرهەمهێنەری ئەم دەقە بووبێ،بەڵام بە ڕوانین لە دەلاقەی ئەدەبییەوە، بە ئەنجامی جیاواز دەگەین. ئێمە جگە لە حزووری زەقی چەند واژەی نوێ، وێنەو گوتارێکی نوێمان نایەتە بەرچاو، واتا تیژ و ئانتیتیژگەلی نێو بەرهەم، بە سەنتێزێکی دووپاتەکراوە ناگەن. واژەکان بە تەنیا ماونەتەوە و پێکەوە نەیانتوانیوە خاوەنی فەزا و دەلالەتێکی نوێ بن.

فۆرمیش یەک موو لە فۆرمی ئاسیاوی کلاسیک لای نەداوە. حزووری تۆخ و داسەپاوی

سەروا، یەکسانی بڕگەیی دێڕەکان تەواوی فۆرمی بەرهەمیان تەنیوەتەوە و هیچ جەسارەتێک سەبارەت بە فۆڕمی کلاسیک لە ڕەهەندی نائەدەبییەوەش بۆ مۆدێرنبوونی ئەم بەرهەمە نادۆزرێتەوە.

بە کورتی ئەم هۆنراوەیە، تەواوی ماکەکانی شاربوون و لادێیی نەبوونی (بە پێوانەی دۆستان) پێوە دیارە، بەڵام ئەگەر باسی ئەتۆم و ئینترنێتیشی کردبایە، دیارە خاوەنی تەواوی چوارچێوە تەسک و داڕێژراوەکانی شیعری کلاسیکە. نە نوێیە و نە مۆدێرنە و تێمی مۆدێرنخوازانە، زمان و پێکهاتە هەر کلاسیکە و کۆن.

**گوڵم هەرێمی زۆنگ و زەل**

**چلۆن ئەبێتە جارەگوڵ**

**لە شاری تۆ، لە بانی عەرشە قۆندەرەی دراو**

**شارەکەت**

**ئاسکە جوانەکەم!**

**تەسکە بۆ ئەوین و بۆ خەفەت هەراو**

**منێ کە گۆچی تاوی گەرمی بەر دەوارەکەی عەشیرەتم**

**بە دارەتەرمی کووچە تەنگەکانی شارەکەت**

**ڕانەهاتووە لەشم**

(سوارە ئیلخانیزادە. خەوەبەردینە ـ شیعری شار)

دەقی شیعری سوارە، بەپێچەوانە، پڕە لە دەلالەتەکانی دژە شار و دەسکەوتەکانی و سواردش هەر لەو دیاردانەی گۆران پێیان هەڵدەڵێ (هەڵبەت لە دەسکەوتە دزێوەکانی) هەڵدێ و پەنا دەباتە دێیەکەی. ئەم تێمە دژە شارە، لە قەوارەی بەرهەمێکی شیعری ناکلاسیکدا جێ دراوە. پێکهاتە، قالب، سەروا و زمان تەواو نوێ کراونەتەوە و لە شیعری کۆن و قالبە داڕێژراوەکانی و سەروای داسەپاوی دووپاتبوو و زمان و وێنە و ڕێکەوەند و دەستەواژەی سواو، خۆی ڕزگار کردووە و تەواو لە هەوای نوێ و تازەدا هەناسە هەڵدەکێشێ.

١- یەکسانی عەرووزی (فاعیلا)تەکانی بەپێی پێداویستی شیعر و ڕزگارکردنی لە زۆر بڵێیی و درێژدادڕی بۆ پڕکردنەوەی جەدوەلی کێش تێکشکاند.

شارەکەت... فاعەلوون(١)

ئاسکە جوان / نەکەم ... فاعەلۆن فەعەل (١/٥)

تەسکە بۆ/ ئەوین و بۆ/ خەفەت هەروا/ ...فاعەلۆن مەفاعەلۆن مەفاعەلۆن (٣/٥)

٢- تابووی سەروا و حزووری داسەپاوی وەلا نا و سەروا لەو جێگایانەی کە شیعر دەخوازێ دەکار کرا. مۆسیقی شیعر، نەک هەر بە عەرووز و سەروای داسەپاوی دەرەکی، بەڵکو بە سەروای ناوەکی و هارمۆنیایی پیتەکان دڵبزوێنتر هاتە خوڵقان:

**گوڵم هەرێمی زۆنگ و زەل**

**چلۆن ئەبێتە جارەگوڵ**

لەم دوو دێڕەدا، دووپاتبوونەوەی سێ پیتی ( گ، ز، ل) بەبێ حزووری دیاری سەروا، مۆسیقایەکی سەرنجڕاکێشی خوڵقاندووە. بەر لەوەی کە دووپاتبوونەوەی پیتی (گ) حزووری «گوڵ» چەند قات تۆخ دەکاتەوە و بە دووبارە بوونەوەی پیتی «ز» ناحەزی و نالەباری هەرێمی دژەگوڵ و جوانی «شار» لە نێو گوێچکەدا دەزرنگێنێتەوە. چوار جار هاتنی پیتی «ل»ش لەم دوو تاکبەیتەدا، وەک چوار گوڵمیخ وێنەی خوڵقاوی دێڕەکان پتەو دەکا و فۆرم و بێچمیان دەداتێ. هەر بەم پێیە. خوێنەری ژێر ئەم جۆرە مۆسیقا دەروونییەی لە بەشەکانی دیکەی بەرهەم بۆ دەدۆزرێتەوە.

٣- ڕێکەوەند و وێنەی نوێ و نەسواو و دەکار نەکراوی هێنایە نێو زمانی شیعری و تابووی تێرم و ڕێکەوەندی فۆرمۆڵئاسای کۆنی تێک دا. میتافۆری نوێی «قۆندەرەی دراو» و خوازەی «دارەتەرمی کووچە» دوو نموونەن بۆ خوازە و میتافۆرگەلی نوێ و نەسواوی نێو بەرهەم و ئەم جۆرە داڕشتنە شیعرییە نوێیە لە زمانی سوارەدا دێتە بەرچاو.

٤- شیعری وەک جەستەیەکی پتەو و ئۆرگانێک کە تەواوی ماکە و پاژەکانی پێکەوە پێوەندی پتەویان هەبێ، خوڵقاند و ئیجازی گەیاندنەو پەڕی و حەشو و زێدە وشەی لە قەوارەی دەق هەڵاوارد. بەم حاڵە ئایا فۆرمۆڵە گۆڕینەکە ئیتر کارکردێکی دەمێنێ؟ لە هەر دێڕێک لە شیعری شار، پاژێک لە شاری مەبەستی شاعیر وێنا دەکرێ و سەرجەمی ئەم پاژانە پێکەوە تەواوکەرەوەی جەستەی شارن، بەم جۆرە دەق دەخوازێ کە بە شێوەی ئەستوونی بخوێنرێتەوە، نەک ئاسۆیی. تەواوی وێنە و دەستەواژەکان پێکەوە دەلکێن و بەبێ یەک ناتەواون.

ئەم چوار نموونە و بەڵگەیە، هەڵبژاردەیەکن لە کۆی تەواوی ئەو بەڵگە و خاڵانەی دەکرێ بۆ مۆدێرنبوونی شیعری سوارە بێنینەوە. دیسان پێویستە بوترێ کە ئەم خوێندنەوەیە، لەسەر یەک بەرهەم (شار) دواجار لەسەر بەشێکی کورت لەم بەرهەمە ئەنجام دراوە. دیارە هەر بە قیاسێکی سادەش دەردەکەوێ کە باس لەسەر تەواوی بەرهەمەکانی سوارە، تا چ ڕادەیەک دەستی ڕەخنەگر و خوێنەر بۆ بەڵگە هێنانەوە ئاوەڵا دەکا.

بەم حاڵەتەش، لەبەر ئەوەی تاوانبارکەرانی شیعری سوارە بە شیعری لادێیی، ئاماژە

دەکەنە نێوەڕۆک و مانای بەتایبەت شیعری (شار)، ئێمەش بۆ پاراستنی مێتۆدۆلۆژی و وتار و باسەکەمان، هەر بەو شێوەیە و لەسەر ئەم شیعرە باسەکەمان درێژە پێ دەدەین.

***

ئەمە حاشاهەڵنەگرە کە بەبێ کەشفی پێوەندیی پاژەکانی نێو دەق لەگەڵ یەک و لە تەک جەستەی دەق، ماناکانی دەق نادۆزرێنەوە. واتا ماناکانی دەق ئەو شتانە نین کە واژەکان پێمان دەڵێن. بەڵکو ئەو شتانەن کە واژەکان بۆ یەکتری دەدرکێنن.

هەر دالێک مەدلوولێکی هەیە و لە مابەینی ئەم دووانەدا دەلالەتێک ساز دەبێ. ئەمە تیۆرییە بەناوبانگەکەی سۆسۆرە کە «دریدا» بنەمای ئەم تیۆرییە دەشکێنێ و سەرلەنوێ ئاوا لێکی دەداتەوە:

مەودای مابەینی دال و مەدلوول جاری وایە زۆر دووروودرێژە و جاریش هەیە کە هەر نەبڕاوەیە، ئەم مەودایە لە دەقی ئەدەبیدا و بەتایبەت لە شیعردا خاوەنی زۆرترین پلەیە. کەشفی ئەم مەودایە و زنجیرەی دال و مەدلوولەکان، تا ئەو جێگەیەی بلوێ ئەرکی سەرشانی ڕەخنەگرە، وەستان لەسەر یەکەم پێوەندیی دال و مەدلوول، لە لای خوێنەرانی ئاسایی چاوەڕوان دەکرێ، بەڵام خوێنەری چالاک و ڕەخنەگر ناتوانێ قەناعەت بەوەندە بکا و چاو لە زنجیرە دەلالەتەکان داپۆشێ.

«شار» لە یەکەم خوێندنەوەدا و لە توێژی یەکەمی دەلالەتەکاندا، خاوەنی نیشانە و دەلالەتەکانی بەڕواڵەت دژەشار و دەسکەوتەکانیەتی، بەڵام لە توێژی دووهەمی دەلالەتەکاندا و کەشفی زنجیرەکانی دال و مەدلوول، مانای جیاواز بەرهەم دێ.

(١)

- لە شاردا، دوو کاراکتێری «من»و «شار»، دەورێکی بەرچاویان هەیە. شار، لە ڕوانگەی «من»ەوە کۆمەڵێک ئاوەڵناوی دەدرێتە پاڵ. زۆربەی ئەم ئاوەڵناوانە دزێو و ناحەز و دژی جوانی و پاکین، بەڵام شار لقێکی دیکەشی لێ کەوتووەتەوە کە کارێکی ئیجابی بە نیسبەت «من»ەوە هەیە، ئەویش کاراکتێری تەماوی «تۆ»یە. ئەم کاراکتێرە قەت بە شێوەی سەربەست نەهاتووەتە کایە، بەردەوام لکاوەتە چەند واژە و دیاردە و ئاوەڵناوەوە.

**گوڵم**
**دڵم پڕە لە دەرد و کوڵ**
**ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت**

**ئەڵێم بە جامێ ئاوی کانیاوی دێیەکەم**
**عیلاجی کەم کوڵی دڵی پڕم، لە دەردی ئینتیزارەکەت**

...

لە سەرلەبەری دەقدا، دێ و دیاردەکانی خراونەتە پاڵ «من» کە لە شار هەڵدێ و شار و دەسکەوتەکانی لەگەڵ «تۆ»ی لکاو هاتووەتە کایە.

گوڵم ـ شارەکەت ـ ئینتیزارەکەت

دڵم ـ دێیەکەم

«تۆ» بە چەند ئاوڵناوی بلاوێن و ئەویندارانەی دیش لە نێو دەقدا حزووری هەیە.

گوڵم... ئاسکە جوانەکەم

بەم حاڵە «من» لە لایەک خولیای دێیە و لە لایەکی دیش شەیدای «تۆ».

بەڵام کاراکتێری «تۆ» ،لەگەڵ شار بەردەوام تێکهاڵاون و لە زۆربەی دەقدا، شار بە تەنیا نەهاتووە و لکاوە بە «تۆ» واتا «شار»ی «تۆ».

سەرلەبەری دەق بەم پێوەندییانەوە پێمان دەسەلمێنێ کە ئەگەر «شار» دیاردەگەلی دزێوی وەک «هاڕە هاڕ، ڕۆژی چڵکن، شەوی پڕ تاو و یاو، غەوارەبوونی مەلی ئەوین، کەمەندی دووکەڵ، دەستی چێوی، زەلیل بوونی شێر باو بوونی ڕێوی، پەتاداربوونی نیگاکان، تەسکبوونی مەودا بۆ ئەوین و هەراوبوون بۆ خەفەت، دارەتەرمی کووچەکان و...»ی لێ کەوتووەتەوە، دیاردەیەکی دڵگیر و خۆشەویستی وەک «تۆ»شی بەرهەم هێناوە. بەکورتی شار دوو لقی لێ بووەتەوە:

ـ دیاردە سەلبییەکان

(هاڕەهاڕ، ڕۆژی چڵکن و...) شار

ـ دیاردە ئیجابییەکان

(کە تۆ سەمبولی تەواوی ئەم دیاردانەیە)

لە زنجیرەی دووهەمی داڵ و مەدلوولەکان «تۆ» دەبێتە نیشانەیەک بۆ تەواوی دیاردە ئیجابی و بەکەلک و باشەکانی «شار» کە «من» لەگەڵ ئەوەی لە دەست دیاردەسەلبییەکان ڕادەکا بۆ لای پاکی و هێمنی دێ، چاویشی لە «تۆ» واتا دیاردە ئیجابییەکانە کە ڕۆژێک بۆی بگەڕێتەوە، واتا منی شیعری بە ڕوانگەیەکی ڕەخنەگرانە دەڕوانێتە شار، وەک کەسێک پسپۆڕی کێشەکانی شاری مۆدێرنیتە بێ و شاعیرانە بڕوانێتە هەردووک لایەنی ئەم دیاردەیە. لەوانەیە حزووری «تۆ» لەم دەقە شیعرییەدا، هەر بە بەردەنگێک بۆ تۆخکردنی

باری دراماتیکی و عاتیفی شیعرەکە دابنرێ و بەس، بەڵام ئەمە هەر تەنیا دەلالەتێکی ساکار و خوێندنەوەیەکی ڕووکەشی پاژەکانی بەرهەمە. ئەم خوێندنەوەیە لەگەڵ پێکهاتەی پتەو و تێکچرژاو و ئیجازی بەرچاوی دەق یەک ناگرێتەوە و پێویستە دان بەوەدا بنێین کە هیچ واژە و دیاردەیەک بەبێ کارکردێکی شوێندانەر و بەبێ پێوەندی لە تەک یەک و لەگەڵ دەق نایەتە کایە. بەم جۆرە، دابەزاندنی ئەم کاراکتێرە شیعرییەش تا ڕادەی بەردەنگێکی شیعری، خوێندنەوەیەکی تەقلیل گەرایانەیە. لە پشت لکاندنی بەردەوامی «تۆ» بە «شار» و چەند پاتەکردنەوەی لە قەوارەی دەقدا،دەلالەتێکی هەراوتر لە بەردەنگێکی ساکار خۆی حەشار داوە. دەق لەسەر سێکوچکەی «من، شار، تۆ» دامەزراوە. کە وابوو، «تۆ» بۆی هەیە کارکردێکی شوێن دانەرتری هەبێ لە بەردەنگێکی خەساو و «منفعل» کە ئاماژەی پێدرا.

**(٢)**

عەقڵانییەتی زاڵی شار و ناوەندبوونی ئەم عەقڵانییەتە بۆ مەعریفە و کەشفی حەقیقەت، بەرهەمی فیکری سەدەی هەژدە بوو، کە ڕێکوپێکی و عەقڵانییەتی دەنرخاند و جیهانی بە ماشێنێکی گەورە دەشوبهاند کە پاژەکانی پێکەوە کار دەکەن و شار بۆ زەینییەتی عەقڵخوازی سەدەی هەژدە، ناوەندی هونەر و ئەدەب بوو. ئەم بۆچوونە، لە ئاخر و ئۆخری سەدەی هەژدە و سەرەتای سەدەی نۆزدە و دوای شۆڕشەکانی ئەمریکا و فەڕەنسە ئاڵوگۆڕی بەسەردا هات. لە باری ئەدەبیشدا بە بۆچوونەکانی «ویلیام وردز ورس»، ئەم ڕوانگەیە تێکچوو، ئیتر ئەمە شار نەبوو کە مەکۆی کەشفی حەقیقەت بێ بە جەستەی وەک ماشێنی و عەقڵانییەت و ڕێکوپێکی خۆی و ناوەند بێ بۆ هونەر و ئەدەب، بەڵکو شهوود بوو بە ڕێگا چارەی کەشفی حەقیقەت و جیهان نەک بە ماشێنێک کە بە ئەندامێکی زیندوو و بەردەوام لە حاڵی گەشکردندا دانرا و گوند و لادێ و پاکی و خاوێنی و هێمنییەکەی بوو بە شوێنگەیەک بۆ مرۆڤ تاکو لە پەنایدا فێرە مەعریفە بێ و حەقیقەتی دەروونی خۆی تێدا بدۆزێتەوە. بەم حاڵە، ئەگەرکو سەلەفی و کۆنەپەرستی و نوێخوازی و مۆدێرن بوون ببەستینەوە بە هاوتەریبی لەگەڵ زەمان و ئاڵوگۆڕەکانی فیکری، سوارە لە شیعرەکەیدا سەر بە ئاڵوگۆڕە فیکرییەکانی دوای سەدەی هەژدەی تێپەڕاندووە.

**(٣)**

لێکۆڵینەوە لەسەر خەسڵەتەکانی نێوان دەقی لە نێوان دەقە شیعرییەکانی سوارە و دەلالەتەکانی پتەوکەری ئەم دەقانە، وتارێکی تێروتەسەل و سەربەخۆ دەخوازێ، بەڵام بۆ

ئەوەی جۆرێکی دیکەی سەلماندنی مۆدێرن بوونی سوارە بخەینە بەرچاو، سووکەئاوڕێک لەم لایەنەش دەدەینەوە:

ئەگەر دەقی شیعری «شار» هەڵاتنە لە شاری تووشی دەسکەوتە دزێوەکانی مۆدێرنیتە هاتوو، ئەمــە هەر لایەکی کـێــشــەکــەیە و ڕووەکــەی دیکەی ئەم هەڵاتنە گــەڕانەوەیەکی ڕیفــورمخــوازانە و هیــوادارانەی بەدواوەیە. شــاری کـۆمــەڵگای ســونەتی، بەپێی دۆخی تێپەڕاندنو لە لایەکی دیکەش خێرایی هێرشی دیاردەکانی مۆدێرنیتە و پیشەسازی، دەبێتە ئاشی مـجـێـورێکی سـەیر و دێوەزمـەیەکی ناحـەز کـە سـوارەش لەبەر ئەم ناڕێکوپێکی و سـەرسـامـیــیـە هەڵدێ، بەڵام بەم حـاڵـەش چاوی لە داهاتووە کـە لەودا، لایەنە ناحـەز و ناڕێکەکانی هەردووک دۆخی سوننەت و مۆدێرنیتە لە کۆمەڵگادا وەلا بنرێن و وڵات ببێتە تابلۆی جوانی و گەشە و پاکی و حەسانەوە.

**خۆشەویستەکەم**
**لە پەنجەرەی نیوەتاکی بوومەلێڵەوە**
**چاوی من لە دیەنی کچی بەیانییە**
**لە حەنجەرەی زەمانەوە**
**گوێم لە زەمزەمەی زوڵاڵی خیزە وردەکانی کانییە**
...

(کچی بەیان، خەوەبەردینە)

*** پەراوێز:**
١) مێزگردی ڕۆژهەلات ـ ساڵی یەکەم ـ ژمارە ١٨، ٢٧ی ڕەزبەری ١٣٨٣

*** سەرچاوەکان:**


١- تکخوانی دو صدایی ـ گفتگوی اوکتاویو پاز
٢- رەخنەی ئەدەبی و قوتابخانەکانی، وەرگێڕاوی عەبدولخالق یەعقووبی،(نووسینی چارلز بریسلێر)، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٢
٣- خەوەبەردینە ـ کۆمەڵە شیعری سوارە ئیلخانیزادە
٤- دیوانی گۆران
٥- مجموعە اشعار نیما.

# لە نێوان هەڵەوپەڵەدا

جەعفەر حوسێنپوور (هێدی)

ئێمە لەمێژە گیرۆدەی ساغکردنەوەی شیعری شاعیرانی ڕابردوومانین، بەداخەوە هەلومەرجی نالەباری ڕابردوو و نەبوونی ئیمکانی چاپ و بڵاوکردنەوە، بوونە کۆسپی سەرەکی بێ هەڵە و پەڵە مانەوەی شیعری ئەو شاعیرانە و سەیر نییە کەچەند بەرەی دوای ئەو شاعیرانەش هەر سەرقاڵی ساغکردنەوەی دیوانەکانیان بن: بەڵام سەیرە کە دیوانی ئەو شاعیرانەی هێند لە مێژ نییە کۆچی دواییان کردووە و سەردەمی ژیانیان سەردەمی بێ ئیمکاناتی و «بێ دەفتەری» نەبووە، دیوانەکانیان پەڵەی تێ کەوێ و ناچار بین خۆ بە ساغکردنەوەیانەوەخەریک بکەین.

دیوانی «خەوەبەردینە»ی سوارە ئیلخانیزادە» دەلاپەڕەی (٢٦)دا، شیعرێکی تێدا بە نێوی «کۆرپەی لێوبەبار»: ئەو شیعرە ئی کاکە سواری نییە و بەداخەوە لە ئاکامی هەست بە بەرپرسایەتی نەکردندا کەوتۆتە نێو دیوانەکەوە. وەک لە بن شیعرەکە نووسراوە، ئەو شیعرە دیاریی کاک «ئەحمەد شەریفی»یە. بەپێی ئەو ئاگادارییەی ئەمن هەمە و لە ڕاستییەکەی دڵنیام، دوو ئاشنای کاک ئەحمەدی شەریفی ئەو شیعرەیان نووسیوە و بە گاڵتە، وەک شیعری سوارە داویانە بە کاک ئەحمەد. کاک ئەحمەدیش کە لەمێژە هۆگری بەرهەمەکانی سوارەیە و لە پێناو کۆکردنەوەیاندا دڵسۆزانە لە هەوڵدابووە، بەداخەوە لەو کاتەدا کەوی لێ بۆتە زڕەکەو و ئەو شیعرەی وەک شیعری سوارە قوازتۆتەوە و پاشان ناردوویە بۆ «گۆڤاری هیوا» و لە ئاکامیشدا کەوتۆتە توێی «خەوەبەردینە»وە!

بە پێویستی نازانم ئەو مەسەلەیە زیاتر بپشکنم، بەڵام بە ئەرکی سەر شانمی دەزانم تکا لە بڵاوکەرەوەی دیوانی کاکە سوارەبکەم هەتا لە چاپی دووهەمی «خەوەبەردینە»دا ئەو شیعرە دەرهاوێ و ئەو پەڵەیە لە دیوانەکە بسڕێتەوە، هیوامە هۆگرانی شیعری سوارەش، کە دیوانەکەیان لە بەر دەستە، خەتێکی ڕاست و چەپ بەو شیعرەدا بێنن و لە بیر خۆیانی بەرنەوە.

حەز دەکەم لە پاشکۆی ئەو قسانەمدا باسی شیعرێکی دیکە بکەم کە بەداخەوە ئەویش بە هەڵە، وەک شیعری «هێمن» بڵاو کراوەتەوە! لەو دوایانەدا بە هەڵکەوت چاوم بە چاپی دووهەمی «پاشەرۆک»ی مامۆستا هێمن کەوت: لەسەر پشتبەرگی «پاشەرۆک»ی چاپی دووهەمدا ئەو چوارینەیەم بەدی کرد:

تاقەداری کـزی پیـری عـەودال | دیەنی هێمنی هێنامە خەیال
وەکوو ئەو تاک و تەریک لەم لێژا | غەیری سوێرایی گراو نەیچێژا

بە لە بەر چاو گرتنی ئەوەی کە کۆمەڵێک نووسراوەی مامۆستا هێمنم بە دەسخەتی خۆی لەبەر دەستن و دەسـخـەتەکـەی دەناسـمـەوە، ئاشکرایە کـە ئەو چوارینەیە بە خـەتی هێـمن نووسـراوەتەوە، بەڵام ئیـمزای بن شیـعرەکـە ئی هێـمن نییـە و لەوانەیەشاکـارێکی دیکەی بڵاوکەرەوەی «پاشەرۆک» بێ! هەرکەس لەو ئیـمزایە ورد بێتەوە دەزانێ قـەڵەمی ئیمزاکە ئەو قـەڵەمە نییـە کـە شیـعـرەکـەی پێ نووسـراوە، ئەوجار شێـوازی نووسـینی شیـعـرەکـەش دەگـەڵ «شێـوازی مـوکـریانی»ی هێـمن نایەتەوە. لەوانـەیە مـام هێـمن ئەو شیـعـرەی، کـە بۆ وی نووسراوە، بە دڵ بووبێ و لە سەر کوتەکاغەزێکی نووسیـبێـتـەوە و پاشان کـەوتبێـتـە دەست بڵاوکەرەوە و ئەویش لە ناشارەزایی لێی بووبێ بە شیـعری هێـمن و ئیـمزا و تاریخیـشی لێ زیاد کردبێ! بەپێی تاریخی بن ئیمزاکە، شیـعرەکـە ساڵی (٦٤) نووسراوە، بەڵام ئەمن ئەو شیعرەم زۆر پێش ساڵی (٦٤) لەبەر بووە و بە شیعری «فـاتیحی شێخولئیسلامی (چاوە)»م زانیـوە و ئێـسـتـاش شیـعـرناسـان هەر بە شیـعـری «چاوە»ی دەزانن و لەوە دڵنیـان کـە ئەو چوارینەیە ئی هێمن نییە. هیوادارم تامەزرۆیانی شیعر ئەو گرێیانە بکەنەوە و نەهێڵن لێیان ببێتە گرێپووچکە.

**ئاڵمان ـ زستانی ١٩٩٨**

---

سەرچاوە: گۆڤاری «سروە»، ژمارە ١٤٤،لاپەڕە ٢٩



**بەڕێز: کاک هێدی**

**وێڕای سلاو و ئاواتی سەرکەوتن**

بەرهەمی ئێوەمان بە دەست گەیشت و لەلایەن بەرپرسانی ئەم بەشەوەبەوردی خوێندراوە. لەژێرەوەکورتەی بیروڕای ئێمەدەخوێننەوە. هیوادارین لەداهاتووشدا هاوکاریمان بکەن.

نامەکەی جەنابتمان پێگەیشت. زۆر سپاس کەباسی چۆنیەتی خولقانی «کۆڕبەی لێوبەبار»ت بۆ کردین، ئێمەدەزانین ئەو کەسانەی ئەو کارەیان کردووەکێن! دەستیان خۆش بێ. تەنیا فەرهەنگ و ئەدەبیاتی کوردی مابوو کەقوماری پێ بکەن. حەیف نییە گاڵتەبەشاعیرێکی وەک سوارەیا دڵسۆزێکی وەک کاک ئەحمەد شەریفی بکرێ. بەهەر حاڵ ئەم مەسەلەیەپێویستی بەڕوونکردنەوەیەکی قووڵتر هەیە. هیوادارین ڕۆژێک لەچوارچێوەی وتارێکدا، هەم ناوی کەسەکان بنووسرێ و هەم چۆنیەتی ڕووداوەکە. ئێمەکاتێک دیوانەکەمان چاپ دەکرد، بەچەند قۆڵی (کاک ئەحمەد قازی، کاک مارف ئاغایی و...) لەم شیعرەدواین، هەر چەند ماناکەمان بۆ ساغ نەبۆوە، بەڵام هیچ فکرمان بۆ ئەوەنەچوو هی کاک سوارەنەبێ، چونکەبەر لەئێمەش ئەم شیعرەبلاو کرابۆوە. با بزانین لەچاپەکانی دواییدا چ دەکەین!.

**١٣٧٦/٦/١١ـ ئارشیوی هێدی**

# کورتە وەڵامێک و ڕوونکردنەوەیەک

**ئەحمەد شەریفی**

برام کاک جەعفەر حوسێنپوور (هێدی) دە کورتە وتارێکدا، دە سروەی ٤١٤ی پووشپەڕی ١٣٧٧دا، دیاردە دەکەن کەشیعری «کۆڕپەی لێوبەبار» شیعری سوارە نییە و دەنووسێ: «دوو ئاشنای کاک ئەحمەد شەریفی ئەو شیعرەیان نووسیوە و بە گاڵتە، وەک شیعری سوارە، داویانە بەکاک ئەحمەد و...».

قسەکەی کاک جەعفەر ڕاستە، بەڵام دوو ئاشنا نەبوون و یەک کەس بوو. ئەو شیعرە کاک عەلی خزری، کە ئەوکات پێکەوە لە کرماشان بووین، دایمێ و کوتی شیعری سوارەیە و منیش لەگەڵ شیعر و شوێنەوارەکانی تری سواردا نووسیومەتەوە. ئێستا ئەگەر شیعری سوارەی نییە و کاک عەلی خزری گاڵتەی بە من و بە سوارە و خوێنەر و مێژووی ئەدەبی کوردی کردووە، ئەمن تاوانێکم نییە و با خوێنەر بزانێ کێ تاوانبارە.

ئێستا کە ئەم چەند دێڕە دەنووسم دەستی ڕاستەم لە چوار جێگادا شکاوە و ناتوانم خاسی بنووسم، دەنا ئەو هەویرە ئاوێکی فرەتری گەرەک بوو.

سەرچاوە: گوڤاری «سروە»، ژمارە ١٥١، لاپەڕە ٧٤

* * *

# ڕوونکردنەوەی ڕوونکردنەوەیەک

**عەلی خزری**

بەڕێز کاک ئەحمەد شەریفی لە «سروەی ژمارە ١٥١، لاپەڕەی ٧٤»دا لە بە خەیاڵ ڕوونکردنەوەیەکدا، بێئەوەی هەموو بارێکی مەبەستەکە هەڵسەنگێنێ زۆر دیزە و گۆزەی بە دەستی خۆی و ئەم و ئەو شکاو! لە سەری مندا دەشکێنێ و بە حورمەتی دەستی ڕاستی لە چوار جێگادا شکاوی نەبا، گۆیا خاستری دەنووسی و ئەو هەویرە چەندی ئاو هەڵگرتبا ئاوی لێدەنا. بەڵام هەویر شێلان، ئەویش بە دەستی چەپ، دەستاوێکی چاوپێداخشاندنەوەی گەرەک بوو، کە دڵنیام ئەو کات کاک ئەحمەد بۆی ڕوون دەبۆوە کێ گاڵتەی بە سوارە و خوێنەری سروە و مێژووی ئەدەبی کوردی کردووە؟ دەبوو بە گێڕانەوەی چۆنیەتی ڕووداوەکە ئەو داوەری و قەزاوەتە باوێتە ئەستۆی خوێنەران، نە ئەوە کە ئاوا بە کەملوتفی حوکم بدا.

بەهاری ساڵی ٦٢ی هەتاوی بوو، من و کاک ئەحمەد لە رادیۆ کوردیی کرماشان کارمان دەکرد. کتێبێکی کوردی کوردەکانی «ئێرەوان»م دەست کەوتبوو کە بە پیتی ڕووسی نووسرابوو. دەمهەویست بیهێنمە سەر ڕێنووسی پیتی عەرەبی و مانای هێندێک وشەی نامۆو گرانیش لێکدەمەوە، بەڵام هیچ فەرهەنگ و قامووسێکی وام لە دەستدا نەبوو، هەتا ڕۆژێک لە ماڵە کاک ئەحمەد چاوم بە کتێبێک کەوت کە هەرچەند قامووس نەبوو، بەڵام کاری منی تا ڕادەیەک پێ جێبەجێ دەبوو. داوای ئەو کتێبەم لێ کرد، بەڵام ئەو لە سەر عادەتی خۆی ئەو کتێبەی تەنانەت بە ئەمانەتیش نەدامێ. دەیکوت کتێبەکانم هەموو هی تۆن، بەڵام بە مەرجێک لە ماڵە خۆم نەچنە دەرێ!

دیارە منیش دەمهەویست وەک مەرجەع ماوەیەک لە لام بێ. هەر نێوەنێوە لێم دووپاتە دەکردەوە، بەڵام بێ سوود بوو. بەرەبەری هاوینێ برای بەڕێزم کاک جەعفەر شێخولئیسلامی (ئاشتی) بۆ سەردانم هاتە کرماشان. کاک ئەحمەد ئەو کات بە گەرمی خەریکی کۆکردنەوەی شوێنەوارە جوانەکانی سوارەی ئەمر بوو. ڕۆژێک لە ڕادیۆ سێبەسێ دانیشتبووین، کوتم: کاک ئەحمەد ئەگەر بێتوو ئەو کتێبەم بدەیەی شیعرێکی بڵاو نەکراوەی سوارەت دەدەمێ. کوتی: باشە، سبەی بیهێنە، منیش کتێبەکە دێنم، ئەگەر شیعرەکە هی سوارەی بوو ئەوە سەودامان سەر دەگرێ.

شەو «ئاشتی» پرسی جا بە ڕاست تۆ شیعرێکی وات هەیە؟

کوتم: نا، بەڵام هەر ئەوەندە چەند وشە لەو وشانەی کە سوارەی ئەمر زۆرتر لە

شیعرەکانیدا کەڵکیان لێ وەردەگرێ لە پەنایەک دانێم و دوو سێ ڕستەی کورت و درێژیان لێ دروست کەم دەبمە خاوەنی کتێبەکە! لە سەر ئەو مەبەستە باسێکی تێروتەسەل و خەستوخۆڵ دامەزرا. «ئاشتی» لای وابوو کاک ئەحمەد دەزانێ و سەر ناگرێ. بەپێچەوانە من لام وابوو نە تەنیا کاک ئەحمەد بەڵکە زۆر کەسی دیش بەداخەوە ئەوەندەی سرنج دەدەنە مۆر و شەقڵ ئەوەندە گوێ نادەنە ناوک و نێوەرۆک. بۆ سەلماندنی ئەو بڕوایە هەوڵم دا تەنانەت شیعرەکە هیچ مانایەکی نەبێ، چونکە ئەگەر مانای بوایە دەکرا بڵێین ئەوە شیعرێکی لاوازی سوارەیە.

بەو شێوەیە شیعری «کۆرپەی لێوبەبار» بێ ئەوەی هیچی بەسەر هیچەوە بێ لە دایک بوو. بۆ بەیانی تەماشامان کرد کاک ئەحمەد کتێبەکەی هێناوە، کە شیعرەکەم بۆ خوێندەوە کوتی باوەڕ کە چەند ساڵە لەو شیعرەی دەگەڕێم!!! بیستبووم، بەڵام نەمدەزانی کێ هەیەتی. فەرموو ئەوەش کتێبەکە!!!.

ئەوە زۆرتر جەفەنگێکی دۆستانەبوو، نەک ئەو گاڵتەیەی کاک ئەحمەد باسی دەکا.

یەک دوو حەوتوو ڕابرد، ڕاستییەکەم پێ‌کوت، بەڵام باوەڕی نەکرد و لای وابوو گاڵتە دەکەم! زۆری پێ نەچوو لەوپەڕی سەرسوڕمانەوە دیتم گۆڤارێکی دەرەوەی وڵات ئەو شعرەی لە چاپ داوە. هەر بە دوای ویدا گۆڤارێکی دی بە ناوی دیاریی کاک ئەحمەد شەریفی چاپی کرد! ئەودەم کاک ئەحمەد هاتبووە سەر ئەو بڕوایە ئەگەر هی سوارەش نەبووبێ ئەوجار بوو بە هی سوارەی!!!

ئەو هەویرەی کاک ئەحمەد باسی دەکا، بۆیە زۆر ئاو هەڵدەگرێ چونکە دەبوو ئەودەم ئەو ڕاستییە بۆ ئەو دوو گۆڤارە بنووسێ، ئەوەش یانی زەدەدار بوونی متمانەیەکی کە ئەو وەک نووسەر، وەرگێڕ، لێکۆڵەر، کارناس، فۆلکلۆرناس، شیعرناس، دێرینەناس، دیناس، کۆمەڵناس، زمانەوان و.... پێکی هێناوە.

چەند ساڵ ڕابرد، مەبەستەکە بە ڕواڵەت لە بیر چووبۆوە. وا دیار بوو شیعر دەبێ خۆی شیعر بێ و بە هۆی کرچ و کاڵی نەفەوتێ، نە ئەوەکە ناوی شاعیر بیپارێزێ. کەچی کتێبی «خەوەبەردینە» لە ژێر چاپ هاتە دەر و دیتم ئەو کۆرپە ناشیرنە نە تەنیا نەمردووە بەڵکە لە جێگای دووهەمین شیعری جوانی سوارە قوت بۆتەوە و داوای میرات دەکا، وەک مەسەلەن لە «خەوەبەردینە» نەبێ لە وانی تر جوانترە!!!

دیارە هەر دەبوو سەبارەت بەو زەدەدار نەبوونە کاک ئەحمەد ئەو کۆرپەیە بە کۆرپەی بەحەقی سوارە بقەبڵێنێ و سوور بێ لە سەر ئەوە کە خۆی شاهیدی لە دایکبوونی بووە! پاش دەرچوونی «خەوەبەردینە» چاوم بە خوالێخۆشبوو مارف ئاغایی کەوت و ڕووداوەکەم بۆ باس

کرد، زۆری پێ تێکچوو، بەڵام نەیکوت چ دەکا و پاشانیش چم نەدی.

جا با کڵاوی خۆمان بکەینە قازی و هێندێک بە دڵفراوانی و پشوو لە سەرەخۆیی ئەو مەبەستە هەڵسەنگێنین. ئەو ڕووداوە مەبەستێکی خەمهێنەر و ئاهۆیەکی بە ژانمان، کە لەمێژە پێی گیرۆدەبن، لێ زەق دەکاتەوە و ئەو ڕێگا کۆن و پڕ کەندولەندەمان دێنێتەوە بەر، کە بە داخەوە وەک ڕچەیەکی باوەڕ پێکراو لەمێژە ئێمە پێیدا دەڕۆین، ئاهۆی لە خۆباییبوون و لەو توێلک و قاپۆڕە زل پەرەستنەدا حاسێ بوون! دیارەکەمترین زیانی ئەو ڕێگەیەش ئەوەیە بیرەکان لە بازنەیەکی بەرتەنگدا دەخولێنەوە و هەستی بەدیهێنان و خولقاندن لە کزی دەدەن. هونەر و ئەدەب لە پاوانی تاقمێکی تایبەتیدا، لە خۆباییبوون و خۆ بەزلزانینێک بەدی دێنێ کە ئەو تاقمە دێنە سەر ئەو باوەڕە ئاسمان کون بووە و ئەوان ڕۆهێشتراونەتە خوارێ! هەر ئەگەر بڕوانینە دەوروبەری خۆمان زۆرن ئەو کەسانەی کە لایان وایە لە هەر قامکیان هونەرێک دەبارێ! بە مانایەک، هیچ شتێک نییە ئەوان نەیزانن، جا چونکە ئەو ئیدیعایە لەنێو خۆیدا بۆشە، مێلودرامی وا پێکەنینهێنەر دەخولقێ.

بەڵام ئەگەر ئەو بازنەیە کەلێن و دەلاقەیەی تێدا بێ کە ڕووناکایی پێدا بێتە ژوور، ئەو کات وشەی «بۆم» ؟ قوت دەبێتەوە و ئێمە بە چاوی خۆمان جوان و ناحەزەکان دەبینین و پێویست ناکا کەس چاویلکەی ڕەنگیمان بداتێ و مافی سەربەخۆ بیرکردنەوەمان لێ زەوت بکا، ئەو کەشوهەوایە دەرفەتێک بەدی دێنێ کە لە خۆمان ڕابینین بیر و بڕوامان بە تێڕادیوی ڕابنێین و فێر بین و فێر کەین و لە ئاکامدا فەرهەنگ و ئەدەبمان گەشە بستێنێ. خزمەت بە ئەدەب ئەوە نییە لامان کفر بێ قەڵسە لەو خۆ بە زل زانییە بگێڕین! خزمەت بە هونەر ئەوە نییە لامان کفر بێ بە چاوی ڕەخنە بڕوانینە کارەکان، خۆشەویستیی سوارە ئەوە نییە بێ ئەوەی بڕوانینە کاکڵ و نێوەڕۆکی «کۆڕیەی لێوبەبار» بە دووهەمین شیعری جوانی سوارەی لەقەڵەم بدەین. کە دەڕوانینە پێشەکیی کتێبی «خەوەبەردینە» و ڕیزی ئەو بەڕێزانە دەبینین کە بە شیعرەکانی سوارەدا چوونەوە،جگە لە کاک عومەر ئیلخانی کە لە لاپەڕەی ١٧، پاراگرافی دووهەمدا ئیشارەیەک بە شکێک دەکا، سەرت سووڕ دەمێنێ کە ئایا دەکرێ ئەو لێنژنە بەهێزە ئەو پینە نالەبارەیان نەدیبێ؟ یان دیویانە، بەڵام چونکە لێی حاڵی نەبوون نەیانوێراوە باسی بکەن؟ یان ڕەخنە لە سوارەیان بە کفر زانیوە؟

کاک ئەحمەدی بەڕێز «کۆڕیەی لێوبەبار» گاڵتە نەبوو، دەمەلاسکەیەک بوو لەو حاڵی نەبوونە، قەڵسەگێڕانێک بوو لەو خۆ بە زل زانینە! شکاندنەوەی قوڵنجی ئەو دەستە بوو کە لە هەر قامکێکی هونەرێک دەبارێ. ڕەنگە ئەو جار ڕوون بووبێتەوە لەو نێوەدا کێ تاوانبارە؟

سەیر ئەوەیە شیعری ئەو گۆرانییانەی کە بە ناوی شیعری گومانلێکراوی خوالێخۆشبوو سواره دەریانهاویشتوون (چونکە دیویانە ساکار و سادەن) ڕاست شیعری سوارەن، یان وێچووتر ئەوەیە بڵێم ئەو بەڕێزە زۆر شیعری بۆ گۆرانی داناون. لە بیرمە کاک ئەحمەد ئەو کات لە کرماشان بووین لە ڕووی شریتی گۆرانییەکان ئەو شیعرانەی نووسینەوە.

ڕادیۆ کرماشان یەکەم ڕادیۆی کوردیی بەهێز بوو (چونکە بەر لەویش ڕادیوی کوردی بووە) کە خاوەنی ئارشیوێکی زۆر بایەدار بوو (کە بەداخەوە فەوتا) بەپێی باوی کاری ڕادیۆ کە گۆرانییەک تۆمار دەکرا، ناوی گۆرانیبێژ و شاعیر و مۆسیقار و ئۆپێراتۆر و کات و ساتی تۆمارکردنی، لە پشت قالبی ئەو شریتە دەنووسرا، ئەمن ماوەی هەشت ساڵ لەوێ کارم کردووە، چاوم زۆر بەو شریتانە کەوتووە کە بە ناوی شاعیر ناوی «سوارە ئیلخانیزادە»یان لەسەر نووسرابوو و جگەلەپەخشان و گۆرانی، تەنانەت بەیتی «لاس و خەزاڵ» یشم دیوە و سوارەی نەمر بە شێوەی چیرۆک دەریهێناوە و خۆشی دەوری تێدا گێڕابوو، کە وابزانم کاک ئەحمەد هەیەتی.

بە بڕوای من، خوالێخۆشبوو سوارە شاعیرێکی بە توانا و بە دەسەڵات بوو، هەرچەند زۆر کەس لای وایە ئەو بۆ دارژتنی شیعر، هەوڵی داوە لاسای شاعیرانی فارسی نوێبێژ بکاتەوە، بەڵام بە بڕوای من ئەگەر هێندێک بە وردبینییەوە سرنج بدەینە پەخشان و شیعر و کارەکانی تری سوارە، دەبینین ئەو وا قاڵی باوەشی سروشت و پاکیی ژیانی دوور لە شار و ئاوایی بووە و لەشبەباری، ئەویش لە هەرەتی گەنجی و کاتی فێربووندا و نیزیک بوون لە دیوەخان و هەرەتی باوی بەیتبێژ و حیکایەتخوان و حەیرانبێژ و.... سەرجەم، بە باو و نەریتی ڕەسەنی کوردی وا گۆش درابوو، کە شوێنەوارێکی بەدی ناکەی بە شێوەیەکی زۆر بەر چاو، ئەو ڕەنگ و بۆنەی تێدا هەست نەکرێ و سوارە کە دەڵێ: «گوڵم دڵم پڕە لە دەرد و کۆڵ» ، ئەوە تارمایی ئەو دەنگە بە سۆزەی حەیرانبێژە پیرە ڕاوێژ خۆشەکەیە، کە لە تارانی پڕ لە دووکەڵ و دەنگ و هەرا، ئێستاش وەبیر هاتنەوەی ئۆخژنی دەداتێ و جوانترین مۆسیقایە کە ددیکوت «ئایییی غەمی لە دڵم چەندە زۆرە عەزیزەکەی لە دنیایەم، ئای لە بەر ئەوێ غەمێ، ئای لەوێ زوڵمێ و...» . سوارە شێوەیەکی زۆر ڕەسەنی شیعری کوردی وەبیر هێناوە کە بەر لەویش «گۆران»ی نەمر ئاڵاکەی هەڵگرتبوو. هەروەک ژیانی ئینسان پلە و قۆناغی جۆراوجۆری هەیە، ژیانی ئەدەبیی شاعیرێکیش سەردەمی جۆراوجۆر تێپەڕ دەکا. شیعرەکانی سوارەش ئەو ڕێیەیان بڕیوە، کە وابوو هیچ سەیر نییە شیعری لاوازیشی هەبێ و تای تەرازووی هێندێکیان لە وانی دی سەر بکەن.

ئێمە دەبێ هەموو کات ئەوەمان لە بەر چاو بێ کە: شاعیرەکان شیعر دەخوڵقێنن و

شیعرەکان شاعیرەکان و ئەدەبی گەلەکەیان. بەڵێ، ئەوە ڕاستە کە سوارە شیعری زیندووی زۆرن و ئەو تەمەنە کورتە و ئەو سەرکەوتنە و ئەو ڕێ ڕژدە بڕینە وا بەلەز، توانا و هێزێکی زۆری دەوێ کە سوارە بووی، بەڵام سەرکەوتوویی شاعیر کاتێک دەردەکەوێ کە بە ڕانانی کارە لاواز و بەهێزەکانی قۆناغەکانی ژیانی ئەدەبیی ئەو، بناسرێن. ئەو ئامانجەش کاتێک دێتە دی کە ئەو بوارە هەڵبەستێن، لە قەدەر توانامان لە کاران ڕۆبێین و دەرگای بیروڕا گۆڕینەوەش ئاواڵە بێ، ئەگینا هەم لە خۆمان و هەم لەو کەسانەش «ئوستوورەی درۆیین» دروست دەکەین و مێژووی ئەدەبمان پڕ دەبێ لە چاووڕاو و پێداهەڵخوێندن و «ئەویەڕی بەشەر» خولقاندن. لە حاڵێکدا، ئەو کەسانە زۆربەی زۆریان، لە ژیانی خۆیاندا، خاکی و بێ فیزوهەوا بوون و لە ئوستوورەبوون جارز و وەڕز.

بیرەوەرییەکی خۆشم لە مام هێمنی نەمر هەیە کە نووسینی لێرەدا ڕەنگە جێی خۆی بێ.

چەند مانگ بەر لە دامەزرانی ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەییووبی و گۆڤاری «سروە» خوالێخۆشبوو مامۆستا هێمنی نەمر، لەگەڵ چەند هاوڕێ و دۆستی تر، لە کرماشان میوانم بوون. خەریکی کار لە سەر بەیت و حەیران و .... بووم، شەوێکی دانیشتبوو تەماشای دەکردین، لە نووسراوەیەکدا چاوی بەو دێڕە کەوت «ژن دەبێ بە شەووگوردی مێردی بشێ»، فەرمووی:

– ئەوەم بۆ لێکدەوە.

لە وەڵامدا کوتم:

– شەووگورد لە دوو وشەی «شە» و «گورد» پێکهاتووە، «شە» ئەو موو یان خوری یان مەرەزەیە کە ڕێسراوەو ئامادەیە بۆ کاری جۆلایی، «گورد» کەرەسەیەکی جۆلاییە کە وەک «شانە»یەکە هەر دوو لای گیرابێ و لە دار دروست دەکرێ. جا بۆ وێنە بۆ چنینی پۆپەشمێن لە «شە»یەک کەلک وەردەگیرێ کە زۆر ورد ڕێسرابێ و بۆ چنینی جاجم لە «شە»یەک کە درشت بێ. ئەو «شە»یانە بە دەنکەکانی ئەو «گورد»انەوە دەکرێن. هەر «شە»یەی «گورد»ی خۆی دەوێ. «شە»ی درشت لە «گورد»ی باریکەوە ناچێ و «شە»ی باریکیش لە «گورد»ی درشتدا کارەکە ناحەز دەکا. مەبەست ئەوەیە ژن دەبێ بزانێ بار و هەوای مێردەکەی چۆنە، ئاوای دەگەڵ پێ ڕاکێشێ.

فەرمووی ئەمن ئەوەم نەدەزانی، «شەوگورد»م بە یەک وشە دانابوو،لام وابوو یانی «لاوی شەوگەڕ». ئەمن ئەو کات پێم ناخۆش بوو مامۆستا هێمن بڵێ فلان شتم نەزانی. بەڵام ئەوەی خۆی لە خەیاڵی نەدەهات ئەوە بوو. ئەوەی نەیدەزانی خۆ بە زل زانی بوو. لە پرسیار و فێربوون نەدەوەستا و بەڕاست لای وابوو دەبێ لە زۆر شیعری خۆشی ڕازی نەبێ،

بەڵام وەک وێنەی سەردەمێکی تایبەتی لە ژیانی، بوونیانی بە پێویست دەزانی. هەر لەو سەفەرەدا گێڕایەوە:

- ماوەیەک بوو لە وشەی هاوتای «مرئی« و «نامرئی» دەگەڕام. پێم سەیر بوو چۆن دەبێ کورد ئەو وشانەی نەبێ، ماوەیەک لەمەوبەر گوێم لێ بوو ژنێک تووک و دوعای لە یەکێک دەکرد و دەیکوت: ڕەببی تیری نەبەدیت وێکەوێ!

لام وابوو بارێکی گرانم لە سەر شانی هەڵگیراوە، چونکە بۆم ڕوون بۆوە «بەدی» و «نەبەدی» تەواو پڕ بە پێستی «مرئی» و «نامرئی»ن.

خزمەت بە فەرهەنگ و ئەدەب، یانی کردنەوەی دەرگای بیری ئەو ئینسانانە و پشکنینی دەروون و ناسینیان.

**فینلاند - ١٩٩٩/٦/٢٥**

---

- ئەو بابەتەلەئارشیوی جەعفەر حوسێنپوور(هێدی) وەرگیراوەو پێشتر بلاو نەکراوەتەوە.

* * *

# ئاسۆ و وەبیرهێنانەوەیەک

محەممەد بەهرەوەر

کاتێک ژمارە ١٠٨ی گۆواری مەهابادم بە دەست گەیشت و سرنجی بابەتەکانم دا، زیاتر لە هەمووان «کۆڕێک بۆ سوارە..../ ئەنیستیتۆی خانی» سرنجی ڕاکێشام و بە پەلە لاپەڕەی سیو دووم هەڵداوە و بە وردی ڕاپۆرتەکەم خوێندەوە. یەکێک لەو کەسانەی کە لەو کۆڕەدا وتاری خوێندۆتەوە کاک سەعید نەجاری بووە و لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە:

«لە درێژەی ئەم کۆڕەدا سەعید نەجاری (مامۆستا ئاسۆ) وتەیەکی پێشکەشی ئامادەبوان کرد و ئاماژەی بەمە کرد کە هەرچەند سوارە زۆری لە سەر کوتراوە و زۆری لە سەر نووسراوە، بەلام بەم جۆرەی کە پێویستە نەناسراوە و قسەی لە سەر نەکراوە و سەبارەت بە ڕوانین و تایبەتمەندییەکانی کەسایەتیی سوارە ئاخاوتنی پێشکەش کرد و ئاماژەی بە ڕۆڵی هەوالانی سوارە (عەلی حەسەنیانی (هاوار)، فاتیح شێخولئیسلامی (چاوە)) کرد و کوتی: زۆر ڕاشکاوانە دەڵێم کە شیعری «تۆ دەریامی» هی سوارە نییە و دەڵێ: کاتێک سوارە لە ڕادیۆ تاران بەرنامەی تاپۆ و بوومەلێڵی پێشکەش دەکرد، شیعری زۆر شاعیری تری لە دەفتەرەکەیدا دەنووسین، تا بیانخوێنێتەوە. دوای کۆچی دوایی سوارە بە هەڵە بە ناوی ئەو لە چاپ دراون.

دیوانی «خەوەبەردینە» دوای ئەوەی تایپ دەکرێ، لە لایەن ژمارەیەک کەسایەتی و شاعیر و نووسەر دەخوێندرێتەوە و نێوەرۆکی کتێبەکە بە تێکڕای دەنگ پەسند دەکەن. ساڵی ١٣٧٢ دیوانی «خەوەبەردینە» لە ناوەندی بلاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی (ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەییووبی) چاپ کرا و بلاو بۆوە.

لە «تێبینی»ی لاپەڕە (الف)ی کتێبی «خەوەبەردینە»دا کە خوالێخۆشبوو مارف ئاغایی نووسیویە، نووسراوە: «ئەم دیوانە دوای ئەوەی تایپ کرا، لە لایەن کاک قازی ئەحمەد بە تەنیایی و بەڕێزان مەلا محەممەد عەبباسی، کاک ئەحمەد مەولانی، کاک فەتاح ئەمیری، کاک حوسێن موهتەدی، کاک هەمزەی عەلیار، کاک سەلاح عەرەبی، کاک سەعید نەجاری،کاک سەعدوڵلا مەجیدی و کاک عومەر ئیلخانیەوە بە کۆمەڵ خوێندراوە و ئەگەر دڵسۆزی و پێداهاتنەوەی وردبینانەی ئەو بەڕێزانە نەبوایە، دیوانەکە بەم شێوەیەدەرنەدەچوو.»

شیعری «تۆ دەریامی» لە لاپەرە ٣٨ی دیوانی «خەوەبەردینە»دا هاتووە و مامۆستا ئاسۆ ١٧ ساڵ لەمەوبەر «وەباڵ»ی لەسەر کێشاوە. کە ئی سوارەیە. هەنووکە باوەڕ بە قسەی ١٧

ساڵ بەر لە ئێستای مامۆستا ئاسۆ بکەین یان ئەو وتارە تازەیەی کە لە کۆڕی ڕێزگرتن لە سوارە، لە ورمێ پێشکەشی کردووە!؟ مامۆستا ئاسۆ لە وتارەکەیدا ئاماژە بە دەفتەری یادداشتەکانی سوارە دەکا و دەڵێ: «شیعری زۆر شاعیری تری لە دەفتەرەکەیدا دەنووسین، تا بیانخوێنێتەوە. دوای کۆچی دوایی سوارە بە هەڵە بە ناوی ئەو لە چاپ دراون.» ئەو دەفتەرەی کە سوارە شیعری شاعیرانی تری تێدا نووسیوە بۆ تاکو ئێستا لە باسی نەکراوە؟ ئەگەر ئەو بۆچوونەی مامۆستا ئاسۆ ڕاست بێ خۆ بەشێک لەو هەڵەیەی کراوە خۆشی دەگرێتەوە، چونکە بۆخۆی یەکێک بووە لەو کەسانەی بە دیوانەکەدا هاتۆتەوە. ڕەنگە ئەو گومانە بۆ خوێنەرانیش بێتە پێش و بڵێن لەوانەیە هێندێک لە شیعرەکانی دیکەی کاک سوارە لەگەڵ شیعری شاعیرانی تر تێکەڵ بووبن. مامۆستا ئاسۆ دوای کۆچی دوایی سوارە کە بە دیوانەکەدا چۆتەوە لە سەر سوارەی کردبن بەماڵ و پاشان هەر خۆشی لێی لە هەڵلا دا و بێژێ، «زۆر ڕاشکاوانە دەڵێم کە شیعری «تۆ دەریامی» هی سوارە نییە». مامۆستا ئاسۆ لە زۆربەی ئەو کۆڕ و کۆبوونەوانەی بۆ ڕێزگرتن لە سوارە بەڕێوە چوون بەشداری کردووە و بیروڕای خۆی لە سەر کەسایەتی و شیعرەکانی سوارە دەربڕیوە و ئیشارەی بەو دەفتەرە نەکردووە کە سوارە شیعری زۆر لە شاعیرانی تری لە دەفتەرەکەیدا دەنووسین، تا بیانخوێنێتەوە. دوای کۆچی دوایی سوارە بە هەڵە بە ناوی ئەو لە چاپ دراون....».

مامۆستا ئاسۆ بۆ ئەوەی خاترجەم بێ کە شیعری «تۆ دەریامی» ئی سوارەیە، با بزانین کاک سەلاحی موهتەدی، ئامۆزای شاعیر، لە کتێبی «سوارە و پەخشانی کوردی، ل ٣١٤، چاپ و پەخشی سەردەم ساڵی ٢٠٠٥»چیمان پێ دەڵێ: کاک سەلاح بەم جۆرە باسی شیعری «تۆ دەریامی» دەکا: «شیعرێکی هەیە «تۆ دەریامی»، ماوەیەک بوو «سوارە»م نەدیبوو، جوابی نارد کەشیعرێکم گوتووە و لەمێژە گوتوومە، بەڵام دەرم نەخستووە، با بۆت بنێرم، من لە بۆکان بووم، خەریکی کاری نهێنی بووین و لە ژێر چاوەدێریدا بووین، دیارە «سوارە» بەشدار نەبوو، «سوارە» سەری خۆی داخستبوو و لە سەر هێلکەکانی کڕ کەوتبوو!! بەڵام کە ئەم شیعرەی بۆ من نارد، من بە هۆی ئەوەوە کە هەم هاوڕێ بووین و هەم ئامۆزا، شەڕەقسەمان هەبوو، شەڕەجنێومان هەبوو، لەگەڵ کۆڵێک جنێو ڕاسپاردەیەکم بۆ نارد کە «ئەم شیعرە دوو بەشە، تۆ نیوەت لە کاتێکدا گوتووە، نیوەت لە کاتێکی تردا گوتووە!...» دیم نیوەی ئەوەڵی شتێکی زۆر گشتی بوو، بۆ خەبات و بۆ تێکۆشان و بۆ پێداهەڵگوتن بە جوانیدا نووسرابوو، بەڵام نیوەی دووهەم باس و شۆڕشی کوردستانی عێراق و باسی «حیزبی بەعس»ی دەکرد، تێگەیشتم ئەمە لە بەر دڵی «حکومەتی ئێران» دەڵێ، چونکە ئەو کات ئێران ئەو جۆرە شیعرەی هان دەدا!! لە عێراقیشدا خەڵکیان هان دەدا کە بە خەبات لە

کوردستانی ئێراندا هەڵبدەن و خەڵک بە ناوی کوردستانی عێراقەوە هەندێ قسەی خۆیان دەکرد. من دەمزانی حکومەتی ئێران ئەو شیعرەی پێخۆشە، لەبەر ئەوە جوابم لێ گێڕایەوە، گوتم: «نەڵێ نەیزانی» گوتم: «ئەم شیعرە دوو بەشە... لە دوو قۆناغی جیاوازدا گوتووتە!!» «سوارە» لە وەڵامدا گوتبووی «پێی بڵێن بەو «سەگە»، دیارە سیاسەت هێشتا زەوقی ئەدەبی لێ تێک نەداوە، ڕاست دەکا، ئەمە دوو بەشە، بە دوو جۆر گوتوومە».

* * *

سەرچاوە: گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ۱۰۹، ل ۲۲

سەرچاوەکان:

١ـ گۆڤاری سروە، ژمارە ٤، ساڵی یەکەم، زستانی ١٣٦٤، لاپەڕە ٤٤ تا ٤٧.
٢ـ گۆڤاری سروە، ژمارە ١٢، ساڵی سێهەم، لاپەڕە ١٢ تا ١٥.
٣ـ گۆڤاری مامۆستای کورد، ژمارە ٤ ـ ٥، سوێید، ئەستکهلم ـ ١٩٨٧.
٤ـ گۆڤاری مامۆستای کورد، ژمارە ٣، ساڵی ١٩٨٦.
٥ـ گۆڤاری سروە، ژمارە ٥٥، لاپەڕە ١٣ ـ ١٩، ڕێبەندانی ١٣٦٩.
٦ـ گۆڤاری سروە، ژمارە ٦٢، ساڵی حەوتەم، خەرمانانی ١٣٧٠.
٧ـ گۆڤاری سروە، ژمارە ٦٦، ساڵی حەوتەم، بەفرانباری ١٣٧٠.
٨ـ گۆڤاری سروە ـ ژمارە ٦٨، ساڵی حەوتەم، ڕەشەمەی ١٣٧٠.
٩ـ خەوەبەردینە ـ ساڵی ١٣٧١.
١٠ـ گۆڤاری سروە، ژمارە ٧٥، ساڵی هەشتەم، ڕەزبەری ١٣٧١.
١١ـ گۆڤاری سروە، ژمارە ٨٤، پووشپەڕی ١٣٧٢، لاپەڕەی ٣٢ ـ٣٤.
١٢ـ گۆڤاری سروە، ژمارە ٩٤ ـ ٩٣، ساڵی دەهەم.
١٣ـ سروە، ژمارە ٩٣ ـ ٩٤، خاکەلێوە ـ بانەمەڕ، ساڵی دەهەم. لاپەڕە ٢٤ تا ٢٧.
١٤ـ گۆڤاری سروە، ژمارە ٩٦ ـ ٩٥، ساڵی دەهەم.
١٥ـ گۆڤاری ئابیدەر ١٦ ـ ٧٦/٩/٤.
١٦ـ گۆڤاری سروە، ژمارە ١٤١، ساڵی سێزدەهەم، لاپەڕە ٦٠، خاکەلێوەی ١٣٧٧.
١٧ـ گۆڤاری زرێبار، ژمارە ٣، جۆزەردانی ١٣٧٧، لاپەڕە ٤٢ تا ٤٤.
١٨ـ گۆڤاری ڕوڤار، ژمارە ٥، ساڵی ٧٧.
١٩ـ تاپۆ و بوومەلێڵ، ئیلخانیزادە ـ سوارە، پێشەکی سەلاحەددینی عەرەبی (ئاشتی)، لاپەڕەی ٩ ـ ١٣، چاپی یەکەم ساڵی ١٣٧٩، بلاوکردنەوەی پانیز.
٢٠ـ گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ١٠، ساڵی یەکەم، بەفرانباری ١٣٨٠، لاپەڕەی ١٤ تا ١٧.
٢١ـ گۆڤاری سروە، ژمارە ٢٠٧، ساڵی هەژدەهەم، لاپەڕە ٥ تا ٧ و "نوسخەی نووسەر".
٢٢ـ بەرنامەی کتێبێک لە گفتوگۆدا ـ تەلەویزیۆنی کوردسات. ٢٠٠٣.
٢٣ـ گۆڤاری گەلاوێژی نوێ، ژمارە ٣٤، حوزەیرانی ٢٠٠٤.

**بەرهەمەکانی تری نووسەر**

١. حەزرەتی ئیبراهیم
٢. کۆیلەی ڕاپەڕیو
٣. زەوی چاک
٤. گوندی ئێمە
٥. تەنەکاوا
٦. سوارەو پەخشانی کوردی
٧. نامەبۆ منالێک کەهەرگیز لەدایک نەبوو (ئامادەی چاپ)



## کتێبە چاپکراوەکانی
## کۆڕی زانیاری کوردستان و ئەکادیمیای کوردی

**کۆڕی زانیاری کوردستان:**

١) فەرهەنگی زاراوە (عەرەبی ـ کوردی)، بەدران ئەحمەد حەبیب، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٢، (١٤٢ لاپەڕە).

٢) کوردی تورکمانستان ـ مێژوو ـ ئەتنۆگرافیا ـ ئەدەب، د. مارف خەزنەدار، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٣، (٢٥٨ لاپەڕە).

٣) زاراوەی یاسایی، لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٤٠ لاپەڕە).

٤) زاراوەی کارگێڕی، لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٤٧ لاپەڕە).

٥) من ينابيع الشعر الكلاسيكي الكردي، ج١، رشيد فندی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٢٤٠ لاپەڕە).

٦) ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی، بەدران ئەحمەد حەبیب، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٥٦ لاپەڕە).

٧) ڕێزمانی کەسی سێیەمی تاك، د.شێرکۆ بابان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (١٥٩ لاپەڕە).
٨) چوارینێن خەیام، د. کامیران عالی بەدرخان، وەرگێڕانی لە لاتینییەوە د. عەبدوڵلا یاسین ئامێدی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٩٤ لاپەڕە).
٩) شێوەی سلێمانی زمانی کوردی، د. زەریَ یوسوپۆڤا، و: لە ڕوسییەوە د. کوردستان موکریانی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٢١٦ لاپەڕە).
١٠) العروض في الشعر الكردي، احمد هردی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٢١٨ لاپەڕە).
١١) ژانرەکانی ڕۆژنامەوانی و مێژووی چاپخانە ١٤٥٠ ـ ١٥٠٠، د. مەغدید سەپان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٢٧٨ لاپەڕە).
١٢) زاراوەی ڕاگەیاندن، لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (١٠٨ لاپەڕە).
١٣) فەرهەنگی زاراوەگەلی ڕاگەیاندن (ئینگلیزی ـ کوردی ـ عەرەبی)، بەدران ئەحمەد حەبیب، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (١٦٥ لاپەڕە).
١٤) ئەدەبی منداڵانی کورد ـ لێکۆڵینەوە ـ مێژووی سەرهەڵدان، حەمە کەریم هەورامی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٤٠٦ لاپەڕە).
١٥) گیرەکێن زمانێ کوردی، د. فازل عمر، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (١٣٤ لاپەڕە).
١٦) ل دۆر ئەدەبێ کرمانجی ل سەد ساڵا نوزدێ و بیستێ زایینی، تەحسین ئیبراهیم دۆسکی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٢٧٦ لاپەڕە).
١٧) دەنگسازی و بڕگەسازی لە زمانی کوردیدا، د. شێرکۆ بابان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٢٠٦ لاپەڕە).

١٨) هۆنراوەی بەرگری لەبەرهەمی چەند شاعیرێکی کرمانجی سەروودا ١٩٣٩ ـ ١٩٧٠، د. عبدالله یاسین عەلی ئامێدی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٣٢٠ لاپەڕە).
١٩) یوسف و زولەیخا، حەکیم مەلا ساڵح، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٤٠٧ لاپەڕە).
٢٠) زمانی کوردان ـ چەند لێکۆڵینەوەیەکی فیلۆلۆجی زمان، پ. د فریدریش موولێر ئەوانی تر، و: لە ئەڵمانییەوە د. حمید عزیز ، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (١٩٢ لاپەڕە ).
٢١) ڕێبەری بیبلۆگرافیە کوردییەکان ١٩٣٧ ـ ٢٠٠٥، شوان سلێمان یابە، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٤٠٠ لاپەڕە).
٢٢) فەرهەنگی گەورەی من. د. کوردستان موکریانی، چاپی یەکەم، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦ ، (٨٠ لاپەڕە).
٢٣) دیوانی عەزیز ـ محەمەد عەلی قەرەداغی ـ هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠، (١٤٤ لاپەڕە).
٢٤) زاراوەگەلی کاروباری مین ـ جەمال جەلال حوسێن ـ دلێر سابیر ئیبراهیم ـ دەزگای گشتی هەرێم بۆ کاروباری مین، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٨٠ لاپەڕە).
٢٥) زاراوەی ڕاگەیاندن ـ کەمال غەمبار ـ هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٩٦ لاپەڕە).
٢٦) زاراوەی ئەدەبی ـ ئامادەکردنی: لیژنەی ئەدەب لە کۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٢٨٠ لاپەڕە).
٢٧) ئیندێکسی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد (١٩٧٣ ـ ٢٠٠٢) ـ شوان سلێمان یابە ـ هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٢٤٠ لاپەڕە).

٢٨) The Historical Roots of the National Name of the Kurds
ـ د. جەمال رەشید، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (١٠٧ لاپەڕە)
٢٩) فەرهەنگی کۆمەڵناسی ـ عوبێد خدر ـ چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٨٣ لاپەڕە).
٣٠) بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتیمانی لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا (١٨٨٠ ـ ١٩٣٩ز) ـ د.سەعدی عوسمان هەروتی ـ چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (١٥٥ لاپەڕە ).
٣١) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی قاجاری دا ، نووسینی: حەسەن عەلی خانی گەڕووسی ، وەرگێڕانی لە فارسییەوە: محەمەد حەمە باقی ـ چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، ( ٢٠٤ لاپەڕە ).
٣٢) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی ئەرمەنیدا، نووسینی: ئەسکەندەر غوریانس، وەرگێڕانی لە فارسییەوە ـ محەمەد حەمە باقی. چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (١٢٨ لاپەڕە ).
٣٣) فەرهەنگی کوردی ـ فارسی، وەرگێڕانی لە فارسییەوە ـ محەمەد حەمە باقی. چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (١١٢ لاپەڕە ).
٣٤) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی ئینگلیزی و ئەمریکی دا ـ نووسینی ـ وەدیع جوەیدە. وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە ـ محەمەد حەمە باقی . چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، ( ١١٦ لاپەڕە ).
٣٥) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی قاجاری دا، نووسینی: عەلی خان گۆنەخان ئەفشار. وەرگێڕانی لە فارسییەوە ـ محەمەد حەمە باقی. چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٤٢٦ لاپەڕە ).
٣٦) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی قاجاری دا، نووسینی: عەلی ئەکبەر سەرهەنگ. وەرگێڕانی لە فارسییەوە: محەمەد حەمە باقی. چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧. (١٩٢ لاپەڕە).

٣٧) چەپکێك لە زاراوە گەلی کشتوکاڵ - ئامادەکردنی - حەمە ساڵح فەرهادی - چاپخانەی دەزگای ئاراس - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (١٤٤ لاپەڕە).
٣٨) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران دا. وەرگێڕانی لە فارسییەوە: محەمەد حەمە باقی. چاپخانەی دەزگای ئاراس - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٢٧٠ لاپەڕە)
٣٩) فەرهەنگی دیوانی شاعیران (نالی، سالم، کوردی)، نووسینی - د. محەمەد نووری عارف، چاپخانەی دەزگای ئاراس - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (١٠٠٠ لاپەڕە).
٤٠) یەکەم فەرهەنگی تۆ، وەرگێڕانی: د.کوردستان موکریانی، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٨٦ لاپەڕە).
٤١) ئەدەبی منداڵانی کورد دوای ڕاپەڕین، نووسینی: حەمە کەریم هەورامی، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٣٦٨ لاپەڕە).
٤٢) فەرهەنگی هەراشان، کۆکردنەوە و دارشتنی: کۆمەڵێك مامۆستا، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٣٣٦ لاپەڕە).

**ئەکادیمیای کوردی:**

٤٣) ئەلبوومی کەشکۆڵ، ب ١، دانراوی: محەمەد عەلی قەرەداغی، چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٣٥٢ لاپەڕە).
٤٤) الأدب الشفاهي الكردي ، علي الجزيري ، چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٢٠٠ لاپەڕە).
٤٥) بەرکوڵێکی زاراوە سازیی کوردی، ئامادەکردنی: جەمال عەبدول، دووەم چاپ، چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٣٣٠ لاپەڕە).
٤٦) دیوانی قاصد، ساغکردنەوەی: شوکر مستەفا و رەحیم سورخی، چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٣٥٢ لاپەڕە ).
٤٧) چەند لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی مێژووی کورد لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، نووسینی: دکتۆر زرار سدیق تۆفیق، چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٢٠٨ لاپەڕە).

٤٨) کیمیای ژەهری دەستکرد. نووسینی: پ.د. عەزیز ئەحمەد ئەمین، چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٢٠٨ لاپەڕە).
٤٩) ڕۆڵی سەربازیی کورد لە دەوڵەت و میرنشینە ناکوردیەکان لە سەردەمی عەبباسیدا، نووسینی: مەهدی عوسمان حسێن هەروتی، چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٣٦٨ لاپەڕە).
٥٠) دور نواب السليمانية في المجلس النيابي العراقي (١٩٤٥ - ١٩٥٨)، دانانی: سالار عبدالكريم فندی الدوسكی، چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٣٠٤ لاپەڕە).
٥١) عبدالله گۆران، رائداً لحركة تجديد الشعر الكوردي، دانانی: کەمال غەمبار چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٣٢٠ لاپەڕە).
٥٢) وثائق بريطانية عن تشكيل دولة كوردية مستقلة ١٩٢٤ - ١٩٢٧ ، دانانی: د.عبدالفتاح علی البوتانی، چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٢٦٨ لاپەڕە).
٥٣) ساڵنامەی ئەکادیمیای کوردی ، ئامادەکردنی: پرۆفیسور د. وریا عومەر ئەمین . چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٥٦ لاپەڕە).
٥٤) مەمێ و زینێ، ئامادەکردنی: جاسمێ جەلیل، دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ خستوویەتییە سەر نووسینی کوردیی عیراق و پێشەکیی بۆ نووسیوە و لێی کۆڵیوەتەوە، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (١٦٨ لاپەڕە).
٥٥) هەنگاوێك لەسەر ڕێگەی لێکۆڵینەوەی (دیوانی سالم)دا، محەممەدعەلی قەرەداغی، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٨٠ لاپەڕە).
٥٦) کەرەسە بەتاڵەکان لە ڕوانگەی تیۆری دەسەڵات و بەستنەوە ((شێوەزاری کرمانجی سەروو))، نووسینی: ڤیان سلێمان حاجی، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٢١١ لاپەڕە).
٥٧) هێز و ئاواز لە دیالێکتی کوردیی ژووروودا، نوسینی: عەبدولوەهاب خالید موسا، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (١٤٦ لاپەڕە).
٥٨) کەپنامەی مێرگولان، نوسینی: ڕەسوڵ دەروێش، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، ( ١٧٦لاپەڕە).

٥٩) دۆخەکانی ژێرەوە لای فیلمۆرو هەندی لایەنی ڕستەسازیی کوردی، ئامادەکردنی: یوسف شەریف سەعید، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩ (١٣٤ لاپەڕە).
٦٠) هەندێ لایەنی ڕێزمانی دەسەلآت و بەستنەوە (GB) لەزمانی کوردیدا، ئامادەکردنی: د.سەباح ڕەشید قادر، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩ (١٧٢ لاپەڕە).
٦١) الحياة الاجتماعية للكورد بين القرنين (٤ ـ ٩هـ/١٠ ـ ١٥م)، دانانی: دکتۆرە فائزە محەمەد عزەت، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٢٧٢ لاپەڕە).
٦٢) العلاقات الايرانية ـ السوفيتية ١٩٣٩ ـ ١٩٤٧، دانانی: نزار ايوب حسن الگولی، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٢٩٠ لاپەڕە).
٦٣) بیبلیۆگرافیای کوردناسی لە سەرچاوە فەرەنسییەکاندا، د. نەجاتی عەبدوڵلا، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٥٢٨).
٦٤) بیبلیۆگرافیای کوردناسی لە سەرچاوە ئینگلیزییەکاندا، د. نەجاتی عەبدوڵلا، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٤٤٨).
٦٥) امير امراء كردستان (ابراهيم باشا الملي ١٨٤٥ ـ ١٩٠٨)، دانانی: أ. د. عبدالفتاح علي البوتاني ـ علي صالح الميراني، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (١٦٠ لاپەڕە).
٦٦) دیوانا مەلا محەمەدێ سەیدا، بەهەڤکار: سەید جەلال نزامی، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٨٨ لاپەڕە).
٦٧) داستانی هەیاسی خاس و سوڵتان مەحموود، نووسینی: محەمەد ساڵح سەعید، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٣٢٦ لاپەڕە).
٦٨) کیمیای ژینگە، پیسبوونی ئاووهەوا، پ . د. عەزیز ئەحمەد ئەمین، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (١٦٠ لاپەڕە).
٦٩) گەشتنامەی پوژولا بۆ کوردستان ساڵی ١٨٣٧، وەرگێڕانی: د. نەجاتی عەبدوڵلا، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (١٩٨ لاپەڕە).
٧٠) ڕێزمانی کوردی، وەرگێڕانی: د. نەجاتی عەبدوڵلا، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (١٤٤ لاپەرە).

٧١) بونیاتی زمان لەشیعری هاوچەرخی کوردیدا، دانانی: د. ئازاد ئەحمەد مەحموود، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩ (٢٥٨ لاپەڕە).
٧٢) الحركة الشيوعية في تقارير مديرية الامن العامة ١٩٥٩ ـ ١٩٦٢، نووسینی: د. عبدالفتاح علی البوتانی، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٢٨٨ لاپەڕە).
٧٣) فەرهەنگی سۆفیانەی دیوانی (جزیری و مەحوی)، نووسینی: د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠١٠، (٣٦٠ لاپەڕەیە).
٧٤) چیرۆکی منداڵان لە ئەدەبی کوردیدا (١٩٩١ ـ ٢٠٠٥)، دانانی: ڕازاو ڕەشید صەبری، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠١٠، (٢١٢ لاپەڕە).
٧٥) هەولێر لە سەردەمی ئەتابەگیاندا، نووسینی: پ. د. موحسین موحەممەد حوسێن، عثمان علی قادر کردویە بە کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، ساڵی ٢٠١٠، (٤٧٣ لاپەڕە).
٧٦) هەورامان باشتر بناسین، نووسینی: محەمەد رەشیدی ئەمینی، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، ساڵی ٢٠١٠، (٩٦ لاپەڕە).
٧٧) فەرهەنگا کانی، نووسینی: محەمەد سالح پێندرۆیی (جگەر سۆز)، چاپخانەی سپیرێز – دهۆك، ساڵی ٢٠١٠ (٦٣٩ لاپەڕە).
٧٨) وشەنامە، نووسینی: جەمال حبیب الله (بێدار)، چاپخانەی سپیرێز– دهۆك، ساڵی ٢٠١٠ (١١٤٧) لاپەڕە).
٧٩) بیبلیۆگرافیای ئەکادیمیای کوردی، ئامادەکردنی لیژنەی بیبلیۆگرافیای ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی سپیرێز – دهۆك، ساڵی ٢٠١٠ (٤٠٠) لاپەڕە.
٨٠) ئاسوورییەکانی باشووری کوردستان، نووسینی د. عەبدوڵلا غەفور، چاپخانەی سپیرێز – دهۆك، ساڵی ٢٠١٠ (٢٠٨) لاپەڕە.
٨١) جوگرافیای ئابووری نەفت لە کوردستاندا، چاپی سێیەم، نووسینی د. عەبدوڵلا غەفور، چاپخانەی حاجی هاشم– هەولێر، ساڵی ٢٠١٠ (٣٠٥) لاپەڕە.
٨٢) فلسفة العشق الإلهي في شعر الجزيري، تألیف محمد امین دوسكي، الطبعة الثانية، مطبعة سپیرێز– دهۆك، سنة ٢٠١٠ (١٩٦) صفحة.

٨٣) فەرهەنگی کوردی – فەرەنسی، نووسەر: ئۆگست ژابا، بلاّوکەرەوەی زانستی: فێردیناند یۆستی، وەرگێڕانی پێشەکی و دووبارە لەچاپدانەوەی: د.نەجاتی عەبدوڵلاّ، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، ساڵی ٢٠١٠ (٥٠٥) لاپەڕە.
٨٤) فەرهەنگی ئابووری، دانانی: پ.ی.د. سەلاحەددین کاکۆ خۆشناو، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، ساڵی ٢٠١٠ (٢٥٦لاپەڕە).
٨٥) الوسائل التعليمية ومعوقاتها في تدريس العلوم، رشيد فندي، مطبعة سپيرێز – دهوك، سنة ٢٠١٠ (١٣٠) صفحة.
٨٦) سایکۆلۆژی زمان
٨٧) الكُرد في مؤلفات المقريزي التاريخية – دراسة تحليلية، الدكتور فرهاد حاجي عبوش، مطبعة سبيريز– دهوك، سنة ٢٠١٠ (٤١٨) صفحة.
٨٨) من معالم الحياة الكردية في سوريا / تأليف ميديا عبدالمجيد محمود، مطبعة سپيرێز – دهوك ٢٠١٠، ٢١٦ صفحة.
٨٩) ئێل و ئویجاخێن کوردا ل کوردستانا ئیرانێ، وەرگێرانا مەسعود گولی، چاپخانا سپیرێز – دهۆك ٢٠١٠، ١٤٠ لاپەڕە.
٩٠) سمکویێ شکاك و شۆڕەشا وی د بەلگەنامەیێن ئیرانیدا، ئامادەکرن و تویژاندن فاخر حەسەن گولی و وەرگێران و پێداچوون نزار ئەیوب گولی، چاپخانا سپیرێز – دهۆك ٢٠١٠، ٣٨٤ لاپەرە.
٩١) الفارقي ومنهجه من خلال كتابه تاريخ ميافارقين وآمد، تأليف سطظان محمد سعيد كوچر، مطبعة سپيرێز – دهۆك ٢٠١٠، ٣٠٨ صفحة.
٩٢) پەندی کوردی، نووسینی حەمید رەشاش، چاپخانەی سپیرێز – دهۆك ٢٠١٠، ٣٢٤ لاپەڕە.
٩٣) دو فەرهەنگێن ڤەهاندی نووبار و (مرصاد الأطفال) بەرهەڤکرنا تەحسین ئیبراهیم دۆسکی، چاپخانەی سپیرێز – دهۆك ٢٠١٠، ١١٢ لاپەرە.
٩٤) دو ڤەهینۆکێن کرمانجی د علمێ تەجویدێ دا، بەرهەڤکرنا تەحسین ئیبراهیم دۆسکی، چاپخانەی سپیرێز – دهۆك ٢٠١٠، ١٠٠ لاپەرە.
٩٥) لێکۆلێنەوەو ساغکردنەوەی بەشێك لە دیوانی موخلیس. د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، چاپخانەی سپیرێز – دهۆك ٢٠١٠، ٣٢٤ لاپەرە.

٩٦) دیوانا نەفعی، ساخکرن و بەرهەڤکرن تەحسین ئیبراهیم دۆسکی و مەسعود خالد گولی، چاپخانا سپیریز/ دهۆك ٢٠١٠، ٢٦٠ لاپەرە.
٩٧) بنیاتی جۆرەکانی ڕووداو لە ڕۆمانی کوردی باشووری کوردستان، نووسینی ڕێزان عوسمان (خاڵە دێوە)، چاپخانەی سپیریز/ دهۆك ٢٠١٠، ٢٧٦ لاپەرە.
٩٨) تورك لە بولگارستان، کورد لە تورکیا، نووسینی، عەزیز نەسین، وەرگێران و ئامادە کردنی، بەکر شوانی و سیروان ڕەحیم، چاپخانەی حاجی هاشم/ هەولێر ٢٠١٠، ١٤٠ لاپەرە.
٩٩) الدولة الأيوبية وفق نظرية الدولة لابن خلدون، تأليف: د. حكيم عبدالرحمن البابيرى، مطبعة، حاجى هاشم/ أربيل ٢٠١٠ ، ٣٢٠ صفحة.
١٠٠) فەرهەنگی پزیشکی، دانانی د. جەمال ڕەشید، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر ٢٠١٠، بەرگی یەکەم ٨٤٠ لاپەرە.
١٠١) فەرهەنگی پزیشکی، دانانی د. جەمال ڕەشید، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر ٢٠١٠، بەرگی دووەم ٧٩٦ لاپەرە.
١٠٢) فەرهەنگی پزیشکی ، دانانی د. جەمال ڕەشید، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر ٢٠١٠، بەرگی سێیەم ٦٨٠ لاپەرە.
١٠٣) ڕاسپاردەکانی کۆنفرانسی بەرەو ڕێنووسێکی یەکگرتووی کوردی، ئامادەکردنی: لێژنەی زاراوە لەئەکادیمیای کوردی، هەولێر ساڵی ٢٠١٠، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، (٦٤) لاپەرە.
١٠٤) ڕۆژنامەنووسی پرۆفیشناڵ و ئیتیکی ڕۆژنامەوانی، نووسینی: محەمەد ساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، ٢٠١٠، (١٨٤) لاپەرە.
١٠٥) ڕەوتی نوێکردنەوەی شیعری کوردی لە باشووری کوردستان لەساڵانی (١٩٨٠-١٩٩١) دا، نووسینی : د. حوسێن غازی کاك ئەمین گەلاڵەیی، چاپخانەی حاجی هاشم- هەولێر، ساڵی ٢٠١٠، (٢٣٥) لاپەرە.
١٠٦) فەرهەنگی میدیا (کوردی-کوردی)، بەرگی یەکەم، نووسینی: د.ئەورەحمانی حاجی مارف، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، ساڵی ٢٠١٠، (٢٨٩) لاپەرە.
١٠٧) لایەنە ڕەوانبێژییەکان لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، نووسینی: د.ئیدریس عەبدوڵلا مستەفا، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، ساڵی ٢٠١١، (٤٢٥) لاپەرە.

١٠٨) فەرهەنگی زاراوەكانی ئاو، نووسینی: ناهیدە تاڵەبانی – د.خالید بەرزنجی – فەیروز حەسەن عەزیز، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر،ساڵی ٢٠١١، (٤٢٨) لاپەرە.
١٠٩) مذكرات دولة الرئيس حسني بك البرازي رئيس الوزراء السوري الأسبق (١٨٩٥-١٩٧٥) تقديم: الدكتور عبدالفتاح علي البوتاني، مراجعة الهوامش: علي صالح الميراني، مطبعة الحاج هاشم – اربيل ، سنة ٢٠١١، ( ١٢٤ ) صفحة.
١١٠) عەقیدە نامەیێن كرمانجی، كۆمكرن و بەرهەڤكرن: تەحسین ئیبراهیم دۆسكی، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، ساڵی ٢٠١١، ( ٤٢٥) لاپەرە.
١١١) المعجم التاريخي لإمارة بهدينان، تأليف: الدكتور عماد عبدالسلام رؤوف، مطبعة الحاج هاشم – اربيل، سنة ٢٠١١، (٤٢٣) صفحة.
١١٢) ما مِنْ مكانٍ نختبئُ فيه، مذكرات ممرضة بريطانية في العراق ١٩٥٤-١٩٩١، تأليف: سوزان فرانكس و أندرية كروفس، ترجمة: ابتسام نعيم الرومي، مطبعة الحاج هاشم – اربيل، سنة ٢٠١١، (٢٩٥) صفحة.
113) Aspects of the Verbal Construction in Kurdish, Auther : Dr. Waria Omar Amin, Printed in : Haji Hashim Printing House, Erbil- 2011, (179) page.
١١٤) بیرەوەرییەكانی عەلی ئەكبەرخانی سەنجاوی سەردار موقتەدر، ساغكردنەوەی: دكتۆر كەریمی سەنجاوی، وەرگێڕانی : دكتۆر حەسەن جاف، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، ساڵی ٢٠١١، (٦٨٧) لاپەرە.
١١٥) شیعری شانۆیی لە ئەدەبی كوردیدا (باشووری كوردستان ١٩٢٥ – ١٩٦١)، نووسەر: عەبدوڵڵا رەحمان عەوڵڵا، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، ساڵی ٢٠١١، (٦٩٥) لاپەرە.
١١٦) شواهد المقبرة السلطانية في العمادية (دراسة تاريخية – أثرية)، المؤلف: الدكتور عماد عبد السلام رؤوف – الدكتورة نرمين علي محمد أمين، مطبعة الحاج هاشم – اربيل، سنة ٢٠١١، (١١٤) صفحة.
١١٧) تقسيمات كيشورى در شرق كردستان، گردآورند: دكتر عبدالله غفور، چاپ دوم، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، ساڵی ٢٠١١، (٤٤٨) لاپەرە.

١١٨) الكورد في جيش الدولة المملوكية البحرية، المؤلف: عزت سليمان حسين، مطبعة الحاج هاشم – اربيل، سنة ٢٠١١، (٢٠٠) صفحة.
١١٩) قصائد كردية مترجمة ومقالات نقدية، ترجمة وتقديم: كمال حسين غمبار، مطبعة الحاج هاشم – اربيل، سنة ٢٠١١، (٤٢٤) صفحة.
١٢٠) ئێزدیاتی (جڤاك، سەمبۆل، ریتووەل و میت)، نووسەر: د. خانا ئۆمەرخالی، چاپی دووەم، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر سالّی ٢٠١١، (١٩٨) لاپەڕە.
١٢١) گەشتێك بەكارگەی جۆلایی دا، نووسینی: عەبدوللا سەمەدی، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، سالّی ٢٠١١، (١٢٢) لاپەڕە.
١٢٢) فەرهەنگی ناهید، نووسینی: محەمەد ناهید، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، سالّی ٢٠١١، (٨٢٦) لاپەڕە.
١٢٣) دراسة في أدب الفولكلور الكردي، الدكتور عزالدين مصطفى رسول، الطبعة الثانية، مطبعة الحاج هاشم – اربيل، سنة ٢٠١١، (١٧٦) صفحة.
١٢٤) زمانەوانی، پرۆفیسۆر د. محمد معروف فتاح، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، سالّی ٢٠١١، (٢٤٤) لاپەڕە.
١٢٥) ئۆسمان سەبری و ئالییەك ژ سەربۆرا وی یا ئەدەبی، نووسینی: كۆڤان خانكی، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، سالّی ٢٠١١، (٣٣٦) لاپەڕە.
١٢٦) بیبلیۆگرافیای كوردناسی: كورد و كوردستان لە سەرچاوە ڕووسییەكاندا، نووسەر: ژ.س. موسائیلیان، وەرگێڕانی لە ڕووسییەوە: د.ئەفراسیاو هەورامی، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، سالّی ٢٠١١، (٨٢٦) لاپەڕە.
١٢٧) شعر و پەخشانی سوارە، لێكدانەوەو شیكردنەوەی بەرهەمەكانی سوارە، كۆكردنەوەو ئامادەكردنی: محەممەد بەهرەوەر، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، سالّی ٢٠١١، (٤٠٦) لاپەڕە.